# یادی کەلار

بڵاوکراوەیەکی تایبەتە بە ساڵیادی بەقەزابوونی کەلار

ژمارە ( ٦ )ـی شوباتی ٢٠٢٢




سەرپەرشتیارانی بڵاوکراوە:

مستەفا سەعید عەلی

ئەحمەد محەمەد قادر




کاروباری هونەری:

زاری



52

# پێڕستی بابەتەکان



# کەلار دوای 52 ساڵ له بەشار بوون

شەهاب حاجی ئەحمەد
قایمقامی کەلار

کـەلار بەهەرچـی تیایدایـە شـارێکی زینـدووە، بەئازایەتـی خەڵکەکـەی، بـە مـەرزی، بەنەوتـی سـەوز و ڕەشـی، بـە هەڵکەوتـەی جوگرافـی ، بەسـەروەتی سـەر ئـەرز و بـن ئـەرزی، بـە ڕووبـاری، بـەزەوی بەپیتـی، بەگیانـی پێشـمەرگانە و ئازایەتـی گەنجەکانـی، بەڕەسـەنایەتی وهونـەری سـادە وجوانـی، بەپاکـی ومیهرەبانـی و غەریبدۆسـتی خەڵکەکـەی، کـەلار شـارێکە بەشـی وڵاتێـك خاڵـی هێـز و جیاکـەرەوەی هەیـە، ئـەوە دەبێتـە 52 ساڵ کە شارەکە لـە زەمانـی حکومەتی عیراقـدا کراوەتـە قـەزا، بـەڵام ئـەو پارچـە شـوێنەواریانەی

پارساڵ لە سەنتەری شارەکەدا دۆزرایەوە، دەریخست
مێژووی کەلار دەگەڕێتەوە بۆ(دوو هەزار ساڵ ) پێشتر
و ئێستا ئەو نموونانە لە ( بەڕێوەبەرایەتی
شوێنەواری گەرمیان ) پارێزراون و لە ژێر لێکۆڵینەوەی
شوێنەوار ناساندان.

ئەوە بۆ شەشەم ساڵی لەسەر یەک چەند چالاکوان و
رۆژنامەنووس و رۆشنبیر و ئەکادیمی و هونەرمەندێک
بەپاڵپشتی و هاوکاری ئێمە لە ئیدارەی شارەکە یادی
رۆژی کەلار بەبڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی وەرزی سەنگین
و چالاکی جۆراوجۆر دەکەنەوە،بڵاوکراوەی یادی کەلار لە
شەش ساڵی ڕابردودا بۆتە ئەرشیف و ئینسایکلۆپیدیایەکی
نایاب بۆ هەرچی کە پەیوەندی بە کەلار و کەلاریەکانەوە
هەیە.

لەپەیوەندی بە شارەکەشدا دووای 52 ساڵ کەلار کە
کاتی خۆی بەناچاری و لەدۆخێکی ناسروشتیدا گەورە
بووە، ئێستاش سەرەڕای گەشەی خێرا هێشتا بە ڕێگای
بوژاندنەوە و سەرپێکەوتندایە، کەلار هێشتا گیرۆدەی
ڕێگری جیاجیایە لەبووژانەوە وگەشە وگەورەبوون، بەڵام
کەلار لە ئایندەدا بەو هەموو خاڵی هێزەی هەیەتی دەبێتە
شار بە مانا فراوانەکەی وشەکە، ئێمەش لە ساڵانی
ڕابردودا و لە ئیدارەدانی شارەکەدا سەرەڕای جۆرەها
بارودۆخی نالەبار وکێشە وکۆسپ وئاستەنگی زۆر،
بەڵام هەوڵی زۆرمان بۆ دەربازکردنی کەلار لە ڕەوشە

ناهەموار وسەختەکاندا دا و بەهەوڵ وهیممەتی هەموو دڵسۆزان لە فەرمانگەکانی کەلار و ئیدارەی گەرمیان و بەڕێوەبەرایەتییەکانی و خەڵکە پاك وچاکەکەی کەلاریش شارەکەمان گەیاندە ئەم رۆژە و ئەم حاڵە کە شارێکی زیندوو و پڕ جموجوڵ وبوژاوە و ئاوەدانە و ئاسۆی ئایندەشی پشت بەخوا رۆشنە، بەتایبەت کەچاومان لەسەر ئەوەیە کار وپرۆژەی هەمووان لە حکومەت و خەڵك و رێکخراوەکان ئەوەی لێ بەرهەم بێت کە کەلار ببێتە ناوەندی پارێزگای گەرمیان و ناوەندێکی گەورەی بازرگانیش لە ناوچەکەدا کە هەموو مەرجەکانی ئەم بوونە سەنتەری بازرگانیەی تێدایە، لە ئێستاشدا حکومەت کار بۆ ئەوە دەکات لەسەر رووباری سیروان پرۆژەی گەورەی گەشتیاری و بازرگانی ونیشتەجێبوون بە "3" قۆناغ دروست بکرێت، بەمەش پشت بەخوا و بەهیممەتی دڵسۆزان کەلارەکەمان دەبێتە یەکێك لەشارە گەشتیاریە جوان وسەرنج ڕاکێشەکان بۆ گەشتیارانی کوردستان وعیراق.

# قەزای کەلار
# ڕابردو و ئاینده



شێخ محەمەد شاکەلی

من لەسەرەتای چلەکانی سەدەی پێشوو لە شارەدێی کەلار هاتوومەتە دونیاوە، لە هەرکات شوێنێك باسی کەلار بێتە پێشەوەی بیروهۆشم دەگەڕێتەوە بۆ کەلاری سەردەمی منالّیم و سیما و شێوەی و چۆنێتی ژیانی پێش زیاتر لە شەست ساڵ بەڕوونی وەکو تابلۆیەکی پڕ لە جولّەو ڕەنگ دێتەوە یادم. لەبەرئەوە باسەکەم دەربارەی قەزای کەلارو دەوروبەریەتی لەو سەردەمەوە دەستپێدەکەم.

کۆتایی چلەکانی سەدەی پێشوو، ئاوەدانی بەرچاو تەنها لە شوێنی ئێستای قەزاو دەوروبەری گوندی کەلار نزیك سەدماڵێك و دێی بنگرد دە دوانزە ماڵێك لە بناری باشووری گردی شێروانە و ئاشەواکەی خوالێخۆشبوو ( کەریم بەگی جاف ) لای ڕۆژهەڵاتی گردەکەوە بوو، بو جۆگەیەك ئاو کاری دەکرد کەلەڕووباری سیروانەوە بۆی هێنرابوو. قەڵای شێروانەش بە شکۆوە لەسەر گردەکەوە دەیڕوانییە ڕووباری سیروان، بەلای چەپیدا دەشتی بەرینی شێروانە و شاکەل بوو، بەلای ڕاستیدا شەقامی پان و پۆڕ و باڵەخانەو بازاڕو خەڵکی زۆر و کارەبا و زانکۆ و سەدان جۆری ئاوەدانی و بینا و جولّەی خەڵك نەدەبینرا.

زەوی زاری باکورو ڕۆژاوا و باشورە قەزاکە کشتوکاڵی دەیمی

لێدەکرا خاوەن مەڕومااڵات و ڕەشە وڵاخیش بۆ لەوەڕخۆری سودیان لە گژوگیای ئەو دەشتە وەردەگرت.
ساڵی ١٩٥٣-١٩٥٤ ئاوەدانییەکی بچووك لەسەر ڕێگاخاکییەکەی نێوان جەلەولا و باوەنور، کە بە شوێنی ئێستای قەزا داتێدەپەڕێت دەرکەوت، ئەمەش بەهۆی دامەزراندنی پرۆژەیەکی گواستنەوەی ئاو لە ڕووباری سیروانەوە بۆ دەشتی ( سەیل ماڵ )، کە شوێنی ئێستای گەڕەکی پیشەسازیی کەلارە، بەدانانی ئامێرێکی گەورەی ئاو هەڵگۆز و لوولەوە کەرەستەی دیکەوە، کە پێویستی بە وەستا و چەند کرێکارێك هەبوو، بۆ ئەوانە لەو شوێنەدا خانوو دروستکرا. ئەمە یەکەم شوێنی نیستەجێبوون بوو لەو شوێنەی کە ئێستا سەنتەری شاری کەلارە.
پرۆژەی ئاو گواستنەوە لە سیروانەوە بۆ ئەو دەشتە بە پیتە بەدەست پێشخەری (مستەفا بەگی جاف ) و خزمەتێکی تری لەو سەردەمەدا کارێکی گرنگ بوو لەڕووی ئابووری و ئاوەدان کردنەوە.

بەهۆی ئەو پرۆژەوە دوای ماوەیەکی کەم چەند ماڵ و چایخانە و دوکانێك لەو نزیکانە دروستکران، بۆ ماوەیەك خەڵکی دەوروبەر بەو شوێنەیان دەوت ( مەکینەکە ).. کە مەبەستیان ئامێری ئاو هەڵگۆزەکەبوو . هەموو دانیشتوانی گوندی کەلار و بنگردو مەکینەکە ئەو دەمە ژمارەیان لە هەزار کەس تێپەڕی نەدەکرد. قەزای کفری ئەوکات، تەنها شاری گەرمیان بوو لە بناری سەگرمەوە بۆ بەرزاییەکانی حەمرین. پێویستیەکانی ژیان لەکەرەستەی کشووکاڵی و داوودەرمان و پێویستی تەندروستی هەموو لەو شارەوە دەهێنران بۆ دێهاتەکانی دەورەبەری. ڕێگایەکی خاکی بە زستان قوڕو لافاو بە هاوین تەپووتۆزو خۆڵاوی بون، گواستنەوە ئاسان نەبوو، خەڵك زۆرتر بە پیادە یان سواری ولاخی بەرز و گوێ درێژ سەفەریان دەکرد. ئۆتۆمبێل زۆرکەم یان هەرنەبوو، ساڵی هات و نەهات واتە ساڵی باران بارین یان باران نەبارین

کاریگەری لەسەر ژیانی خەڵکی ناوچەکە هەبوو، چونکەپشتیان بە باران دەبەست بۆ کشتوکاڵ و مەڕداری کە تاکە سەرچاوەی بژیوییان بوو. دانشتوانی گوندی کەلار بەتایبەتی گەنجەکان هاوینی درەنگ و پایز دەچونە سەر کەناری سیروان، کە ڕوەکێکی کێوی زۆری لێبوو، هەریەکە چەند بارە دارگەز یان پەڵك یان تەرویان دەبڕییەوە بە وڵاخ دەیانهێنایەوە بۆ ماڵەوە و دایان دەنا بۆ ووشك بونەوە، بەهارانیش پاش نیشتنەوەی لافاوی سیروان، وردە دارو دەوەنی ووشك لەکەناری ڕوبارەکە بە جێ دەما، ژنانی گوند بە کۆمەڵ دەچوون کۆیان دەکردەوە دەیانهێنایەوە بۆ ماڵ، وردەدارە وشکەکان بەکەڵك بوون بۆ سوتەمەنی و پێ دەوترا ( ئاو ماڵکە ). دارەوشکە کەڵەکە کراوەکانیش پاش ماوەیەك، چەند کەسێك بە گروپ بەکاروانێك باریان دەکرد. سپێدەی بەیانی ڕێدەکەوتن بۆ شاری کفری، سەرباریشی چەند مریشك و کەڵەشێر و بڕێك هێلکەبوو بەمەبەستی فرۆشتنیان لەشار. ڕێگایەکی دورودرێژ زیاتر لە ٦٥کم چوون و گەڕانەوەیان دەبڕی و پێش نیوەڕۆ دەگەیەشتن و شتەکانی خۆیان ساغ دەکردەوە و بە پارەکەی هەندێك پێویستی ماڵیان دەکڕی و بەهەمان ڕێگادا پێش نوێژی شێوان دەگەشتنەوە مەنزڵ.

ڕێگای نێوان – جەلەولا – باوەنور – دەربەندیخان ئەوەندە باشنەبوو هەمووکات بەکەڵکی هاتوچوبێت بەتایبەت لەوەرزی باران باریندا، حکومەت لەسەرەتای پەنجاکاندا زۆر لەسەرخۆ خەریکی چاککردنی ئەو ڕێگەوبانەبوو، هەندێك کرێکارو ئامێر لە نێوان جەلەولا – کەلار وەکو سەرەتا بەو کارەوە خەریك بوون. بۆ سالانی ١٩٥٣ بە دواوە ڕێگاکە ئەوەندە چاك کرایەوە بە کەڵکی هاتوچۆی ئۆتۆمبێل بێت دانشتوانی گوندەکانی سەر ڕێگاکە تا باوەنور هاتووچۆیان بۆ کڕینی شتومەك و فرۆشتنی بەروبومەکانیان لە کفرییەوە وە گواستنەوەی بۆ جەلەولا و خانەقین و بەغداد. ئەم زۆربوونی هاتوچۆ و پرۆژەی چاککردنی ڕێگایە وایکرد ژمارەی ماڵەکانی ( مەکینەکە ) ی شوێنی ئێستای قەزای کەلار خەڵکی زیاتر ڕووی تێبکەن و خانو

و چایخانـەو چەنـد دوکانێکـی لێدروسـت بکرێـت.
تـا سـاڵی ١٩٥٨ شـوێنی ئیسـتای قەزاکـە ئەوەنـدە خەڵـك و خانـوو جوڵـەی تێدابـەدی نەدەکـرا کـە نـاوی شـارۆچکە یـان گونـدی لێبنرێـت لـەو بـەرەوارە بـەدواوە گۆڕانـگاری دەسـتیپێکرد.
کودەتـای ١٤ی تەمـوزی ١٩٥٨ وەکـو بۆمبێـك تەقییـەوە و لـە هەمـوو عێراقـدا دەنگـی دایـەوە. هەرچەنـدە جوڵانەوەکـە لەسـەرەتادا کودەتایـەك بـوو هەندێـك ئەفسـەرو چەنـد یەکەیەکـی سـەربازی ئەنجامیانـدا. بـەڵام لەبەرئـەوەی گۆڕانکارییـەکان و ئامانجەکانـی لـە بەرژەوەنـدی گشـتی خەڵکـی عێراقـدا بـوو، بەگەرمـی پێشـوازی لێکـراو بـە شۆڕشـی دژی سـتەم و خـراپ بەکارهێنانـی دەسـەڵات نـاوی دەرکـرد، بەتایبەتـی بـۆ کـورد جێـگای خۆشـحاڵی بـوو، چونکـە بـۆ یەکەمجـار بـە فەرمـی دانـرا بـەوەی لـە عێراقـدا کـورد و عـەرەب هاوبەشـن.
ماوەیـەك شۆڕشـی سـەرکردایەتی جێگـەی پشـتگیری زۆرینـەی خەڵکـی کوردسـتان بـوو، بـەڵام پـاش نزیکـەی دووسـاڵێك گیروگرفـت لـە نێوانـدا دروسـتبوو، شـێوازی هەڵسـوکەوتی دەسـەڵاتدارانی شۆڕشـەکەو بەغـداد بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی نەتەوایەتـی گەلـی کـورد دادپەروەرانـە و دروسـت نەبـوو، ناکۆکـی هاتـە پێشـەوە کـە سـەرئەنجام سـەری لـە ململانـێ و شـەڕی چەکدارییـەوە دەرهێنـا.
لـە ئەیلولـی ١٩٦١ شـۆڕش لـە کوردسـتان بەرپابـوو، ئـەم ڕووداوە کاریگەریـی لەسـەر هەموو کوردسـتان هەبوو، کەلار و دەورووبەریشـی بەدەرنەبـوون لـە ئەنجامەکانـی، ئـەوکات پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان سـەرکردایەتی شۆڕشـەکەی دەکـرد و ژمارەیـەك کادرو ئەندامـی چالاکی ئـەو پارتـە لـە شـارەکانی خورماتـوو و کفـری و خانەقیـن و شـارەدێی کـەلار هەبـوون، کـە مـاڵ و حاڵـی خۆیانیـان بەجێهێشـت و دواتـر لـە شـاخی بەمـۆ بنکـەو بارەگایـان دانـا و بـە چالاکـی سیاسـی و پاشـان سـەربازی دەسـتیان بـە جموجۆڵکـرد.
هـەر لـەو سـاڵەدا ١٩٦٠ – ١٩٦١ ڕێـگای نێـوان جەلـەولا – دەربەندیخـان کۆتـای پێهـات و ڕێـگای دەربەندیخـان – سـلێمانیش هـەروا. هاتوچـۆ بـەو ڕێگایانەدا ئاسـانترو باشـتربوون، شـوێنی ئێسـتای قـەزای کەلاریش ئاوەدانـی و جموجۆڵـی زیاتـری تێکـەوت. لـە باکـوری ( مەکینەکـە ) و

بـەلای چەپـی شـەقامەکەدا ژمارەیـەك پۆلیـس و جێگـری ئەفسـەرێکی تێداجێگیرکـران، ئەمـە یەکـەم دامـەزراوەی حوکمـی بـوو هاتـە کـەلارە وە.

لـە سـاڵی ١٩٦٢ هەسـتت بـە بوونـی پێشـمەرگە لـە بەرزاییەکانـی باکـوری کـەلار دەکـرا. جموجـول وچالاکییـەکان بـوون بـە هـۆی لاوازی هەیبەتـی دامەزراوەکانـی حکومـەت لـە ناوچەکـەدا. سـەرەتای ١٩٦٣ بـە کـردەوە شـەڕ و پێکـدادان لـە نێـوان سـوپای عێـراق و پێشـمەرگە لـە زۆربـەی ناوچـەکان درێـژەی هەبـوو، پشـتگیری زۆرینـەی خەڵکـی کـورد بـۆ شـۆڕش، چونکـە جموجۆڵـی هێـزی سـەربازی و ئەمنـی دەوڵەتـی عێـراق سـتەمکارانە و دوور لـە بنەماکانـی مرۆڤدۆسـتی بـوو، جگەلەمـە هێـزی پێشـمەرگە هێزێکـی خۆبەخـش و بـەدوای هیـچ بەرژەوەندییەکـی تایبەتـدا نەبـوون.

لـەو هەلومەرجـەدا لەنـاکاو بەعسـییەکان لـە رەمـەزان / شـوباتی ١٩٦٣/ لـە بەغـدا کودەتایـان لـەدژی دەسـەڵاتی سـەربازیی عبـد الکریـم قاسـم بەرپاکـرد و لەماوەیەکـی کەمـدا توانییـان حکومەتەکـەی لەناوببـەن. لـەوەودوا ئاگروئاسـن و توندوتیـژی زۆریـان بەکارهێنـا و سیاسـەتی توندوتیـژی لەیەکـەم ڕۆژەوە بـوو بـە بەرنامـە و کاریـان لەسـەردەکرد. پـاش چەنـد مانگێـگ ئارامـی و هەندێـك گفتوگـۆی نێـوان شـۆڕش و بەعـس کەبەئەنجـام نەگەشـیت ئاڵـۆزی پەیدابـوو، لـە حوزەیرانـی هەمـان سـاڵ حکومـەت بـە هێرشـێکی گـەورەو بەربـەڵاو شـەڕی دژی گەلـی کـورد دەسـتپێکرد.

مـاوەی دەسـەڵاتی یەکەمـی بەعـس کەمتربـوو لـە سـاڵێك، پڕبـوو لـە زەبروزەنـگ و کوشـتن و وێرانکـردن بەتایبـەت لـە کوردسـتان و خەڵکـی بیرەوەرییەکـی تاڵیـان هەبـوو دەربـارەی ئـەو کاتـە و ناویـان لێنابـوو ( سـاڵی بەعسـییەکان ).

سـاڵی ١٩٦٣ بـۆ کـەلارو دەوروبـەر و هەمـوو کوردسـتان و عێراقیـش سـاڵی نەهـات و مەینەتـی و توندوتیـژی بـوو. ئـەوکات ئیـتر جـادەی نێـوان جەلـەولا – سـلێمانی چـاك کرابـوو بـۆ هاتوچـۆ، بـەڵام تەنهـا بـە ڕۆژ ڕێـگا بـە هاتوچـۆ دەدرا. دەربەندیخـان وەکـو شـوێنی کۆکردنـەوەی هێـزە سـەربازییەکانی عێـراق و سـەربازگەیەکی گـەورە سەرپەرشـتی

کاری سەربازی دژە شۆڕشی لە باکورو باشوری ناوچەکەدا دەکرد. جادە گشتییەکان تا نزیك خۆرئاوا لە ژێرکۆنترۆڵی سوپا دابوون، شەوان تەنها ناوەندی شارەکان بەدەستیانەوە بوو تا خۆرهەڵاتنی ڕۆژی دواتر، هێزە سەربازییەکان ئەو ساڵە لە ڕوخاندن و سوتاندنی دێهات و دەغڵ و باخی هاوڵاتیان درێغییان نەکرد، جگەلە بۆمباران بە تۆپی دوورهاوێژ و فرۆکە لە ئاسمانەوە کە زیانی گیانی و ماڵی زۆری دەگەیاندە خەڵکی مەدەنی بێ تاوان. تا ئەوکاتە تەنها دامەزراوەی فەرمی لە باکوری ئێستای قەزای کەلار تەنها ئەو بنکەی پۆلیسە هەبوو. توندوو تیژی و جەبەرووتی بەعسییەکان کەمتر لە ساڵێکی خایاند، ئەوانیش بە کودەتایەکی سەربازی کە عبدالسلام عارف و چەند یەکەیەکی سەربازی لە بەغداجێبەجێیان کرد و کۆتاییان پێهات و تا ساڵی ١٩٦٨ دەسەڵاتی هەردوو برا عبدالسلام و عبدالرحمن درێژەی هەبوو.
بەهاتنی بەعسییەکان بۆ جاری دووەم بۆ دەسەڵات لە ساڵی ١٩٦٨ سەرلەنوێ بەعس دەسەڵاتی لە عێراقدا گرتەوە دەست.
لە پاش نەمانی حوکمی یەکەمی بەعس تا ساڵی ١٩٧٠، ماڵ و خانوو ئاوەدانی لە شوێنی ئێستای کەلار لەبەری چەپی شەقامی سەرەکی زیادی دەکرد، پاشان لەبەری ڕاستی جادەکەش خانووی نیشتەجێبوون و دووکان و چایخانە، بەڵام وەکو بازرگانی و ئاڵوگۆڕی بەروبوم و ساغکردنەوەیان بە پارەو چۆڵ و کۆبونەوەی خەڵکی زۆر بەدینەدەکرا لەو شوێنە.
هەر لەو ساڵانەدا و بە دیاریکراوی لە ساڵی ١٩٦٥ بە دواوە بە هۆی دروستبوونی دووبەرەکی و شەڕی ناوخۆ، لەناو خودی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی کوردستاندا، باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بنکەیەکی گەورەیان لە شارەدێی کەلار دامەزراند و ژمارەیەك پێشمەرگەو بەرپرسی لێجێگیر بوون، جموجۆڵی سیاسی و سەربازی ئەوان ڕۆڵی هەبوو لە گەشەکردنێکی سنورداری ئابووری لەگوندی کەلار و شوێنی ئێستای کەلار. پەیوەندی کارگێڕی دێهات و ناحییەکانی سەرقەڵاو پێباز بەقەزای کفرییەوە بوو کفریش سەر بە پارێزگای کەرکوك بوو.

لـە سـەرەتای شەسـتەکانەوە پاسـێکی ڤاڵڤـۆی بـار و نەفەرهەڵگـری گـەورە ڕۆژانـە لـە گونـدی شـێخ لەنگـەری باشـوری کـەلار، سـبەینان بەڕێدەکـەوت بـە کـەلارو هەمـوو دێهاتەکانـی سـەر ڕێـگای کفـری تـا ناوەنـدی قـەزای کفـری، دێهاتییـەکان بـۆ سـەردان و بازاڕکـردن بـەو پاسـە دەچوونـە شـارو دەگەڕانـەوە. پاسـەکە یـەك دوو کاتژمێـر لەشـار دەمایـەوە بەهەمـان ڕێـگادا بـۆ ئێـوارە دەگەشـتەوە شـوێنی پێشـووی.
لەماوەی ئـەو حـەوت ساڵە ( ١٩٦٣ – ١٩٧٠ ) گۆڕانـکاری گـەورە کـە شـایەنی باسـبێت ڕووی نـەدا لـە ژیانـی خەڵـکدا، پـرۆژەی گـەورە وەك ڕێگاوبـان و نەخۆشـخانە و بەنـداو لـە هەمـوو ناوچەکـە دروسـتنەکرا. لە ڕووی تەندروسـتی و ڕۆشـنبیری و ئابـوری پێشـکەوتنی ئەوتـۆ نەهاتنـە بەرچـاو، زۆربـەی دانیشـتوان جگـە لـە ناوەنـدی شـاری کفـری وەکـو جـاران بـە کشـتوکاڵی و مەڕدارییـەوە خەریـك بـوون، لێـرەو لـەوێ ژمارەیەکـی کـەم کەسـانێك لـە فەرمانگـەی میـری لـە کەرکـوك بەغـداد دادەمـەرزان هەندێـك ئامـرازی نوێـی کشـتوکاڵیش پەیدابـوون. ئەوانـەی توانـای داریـیـان باشـبوو دەیانکـڕی، وەك ترکتـۆر - کۆمپایـن – دەڕاسـە – ئامێـری ئاوهەڵگۆزیـن و ئامێـری گەنـم و جـۆ هاریـن، کـە ڕۆڵیـان هەبـوە لـە گەشـەکردنێکی سـنورداری بـواری کشـتوکاڵی لـە ناوچەکـەدا.

گونـدی کـەلار و گوندەکانـی دەوروبـەری، دووربوون لەناوەنـدی قەزای کفرییـەوە، ڕێـگای هاتوچۆکردنیشـی ئاسـان نەبـوو، ژمارەی دانیشـتوانی کـەلار تـا دەهـات لەزیادبوونـدا بـوو بۆیـە بیرۆکـەی پێویسـت بـوون بەناوەندێکـی کارگێـڕی نزیـك، جگەلـە قـەزای کفـری لەلایـەن کەسـانی وشـیار و خەمخـۆرەوە دروسـتبوو، لـە کـۆڕوکۆبونەوەکانـدا باسـی لێوەدەکـرا بـەڵام بـۆ دیاریکردنـی شـوێنەکە ڕوون نەبـوو سـەرقەڵا – باوەنـور – پێبـاز – کـەلار یـان شـوێنێکی تـر گونجاوبێـت.
ویسـتی بەشـێکی زۆری دانیشـتوانی ناوچەکـە بـۆ پێویسـتی سـەنتەرێکی کارگێـری دیکـە جگـە لـە قـەزای کفـری بیرۆکـە و داوایەکـی ڕەوا و لـە جێگـەی خۆیدابـوو، ئـەم بابەتە تا سـاڵی ١٩٦٨ وەك بـاس و بیرۆکـە قسـەی لێکـرا، کەسـانێکی شـارەزای ناوچەکـە شـوێنی ئێسـتای قـەزای کەلاریـان بـە گونجـاو دەزانـی، بکرێتـە ناوەندێکـی

ئیداری، کە هێشتا ڕوون نەبوو ناحیە دەبێت یان قەزا، لە ڕاستیدا شوێنەکە لەبەر هەبوونی پانتایی زەوی زۆرو نزیکی لە ڕووباری سیروان و زۆری ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە و هەبوونی سەرچاوەی ئابووری ( کشتوکاڵی، مەڕداری و ئەگەری دۆزینەوەی نەوت ) و گرینگی شوێنەکە لە ڕووی جوگرافییەوە، خاڵی یەکگرتنی ڕێگاکانی سلێمانی و بەغداد و کەرکوك و نزیکی لە سنوری ئێران، هەموو ئەو هۆکارانە یاریدەدەر بوون بۆ ئەوەی سەر ئەنجام شوێنی ئێستای قەزای کەلار ببێتە ئەو سەنتەرە کارگێرییە کە چاوەڕوان دەکرا.
ویستی خەڵکی ناوچەکە بۆ پێویستی سەنتەرێکی کارگێڕی نزیك، لەگەڵ ویستی دەسەڵاتی ناوەندی عێراق لە بەغداد یەکی گرتەوە. دەسەڵاتدارانی بەعس ئەو کات بە پەرۆش بوون هەندێ یەکەی ئیداری نوێ بۆ مەبەستی خۆیان دامەزرێنن، لەبەر ئەوە زۆر بەپەلەو بەحەماسەتەوە، بڕیاری یەکسەر بەقەزابونی کەلاریان دا و قائمقامی بۆ دەستنیشان کرا و لەڕووی ئیدارییەوە پەیوەندی لەگەڵ قەزای کفری پچڕا هەردوو ناحیەی پێبازو سەرقەڵا خرانە سەر قەزای کەلار و قەزای کەلاریش خرایە سەر پارێزگای کەرکوك. ڕاستی ئەوە ڕووکەشی مەسەلەکە بوو لای سەرکردایەتی بەعس ئاشکرا کرا، بەڵام نەخشە و پیلانیان بۆ داهاتوی کەلارو قەزاکانی کفری و چەمچەماڵ و خورماتوو و جێبەجێکردنی هەڵگیرابوو بۆ کاتێکی گونجاو. لە ١١ ئازاری ١٩٧٠ کاتێك بەیانی ١١ ئازار لە نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی شۆڕش مۆرکرا، دووساڵ بوو کەلار کرابووە قەزا و وەکو واقعێك مامەڵەی لەگەڵ دەکرا. بەڵام هێشتا پێویستیەکانی سەنتەرێکی ئیداری وەکو پێویست بەدینەکرا ( هەیکەلی ئیداری و دامەزراوەی فەرمی و بیناو کارەبا و دام و دەزگا )ی پێویست واتە لەسەرەتادا.
بەیانی ئازار لەسەرەتادا ئاشتی و سەقامگیری لەگەڵ خۆی هێنا، بەڵام زۆری نەخایاند گیروگرفت و لێك حاڵی نەبوون لە نێوان بەعس و پارتی دروستبوو، لەکاتی ئاسایی بوونی پەیوەندی ڕژێم هەوڵیدەدا بەپەلە پرۆژەی ئاوەدانکردنەوە و دابینکردنی پێویستی بەقەزابوونی کەلار جێبەجێبکات، ئەوەی جێگای سەرنج بوو

لێپرسراوانی ناوچەی پارتی دیموکراتی کوردستان بەگەرمی پێشوازییان نەدەکرد لە هەوڵەکانی حکومەتی بەغدا و پەلەکردنی بۆ تەواو کردنی هەیکەلی ئیداری قەزاکە و بنیاتنانی دامەزراوە فەرمییەکان و هەڵمەتی زەوی دابەشکردن و هاندانی خەڵکی بۆ نیشتەجێبوونی لەسەنتەری قەزاکە – هەندێك بیانوو هەبوون کە تەنها هەڵوێستی کەسی و ناوچەیی ئەبەرپرسانە بوو کە پێیان خۆشنەبوو دامودەزگاکانی حکومەت و یاسا لەناوچەکەدا هاوبەشی دەسەڵاتی ئەوانبن.

رایەکی دیکە دەیگووت : سەرکردایەتی پارتی بەشێوەیەك لە شێوەکان زانیویەتی مەبەست لە پەلەکردن و دروستکردنی قەزای کەلار لەو کاتەدا سیاسییە و بۆ خزمەتی خەڵکی و داخوازی ئەوان نییە، مەسەلەکە پەیوەندی بە پلانێکی گەورەترەوە هەیە بۆ بەعەرەبکردنی هەندێك ناوچەو گۆڕانکاری لە سنوری پارێزگای کەرکوك و کەمکردنەوەی ژمارەی کورد لەو پارێزگایە لە داهاتوودا.

لە ناو ئەم مشتومڕو ڕاوبۆچوونە جیاوازانەدا پرۆسەی بەقەزاکردنی کەلار بەڕێوە چوو، بەڵام بێ گیروگرفتیش نەبوو، تا ئازاری ١٩٧٤. کە بە درێژایی ئەو ماوەیە نێوان حکومەتی عێراق و شۆڕش ئاڵۆز دەبوو. لەمانگی ئازاری ١٩٧٤ پەیوەندییەکە بەرەوهەڵدێر دەچوو کێشە لەناوچە تێکەڵەکانی باشوری کەلار و کفری ڕۆژانە سەریان هەڵدەدا. هەوڵی حکومەت بۆ درێژەدان بە کارەکانی بۆ بە قەزاکردنی کەلار و دابینکردنی پێویستیەکانی درێژەی هەبوو. کاربەدەستانی میری و حزبی بەعس لە کفری و کەرکوك و بەغداد بە گەرمی و ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەشداری جێبەجێکردنی پرۆژەکە دەبوون و هانی خەڵکیان دەدا نیشتەجێ ببن و زەوییان بە نرخی کەم یان بە خۆڕایی دابەشدەکرد، لەپاڵ ئەوەشدا کاریان دەکرد دامودەزگای ئەمنی و قەزاکە جێگیربکەن و خەڵکانێکیش پەیدابکەن هاوکارییان بکات، بەرامبەر هاوکاری مادی و دامەزراندن، ئەمەش لەلایەن پارتی و کادرانی ئەوحزبەوە بە توندی ڕەتکرایەوە، تا ئەو کاتەی بە کردەوە شەڕ دەستی پێنە کردبوو، ڕێگەنەدرا دەزگای ئەمنی و حزبی لەکەلار بە ئاشکراهەبێت، بەڵام دوای هەڵگیرسانی شەڕ واقیعێکی

تـر هاتـە پێشـەوە. لەمانگـی چـواری ١٩٧٤ بـەدواوە شـەڕوپێکدادان لـە نێـوان سـوپای عێـراق و پێشـمەرگە لـە زۆربـەی ناوچەکانـی کوردسـتان دەسـتیپێکرد. ناوچەکانـی باشـور تارادەیـەك ئارامتربـوون، چونکـە هێزەکانـی سـوپای عێـراق گرنگییـان دەدا بـە کردنـەوەی ڕێـگاکان و ئازادکردنـی شـارەکان و شـوێنە سـتراتیژییەکانی باکـور. لەبەرئـەوە دەزگاکانـی حزبـی و ئەمنـی لەسنوری کەرکـوك هەوڵەکانیـان چڕکـردەوە بـۆ دروسـتکردنی پێگەیەکـی پتـەو لەگەرمیـان، خەڵکێکـی زۆریـش کـە پەیوەندییـان بـە شۆڕشـەوە هەبـوو شـارو دێهاتەکانـی نزیـك جادەگشـتییەکانیان بەجێهێشـت و ڕویـان لـە شـوێنی دوورە دەسـتی ڕژێـم کـرد. قـەزای کـەلار لەسـەرخۆ لەژێنگەیەکـی ئـارام و کوردانـە گـۆڕدرا بـۆ پێگـەو ناوەندێکـی ئەمنـی و موخابەراتـی و سـەربازی، حزبی کارتۆنـی پەیدابـوون و چەکدارکـران، چەکـداری کوردیـش دروسـتکران کـە ڕاسـتەخۆ پەیوەندییـان بـە دەزگا ئەمنییەکانـەوە هەبـوو، هەمـوو ئەوانـە لەگـەڵ ئـەوەی هاوکاری دەکـران و پیاوانـی ڕژێـم دەسـتیان بـە پشـتیاندا دەهێنـا، بـەڵام ئەوانـە کەمینەیـەك بـوون لـە نێـو زۆرینەیەکـی هۆشـیار و نیشـتمان پـەروەری نیشـتەجێی کـەلار و دەوروبـەری.

هەلومەرجـی پـڕ لـە ئاڵـۆزی و شـەڕوپێکدادان بـوو بـە هـۆی وەسـتانی پرۆژەکانـی ئاوەدانکردنـەوەی قەزاکـە، چونکـە حـزب و ڕژێـم ( هەمـوو تواناکان لـە پێنـاو سـەرکەوتن بێـت ) بـوو. ژیـان زۆر بەقورسـی لەژێـر سـێبەری تـرس و دڵەڕاوکـێ و ئومێـد بەسـەرکەوتن ی شـۆڕش بەسـەردەچوو. کاروکەسـابەت جگـە لـە کەسـابەتی شـەڕو سـیخوری و ئـەوەی پەیوەنـدی بـە شـەڕەوە نەبێـت نەمابـوو. لـەو کاتـەداو لەناکاو پەیمانـی ڕێکەوتنـی شـای ئێـران و جێگیـری ئـەو کاتـەی سـەرۆکی حکومەتـی عێـراق ( صـدام حسـین ) لـە جەزائیـرەوە بـڵاو کرایـەوە کـە کۆتایـی بـە شـۆڕش و بەرگـری هێنـا و واقیعێکـی دیکـەی هێنایـە نـاو. ڕژێمـی عێـراق و ئەوانـەی سـەر بـە ڕژێـم بوون کردیـان بە جـەژن، و لای زۆربـەی دانیشـتوانیش غـەم و پـەژارە دەبـاری، ی ناوەنـدی عێـراق ئیـتر دەسـتی کـراوە بـوو بـۆ ئـەوەی نەخشـەو پلانەکانـی خـۆی جێبەجێبـکات بـە بـێ هیـچ ترسـێك لـە بەرگـری و بەگژداچـوون و ڕێگـری لێکـردن.

دەسـەڵاتی مەسـت بەسـەرکەوتن، پـاش مۆرکردنـی ڕێککەوتنـی

جەزائیـر بەچەنـد ڕۆژێـك کەوتـە جموجـۆڵ و کاتـی بەفیرۆنـەدا و بـە زنجیـرە هەنگاوەکانـی جێبەجێدەکـرد، بۆئـەوەی دڵنیابێـت جارێکـی کـە و هەتاهەتایـە کـورد توانـای هەڵسـانەوەو بەرگـری نابێـت و ئەوناوچانـەی تێکـەڵاون و کـورد بـە کوردسـتانی ئەزانێـت و کەسـایەتی عەرەبـی تێدابـوو بیـکات بـە زۆرینـە وەکـو پارێـزگای کەرکـوك و قـەزای خانەقیـن و گوێـرو مەخمـور و شـەنگال و هەرشـوێنێك ڕژێمـی ئـەو کاتـەی عێـراق بەمەترسـیی دەزانـی لەسـەر ئاسایشـی خـۆی.

هەنگاوەکانی دەسەڵات ئەمانەبوون :

١. بـەزۆر چۆڵکردنــی هەمــوو دێهاتەکانــی بنـاری بەمــۆ و سـنوری ناوچەکانــی مەیـدان و قۆرەتــو و دێهاتەکانــی شــێخ بـاوە تـا نزیـك شـاری خانەقیـن و داگیرکردنـی خانـوو زەوی و زارەکانیـان و بەخشـینی بـە خۆڕایـی بەعەرەبـی هـاوردە و نیشـتەجێ کردنیـان و دورخسـتنەوەی خـاوەن مـاڵ بـۆ ناوچـەی بەنـاو ئۆتۆنۆمـی کـە بـەشی هەرەزۆریـان دواتـر لـە قـەزای کـەلار نیشـتەجێ کـران.

٢. دورخسـتنەوەی هەمـوو ئەوکەسـانەی پەیوەندییـان بـە شۆڕشـەوە کردبـوو بـۆ باشـوری عێـراق، کەلەسـەر بەڵێـن و لێبوردنـی ڕژێـم گـە ڕابوونەوە.

٣. هەڵمەتێکـی بەرفـراوان و بەپەلـە بـۆ دروسـتکردنی ڕێـگا، بـۆ شـوێنە سـەختەکانی نزیـك سـنوری ئێـران و شـاخ و بەرزاییەکانـی کوردسـتان و دانانـی پێگـەی سـەربازی بچـوك و گـەورە بـۆ دڵنیابـوون کـە جارێکـی دیکـە سـوودیان لێوەرناگیرێـت بـۆ دژایەتـی ڕژێـم.

٤. کاری جدی بـۆ بەعسـیکردنی ئـەو کەسـانەی ئامـادەن هاوکاربـن بـە پێدانـی ئیمتیـازات و هەڵبژاردنـی هەندێـك لەوانـەی ئامادەییـان تێدابێـت بـۆ سـخوڕی.

٥. پـاش ماوەیەکـی کـەم لـە مۆرکردنـی ڕێکەوتنـی جەزائیـر، بڕیـارە گرنگەکـەی دەرکـرد بـە پچڕپچڕکردنـی پارێـزگای کەرکـوك و لکاندنـی هـەردوو قـەزای کـەلار و چەمچەماڵ بـە پارێزگای سلێمانی و خورماتوو بـۆ سـەلاحەدین و کفـری بـۆ دیالـە. پانتایـی پارێـزگای کەرکـوك بچـووك کرایـەوە و ژمـارەی کـوردی دانیشـتووی ئـەو پارێزگایـەش هـەروا. بـۆ

کەمکردنـەوەی دانیشـتوانی نـاو شـاری کەرکوکیـش پلانـی تایبەتیـی جێەجێکـرد، بـەم هەنـگاوە بەعـس کێشـەیەکی گـەورەی بـۆ کـوردو پێکهاتەکانـی دیکـەی عێـراق هێنایـە نـاو کە تا ئەمـڕۆش تەشـەنەدەکات و گەورەتـر دەبێتـەوە و بـە تێپەڕبوونـی کات ئاڵۆزتردەبێـت.
قـەزای کـەلار لـە ئەنجامـی ئـەو وەزعـە هاتـە پێشـەوە بەهاتنـی ژمارەیەکـی زۆری ئـاوارەی دەرکـراوی ئەوبـەری سـیروان قەرەباڵەغـی زۆری تێـدا دروسـتبوو کارو کەسـابەت و ئاوەدانیشـی بەدواداهـات.
لـە سـاڵی ١٩٧٥ و بەشـێك لـە سـاڵی ١٩٧٦ بارێکـی نائاسـایی بەسـەر کـەلاردا تێپەردەبـوو خەڵـك سـەرکزو نائومێدبـوون، و بـە کاروبـاری ڕۆژانـەی خۆیانـەوە سـەرقاڵ بـوون، ژمارەیـەك لـە دانیشـتوانی کـەلار و دەوروبـەری دوورخرابونـەوە بـۆ باشـورو ئـەوەی کـوڕو کـەس و کاری سەربەشـۆرش بـوون لـە ژێرچاودێریـدا بـوون، تروسـکایەك هیـوا بەدینەدەکـرا بـەڵام ئـەو حاڵەتـە گشـتگیر نەبـوو، هەبـوون بـە ئومێـدەوە تەماشـای ئاینەدەیـان دەکـرد زۆری نەخایانـد سـەرەتایی بەرگـری لـە شـاخە دورە دەسـتەکانەوە دەسـتیپێکرد. ژمارەیەکـی بەرچـاو گەنـج و کەسـانی هۆشـیار بەنهێنـی لـە ڕیـزی ڕێکخسـتنەکانی دژ بـە ڕژێـم کەوتنـە جموجـوڵ. بـە تێپەڕبوونـی کات و بـە هێزبوونـی باسـکی شـۆرش و بەرگـری تەمـی ناومێـدی ڕەوییـەوە و هەوڵەکانـی دامـودەزگا داپلۆسـێنەرەکانی ڕژێـم بـێ سـوودبوون، هەرچەنـدە ئـەوان لـە ئـازاردان و لەسـێدارەدان و زیندانیکـردن دریغییـان نەدەکـرد، بـەڵام ئەنجامـی ئـەو کردەوانەیـان بەهێزبوونـی گیانـی بەرگـری بـوو. دەسـەڵاتی ڕژێـم و لەخۆبایـی بوونـی و کارە نارەواکانـی لـە کوردسـتان بـە ڕاپەڕینـی ١٩٩١ کۆتاییپێهـات و هەمـوو کوردسـتان و کـەلار سـەردەمێکی تـاڵ و تاریکیـان تێپەڕکـرد و سیسـتەمێکی نـوێ بەڕێوەبـردن دەسـتیپێکرد.

قـەزای کـەلار لـە ڕووی جوگرافـی و ئابـوری و سیاسـییەوە تایبەتمەندی خـۆی هەیـە. ئەمـە وایکـردوە لـە هەرکوێـی عێـراق و کوردسـتان و دەوروبـەری قەزاکـە کێشـەوگرفت بێتـە پێشـەوە خەڵکـی ئـەو شـوێنانە بیانەوێـت خۆیـان لـە کێشـە لابـدەن و بـۆ شـوێنێکی ئـارام کـۆچ بکـەن، کـەلار هەڵدەبژێـرن. لـە پـاش ڕووخانـی ڕژێمـی بەعـس سـەدان کـەس

پێیان باش نەبوو لە شوێنی ئەسڵی خۆیان بمێننەوە بە هۆی جیاواز، زۆر لەوانە کۆچیان کرد بۆ کەلار، لە ناویاندا خەڵکی شارەزا هەبوون لە بیناسازی - دارتاشی - بازرگانی - پزیشکی - مامۆستا. ئەمانە بەهرەکانیان خستە خزمەتی ئاوەدانی و گەشەی ئابووری کەلارەوە و خۆشیان سوودمەندبوون. لەکاتی پرۆسەی شوومی ئەنفالدا هەزاران پیاو و ژن و منداڵ لە دێهاتەکانی باکوری ڕۆژئاوای کەلاردا لە شوێنی خۆیان دەرکران ئەوانیش لە کەلار یان نزیکی نیشتەجێبوون، ئاوارەکانی بەری چەپی سیروان و باشووری کوڵەجۆش بەشێکیان هاتنە کەلار. لە ئەنجامی ململانێ شیعەو سونە خەڵك لە هەردوولا بە کۆمەڵ لە کەلارو دەوروبەری نیشتەجێ بوون. هەروەها پاش ڕووداوەکانی ساڵی ٢٠١٧ ی کەرکوك و خورماتوو.

ئەمانەبوون ئەوانەی گەشتنە کەلار، هاتنی ئەو ژمارە زۆرەی خەڵك، هۆکاربوون بۆ گەشەکردنی سەرنج ڕاکێش لە هەموو بوارەکانی ئابوریدا و کۆمەڵەیەکی فرە فەرهەنگ و ڕەنگ پێکبێنیت لە بۆتەی قەزاکەدا و توانا جیاوازەکان بۆ پێشکەوتنی ئابوری کۆمەڵگە کە بەکاربێنێ و ئاسەواریشی بە ڕوونی دیارە.

کاروباری کارگێڕی لە سنوری ئیدارەی گەرمیان ( قەزای کەلار و قەزای کفری ) گەشەی کردوە بەڵام ئەم پێشکەوتنە لە سەرخۆو سنورداره. لە ساڵی ١٩٩٢ پاش هەڵبژاردن و دامەزراندنی حکومەت. یەکە ئیدارییەکان لە هەرێم دامەزران و کۆمەڵێك کادری ئیداری لەو بوارەدا کاروبارەکانیان ڕاپەڕاندوە شارەزاییان تارادەیەك پەیدا کردووە. چەندین ڕێگر و ئاستەنگ لە سەرەتاوە تا ئەمرۆ هەبوون، هۆکاری سستی و لاوازی باشتر جێبەجێکردنی کاروباری کارگێڕی لە سنوری کەلار بە تایبەتی و هەرێم بەگشتی، تەنها ئاماژە بە گرنگەکان دەدەم :

ناوچەکە واتە سنوری ئیدارەی گەرمیان تایبەتمەندی خۆی هەیە، هاوسنورە لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی عێراق و هەروەها ئێرانیش، پەیدابوونی لە ناکاوی سەرچاوەی داهاتی زۆری خاڵە سنورییەکان و دۆزینەوە و دەرهێنانی نەوت لە چەند شوێنێکی قەزای کەلار جگە لە سەرچاوەی داهاتەکانی کە کەمترنین لەوەی باسکران

چاوەڕوان کراونەبوو. ئەم داهاتە زۆرانەی ناوچەکە ڕۆڵی هەیە لە گەشەکردنی باری ئابوری و لەهەمان کاتدا هۆکارە بۆ دروستبونی چەندین کێشەو گەندەڵی و دەوڵەمەند بوونی نارەوا و بەفیڕۆدانی سامانی گشتی بۆ بەرژەوەندی تایبەت جگە لە خراپ بەڕێوەبردنی پرۆژەکان و بەزۆر تێکەڵاو بوونی هەندێك بەرپرس لە کاروباری بازرگانی بەهۆی ئەوەی ئەوانە سەرقاڵی ئەو کارانەن یاسای دژ بە بەرژەوەندی گشتین خۆیان وا دەناسێنن کەبەشێکن لە دەسەڵات یان نوێنەری ئەوانن و هیچ بەپرسێکی ئیداری توانای لێپێچینەوە و ڕێگریی نییە لە ترسی توشبوون و سزادان.

دیاردەی گەندەڵی و دەوڵەمەند بوونی نایاسایی و سوود وەرگرتن لە پێگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە زۆربەی یەکە ئیدارییەکانی هەرێم بەڕادە و بە شێوەی جیاواز بەدیدەکرێت پێویستە بەپەلە هەنگاو بنرێت بۆ چارەسەرکردنیان.

ئەوەی لەسەرەوە باسکرا واناگەیەنێ بابەتەکە گشتگیر و کەسانی دەست پاك و بوێرو خاوەن هەڵوێست لە ئیدارەی گەرمیان بونیان نییە. بەڵکو دیارن و دەناسرێن و جێگای ڕێزی خەڵکن.

قەزای کەلار لە ڕووی ئەمنییەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی گرنگی شوێنەکەی، لە بارێکی ئەمنی سەقامگیردایە و دام و دەزگا ئەمنییەکانی گەرمیان لە ماوەی ساڵانی پێشوو شارەزای باشیان پەیداکردوە و توانایەکی باشیان هەیە لە بەرگری کردن لە ئاسایشی هاوڵاتیان و تاڕادەیەکی باش متمانەیان پێیان هەیە.

کەلار و شارستانی بوون :

قەزای کەلار لە دەرەوە بەبێ چوونە ناو وردەکاری ژیانی دانشتوانی تەماشای بکرێت وەکو شارێك دێتە بەرچاو کە هەموو مەرجەکانی ژیانی شارستانی تێدایە.

شەقامی بەرین و دارودرەخت، سەوزایی زۆر، باڵەخانە و مۆڵ و

بـازاڕ و زانكـۆ و پەیمانـگا و خەڵكـی سـەرقاڵ بـە ئاسـایش و گـەڕان و ئاسایشـی سـەقامگیر.

لەبەرئـەوەی تەمەنـی ئـەم شـارە زۆرنییـە چونكـە ٦٠ سـاڵی تێپەڕنەكـردووە، هێشـتا كاتـی پێویسـتە بـۆ ئـەوەی ژیانـی شارسـتانی لـەم شـارەدا بچەسـپێت، زۆربەی دانیشـتوانی ئێسـتای كەلار بـە كۆمەڵ و تـاك، لەكات و شـوێنی جیاوازەوە هاتـوون و هەلومەرجی هاتنەكەشیان وەك یـەك نەبـووە. ئـەو كۆمـەڵ و تاكانـەش فەرهەنـگ و داب و نەریتـی ئەوشـوێنەیان لەگـەڵ خۆیـان هێنـاوە، توانـەوەی جیاوازییـەكان لەبۆتـەی فەرهەنگێكـی گشـتگیر و نزیـك لەیـەك، كاتـی زۆری پێویسـتە هێشـتا بـە زەقـی جیـاوازی و شـێوەیەك لـە دەمارگیـری و دەسـتگرتن بـە نەریتـی تایبەتییـەوە لـە كۆمەڵگـەی كـەلارەوە بەدیدەكرێـت. دامـودەزگا رۆشـنبیری و میدیـا و زانكـۆ ڕێكخـراوە مەدەنییـەكان لـە دروسـتبوونی قەزاكـەوە تـا ئێسـتا بـە هـۆی نـا سـەقامگیری بـاری سیاسـی و ئەمنـی و ئابـوری هەرێمـی كوردسـتان بەگشـتی و كەلاریـش وەك بەشـێك لـەو هەرێمـە وەكـو پێویسـت نەیانتوانیـوە فـەزاو هەلومەرجێكـی پێكەوەنانی ژینگەیەكـی شارسـتانی دروسـتبكەن.

بێگومـان قـەزای كـەلار لـە ڕووی ئابـوری و ئاوەدانكردنـەوەوە گەشـەی زۆری كـردوە، شانبەشـانی ئەو پێشـكەوتنە بـواری گەشـەی كۆمەڵایەتی و رۆشـنبیری بەدیدەكرێـت بـەڵام بـەراورد ناكرێـت بـەوەی یەكەمـە و هێشـتا هـەوڵ و ماندوبوونـی زیاتـری پێویسـتە ئەگـەر وەزعەكـە لەباربێـت لەمـەودوای ( ٢٠ – ٣٠ ) سـاڵی داهاتـوو ئایندەیەكـی گـەش و پڕشـنگدار چاوەڕوانـی دانیشـتوانی ئـەم قەزایـە دەكات.



# خوێندنی باڵا لە کەلار

پ.ی.د. دارا حەمید محەمەد
زانکۆی گەرمیان

ئەم باسە تایبەتە بە سەرەتاکانی کردنەوەی خوێندنی باڵا(دبلۆمی باڵا، ماستەر، دکتۆرا) لە کەلار و بەردەوامیی ئەو پرۆسە گرنگ و هەستیارە هەتا نووسینی ئەم بابەتە. خوێندنی باڵا قۆناغی دوای خوێندنی بەراییە لە زانکۆ و پەیمانگاکان، واتە دوای وەرگرتنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس، لەو قۆناغەدا خوێندکار دوای ڕێکارەکانی وەرگرتن بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی دبلۆمی باڵا(یەك ساڵ) دەخوێنێت، بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی ماستەر (دوو ساڵ) و بۆ بڕوانامەی دکتۆرا (سێ ساڵ) دەخوێنێت. لە ئێستادا خوشبەختانە هەرسێ جۆری خوێندنی باڵا(دبلۆمی باڵا، ماستەر، دکتۆرا) لە زانکۆی گەرمیاندا هەن.






هەڵبەت كردنەوەی ناوەندەكانی خوێندنی بەرایی(بەكالۆریۆس) زانكۆ و پەیمانگا لەكەلاربەتایبەتی و گەرمیان بەگشتی سەرەتا و زەمینەسازیی بوو بۆ كردنەوەی پرۆسەی خوێندنی باڵا(دبلۆمی باڵا، ماستەر، دكتۆرا)، بەمەبەستی لەبەرچاوگرتن و وەك ڕاستییەكی مێژوویی پاراستنی مافی هەموو كەس و لایەك لەكردنەوەی خوێندنی باڵا لەكەلار و گەرمیان زۆر بە پێویستی دەزانم پێش ئەوەی بچمە سەر باسی سەرەتای كردنەوەی خوێندنی باڵا(دبلۆمی باڵا، ماستەر، دكتۆرا) لەكەلار،كە دەتوانم بێدوودڵی بڵێم: تا كۆتایی سەدەی ڕابردوو تەنانەت وەك خەونێكیش نەبوو، كە ڕۆژێك لە ڕۆژان خوێندنی باڵا لەكەلار بكرێتەوە، هەربۆیە بەپێویستی دەزانم سەرەتا پوختەیەكی كردنەوەی ناوەندەكانی خوێندنی سەر بە وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستیی، هەڵبەت مەبەستم(زانكۆ و پەیمانگا)یە لەكەلار بەتایبەتی و گەرمیان بەگشتی بخەمەڕوو.

ئەوەی باس دەكرێت ساڵی كردنەوە و پوختەیەكی مێژوویی ناوەندەكانی خوێندنی باڵایە لەكەلار و هەموو گەرمیان جگە لە كۆلێجەكانی ئێواران كە لەگەڵ هەمان كۆلێجی بەیانیاندا ئاماژەم بۆكردوون:

١- پەیمانگای تەكنیكی كەلار یەكەم ناوەندی خوێندنی باڵایە، كە لەكەلار كراوەتەوە، ئەم پەیمانگایە بە پێی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران ژمارە(٣١٥٥/٥/٤ لە ( ٧ / ٩/ ١٩٩٤) وەك پەیمانگای كشتوكاڵ كراوەتەوە، دواتر بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران

ژماره ٤١٥٥ لـه ١٩٩٥/١٢/٦ گـۆڕرا بـۆ پەیمانـگای تەکنیکـی کـەلار. لەئێسـتادا ١٠ بەشـی زانسـتیی هەیـە و ژمـارە خوێندکارانـی خوێندنـی بەیانیـان(١٤٥٠) و خوێندنـی ئێـواران(٥٠٠) خوێنـدکارن.



پەیمانگای تەکنیکی کەلار

٢- کۆلیجــی پــەروەردە : کۆلێجــی پــەروەردە لــە ســاڵی (٢٠٠٤-٢٠٠٥ ) دامــەزراوە، لــە ئێســتادا کۆلێجــی پــەروەردە ئــەم بەشــانە لەخۆدەگرێــت (زمــانی کــوردی، زمــانی عــەربی، زمــانی ئینگلیــزی، جوگرافیـا، پەروەردەودەروونـناسی ، مێـژوو ، بایۆلۆجـی، فیزیـا، کیمیـا، ماتماتیـك ) ژمـارەی خوێنـدکارانی دەرچـووی ئـەم کۆلێجـە بـۆ سـاڵی خوێنـدنی ٢٠٢٠ – ٢٠٢١ بریتییبـوو لـە ( ٤٤٣) خوێنـدکار، ژمـارەی خوێنـدکارە دەرچـووەکانی ئـەم کۆلێجـە، لـە سـاڵی دامەزراندنییـەوە تاکوسـاڵی خوندنـی ٢٠٢٠-٢٠٢١ بریتییـە لـە ( ٦٣٢٣ ) خوێنـدکار کـە بڕوانامـەی بکالۆریۆسـیان وەرگرتـووە لەبـوارەکانی: (زمـانی کـوردی، زمـانی عـەرەبی، زمـانی ئینگلیـزی، جوگرافیـا، پـەروەردەو دەروونـاسی،، مێـژوو. بایۆلۆجـی، فیزیـا، کیمیـا، ماتماتیـك ).



کۆلێجی پەروەردە

کۆلێجی پەروەردەی ئێواران لە ساڵی خوێندنی (٢٠١٧ - ٢٠١٨ ) دامەزراوە، لە ئێستادا ئەم بەشانە لەخۆ دەگرێت ( زمانی ئینگلیزی، پەروەردەودەروونناسی، کیمیا )، ژمارەی خوێندکارانی دەرچووی ئەم کۆلێجە بۆ ساڵی خوێندنی ( ٢٠٢٠ – ٢٠٢١ ) بریتییە لە ( ٧٢ ) خوێندکار، ئامانجی کردنەوەی ئەم کۆلێجە ڕەخساندنی هەلی خوێندنە بۆ ئەو خوێندکارانەی کە نمرەی پێویستیان نییە لە خوێندنی بەیانیان و پێگەیاندنیان وەك کادری زانستی و پسپۆری بەتوانا و لێهاتوو لە بواری (پەروەردەودەروونناسی، زمانی ئینگلیزی، کیمیا ).

٣- کۆلێژی زمان و زانستە مرۆڤایەتییەکان / خانەقین ساڵی ٢٠٠٤ بە فەرمانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان / سلێمانی دامەزرا، سەرەتا بە بەشی زمانی کوردی دەستی پێکرد و سەر بە زانکۆی سلێمانی بوو، دواتر بەشەکانی عەرەبی و ئینگلیزی و دەروونناسی و جوگرافیا و مێژوو کرایەوە، مەبەست لە کردنەوەی ئەم کۆلێژە خزمەتکردنی زانست و فەرهەنگی زمانی کوردی لە شاری خۆشەویستی خانەقین و سەلماندی کوردستانی بوونی خانەقین بوو.



کۆلێجی زمان و زانستەمرۆڤایەتییەکان/ خانەقی

٤- کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت، سەرەتا بەناوی کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەتی کەلار/ زانکۆی سلێمانی لە ساڵی خوێندنی (٢٠٠٧-٢٠٠٨) دامەزرا، بە پێی فەرمانی زانکۆیی زانکۆی گەرمیان ژمارە (٤٥٩/٣/٧ لە ٢٠١١/٧/٢) ناوەکەی گۆڕرا بۆ سکوڵی پەروەردەی بنەڕەت، دواتر جارێکی تر بە فەرمانی زانکۆیی، زانکۆی گەرمیان ژمارە (٥٤٩٩ لە ٢٠١٥/١٢/١٩) ناوەکەی گۆڕاوە بۆ کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت، کۆلێجەکە ئەم بەشانە لەخۆدەگرێت (زمانی کوردی – زمانی عەرەبی – زانستە کۆمەڵایەتییەکان – پەروەردەی وەرزش – باخچەی ساوایان)، ژمارەی خوێندکارانی بریتییە لە (٨٠٨) خوێندکار، ژمارەی خوێندکارە دەرچووەکانی ئەم کۆلێجە، لە ساڵی دامەزراندنییەوە تاوەکو ئێستا بریتییە لە (٢٢٧٩).



کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت

کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت / ئێواران بە پێی فەرمانی زانکۆیی زانکۆی گەرمیان ژمارە (٣٨٠٥) لە ساڵی (٢٠١٢) دامەزراوە، ئەم بەشانە لەخۆدەگرێت (زمانی کوردی، زمانی عەرەبی،زمانی ئینگلیزی،زانستە کۆمەڵایەتییەکان، پەروەردەی وەرزش، ماتماتیک، باخچەی ساوایان ) ژمارەی خوێندکارانی ئەم کۆلێجە بریتییە لە (٢٤٨) خوێندکار ژمارەی خوێندکارە دەرچووەکانی ئەم کۆلێجە لە ساڵی دامەزراندنییەوە تاکو ئێستا بریتییە لە (٦٧٥) خوێندکار کە بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان وەرگرتووە لە پسپۆڕییەکانی ( زمانی عەرەبی، زمانی کوردی، زانستە کۆمەڵایەتییەکان، پەروەردەی وەرزش، زمانی ئینگلیزی، ماتماتیك )

٥- کۆلێجی پەروەردەی جەستەیی و زانستە وەرزشییەکانی خانەقین لە ساڵی خوێندنی(٢٠٠٨- ٢٠٠٩) بە فەرمانی زانکۆیی ژمارە (١٢٤٢٧/٥/٧) لە (٢٠٠٨/٩/٢٧) دامەزراوە. ژمارەی خوێندکارانی کۆلێجەکەمان بریتییە لە (١٠٧) خوێندکار لە قۆناغی یەکەم هەتا قۆناغی چوارەم و لە ساڵی (٢٠١١) بوو بە سکولی وەرزش لە فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتییەکان و وەرزش لە خانەقین، لە ساڵی

(٢٠١٦) دووبارە بوو بە کۆلێجی پەروەردەی وەرزش، و لە ساڵی (٢٠١٩) ناوی کۆلیجەکە گۆڕا بۆ (کۆلێجی پەروەردەی جەستەیی و زانستە وەرزشییەکان)، لە ساڵی خوێندنی(٢٠١٦-٢٠١٧)ەوە بەشی خوێندنی ئێواران لە کۆلێجەکە کرایەوە و لە ساڵی خوێندنی (٢٠١٩-٢٠٢٠) یەکەم خولی دەرچوون.



کۆلێجی پەروەردەی جەستەیی و زانستە وەرزشییەکان/ خانەقی

٦- کۆلێجی زانستە ئەندازیارییە کشتوکاڵییەکان لەساڵی خوێندنی ٢٠١٣-٢٠١٤ لەچوارچێوەی گەشەکردن و فراوانبوونی زانکۆی گەرمیان و وەک پێداویستییەکی ناوچەکە، لەشاری کفری کرایەوە، سەرەتای کردنەوەی تەنها بەشێک بوو بەناوی (بەشی سامانی ئاژەڵ) سەر بە سەرۆکایەتی زانکۆ بە فەرمانی وەزاری ژمارە (١٠٣٨٩) لە ڕێکەوتی ٢٧-٥-٢٠١٣. لە ڕێکەوتی ٢٣-٩-٢٠١٣ بە فەرمی ئەو بەشە زانستییە کرایەوە.
-لە ڕێکەوتی ١-١٢-٢٠١٣ یەکەم ڕۆژی خوێندن لە بەشی سامانی ئاژەڵی دەستپێکرد و لە قۆناغی یەکەمدا (٥٤) خوێندکاری وەرگرت.
-بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە (٢٢٣٧) لە ڕێکەوتی ٢٠١٣/١٢/٣١ بڕیار لەسەر کردنەوەی کۆلێجی کشتوکاڵ درا و لە ساڵی خوێندنی ٢٠١٤-٢٠١٥ تەنها بەشی (سامانی ئاژەڵ)ی لە خۆ گرت.

-لە ئێستادا کۆلێجەکە پێک دێت لە دوو بەشی زانستی بەم شێوەیە:

١--بەشی سامانی ئاژەڵ.

٢-بەشی بەروبوومی کێڵگەیی (هەڵپەسراوە)

٧- کۆلێجی زانست لە ساڵی خوێندنی (٢٠١٥-٢٠١٦)دا لە زانکۆی گەرمیان دامەزراوە، ئەم بەشانە لەخۆ دەگرێت (زانستی کۆمپیوتەر) و (زانستی کیمیا)، سەرەتا بەبەشی زانستی کۆمپیوتەر لەساڵی (٢٠١٣) دەستی پێکرد پاشان لەساڵی (٢٠١٥) بەشی زانستی کیمیا کرایەوە. ژمارەی خوێندکارانی ئەم کۆلێجە بریتییە لە (٣٣٦) خوێندکار، بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠٢٠-٢٠٢١) پێنجەم خولی دەرچوانی لە بەشی (زانستی کۆمپیوتەر و زانستی کیمیا)پێگەیاند،کەژمارەیان (٨٩) خوێنکارە. ژمارەی خوێندکارە دەرچووەکانی ئەم کۆلێجە لەساڵی دامەزراندنییەوە تاوەکو ئێستا بریتییە لە (٣٢٠) خوێندکار.



کۆلێجی زانست

کۆلێجی زانست /ئێواران لە ساڵی خوێندنی (٢٠١٧-٢٠١٨)دا لە زانکۆی گەرمیان دامەزراوە، ئەم بەشانە لەخۆ دەگرێت (زانستی کۆمپیوتەر) و (زانستی کیمیا)، ژمارەی خوێندکارانی ئەم کۆلێجە بریتییە لە (٥٧) خوێندکار، بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠٢٠-٢٠٢١)یەکەم خولی دەرچوانی لە هەر دوو بەشی (زانستی کۆمپیوتەر و زانستی کیمیا)پێگەیاند، کەژمارەیان (٥٢) خوێندکارە.

لە زانکۆی گەرمیاندا دوو بەشی زانستیی هەن کە لەبەرواری کردنەوەیانەوە تا ئێستا، هەر وەکو بەش ماونەتەوە و نەکراون بە کۆلێج ئەوانیش بەشەکانی ئەندازیاری بیناکاری و بەشی یاسان:

ئەندازیاری بیناکاری بەشێکی گرنگە لە بەشە جیاجیاکانی ئەندازیاری و کۆنترین بەشی ئەندازیارییە، کە گرنگی دەدات بە دروست کردنی ژێرخانی وڵات لە ڕووی دروست کردن وبیناکردنەوە وەك دروست کردنی هەموو جۆرەکانی بینا و دروستکردنی پرد و ڕێگاوبان و فرۆکەخانە، هەروەها لە ڕووی پێکهاتەی ئەو

کەرەستانەی بۆ دروست کردن بە کاردێت ئاستی بەرگری دروست کراوەکان بۆ هەموو جۆرە بار و کەش و هەوایەکی جیاواز بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە هەموو دروستکراوەکان بە پێی مەرجە ئەندازیارییەکان ئەنجام بدرێت و لە هەموو ڕوویەکەوە سەلامەت بێت بۆ بەکارهێنەران. ئەم بەشە بە پێی فەرمانی وەزاری ژمارە (١٠٣٩١) لە ٢٠١٣/٥/٢٧ دامەزراوە ولە ساڵی ٢٠١٤_٢٠١٥ خوێندکاری وەرگرتووە وژمارەی خوێندکاران (١٢٥) خوێندکارە.

بەشی یاسا بە پێی فەرمانی وەزاری ژمارە (٣٥٩) لە بەرواری (٢٠١٦/٣/٣٠) کراوەتەوە، بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠١٦-٢٠١٧) کە ساڵی یەکەمی کردنەوەی ئەم بەشەیە (٥٩) خوێندکاری وەرگرتووە، لەئێستادا ژمارەی خوێندکارەکانی (٢٠٢) خوێندکارە (بەیانیان +ئێواران)

٨- کۆلێجی پزیشکی-زانکۆی گەرمیان یەکێکە لە دیارییەکانی حکومەتی هەریمی کوردستان بۆ ناوچەی گەرمیان، لە بەر هەڵکەوتەی ناوچەکە و دووری لە ناوەندی سەنتەری پارێزگاکانەوە، هەروەها لە پای ئەو هەموو قوربانییە کە گەرمیان داویتی لە ڕێگای بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردستان، لە سیپتەمبەری ساڵی ٢٠١٨ بە فەرمانی وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی دامەزراوە...




کۆلێجی پزیشکی

کۆلێجی پزیشکی زانکۆی گەرمیان پەیڕەوی سیستەمی خوێندنی پزیشکی تێهەڵکەیش ( Medical Integrated Education) دەکات کە سیستەمێکی نوێی بەریتانییە ولە ئێستادا لە زۆربەی وڵاتانی دونیا پەیڕەو دەکرێت.
خوێندن لە کۆلێجی پزیشکی شەش ساڵە، پەیڕەوەی سیستەمی کۆرسات دەکات، ئامانجی خوێندنی پزیشکی تێهەڵکێش ( Medical Integrated Education) بریتییە لە پێگەیاندنی پزیشکی بەتوانا و لێهاتوو لە بوارەکانی (توێژەری زانست خواز، پیشەیی و پراکتیکار).
دەرچووانی کۆلێجی پزیشکی دەبنە خاوەن بڕوانامەی بکالوریۆس لە پزیشکی گشتیدا دوای تەواوکردنی هەموو سیمستەرەکانی خوێندنی پزیشکی.
لە ئێستادا کۆلێجی پزیشکی زانکۆی گەرمیان سێ قۆناغ خوێندکاری هەیە، وانەکانی تیۆریی لە نێو کەمپی زانکۆ دەخوێنن و وانەکانی پراکتیکی لە نێو نەخۆشخانەی فێرکاری کەلار دەخوێنن.
٩- کۆلێجی کۆمپیوتەر وتەکنەلۆجیای زانیاری لەساڵی ٢٠١٩ بە فەرمانی وەزارەتی خوێندنی باڵا وتوێژینەوەی زانستیی هەرێمی کوردستان لەشاری خانەقین دامەزراوە، ئەم کۆلێجە تاکە کۆلێجی پسپۆڕی بواری تەکنەلۆجیای زانیارییە لەناوچەکەدا و دوو بەشی زانستی لەخۆ دەگرێت (بەشی تەکنەلۆجیای زانیاری و بەشی نیتوۆرک)، لەئێستادا خوێندکاری قۆناغەکانی یەکەم ودووەم و سێیەمی هەیە.
١٠- کۆلێجی تەکنیکی کەلار، سەربە زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانییە، لە ٢٠٢١ کراوەتەوە، تەنها بەشی شیکاری نەخۆشییەکانی هەیە، ژمارەی خوێندکارەکانی ٦٠ خوێندکارە.




١١- پەیمانگای تەکنیکی تایبەت لەکەلارلەساڵی( ٢٠١٥ ) دامەزراوە، ( ٣) بەشی هەیە کە بریتین لە (بەشی زمانی ئینگلیزی،بەشی ڕاگەیاندن، بەشی IT ) ساڵی خوێندنی ٢٠٢١-٢٠٢٢ پێنجەم خولی دەرچووانی ئەم پەیمانگایەبوو، ژمارەی خوێندکارنی لەئێستادا(٣٠٠) خوێندکارە.




پەیمانگای تەکنیکی تایبەت لەکەلار

وەك پێشتر ئاماژەمان بۆكرد، كردنەوەی خوێندنی باڵا( دبلۆمی باڵا، ماستەر، دكتۆرا) لەكەلاردا تەنانەت خەونیش نەبوو، بەڵام بەئیرادەی خەمخۆرانی زانست و زانیاری ئەو خەونە بووبە كەتوار (واقیع) و لەئێستادا هەرسێ جۆری خوێندنی باڵا ( دبلۆمی باڵا، ماستەر، دكتۆرا) لە زانكۆی گەرمیان دەخوێنرێت.

سەرەتای كردنەوەی خوێندنی باڵا(ماستەر « دكتۆرا) لەكەلار بەمشێوەیەبوو :

١- كردنەوەی ماستەر لەبەشی بایۆلۆجی، كۆلێجی پەروەردە بۆ ساڵی خوێندنی ٢٠٠٥-٢٠٠٦ و (٦) خوێندكار وەرگیران بەناوەكانی(محمد ابراهیم « ئارام افراسیاب « محمد فتاح « عماد داود « سالار ابراهیم علی، محمد حسن فتاح).

٢- لە هەمان ساڵی خوێندندا واتە ٢٠٠٥-٢٠٠٦ خوێندنی باڵا ماستەر لە بەشی زمانی عەرەبی « كۆلێجی پەروەردە كرایەوە و دوو خوێندكار وەرگیران بەناوەكانی (كاوە اسماعیل عبداللە» كوثركریم احمد ).

فەرمانی زانكۆیی وەرگرتنی یەكەم خوولی خوێندنی باڵا ماستەر كە لەكۆلێجی پەروەردە/كەلار وەرگیران، ژمارەیان(٨) خویندكاربوو.(٦) خوێنكاری لەبەشی بایۆلۆجی و (٢) خوێندكاریشی لەبەشی زمانی عەرەبی بوون.

٣- لەبەشی زمانی ئینگلیزی، كۆلێجی پەروەردە لە ساڵی خوێندنی ٢٠٠٨-٢٠٠٩ خوێندنی ( دكتۆرا )كرایەوە و ( ٦) خوێندكاری وەرگرت.

٤- بەشی زمانی كوردی، كۆلێجی پەروەردە لەساڵی خویندنی ٢٠٠٩-٢٠١٠ خوێندنی دكتۆرای كردەوە و (٣) خوێندكاری وەرگرت.

دوای دامەزراندنی زانكۆی گەرمیان بەفەرمانی هەرێمی ژمارە ( ٠٧٦١ ) لە ( ٢٠١٠/٧/٨)دا بەرەوی زیاتر بە خوێندنی باڵا درا، لە ئێستادا خوێندنی باڵا (دبلۆمی باڵا، ماستەر و دكتۆرا ) لەم كۆلێج و بەشانە هەن :

ناوی ... وردو میهرەبان

هەرێمی کوردستان – عیراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی
سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانی
نووسینگەی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ
بۆ کاروباری زانست و خوێندنی باڵا

ژمارە / ١٠٥٥٦/٥/٣
بەروار / ٢٠/ ١١/ ٢٠٠٥
ڕێکەوتی ٢٩/ ٨/ 2705 ک

زانکۆی سلێمانی
کۆلێجی پەروەردە
( هاتوو )
ژمارە: ٢٥١٧
ڕۆژ: ٢٦/ ١١/ ٢٠٠٥

بۆ ... فە... زانکۆیی
بەڕێوەبەرایەتی وەرگرتنی خوێندنی باڵا

دوا بەدوای فەرمانی زانکۆییمان ژمارە ٩/٥/٢... لە ٢٥/ ... ٢٠ دا، تایبەت بە دەستنیشانکردنی ناوی پاڵێوراوانی ... خوێندنی باڵای کۆلێجەکانی (پزیشکی، پزیشکی ددان ... پەرستاری، پەروەردەی وەرزش، پەروەردەی کەلار، پەروەردەی بنەڕەت، زانست، ئەندازیاری، کشتوکاڵ، کارگێری و ئابووری، زانستە ... کۆمەڵایەتییەکان، زمان، یاسا) لە زانکۆی سلێمانی، بڕیار درا ...

وەرگرتنی ئەو بەڕێزانەی کە لە لیستی هاوپێچدا ناویان هاتووە ... (کاظم فرج عارف سعید) دەست پێدەکات و بە (نەوژین ... ختیار صالح) کۆتایی دێت بۆ خوێندنی باڵای ساڵی ٢٠٠٥ – ٢٠٠٦ لە ... دەست بەکاربوون و پەیوەندی کردنیان بە خوێندنەوە.

هاوپێچ:
لیستی ناوی وەرگیراوانی خوێندنی باڵا

پرۆفیسۆر
د.نزار محمد محمد أمین
یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانست
و خوێندنی باڵا

٢٤/ ١١/ ٢٠٠٥

وێنەیەک:-
- وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی – نووسینگەی بەڕێز ... خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی لەگەڵ ڕێزدا...
- وەزارەتی تەندروستی – نووسینگەی بەڕێز وەزیری تەندروستی ، لەگەڵ ...
- سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانی – بەڕێوەبەرایەتی نووسینگەی سەرۆک ... ڕێزدا...
- هەردوو نووسینگەی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ لەگەڵ ...
- گشت دام و دەزگاکانی زانکۆ.
- گشت کۆلێجەکان
- لیژنەی سەرپەرشتیاری سەرەکی خوێندنی باڵا ، لەگەڵ ڕێزدا.
- دۆسیەی گەسیتی.

١- لە كۆلێجی پەروەردە بەشی زمانی كوردی (ماستەر و دكتۆرا ) دەخوێنرێت.
٢- لە كۆلێجی پەروەردە بەشی زمانی ئینگلیزی (ماستەر و دكتۆرا ) دەخوێنرێت.
٣- لە كۆلێجی پەروەردە بەشی زمانی عەرەبی (ماستەر ) دەخوێنرێت.
٤- لە كۆلێجی پەروەردە بەشی دەروونناسی (ماستەر ) دەخوێنرێت.
٥- لە كۆلێجی پەروەردە بەشی بایۆلۆجی (ماستەر ) دەخوێنرێت.
٦- لە كۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت بەشی زمانی كوردی (ماستەر ) دەخوێنرێت.
٧- لە كۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت بەشی زانستە كۆمەڵایەتییەكان (دبلۆمی باڵا ) دەخوێنرێت
٨- لەكۆلێجی زمان و زانستەمرۆڤایەتییەكان/ خانەقی - بەشی زمانی كوردی(دكتۆرا) دەخوێنرێت.
٩- لەكۆلێجی زمان و زانستەمرۆڤایەتییەكان/ خانەقی - بەشی زمانی عەرەبی(دكتۆرا) دەخوێنرێت.
٠١- لەكۆلێجی زمان و زانستەمرۆڤایەتییەكان/ خانەقی - بەشی جوگرافیا(ماستەر و دكتۆرا) دەخوێنرێت.
١١- لەكۆلێجی زمان و زانستەمرۆڤایەتییەكان/ خانەقی - بەشی دەروونناسی(ماستەر) دەخوێنرێت
٢١- لە كۆلێجی پەروەردەی جەستەیی و زانستە وەرزشییەكانی خانەقین (ماستەر) دەخوێنرێت.

تێبینی / بۆئامادەكردنی ئەم بابەتە وەك سەرچاوە سوود لە سایتی زانكۆی گەرمیان و سایتی پەیمانگای تەكنیكی كەلار و كۆلێجی تەكنیكی كەلار و ڕێبەری دەرچوونی زانكۆی گەرمیان و پەیمانگاكانی كەلار وەرگیراوە.

| ژ | ناو | پسپۆڕی | بڕوانامە |
|---|---|---|---|
| 239 | سیروان عزیز اکبر | ...جی - مایکرۆ | ماستەر |
| 240 | محمد ابراهیم خلیل | ...ی - ڕووەك زانی | ماستەر |
| 241 | عماد داود عباس | ...ی - ڕووەك زانی | ماستەر |
| 242 | ئارام افراسیاو احمد | ...ی - مێرووەکان | ماستەر |
| 243 | کوثر کریم احمد | ...نی عەرەبی | ماستەر |
| 244 | کاوە اسماعیل عبدالله | ...نی عەرەبی | ماستەر |
| 245 | سالار ابراهیم علی | ...ی - مشەخۆرەکان | ماستەر |
| 246 | کوردستان عمر محمد | ...زمەڵناسی | ماستەر |
| 247 | توانا فەرەیدون حسین | ...زمەڵناسی | ماستەر |
| 248 | ئارام علی فرج | کۆ... - ئەنثرۆپۆلۆجیا | ماستەر |
| 249 | نیاز عزالدین محمد | کۆ... - ئەنثرۆپۆلۆجیا | ماستەر |
| 250 | ژیا عباس قادر | ...ناسی - خدمە | ماستەر |
| 251 | علی جعفر خالد | ...ناسی - خدمە | ماستەر |
| 252 | ساکار محمدحسن | ...رافیا / مرۆیی | ماستەر |
| 253 | ڕۆژان فەرەیدون عبدالرحمن | ...فیا / سروشتی | ماستەر |
| 254 | خلیل کریم میرزا | ...فیا / سروشتی | ماستەر |
| 255 | هێمن مجید حسن | ...اندن - ڕۆژنامە | ماستەر |
| 256 | فؤاد علی احمد | ...اندن - ڕۆژنامە | ماستەر |
| 257 | هێرش رسول مراد | ...اندن - ڕۆژنامە | ماستەر |
| 258 | ابراهیم سعید فتح الله | ...دن / تەلەفزیۆن | ماستەر |
| 259 | جوان بهاءالدین علی | ...دن / تەلەفزیۆن | ماستەر |
| 260 | سلام نصرالدین محمد | ...دن / تەلەفزیۆن | ماستەر |
| 261 | حسیب محمود مجید | مێژوو... ...ژووی نوێ وهاوچەرخ | ماستەر |
| 262 | ئامانج حسن احمد | مێژوو... ...ژووی نوێ وهاوچەرخ | ماستەر |
| 263 | پەرێز عبدالله توفیق | ...ندنی ئیسلامی | ماستەر |
| 264 | نجات محمد فرج | ...کۆمەڵناسی | دکتۆرا |
| 265 | جوان احسان فوزی | ...کۆمەڵناسی | دکتۆرا |
| 266 | جوان بختیار بهاالدین | ...نثرۆپولۆجیا | دکتۆرا |
| 267 | فاتح عبدالله محمد | ...مێژووی کۆن | ماستەر |
| 268 | سهی علی حسێن | ...کرۆبایۆلۆجی | دکتۆرا |
| 269 | نهلە محمد سعید | ...کرۆبایۆلۆجی | دکتۆرا |
| 270 | طالب غیدان منت علی | زاین | دکتۆرا |
| 271 | فریدون عبدالستار محمد امین | زاین | دکتۆرا |
| 272 | ڕزگار رحیم سلێمان | ...یشکی هەناوی | دکتۆرا |
| 273 | دێرین عمر محمد رمزی | ...ندروستی گشتی | دکتۆراه |

جێــی خۆیەتــی سوپاســی ئــەو بەڕێزانــە بکەیــن کــە بــە پێدانــی زانیــاری هاوکارمانبــوون. ئەوانیــش :

١-پ.د. عزالدیــن جمعــە دەرویــش / یاریــدەدەری ســەرۆکی زانکــۆ بــۆ کاروبــاری کارگێــڕی و دارایــی.

٢- پ.د. ئاسـۆ لطیـف / ڕاگـری کۆلێجی زمـان و زانسـتەمرۆڤایەتییەکان/ خانەقیـن

٣-پ.ی.د. محمـد ابراهیـم خلیـل / ڕاگـری کۆلێجـی زانسـتە ئەندازیارییە کشـتوکاڵییەکان/ کفری

٤-پ.ی.د. جـلال سـعدالله حسـن/ مامۆسـتا لەبەشـی زمانـی ئینگلیـزی، کۆلێجی پـەروەردە

٥-پ.ی.د. خالــد فائــق درویــش / مامۆســتا لەبەشــی بایۆلۆجــی، کۆلێجــی پــەروەردە

٦-پ.ی.د. کاوە اسـماعیل عبداللـە/ مامۆسـتا لەبەشـی زمانـی عەرەبـی، کۆلێجی پـەروەردە

٧-د. شوان فرج سعید / مامۆستا لەبەشی کیمیا کۆلێجی پەروەرد

# مەلا ئەحمەدی هۆرینی و چالاکی بزوتنەوەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە 1970-1900



پ.ی.ئەحمەد باوەڕ

زانکۆی گەرمیان -کۆلێژی پەروەردە

## پێشەکی :

بەوپێیەی سالآن و ماوەیەکی زۆرەکەلارو دەوروبەری بەناوەندی ناوچەی گەرمیان دادەنرێ، بەڵام لەوکاتەشەوە،کە هۆزێکی وەك جاف لە ژیانی کۆچەرایەتی و بەتایبەتی گەرمیان و کوێستان کەوتوون، لەگەڵ ئەوەشداو بەدیاریکراوی لە(٢٧ی نیسانی ١٩٢٧) بەدواوە، کەیاسای لیوا، قەزا، ناحیە، دێهات و ناوچەکان لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی مەلیك فەیسەڵی یەکەم و عێراقی پاشایەتی بڵاوکرایەوە[١]. ئیدی لێرەش بەدواوەکەسێکیوەك (کەریم بەگی جاف) و براکانی لەبنەماڵەومیرزادەکانی جاف لە کەلاری ئەوودەمانەدا نیشتەجێ دەبن، شان بەشانی ئەوەش کەوتوونەتەسەربیرۆکەی ئەوەی کەچۆن چەند ناوەندێکی خزمەتگوزاری گرنگ وپێویست بۆخۆیان ودانیشتوانی کەلار دەستە بەربکەن، هەر لە دامەزراندن و هەوڵدان بۆ کردنەوەی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی خوێندن لە ساڵی(١٩٣١-١٩٣٢)،هەروەها لە درێژەی سالآنی دواتریشدا

دەکەونەدەستەبەرکردن ودابینکردنـــی ســەرچاوەی ئــاوی خواردنــەوە، بنکــەی تەندروســتی پێویســت، فەرمانگــەی پۆســتەوگەیاندن وتەلەفۆنــات، مەکینــەی ئــاش وکۆمەڵێــك ســەرچاوەی گرنگــی دی. کەچــی ســەبارەت بەدامەزراندنــی مزگــەوت و کردنــەوەی وەك ناوەندێکــی ئایینــی بۆخواپەرســتی، ئــەوا بەتــەواوی بێگومانــم لــەوەی، کــە تەمەنــی مزگــەوت و بونیادنانــی یەکــەم مزگــەوت لەشــوێنێکی ئاوەدانــی وەك کــەلاری ئێســتادا زیاتــر دەگەڕێتەوەبۆســاڵان و کۆتاییەکانــی ســەدەی نۆزدەیەمــی زایینــی ویەکەمیــن مــەلای مزگەوتیــش، کــە لەقۆناغــی ســەرەتادا لەناوچــەی هەورامــان و ســنووری تەوێڵــەو بیارەوەهاتبێتەناوچــەی گەرمیــان و کــەلار، ئەویــش خوالێخۆشــبوو(مەلا محەمــەدی جوانرۆیــی) (١٨٦٨-١٩٣٨) بــووە، بەجۆرێــك ســاڵانێکی زۆر لــە ناوچــەی گەرمیــان و لیــوای کەرکــووك و هەروەهــا ســنووری قــەزای خانەقییــدا ماوەتــەوە، تەنانــەت لەســاڵانی دواتریشــدا هــەر لــە کــەلاری کــۆن ژیانــی هاوســەرگیری پێکەوەنــاوەو لەســاڵی(١٩٣٨)دا لەشــاری خانەقــی کۆچــی دوایــی کــردووەو لەگۆرســتانی (پاشــاکۆپری) نێــژراوە[٢]. دوابــەدوای ئەویــش کۆمەڵێــك کەســایەتی ئایینــی و زانــاو مــەلای زۆر شــارەزا وەك ئیــمام و خەتیبــی مزگــەوت و هــاوکات وەك پیشــەی وانەوتنەوەڕوویــان لەناوچەکەکــردووەو لەکــەلاری ناوەنــدی گەرمیانــی ژێــر دەســتەڵاتی بەگزادەکانــی جافــدا، بۆماوەیەکــی زۆر لەکــەلاردا ماونەتــەوە، وەك ئامــاژەی بۆکــرا، کاروبــاری ئایینــی و ئیمامــەت و تاربێژیــان بــۆ دانیشــتوانی گەرمیــان بــە گشــتی وکــەلار بەتایبەتــی ڕایــی کــردووە، شانبەشــانی ئــەوەش بەدرێژایــی مێــژوو، بــوون بــە بەشــێکی گرنــگ و دانەبــڕاو لەدانیشــتوانی ئــەم ناوچەیــەو تێکــەڵ بەدانیشــتوان و خەڵکەکــەی بــوون لەنێویانــدا : مەلائەحمــەدی کەلار(١٨٨٠-١٩٥٩)،کــە لەدەروبــەری ســاڵی (١٩٠٦) دا، هــەر بەڕەبەنــی و لەتەمەنــی گەنجیــدا هاتووەتەکــەلارو تائەوکاتــەی لــە ســاڵی (١٩٢٧) بــەدواوە، کــەلاری بەجێهێشــتووە، بۆماوەیەکــی زۆریــش لەســەر داواو ڕاســپاردەی حاجــی ئیبراهیــم

بەگـی کـوڕی سـلێمان بەگـی جـاف (١٨٨٧-١٩٥٢) دەچێتەگونـدی (دەککـە)ی حاجـی ئیبراهیـم بـەگ لەسـنووری قـەزای خانەقـی و ئیـدی لێـرەش بەدواوەبە(مەلائەحمـەدی دەککـە) شـۆرەت وناوبانگـی ڕۆیشـتووە، بـەڵام لەمـاوەو سـاڵانی مانەوەیـدا لەکـەلار نزیکـەی (٢٠) سـاڵی تـەواو وەك مودەڕیـس و وەك وتارخوێـن و قـازی جـاف تیایـدا ماوەتـەوە[٣]. جگەلـەوەش لـە کـەلاری ئەوکاتانـەداو لەدووکاتـی جیـاوازدا هـەر لەکـەلار ژیانـی هاوسـەری پێکەوەنـاوە[٤].
پاشـان کەسـایەتی و پیاوانـی ئایینـی تـری وەك: مەلامسـتەفای عەلـی تایشـەیی(١٨٩٥-١٩٦٩)،مەلائەحمەد عەبدولعەزیـزی هۆرینی(١٩٠٠-١٩٧٠)،مەلامحێدینـی مەلاسـەعیدی زەڵزەڵەیـی (١٨٩٥-١٩٥٩)،مەلائەحمـەدی شـەمێرانی،مەلائەورەحمانی کەرکووکـی، مەلامحەمـەدی فەقـێ ڕەشـید سـەمینی کـەلار (١٩٢٩-١٩٨٠)، مەلائەحمـەدی کـوڕی مەلامحەمـەد ڕەشـیدی قنگربـان(١٩١٢-٢٠٠٢) دێن.بـەڵام ئـەوەی لێـرەداو لەچوارچێـوەی ئـەم کورتەنووسـینەدا، کـە ئێمەدەمانەوێـت لەبارەیەوەبدوێیـن و ڕۆشـنایی زیاتـری بخەینەسـەر ئەوەشـیان مەلائەحمـەد عەبدولعەزیـزی هۆرینییـە (١٩٠٠-١٩٧٠)، واتـە ئـەو کەسـایەتی و پیاوەئایینیـەی، کـە لەسـاڵی(١٩٥٤) بەدواوەلەشـارۆچکەی خەسرەوئابـاد (قزەڕبـات) لەسـەر داواکاری وڕاسـپاردەی داودبەگـی جـاف، هاتووەتەکـەلارو تاکاتـی بەرپابوونـی شۆڕشـی ١٤ی تەمـووزی ١٩٥٨، بگـرە دواتریـش هـەر لەکـەلاردا ماوەتـەوە، پاشـان چووەتەشـارۆچکەی جەلـەولا، لەسـاڵی (١٩٧٠)دا لـەوێ کۆچـی دواییکـردوە.

## تــەوەری یەکــەم: ســەربوردەی کەســایەتی و ژیانــی هاوســەرگیری:

ئــەوەی شــایانی باســەمەلائەحمەد عەزیــز ئیســماعیلی هۆرینــی بەپێــی هەمــوو ئــەو دیکۆمێنــت و نووسراوانــەی کــەلای ئێمــەن، بەسوپاســەوە، لەکــەس و کارو بنەماڵــە کەیانەوەوەرمانگرتــووە، دەیســەلمێنێ، کەمەلائەحمــەد لەســاڵی(١٩٠٠)دا، لەگونــدی هۆرینــی ســەر بە(ناحیــەی مەیدانــی) بنــاری بەمــۆی هاتۆتەدونیــاوە، بەپێــی ڕەگەزنامەعێراقییەکــەی کەلەســاڵی(١٩٤٨)دا دەری کــردووە، دایکــی ناوی(جەواهێـر قـادر) بـووە، بـەزۆری بـاب و باپیـرو بنەماڵەکەشیان هـەر لـەم ناوچەیـەدا سـەرگەرمی کاروبـاری کشـتوکاڵی و ئاژەڵـداری و باخـداری بـوون، وەك ئـەوەی هـەر لەقۆناغـی گەنجـی و لەهەرەتـی لاوییەوەکەوتۆتەگەڕان،ســەرەتا بەمەبەســتی فێربــوون و درێــژەدان بەخوێندنــی ئایینــی ســەردانی شــاری ســلێمانی کــردووەو لەمزگەوتــی گــەورەی شارەوەدەســتی داوەتــە خوێنــدن پاشــان هەربەمەبەســتی درێــژەدان بەخوێنــدن زۆرێــك لەشاروشــارۆچکەکانی ئەودەمانــەی باشــوورو ڕۆژهەڵاتــی کوردســتان گەڕاوەلەوانــە : تەوێڵــە، بیــارە، ســنەوناوچەی ســابلاغ و بۆماوەیەکــی زۆریــش لەناوچــەی هەورامــان و لە(بیارە)دا،ماوەتــەوەو لەگــەڵ ئەوەشــدا بووەبەموریــدی شــێخانی نەقشــبەندی لــە نێویانــدا: شــێخ عوســمان نەقشــبەندی، دوای تەواوکردنــی قۆناغەکانــی خوێنــدن و وەرگرتنــی ئیجــازەی زانســتی مەلایەتــی گەڕاوەتەوەناوچەکــەی خۆیــان و بۆماوەیــەك لــە (باوەمەحمــوود) نزیــك بەشــاری خانەقــی نیشــتەجێ بووە،هەروەهــا بۆمــاوەی چەنــد ســاڵێکیش وەك کارمەنــدی کۆمپانیــای نەوتــی شــاری خانەقـی کاریکـردووە، پـاش دەسـت هەڵگرتنـی لـەم کارەی هاتووەتـە، ناوچــەی (بنکــورە)ی ســەربەناحیەی قۆرەتــوو، لــە گوندەکانــی وەك : (ســەوزبلاخ) و(ئاوایــی گەورە)،لەدەوروبــەری ســاڵی (١٩٤٩)دا، بەتایبەتــی دوای ئــەوەی مەلاســەیدحەکیمی خانەقــی(١٨٩٢-١٩٥٧) وەك مەلاوئیمامــی مزگەوتــی (غێــدان) ئــەم گوندەبەجــێ دەهێڵێــت،

ئیدی مەلائەحمەدی هۆرێنی لەسەر ڕاسپاردەی شێخ وەهابی کوڕی شێخ حەمیدی تاڵەبانی (١٨٨٧-١٩٧٢)،کەبەزۆری بەرپرسیاری یەکەمی ناوچەکەبووە، مەلائەحمەدی هۆرێنی دەچێتە(ئاوایی غێدان)و بۆماوەی (٣) ساڵی تەواو لەم گوندەدا ماوەتەوەو بەرنوێژی وئیمامەتی تێداکردوە، بەماوەیەك دواتریش مەلاسەید عەبدوڵڵای کفری (١٩٠٥-١٩٨٦) کەبەڕەسەن خەڵکی ناوچەی موکریان و گوندی (بەردەزەرد)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە، جێگای دەگرێتەوە،تائەوکاتەی هەر لەناوچەی بنکوورەدێتەگوندەکانی: (گاکوڵ)و(باریکە) و درێژەبەکاری مەلایەتی وبەرنوێژی خۆی دەدات[٥]. بەڵام لەڕووی ژیانی کۆمەڵایەتیشەوەئەوەی جێی سەرنجی زیاتربێت مەلائەحمەدی هۆرێنی لەناوچەی (بنکورە)ی سەر بەناحیەی قۆرەتووی شاری خانەقی، دووجار ژیانی هاوسەری پێکەوەناوە، یەکەمیان: لەدەوروبەری ساڵی(١٩٣٦)دا، کە ناوی (ئامینەعەزیز ڕەشید) بووە، بەپێی شوناسنامەی باری شارستانی لەساڵی (١٩٠٠)دا، هاتۆتەدونیاوەو تەنها یەك کچی لێ هەبووەبەناوی (توبا)، کەلە ساڵی (٢٠١٢)دا، کۆچی دوایکردووەو خێزانی کەسێکی تورکمان بووەبەناوی محەمەد شەوکەتوخەڵکی شارۆچکەی (خورماتوو) بووە لەگەرمیان،دواتریش هاتووەتەشارۆچکەی جەلەولا، کە ئەوکاتەکارمەندی (حانووت)ی سەربازی بووە، لە نێو لیوای (٢٠)ی سەربازگەی جەلەولاو دوومنداڵی لێ هەبووەبەناوەکانی (محەمەد وسوعاد).

شایانی باسە، هاوسەری دووەمی مەلائەحمەدی هۆرینی کەناوی (رابعە) بووە، لە دەوروبەری ساڵی (١٩٣٩)دا هاوسەرگیری لەگەڵ کردووەو کچی ڕەشید چاوش بووە، کەسێك لەهێزەکانی پۆلیس لەسنووری ناحیەی (باوەنوور- دەربەندیخان)، کەبەڕەسەن خەڵکی گوندی (سەوزبلاخ)ی سەربەناوچەی (بنکورە) بوون، دوای ساڵانێکی زۆرو پاش کۆچی دوایی مەلائەحمەدی هۆرینی هاوسەری ئەمیش لەساڵی (٢٠١٢)دا لەشاری دهۆك کۆچی دوایی کردووە، تەنها خوشکێکی هەبووەبەناوی (کافیە) و دایکیشیان

ناوی (شاپەسەند)بووە، بەڵام کافیە خانماوەیەك ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ محەمەد ئەمین عارفی دەربەندفەقەرە لە شاری خانەقی ژیانی هاوسەری پێکەوە ناوە،بەڵام هیچ منداڵیان نەبووە،وەك دەگوترێت هەردووکیشیان لەناوەندی هەشتاکانی سەدەی بیستەمی رابردوودا هەر لە خانەقی کۆچی دواییان کردووە. بەڵام مەلائەحمەدی هۆرێنی لەماوەی ژیانی هاوسەرگیرییانداو بۆجاری دووەم بەدوای یەکدیدا (٩) نۆ منداڵیان هەبووە، کە بەسەریەکەوەدەکاتە (٤) کوڕ و (٥)کچ بەناوەکانی : سەلاح(١٩٤٠)، کەبەزۆری قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی لە قزڕەبات، ناوەندی ودواناوەندی لەقوتابخانەی (نەجیبیە) لەشاری بەغداو هەروەها دواتریش کۆلێژی شەریعەی زانکۆی بەغدای لەساڵی(١٩٦٤-١٩٦٥)دا تەواوکردووە، پاش دامەزراندنی وەك مامۆستا لەشارو شارۆچکەکانی : جەلەولا،کفری، بەعقوبەو دهۆك مامۆستایی کردووە، بەڵام وەك کاروباری ئیداری بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی، جگەلەوەش ماوەیەك سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بووەلەوانە : بەڕێوەبەری ئامادەیی (یازدەی ئازار) لەناحیەی جەلەولا جگەلەهەموو ئەوانەش ماوەیەك کراوەتەجێگری بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی دهۆك ولەساڵی (٢٠٠٦)دا خانەنشین کراوە.بەڵام کوڕی دووەمی : مەحموود لە ساڵی(١٩٤٥)دا، هاتۆتەدونیاوە،پەیمانگەی مامۆستایانی سەرەتایی لەشاری بەعقوبەلەساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩) دا تەواوکردوە، تاکاتی خانەنشین بوونی لەساڵی (٢٠٠٨)دا لە : جەلەولا،ڕەمادی،کەلارو دەربەندیخان مامۆستایەتی کردووە، بەڵام برای سێیەمیان سەباح کە لەساڵی(١٩٦٤)دا هاتۆتەدونیاوە، پەیمانگەی مامۆستایانی دهۆکی تەواوکردوە، سەرەتا وەك مامۆستا لەناحیەی(شیلادزێ) دامەزراوە، پاشان هاتۆتە نێوشاری دهۆك و ماوەیەکیش لەقوتابخانەی (وڵات) درێژەی بەپیشەی مامۆستایی داوە، تائەوکاتەی لەساڵی (١٩٩٨)دا کۆچی دوایی کردوە.بەڵام محەمەدیان لەساڵی (١٩٦٦) دا هاتۆتەدونیاوە، پەیمانگەی تەکنیکی زەعفەرانییەی لەبەغدا تەواوکردوە، ئێستاش فەرمانبەری

وەزارەتــی ئــاوەدان کردنەوەیــە، هەروەهــا کچەکانیشــی : خەدیجــە (١٩٤٩)،پەیمانگــەی مامۆســتایانی کەرکووکــی لەســاڵی(١٩٦٨-١٩٦٩) دا تەواوکــردوە، فاتمــە(١٩٥٢) کۆلێــژی ئەندازیــاری (بەشــی کارەبــا ی لەزانکــۆی مووســڵ تەواوکــردوە(١٩٧٨-١٩٧٩)، هەروەهــا حەلیمــە (١٩٥٧) بۆجــاری یەکــەم پەیمانــگای مامۆســتایانی دهۆکــی لەســاڵی (١٩٨٢)دا تەواوکردوە،دواتریــش کۆلێــژی پــەروەردەی زانکــۆی مووســڵ بەشــی زمانــی عەرەبــی لەســاڵی(١٩٩٤-١٩٩٥) دا خوێندوە،هەروەهــا نەسریــن وەك خــۆی ئەڵــێ لەســاڵی (١٩٥٣) دا لەجەلــەولا هاتۆتەدونیــاوە، بەهەمــان شــێوەئەمیش کۆلێــژی زانســت بەشــی (کیمیــا)ی لەزانکــۆی مووســڵ لەســاڵی (١٩٧٩-١٩٨٠) دا تەواوکــردوە، وەك مامۆســتا لەقوتابخانــەی (گەلاوێــژ) لەشــاری زاخــۆ دامــەزراوە، پاشــان هاتوەتەوەنێوشــاری دهۆك،بــەڵام زەینەبیــان کەلەســاڵی (١٩٤٦)دا هاتۆتەدونیــاوە، تەنهــا قۆناغــی ســەرەتایی تەواوکــردووەو هــەر لەکــەلاری کــۆن بووەبــە هاوســەری مامۆســتا (جەمــال ئیبراهیــم وەنــداوی) خەڵکــی کفــری، کەماوەیــەك لــە کــەلار مامۆســتابووە. ماوەتەوەبڵێیــن هەمــوو مناڵەکانــی مەلائەحمــەدی هۆرێنــی تاکاتــی ئــەم نووســینەهەموو لەژیانــدا مــاون، تەنهــا ســەباحیان نەبێــت، کەلەســاڵی (١٩٩٨) دا کۆچــی دوایــی کــردوە، هەروەهــا خێزانەکەشــی(رابعە خانــم) وەك پێشــتر ئامــاژەی بۆکــرا لــە ساڵی (٢٠١٢)دا، لەشاری دهۆك کۆچی دوایی کردووە.

## تەوەری دووەم : لەپیشەی مەلایەتییەوە تاکۆچی دوایی

مەلائەحمــەد عەزیــزی هۆرینــی وەك پیشــەی مەلایەتــی تاســاڵی(١٩٥١) هــەر لــە ناوچــەی بنکــورەو بەتایبەتــی لە(ئاوایــی غێــدان) ماوەتــەوە، دواتریــش لەســەرداواکاری، عەبدوڵڵابەگــی کــوڕی کەیخەسرەوبەگــی مەحمــوود پاشــای جــاف (١٨٩٠-١٩٤٤)[٦] هاتووەتــە مزگەوتــی مەحمــوود پاشــا(١٨٤٥-١٩٢١) لــە شــارۆچکەی (قزرەبــات)، کەلەودەمانــەدا یەکێــك بووەلەناوەندەزانســتی ومزگەوتەدیــارو ئاوەدانەکانــی ئەوکاتــەی باشــووری کوردســتان،

لەڕووی وانەوتنەوەو ڕاگرتنی فەقێ و خوێندکارەوە، ئەوەی جێی وەبیرهێنانەوەیە ئەم مزگەوتەلەساڵی (١٨٩١)دا لەلایەن مەحموود پاشای جافەوەدروستکراوە[٧]. لەگەڵ هەمووئەوانەشدا کۆمەڵێك مەلای خوێندەوارو شارەزای وەك :مەلامەعسوم هەورامی نەقشبەندی، مەلامحەمەدی وانی لەباکووری کوردستانەوە، هەروەها مەلاجەمیلی ڕۆژبەیانی (١٩١٣-٢٠٠١) ئیمامەت و وانەیان تیا وتۆتەوە، بۆلایەنی خوێندن و وانەوتنەوەش بەردەوام خوێندکار و فەقێی لێ نەبڕاوە، لەهەموو شوێن و ناوچە جیاجیاکانی کوردستان وتەنانەت خوارووی عێراقیشەوەڕوویان تێکردووەو ساڵانێکی زۆرتیایدا ماونەتەوە، خوێندنی ئایینیان لەم مزگەوتەتەواوکردوە، هەرلەو دەمانەشەوە، کەهەریەك لەمەلامستەفای عەلی تایشەیی لە(ناحیەی شێروانە)ی سەربەقەزای کفری و مەلا سەعیدی کوڵەجۆ (١٨٨٩-١٩٦٢)[٨] لە(ناحیەی قەرەتەپە)ی سەربەهەمان قەزاو لەساڵی(١٩٤٧) دا، لە ڕێگای بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئەوقافی کەرکووکەوە، لەسەرپێشنیارو ڕاسپاردەی پەرلەمانتاری ناوچەی گەرمیان داودبەگی جاف لەکەلارو کوڵەجۆ وەك مەلای مزگەوتی ئەوشوێنانەدادەمەزرێن و مانگانەی پێویستیان بۆ دەبڕدرێتەوە[٩]. کەچی بەچەند ساڵێك دواترو لەساڵی (١٩٥٤)دا مەلامستەفای تایشەیی وەك ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی کەلار هەرلەسەر ڕاسپاردەو داواکاری بەگزادەکانی جاف و لەلایەن کەسێکی وەك داودبەگی جافەوە، وەك دەگوترێت بەهۆی هەندێ کێشەوبارودۆخی کۆمەڵایەتی ئەوکاتەوەلەکەلار دووردەخرێتەوەو دەچێتەگوندی (کانی پەمووی) سەربەناحیەی (قۆرەتوو)، لەقەزار خانەقی و تاکاتی کۆچی دوایی لەساڵی (١٩٦٩)دا هەرلەوێ دەمێنێتەوە، تەنانەت ژنێکی خواناسی وەك خاتووزێبای کچی شێخ عەبدوڵلای شێخ حەسەنی قەڵاتەبزان، کەدەبێتەخێزانی شێخ مەحموودی شاکەل (١٨٤٥-١٩١٢)[١٠]، هاوکات دەبێتەدایکی شێخ عەلی واتەغالیب شاکەلی شاعیر(١٩٠٨-١٩٤٨)[١١].کەلەودەمانەشدادانیشتووی کەلاری کۆن دەبێت، وەك

ژنێکـی قسەڕۆیشـتووی ڕێزلێگیـراوی نێودانیشـتوانی ئەوکاتـەی کـەلارولای بەگزادەکانـی جـاف، دژی ئەودەرکـردن ودوورخسـتنەوەی مەلامسـتەفای کـەلار دەبێتەوەولەسـەری دێتەدەنگ‌ونارەزایـی خـۆی لەوبارەیەوەدەردەبڕێـت [١٢].

لـە مـاوەی ئـەو دوازدە سـاڵەی لـە مەککـە بـوو، هـەوڵ و کۆششـی زۆری دا بـۆ ئـەوەی بـروا بـە دەورووبەرەکـەی بهێنێـت سـەبارەت بـە پەیامبەرێتییەکـەی، بـەڵام لـە مـاوەی ئـەو سـاڵانەدا نەیتوانـی بـاوەڕ بـە (١٠٠)کـەس زیاتـر بهێنێـت لـە خەڵکـی هـەژار و کۆیلەکانـی قورەیش، ئـەو بـەو بەڵێنانـەی پێیـدا بـوون سـەبارەت بـەو بەهەشـتەی کە لـە دوای مـردن چاوەڕوانیـان دەکات، بـە حـۆری) ژنانـی چاوبەڵـەک (و غیلـمان و میـوە و شـەرابەوە و بـە نەمـری تێـی دا دەژیـن، بـەڵام کاروبـارەکان لـە دوای کۆچکـردن بـۆ یەثـرب بـە تـەواوی گۆڕانیـان بـە سـەردا هـات، کرێـی ئەرکـەکان بـە کاش و لـە دوای کۆتاییهاتنـی غـەزاکان یەکسـەر دەدران بـە جەنـگاوەران، ئەوەیـش بـوو بـە هـۆکاری ئـەوەی خەڵکـی مەککـە بـە ڕاکـردن بچـن بـۆ لای و ئیسـلامبوونی خۆیـان ڕابگەیەنـن و دان بــە پەیامبەرێتییــە ئاســمانییەکەیدا بنێــن، خەڵکــی مەککــە پێویسـتیان بـە بەڵێنـی دواخـراو نەبـوو، بەڵکـوو زۆرینەیـان کێشـەی زۆریـان هەبـوو لەگـەڵ ژیانێکـدا کـە پێویسـتی بـە بەڵێنێـک بـوو ڕاسـتەوخۆ جێبەجێبکرێـت، لـە پـاش هەمـوو غەزایـەک جەنگاوەرەکـە دەسـتکەوتێکی زۆری وەردەگـرت لـە ژن و حوشـتر و ...تـاد، هەتـا لـە کۆتاییدا دەوڵەمەنـد بـوون و ئەوەیـش هـۆکار بـوو بۆ ئـەوەی زۆرێک لە مەکەییـەکان بـە ڕاکـردن بچـن بـۆ یەثـرب، بۆیـە ژمـارەی جەنگاوەرانـی سـوپاکەی محەمـەد لـە ماوەیەکـی دیاریکـراودا زیـادی کـرد، ئەوەیـش کارێکـی سـەرنجڕاکێش بـوو، بـوو بـە هـۆی ئـەوەی سـەرگەورەکانی مەککـە تووشـی سەرسـوڕمان ببـن و ئـەم زیادکردنەیـش لـە ژمـارەی جەنـگاوەرەکان دەرئەنجامـی سـوودی ئابووریـی دوانەخـراو بـوو، جگـە لـەوە مـن هیـچ هۆکارێکـی تـر شـک نابـەم، ئەگـەر هـۆکاری تریـش

جابۆیەدواتــرو لەبەرنەبوونــی مــەلاو وتارخوێنــی پێویســت لەکــەلار و لەســەرداواکاری و ڕاســپاردەی داودبەگــی جــاف مەلائەحمــەدی هۆرینــی لەشــارۆچکەی قزڕەباتەوەدەگوازرێتەوەکــەلارو تابەرپابوونــی شۆڕشــی(١٤ی تەمــووزی ١٩٥٨) بگرەماوەیــەك دواتریــش هــەر لەکــەلاردا دەمێنێتــەوە، ســەرەڕای کاری ئیمامــەت و خیتابــەت وانەبــە هەمــوو ئەوخوێندکارانــەش ئەڵێتەوەکــە وەك(فەقــێ) لەناوچەجۆراوجۆرەکانــی گەرمیــان وکوردســتانەوەڕوویان لــە گەرمیــان و کــەلاری ئەوددەمانەکردووە،کەزیاتــر بەمەبەســتی درێــژەدان بەخوێنــدن تیایــدا ماونەتــەوە، هەروەهــا وەك شــوێنی نیشــتەجێبوون داودبەگــی جــاف خانوویەکــی ماڵــی ڕەزابەگــی بــرای (١٨٨٦-١٩٤٢) بــۆ تەرخــان کــردوون، ســەرەڕای دەســتەبەرکردنی زەوی وزاری کشــتووکاڵی پێویســت بــۆ چاندنــی گەنــم و جــۆی ســاڵانەو ســەرچاوەی ژیــان لەگــەڵ پێدانــی زەکات و یارمەتیەکــی ناوبەنــاوی بەگزادەکانــی جــاف خۆیــان بۆمــەلای مزگــەوت، هــاوکات مناڵەکانیشــی لــە ڕێــگای قوتابخانــەی ســەرەتایی کــەلاری ئەوکاتەوەدەخاتەبەرخوێنــدن، وەك ئــەوەی نــاوی بەشــێکیان تائێســتاش لەتۆمارەفەرمییەکانــی نێــو یەکەمیــن تۆمــاری قوتابخانــەی ســەرەتایی کــەلاردا بەرچاوەدەکەون[١٣].بــەڵام بۆلایەنــی بازاڕکــردن و کڕینــی پێداویســتی تــری ڕۆژانەش ئــەوا دانیشــتوان و خەڵکــی کــەلارو دەوروبــەری بــەزۆری پشــتیان بــە بــازاڕی شــارو شــارۆچکەکانی وەك : کفــری وخانەقــی و جەلــەولا بەســتووە، جگــە لەوانــەش لەکــەلاری ئەوکاتــەدا چەنــد عەتــار و دوکانێکــی وردەواڵــە فرۆشــی پێویســت هەبــوون، کەبــەزۆری پێداویســتی دانیشــتوانی کــەلارو دەوروبەریــان لــە شــتومەکی جۆراوجــۆری ڕۆژانــە پڕکردۆتــەوە لەنێویانــدا دوکانــی: حاجــی مەحمــوودی عەلــی محەمــەد، ســەمین شــوان، مەجیــد ئەولکەریم،حاجــی ئەحمــەدی خــدری بانــی مــۆردی وحاجــی عوســمانی حاجــی حەســەنی خدر[١٤].هەروەهــا جگەلەچوونەشــارو بوونــی قوتابخانــەی کــەلار ســوود وەرگرتنــی بووەلەکتێبخانەتایبەتیەکــەی محەمــەد ســەعید بەگــی جــاف (١٩٢٦-١٩٩٦)، کــە لەودەمانــەداو وەك

دەگوترێ پڕبووەلەسەر چاوەی دەوڵەمەند بەزمانەکانی : کوردی، عەرەبی و فارسی سەرەرای گۆڤارو رۆژنامەی جۆراوجۆر لەوانە : گۆڤاری گەلاوێژو گۆڤاری دەنگی گێتی تازەو پەیام بەزمانی کوردی، کە بەپێی گێڕانەوەی سەلاح کورەگەورەی مەلائەحمەدی هۆرینی کەدەڵێت:وەك خێزان هەموومان بۆخوێندنەوەسوودمان لەوکتێبخانەدەوڵەمەندەی محەمەد سەعید بەگ وەردەگرت و دەمانخوێندنەوە[١٥].

بەجۆرێك مەلائەحمەدی هۆرینی تاسەروبەندی بەرپابوونی شۆڕشی(١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) لەکەلاردا، وەك ئیمام و خەتیبی مزگەوتی کەلار دەمێنێتەوەواتەتائەوکاتەی بنەماڵەوبەگزادەکانی جافی کەلار بەهۆی بەرپابوونی شۆڕشی تەمووزو کۆتایهێنانی فەرمانڕەوایەتی پاشایەتی لەعێراق و داهاتنی سیستمی کۆماریبەزۆری دەبن بەچەند بەشێکەوەو تارادەیەك ئاوایی کەلار بەجێ دەهێڵن و وەك ئەوەی بەشێکیان لەگەڵ داودبەگی جاف وکورەکانی دەچنەئێرانەوە، هەروەها بەشێکی تریشیان لەگەڵ محەمەد سەعید بەگی جاف (١٩٢٥-١٩٩٦) دەچنە شاری بەغداو لەوێ بۆماوەیەك نیشتەجێ دەبن. بەڵام بەشی سێیەمیان، کەبەزۆری بریتی بوون لەماڵی مستەفا بەگی جاف(١٩٢٥-١٩٩٧)، شەوکەت بەگی ئەحمەد بەگی جاف (١٩٢٤-١٩٨٤)، هەروەها ماڵی حمەڕەشید بەگی حەسەن بەگی جاف (١٩١٣-١٩٧٧)، ئەورەحمان بەگی فەتاح بەگی جاف لەگوندی (حەسەن محەمە)وە،ئەوانیش دەچنە شاری خانەقی و بۆماوەیەك لەگەرەکی (مەزرەعە) نیشتەجێ دەبن. بەڵام ماڵی مەحموودبەگی رەزابەگ (١٩٢٥-١٩٧٥)، کەماوەیەك لەگوندی خەیاڵی ناوچەی (بنکورە) دەبن لەساڵی (١٩٧٥)دا، پاش کۆچی دوایی مەحموود بەگ ئەمانیش دەگەڕێنەوەکەلار و لەکەلاری کۆن نیشتەجێ دەبن[١٦]. بەڵام لەساڵانی دواتردا تەنها ماڵی مەحموودبەگ وحەمەرەشید بەگ نەبێت ئەوانی دی هەموو دەچنەئێرانەوە، دوای چەند ساڵێك داود بەگ لەخەستەخانەی میهری شاری تاران لە(٦ی حوزیرانی ١٩٦٦) کۆچی دوایی

دەكات ودواتریش لەڕێگای مەرزی نێودەوڵەتی (خەسرەوی-خانەقین)ەوە، دووبارە دەهێنرێتەوە گەرمیان و لە گۆڕستانی بەگزادەكانی جاف لە گوندی (سەیدخەلیل)دەنێژرێت[١٧].ئەوانی تریشیان تاسەروبەندی بەرپابوونی شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی ولەسێدارەدانی سالارجاف (١٩٤٤-١٩٧٩) لەچوارچێوەی ئەوزنجیرە لەسێدارەی، كەئایەتوڵلامحەمەد سادق خڵخاڵی(١٩٢٩-٢٠٠٣)[١٨]. لەدژی بەرپرسانی سەردەمی شاهنشاهی جێبەجێیكرد، هاوكات لەسێدارەدانی سالارجافیش بەهۆكاری سەركوتكردنی كۆمەڵانی خەڵك لە ناوچەی هەورامان وشاری پاوە جێبە جێكرا[١٩]. بەڵام ئەوانەی تریان و بەپێی گێڕانەوەی دكتۆرحەسەن جاف لە ڕێگای حكومەتی عێراق و لەناوچەی شلێروناوخوانی شاری سەقزەوە، بەچەند فڕۆكەیەكی هەلیكۆپتەری عێراق لە كۆتاییەكانی ئازاری ١٩٧٩دا، پاش لە ناوچوونی یەكجاری دەستەلاتی شاهنشاهی دووبارە گەڕانەوەعێراق وشاری كەلارو لێرەش بەدواوە بۆ شاری بەغدا[٢٠].

لەكۆتایی ساڵی(١٩٥٨) بەدواوە مەلا ئەحمەدی هۆرێنی بەمەبەستی گواستنەوەی راژەو خزمەتی مەلایەتی لە كەلارەوەسەردانی شاری بەغدای كردووەو لەڕێگای سەرۆكی دیوانی وەقفی سوونی ئەوكاتەی بەغداوە، نەقڵی ناحیەی جەلەولا دەبێت، دواتریش ماڵەكەی لە كەلارەوەدەگوازێتەوە، لە(گەرەكی سكەك) ناحیەی جەلەولا نیشتەجێ دەبێت، واتەبەشێوازێكی فەرمی لەسالانی (١٩٥٩- ١٩٦٣)دا دەبێتەئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی جەلەولا.كە بەمزگەوتی(ئیمام ئەبی حەنیفە) ناسراو بووە،بەزۆری هەموو ژیانی ڕۆژانەی خۆی هەرلەمزگەوت بەسەر بردووە، تەنانەت نانی نیوەڕوانیشی وەك نەسرینی كچی باسی لێوەدەكات بەزۆری لەماڵەوەبۆی براوەتەئەوێ ووەك كەسێكی زاهیدو خواناس خواردنی ڕۆژانەی زۆرسادەوساكار بووە بۆنموونە: زۆرجار هەربەنان وترێ ڕۆژانەی بەسەر بردووە، وەك جل و بەرگیش بەبەردەوامی تەنها دووقاتی هەبووە، هاوینەو زستانەوەك دەگێڕنەوەلەو ڕوووەكەسێك بووەزۆر بەسادەیی

ژیاوە، گوێی بەخۆشی و لەزەتی ژیان و دونیا نەداوە، تائەوکاتەی لە ناوەندی شەستەکانی سەدەی رابردووەوە، بۆماوەیەك توشی نەخۆشی دەبێت و بەوهۆیەوەبەزۆری لەماڵەوەدەبێت تائەوکاتەی، بە یەکجاری و بەمووچەیەکی مانگانەی زۆرکەم، کەتەنها (٩) دینار بووە، لەلایەن وەزارەتی ئەوقافەوەخانەنشین کراوە. بەڵام ئەوەشی جێی سەرنجەمەلائەحمەدی هۆرینی لەکات و ساڵانی مانەوەیدا لەسنووری گەرمیان پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی ناوچەکەو عێراقدا هەبووەلەوانەعەبدولڕەحمان عارف سەرۆك کۆماری عێراق، کەماوەیەك لە جەلەولا فەرماندەی لیوای سەربازی بووە، سەرەڕای باسکردن لەکەسێکی سەربازی وەك تەها شەکەرچی و کارەلوتبەرزییەکانی کەلەوقۆناغەدا، لەناوچەکەدا بەرانبەر بەکۆمەڵانی خەڵك گرتبوویەبەر، وەك ئەوەی لە یادەوەری و لەنووسراوەکانیدا دەردەکەوێت، هەروەها یەکێك لەڕووداوەمێژووییانەی، کەهەر لەڕێگای نووسراو و یادەوەرییەکانی ئەم کەسایەتیەوە، جێی سەرنجبن ئەویش سەردانێکی سەرۆك وەزیرانی عێراق عەبدولڕەحمان بەزاز (١٩١٣-١٩٧٣) بووە، بۆ جەلەولاو مزگەوتی گەورەی جەلەولا، ئەوێش کاتێك لە ڕێگای بنکەی سەربازی شارۆچکەی جەلەولاوەلە کۆتایی حوزەیرانی(١٩٦٦)دا، بە مەبەستی دانووستان و گفتوگۆکردن لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد سەردانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش ومەلامستەفای بارزانی دەکات لە(ناوپردان)، دواتریش لەڕێگای گەڕانەوەیدا، وەك پێشتر ئاماژەی بۆکرا، پێدەچێت لەدەوروبەری کۆتایی حوزەیرانی (١٩٦٦) دا بێت،کەبۆنوێژی عەسرسەردانی مزگەوتی گەورەی جەلەولا دەکات و پاشان چاوی بەمەلائەحمەدی هۆرینی و کۆمەڵێك کەسایەتی و خەڵکی جۆراوجۆری شارۆچکەکەدەکەوێت، سەرەڕای گرتنی وێنەیەکی مێژوویی بەکۆمەڵ لەگەڵ جەماوەری ئامادەبوودا، کەلەبەردەم دەرگای سەرەکی مزگەوتی گەورەی شارگیراوەدواتریش عەبدولرەحمان بەزازی سەرۆك وەزیران زۆر بەخۆشییەوەڕووی دەم لەدانیشتوان وکۆمەڵانی خەڵکی ئامادەبووی شارۆچکەی جەلەولا دەکات، کە بەزۆری کورد بوون

پێیـــان دەڵێـــت : «خوایاربێـــت لـــەم ڕۆژانـــەدا هەواڵێکـــی زۆرخـــۆش وخێـــر بەرێوەیـــە، پەنابەخـــوا خۆتـــان لـــە ڕادیـــۆ و ســـەرچاوەکانی ڕاگەیاندنەوەگوێبیســـت دەبـــن لەگـــەڵ برایانـــی کوردمـــان». وەك ئـــەوەی بەچەنـــد ڕۆژێـــك دواتـــرو لـــە (٢٩ی حوزەیرانـــی١٩٦٦)دا، بەیاننامەمێژوویەکـــەی عەبدولرەحـــمان بـــەزازی ســـەرۆك وەزیـــران بەمەبەســـتی کۆتایهێنـــان بەشـــەڕو چارەســـەرکردنی دۆزی گەلـــی کـــورد بڵاودەکرێتـــەوە[٢١]. هەرچەنـــدە ئـــەم بارودۆخـــەش دواتـــر شـــتێکی ئەوتـــۆی بـــۆ گەلـــی کـــورد لـــێ شـــین نابێـــت.




ئـــەوەی شـــایانی باســـە وێنـــە مێژوویەکـــەی عەبدولرەحـــمان بـــەزاز، کـــە لەبـــەردەرگای ســـەرەکی مزگەوتـــی گـــەورەی جەلـــەولا گیـــراوە، کەکۆمەڵێـــك کەســـایەتی شـــارۆچکەی جەلـــەولاو قزرەباتـــی لەگـــەڵ وەســـتاوە، بەپێـــی بەدواداچـــوون و پرســـیارکردنمان بۆدەســـت نیشـــانکردن و ســـاغکردنەوەی ناوەکانیـــان لەلایـــەن بنەماڵـــەی مەلائەحمـــەدی هۆرێنیبەتایبـــەت (مامۆســـتا ســـەلاح هۆرینی)،کەخۆیشـــی یەکێـــك بووەلەوانـــەی کەلەهەمـــان کات و بۆنـــەدا ئامـــادەی هاتنەکـــەی عەبدولرەحـــمان بەزازبـــووە، بـــەزۆری نـــاوی بەشـــێك لەوکەســـانەمان بۆســـاغکرایەوە، کـــە لەوێنەکـــەدا دیـــارن و ناوەکانیـــان لـــەلای ڕاستەوەدەســـت پێـــدەکات، هیـــوادارم هەرخوێنـــەرو هـــەر کەســـێك، کەزانیـــاری زیاتـــری لایەســـەبارەت بـــەم وێنەیـــەو لەبـــارەی

ئەوکەسانەوە کەلەوێنەکەدا دیارن، با بۆمان بنووسێت و ئاگادارمان بکاتەوە لە دەست نیشانکردنیان، ئەوەش بۆخۆی خزمەتێکی گەورەیەبۆڕاستی وبۆمێژوو: وەك ئەوانەشی لەوێنەکەدا دیارن سەرەڕای عەبدولڕەحمان بەزاز سەرۆك وەزیرانی عێراق و مەلائەحمەدی هۆرینی ئەمانەن کە(یەکەم جارەبڵاودەبێتەوە)، لەڕاستەوە:شەوکەت عەبدولوەهاب، عەبدولرەحمان بەزاز سەرۆك وەزیران،حاجی رەشیدی حاجی فەرەج (پشتەوەی شەوکەت عەبدولوەهاب)،حاجی خەلیل حاجی ئیسماعیل،مەلائەحمەدی هۆرینی، حاجی شوکرداود، مەلامەعصومی نەقشبەندی ئیمام و خەتیبی مزگەوتی قزرەبات، منالی مەلامەعصوم پێم وابێ ناوی عومەر بووە،حاجی حسێن هادی، حاجی سەعدوڵلارەشید(عگاڵ بەسەر)،حاجی عەبدوڵلا حاجی جاسم (چاکەت وپانتۆڵ لەبەر)،جومعەخودادادی بازرگان،مەلاوەلی بانگخوێنی ئەوکاتەی مزگەوتی جەلەولا بووە[٢٢].

مزگەوتی گەورەی جەلەولا (ئەبوحەنیفە)، وەك لەبارەیەوەدەگوترێت لە کۆتایی چلەکانی سەدەی بیستەمی رابردوداو لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی پاشایەتیدا بونیادنراوەو لەساڵی(١٩٥٠)دا بەفەرمی بەرووی کۆمەڵانی خەڵکدا کراوەتەوە. بەڵام یەکەم مەلاووتاربێژی مزگەوت لەساڵانی (١٩٥٠-١٩٥٧)دا سەیدتاهیری بەرزنجی و دواتر شێخ عەبدولقادرع ەبدوڵلاعەبدولقادربووە، کەلەساڵانی(١٩٥٧-١٩٥٩)دا کراوەتەئیمام و وتاربێژی هەمان مزگەوت، واتە بەپێی ئەوخشتەونووسراوە هەڵواسراوەفەرمییەی نێو مزگەوتەکەبێت،کە سەبارەت بەماوەی خزمەت و ئیمامەتی مەلاکانی ئەومزگەوتەی جەلەولا رێکخراوە، مەلائەحمەدی هۆرینی ئەبێتەسێیەمین مەلای مزگەوتی گەورەی شارۆچکەکەو بەدوای ئەوانیشدا هەریەك لە : شێخ عەبدولقادری باجەلان (١٩٦٣-١٩٧٢)،شێخ ئەحمەدی باباڕەسول (١٩٧٢-١٩٧٥)، پاشان شێخ عەبدولخالق واتەئەبوزەهرەی میسری(١٩٧٥-١٩٧٦) دێن[٢٣]. بەجۆرێك مەلائەحمەدی هۆرێنی لەسەروبەندی خانەنشین بوونی بەدواوە، زیاتر لەماڵەوەسەرگەرمی خوێندنەوەو عیبادەت بووە، تائەوکاتەی لەشەوی جەژنی ڕەمەزانی (١٣٩٠ك)

بەرانبەر بە(٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٠)، هەر لەجەلەولا کۆچی دوایکردووەو لەوێش نێژراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی لەدوا بەجێهاوە، کە بەپێی گێڕانەوەی بنەماڵەکەی و هەروەها مامۆستا نەسرینی کچی زیاتر لە هەزار کتێبی جۆراوجۆرودەستنووسی ناوازەی تیابووە، کەبەزۆری کەوتوونەتە دەست بەشێك لەهاوەڵان و مەلای مزگەوتەکانی ناحیەی جەلەولا.

## تەوەری سێیەم:
## مەلائەحمەدی هۆرێنی و دامەزراندنی بزوتنەوەی ئاشتیخوازان لە ناوچەی شێروانە١٩٥٩ :

بەزۆری سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم بزوتنەوەیە لە عێراقدا دەگەڕێتەوەبۆساڵی (١٩٥٠)، بەڵام یەکەمین کۆنگرەی خۆی لەشاری بەغداو لەساڵی (١٩٥٤)دا گرێداوەو لەگەڵ ئەوەشدا چەندکەسایەتیەکی کوردی وەك : ئیبراهیم ئەحمەد، شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفید، محەمەدئەمین زەکی بەگی مێژوونووس و وەزیر، شاعیری ناسراو عەبدوڵڵا گۆران، لەگەڵ مامۆستا مەسعود محەمەدی کوڕی مەلای گەورەی کۆیەتیایدا بەشدار بوون، بەڵام کۆنگرەی دووەمی هەر لەشاری بەغدا، کەبەسەر پەرشتی عەبدولکەریم قاسم و لەژێر دروشمی(ئاشتی و پارێزگاری لەکۆمار -السلم وصيانةالجمهوريه)لەڕۆژانی (١٦-١٧ی نیسانی ١٩٥٩)دا، کارەکانی بەڕێوەچووە، بەجۆرێك لەم کۆنگرەیەدا کەسایەتیەکی ناسراوی چەپی وەك: عەزیزشەریف بە سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتمانی بۆ پشتیوانانی ئاشتی لەعێراق هەڵبژێردرایەوە، شانبەشانی ئەوەش دەستەیەك لەڕووناکبیرانی چەپ بوونەهاوکاری سەرەکی،هەروەها لە(٧ی کانوونی دووەمی ١٩٥٩)دا، عەزیز شەریف سەرۆکی ئەم بزوتنەوەیەتوانیویەتی ئیمتیازی بڵاوکراوەو گۆڤارێکی هەفتانەی سیاسی بەناوی نیشتمانەکەمان(وطننا)، وەك زمانحاڵ بۆئەم ڕێکخراوەتازەیەوەربگرێت، هەرچەندەدواتریش ناوەکەی گۆڕاوەبۆئاشتی(السلم)، هاوکات بەشێوازێکی فەرمی لەلایەن

عەبدولکەریم قاسم خۆیەوەڕێگا بەکارو چالاکی وەك بزوتنەوەیەکی جەماوەریی دراوە، بەوەی ئەم بزووتنەوەیەگرێدراوەبەبوون وکیانی هەموو هاوڵاتییەکی عێراقیەوە،هەروەها گرێدراویشەبەهەموو کەسێکی ئاشتیخوازەوەلەسەرتاسەری جیهان، ئیدی لێرەبەدواوەئەم بزوتنەوەجەماوەرییەلەعێراق و لەهەموو ناوچەجیاجیاکانی باشووری کوردستانیشدا، بەهەموو شارو شارۆچکەکانیەوە، دەتوانێت درێژەبەکارو چالاکی خۆی بدات، تەنانەت دەشتوانێت لق و لیژنەی تایبەت بەخۆی بکاتەوەو هەموو کەسایەتی و ڕەگەزێکی باش بەنێرو مێوەدوور لەهەموو ئینتماو بیروڕایەکی ئاینی، سیاسی و کۆمەڵایەتی لەدەوری چالاکی و ڕێکخستنەکانی خۆی کۆبکاتەوە، هەرچەندەزۆرێك لەکۆمەڵانی خەڵك لەوقۆناغەیەدا وای بۆ دەچوون، کەبزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی لە عێراق و باشووری کوردستان، زیاتر بریتیەلەباڵێکی حیزبی شیوعی عێراق، کەچی بەپێچەوانەوەئەم بزوتنەوەجەماوەرییەهەموو بیروڕاو بۆچوونێکی جیاوازی لەخۆ گرتبوو، هەروەها ساڵانێکی زۆریش بوو لە کاروچالاکی خۆیدا بەردەوام بوو، بەڕادەیەك یەکێك لەولیژنانەی، کەسەر بەبزوتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی لەسنووری گەرمیان و قەزای کفری و بەتایبەتی لە ناحیەی شێروانەی ئەوکاتەدا، کەهەر لەساڵی (١٩٥٩)دا کرابووەوە، بەسەریەکەوەدەستەیەکی هەشت کەسی بۆ هەڵبژێردراوە، بەسەرۆکایەتی : ئەحمەدی فەتاح ڕۆستەم (١٩٢٩-١٩٧٥)ی دانیشتووی کەلاری کۆنی ئەوکاتە، هەروەها ئەندامێتی چەند کەسێکی هاوکاری لەوانە : محەمەدسەعید بەگی کوڕی حمەبەگی جاف (١٩٢٥-١٩٩٦) ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق (١٩٢٨-١٩٣٠)، جوامێر عەبدولقادر،لەگەڵ کەسێکی هەڵبجەیی بەناوی عەبدولکەریم مارف کەریم محەمەد (١٩٣٢-٢٠٠٥)کەلەوماوەیەدا خێزانەکەی خەڵکی کەلاربووە، هاوکات خۆیشی لەکارگەیەکی نزیك گوندی گردەگۆزینەی سەربەکەلاری ئێستا کاری کردووە، بەوهۆیەشەوە، بەزۆری سەردانی ناوچەی شێروانەو کەلاری کردووە، سەرەڕای کەسێکی وەك فەتاح عەزیز سەیدمراد (١٩٤٣-

١٩٨٤)، كەماوەیەك فەرمانبەری بەریدوتەلەفۆنات و دواتریش لە حەفتاكانی سەدەی بیستەمی رابردوودا بووە بەفەرمانبەری ناوەندی دابەشكردنی قوتابخانەكان، لەگەڵ عەلی سەلیم بەگ (١٩١٨-١٩٨٩)، كە لەساڵانی پێشووتردا ماوەیەك لە حیزبی هیواو دواتریش لەریزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان باڵی(جەلالی) دا كاری كردوە، جگەلەئیمام و وتاربێژی مزگەوتی كەلاری كۆن واتەمەلائەحمەد عەبدولعەزیزی هۆرینی، لەگەڵ شێخ رەشید شێخ حەسەن(١٩٢٧-٢٠٠١) كەبەرەسەن خەڵكی گوندی بەڵخەی ناوچەی قەرەداغی دانیشتووی كەلاربووە[٢٤].بەرادەیەك كەسێكی وەك مەلائەحمەد عەبدولعەزیزی هۆرینی ئیمام و وتاربێژی مزگەوتی كەلار كاتێك شۆرشی(١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) لە عێراقدا سەرچاوەدەگرێت، ئیدی كاری رێكخراوەیی وچالاكی كۆمەڵانی خەڵكیش دژ بەسیستمی پاشایەتی بەشێوازێكی چروپر دەستی پێكردوە، ئەویش یەكێك بووەلەوانەی،كەلەكەلاری كۆنی ئەودەماندا ناوبەناو لەوجۆرەچالاكیانەدا بەشداریی كردووە، بۆنموونە: جارێكیان لەگەڵ هەریەك لەشێخ عەتای كوری شێخ جەمالی تاڵەبانی (١٩٢٥-٢٠٠٠) و حسین عەلی محەمەد ئەلبەیاتی بەرێوەبەری قوتابخانەی كەلاری سەرەتا یی(١٩٥٦/٩/٢٤-١٩٥٨/٩/١٥)، كە هەردووكیان پێكەوە،دووكادیری چالاكی ئەوكاتەی حیزبی شیوعی عێراقی ناوچەی گەرمیان و سنووری قەزای كفری بوون. لە كەلاری ئەودەمانەیدا بەخوێندنەوەی وتارو لەخۆپیشاندانی جەماوەرییدا بەشداری هەبووە، ئەمەش لەكاتێكدابوو،كەهێشتا بنەماڵەو بەگزادە كانی جاف لەگەرمیان و كەلاردا مابوون و ناوچەكەیان بەجێ نەهێشتبوو[٢٥]. هەروەها بەماوەیەك دواتر، وەك چالاكی رێكخراوەیی و خۆناساندنیان لەناوچەی شێروانەی سنووری گەرمیاندا،لیژنەی شێروانەی پشتیوانانی ئاشتی بەیاننامەیەكی نووسراویان وەك (لیژنەو رێكخراوی ئاشتیخوازانی شێروانە)بلاوكردۆتەوە،بەلام لێرەش بەدواوەدووكەسی تری ناوچەكەشیان هاتۆتەپاڵ و بەم جۆرەژمارەیان وەك ئەندام و چالاكی كاری رێكخراوەیی بوون بە(١٠) كەس لەكەلارو لە ناوچەكەدا، كەئەوانیش هەریەك

لـە: محەمەدسـالّح عەزیـز سـەیدمراد (١٩١٢-١٩٨٧)، بـرای فەتـاح عەزیـزی سـەیدمرادی کـەلارو لەسـاڵانی دواتریشـدا بۆماوەیـەك موختـاری کـەلاری کـۆن بووەلەگـەڵ خوێندکارێکـی قۆناغـی ئامادەیـی (خانەقـی)، کەئەویـش حەسـەن کەریـم جـاف(١٩٤٣) بـووە، کـەوەك نوێنـەری یەکێتـی قوتابیانـی کوردسـتانی سـەربەپارتی دیموکراتـی کوردسـتان واتەدکتۆرحەسـەن کەریـم بەگـی جافـی ئێسـتا، کەئەویـش لێـرە بەدواوە،بووەبەیەکێـك لەئەندامانـی نوێـی (لیژنـەی ئاشـتیخوازانی ناوچـەی شـێروانە) لەسـنووری گەرمیـان.

وەك پێشـتریش باسـی لێوەکـرا، یەکەمیـن چالاکـی وەڵوێسـت وکاری ڕێکخراوەییـان بەنـاوی( لیژنـەی ئاشـتیخوازانی ناوچـەی شـێروانە)، ڕەنگەئـەو هەنگاوەیـان بووبێـت، بەتایبەتـی وەك نووسـین و دیکۆمێنتێکـی نـووسراو کـە ئەویـش پێکهاتووەلەبڵاوکردنـەوەو ڕاگەیاندنـی بەیاننامەیەکـی نـووسراوی گرنـگ، کەبۆئەوکاتـەی ناوچـەی گەرمیـان و سـنووری ناحیـەی شـێروانەی سـەربەقەزای کفـری لەگۆڕەپانـی سیاسـی عێـراق و ناوچەکوردنشـینەکانی باشـووری کوردسـتان، بەبۆچـوون و لێکدانـەوەی ئێمەبۆئەوهەلومەرجەکۆمەڵایەتییـەی گەرمیـان وناوچـەی شـێروانەبابەتێکی نـوێ و سـەرنج ڕاکێـش بـووە، چونکەبەڕاسـتی لەناوچـەو شـوێنێکی دوورەدەسـتی وەك کەلاروشـێروانەی ئەوکاتەدا،کەناوچەیەکـی تاڕادەیـەك پەراوێـز کەوتـووی دوورە دەسـتبوون لە ناوەنـدی شـارودامودەزگای حکومـی وناوەنـدی کاری ڕێکخراوەییـەوە، هـەر بۆیەهەنگاوێکـی زۆر دڵخۆشـکەربووە، بـەڵام وەکترکارێکـی لەوبابەتەبـەزۆری دووکەسـایەتی خوێنـدەوارو ڕووناکبیریـی نـاسراوی ئەودەمانـەی لەپشـتەوەبووە، کەئەوانیـش بەلێکدانـەوەی ئێمەهەریـەك لـە : محەمـەد سـەعید بەگـی جـاف و مەلائەحمـەد هۆرینـی ئیـمام وتاربێـژی مزگەوتـی کـەلار بوون،بەتایبەتـی ڕووناکبیرێکـی وەك محەمـەد سـەعید بـەگ، کەلەوکاتـەداو بەشـایەتی زۆرێـك لـە کەسـایەتی و کۆمەڵانـی خەڵکـی ناوچەکەنووسـەرو زمانـزان و ڕووناکبیرێکـی دیـاری کوردبووەلەباشـووری کوردسـتاندا، وەك دەشـگوترێت لەودەمانـەو بگرەلەسـاڵانی پێشتریشـەوە، خاوەنـی

کتێبخانەیەکی زۆردەوڵەمەندو بەردەوام نووسین و بابەتی جۆراوجۆرو کاری وەرگێڕانی خۆی لەگۆڤاری بەناوبانگی :گەلاوێژ،دەنگی گێتی تازە، هیوا،هەتاو، روناهی،برایەتی، لەساڵانی دواتریشدا ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی برایەتی بووەلەشاری بەغدا و هاوکات جێی سەرنجی زۆرێك لە خوێنەران و دەستەی ڕووناکبیری کوردی بوون، جگەلەوەش ئەو وەك نووسەرو وەك کەسایەتیەك لەنێوخانەوادەو بەگزادەکانی جافی کەلارو ناوەندی ڕووناکبیریی کوردی دا خاوەنی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی و بیروڕایەکی چەپ و تاڕادەیەك لە ڕێکخستنەکانی نێو حیزبی شیوعی عێراقییەوەنزیك بووەوبەردەوامی هاتووچۆی شاری بەغداو ماوەیەکیش حەمەبەگی جافی باوکی وەك پێشترئاماژەی بۆکرا، وەك داکۆکی کارێکی دیاری مەسەلەی کورد بووە،لەنێو پەرلەمانی عێراق و پاشان داود بەگی جافی (١٩٠٥-١٩٦٦) مامی بەهەمانشێوەهەرئەندامێکی کارای نێوئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی سەردەمی پاشایەتی بوون، بەجۆرێك کەسێکی وەك داود بەگی جاف هەرلەساڵی (١٩٣٦) وەتاکاتی بەرپابوونی شۆڕش(کودەتا)ی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) بەسەر یەکەوەلەنۆخولی پەرلەمانی عێراقیدا، بووە بەنوێنەری لیوای کەرکووك (کفری) لەئەنجوومەنی نوێنەرانی سەردەمی پاشایەتیدا[٢٦].

وەك دەبینی لەرۆژگارێکیشدا محەمەد سەعید بەگ ئەودەقی نووسین و چیرۆکی نووسەرانی ئەوتۆی جیهانی بەتایبەتی لەزمانی فارسییەوەوەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لەزۆرێك لە گۆڤارو ڕۆژنامەکوردیەکانی ئەودەمانەدا بڵاوی کردونەتەوە، کەبۆئەوکاتەو ئەوهەلومەرجەی کوردستان وئێستاشی لەگەڵدا بێت، هەنگاونانێکی گەورەی بێ وێنەبوون بەئاراستەیەکی ڕووناکبیریی گەشەکردووی دەوڵەمەندا، جابۆیەزۆردڵنیام لەوەی کەدەقی ئەم نووسین وبەننامەیەی کە لێرەداو لەناوەرۆك و وردەکارییەکانی دەدوێم ولەسەر چەندخاڵێکی گرنگی دەوەستم و دواتریش دەقەکەی بەتەواوی و وەك خۆی بڵاودەکەمەوەو دەیهێنمەوەسەر ڕێنووسی نوێ، هیچ گومانێکی

تێدانیە، کەلەنووسینی هەریەك لەمحەمەد سەعید بەگی جاف و مەلا ئەحمەدی هۆرینی بووە،هاوکات هەرلەڕێگای ئەوانیشەوە گەیەندراوەتە گۆڤاری (هەتاو) وشوێنانی دی بەمەبەستی بڵاوکردنەوە،کە مامۆستا گیوی موکریانی (١٩٠٤-١٩٧٧)، لەساڵانی(١٩٥٤-١٩٦٠)دا،لەشاری هەولێر بڵاویکردۆتەوە، هەروەها لەخوارەوەی نووسین وبەیاننامەکەشیانەوەوەك پێشتر دەست نیشانکرا، چەند کەسێکی تری ناوچەکەلەسنووری ناحیەی شێروانەو کەلاری کۆنی ئەودەمانەدا ناوی تەواویان و پیشەی ڕۆژانەیان زۆربەڕوونی دەست نیشانکراوە، سەرەڕای هاتنی ناوی لاوێکی خوێندکاری نێو بەگزادەکانی وەك: حەسەنی کەریم بەگی جاف کەلەوماوەیەدا، وەك خۆی باسی لێوەدەکات،کەلەودەمانەدا خوێندکاری قۆناغی چوارەمی ئامادەیی(بەشی وێژەیی) دواناوەندی شاری خانەقی بووە، وەك (نوێنەری یەکێتی قوتابیانی کوردستان) ناوی لەڕیزی واژۆکەرانی نووسین وبەننامەکەی لیژنەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانەدا هاتووە[٢٧].

ئەوەی شایانی وەبیرهێنانەوەیە، دەقی نووسینی بەننامەکەیان بەناونیشانی :( بانگی ئاشتی بۆ دانیشتوانی ناوچەی شێروانە)، بڵاوکراوەتەوە، شانبەشانی ئەوەش بەکوردییەکی جوان و پاراو نووسراوەتەوە، هەروەك ئاماژەی بۆکرا ناوەرۆکی نووسینەکەکۆمەڵێك لێکدانەوەو باری سەرنجی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئاشتەوایی جیهانی بەڕوونی تیا بەرجەستەکراوەو کۆمەڵانی خەڵکی عێراق و باشووری کوردستان و تەنانەت ناوچەکەشی لێ بەئاگا هێنراوەتەوە، تائەوکاتەی لەڕێگای ناوەندەکانی ڕاگەیاندن و بەتایبەتی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی وەك : ژین و گۆڤاری هەتاوو ناوبەناو لەڕۆژنامەی (خەبات) ی زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستاندا بڵاوکراونەتەوە، ماوەتەوەبڵێین بەئەنجامدان و بڵاوکردنەوەی کارێکی لەم بابەتەش ئەوا (لیژنەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە)، خۆناسین وسنوور بەزاندنێکی زیاترو بەرفراوانتری بەخۆیەوەبینیوە، وەك ئەوەی بەبۆچوونێکی بەرفراوانی ئاشتی خوازانەوەداوایان

لەتەواوی مرۆڤایەتی ومیللەتانی جیهان کردووە، بۆئەوەی ئاشتی و ئاسایش لەهەموو شوێن و جێگایەکی جیهاندا بەرقەراربێت وسێبەری ئاشتی باڵ بەسەرتەواوی وڵات و مرۆڤایەتیدا بکێشێت، واتەئاشتی و بەرقەرارییەك، کەلەسایەی دیموکراتیەت و کۆماری نوێ و سیستمی نوێی کۆماریی کەلەسایەی دەستەڵاتی عەبدولکەریم قاسمدا هاتۆتەدی، بەجۆرێك دەستگرتن و بە تەنگەوە چوونی ئەمانەوەئاستی زاستی و خوێندەواری لەوڵاتەکەماندا پێش دەکەوێت و لە رووی کشتوکاڵکردن وسامانی پیشەسازییەوەزیاترئەچێتەڕیزی وڵاتەپێشکەوتووەکانی دونیاوە، وەك لەم بارەیەوەو لەبەشێکی بەیاننامەکەیاندا هاتووە: «بۆئەوکەسانەی پڕبەدڵ حەز لەئاشتی و برایەتی ئەکەن بۆئەوانەی بەرامبەر بە شەڕ هەڵگیرسێنەرەکان ڕق هەڵسان و بێزاری خۆیان دەرئەبڕن بە دەنگی بەرز بانگیان ئەکەین هەوڵبدەن و تێ بکۆشن بۆئاشتی چونکەبەهەوای سەرکەوتنی ئاشتییەوەلە جیهاندا جمهوریتەدیموکراتیەکەمان لە دەست دوژمنانی سەربەستی بۆ ئەپارێزێت وپلەی زانست و خوێندەواریمان بەرزئەبێتەوەو نیشتمانی خۆشەویستمان لەکشتوکاڵ کردن وپیشەسازیدا ئەچێتەڕیزی وڵاتەپێشکەوتووە کانی جیهان» ەوە[٢٨].لەلایەکی ترەوە، بەشێکی تری ناوەڕۆکی بەیاننامەکەڕووبەڕووی ئەوسیاسەتی هاوپەیمانییەی بەغدای سەردەمی پاشایەتی ئەبێتەوە، کە لە ساڵی (١٩٥٥)داو لەکاتی دوازدەیەمین حکومەتی نوری سەعید (٣ی ئابی ١٩٥٤- ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٥)دا هاتۆتەکایەوە، بەبەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨)و کۆتاییهێنانی دەستەڵاتی پاشایەتی و سەرهەڵدانی سیستمی کۆماری و دەستەڵات گرتنەدەستی عەبدولکەریم قاسم، هەروەها لە(٢٤ی ئازاری ١٩٥٩)دا، بەپێی بڕیارێکی فەرمی حکومەتی عێراق لە ئەندامێتی هاوپەیمانی ناوبراو کشاوەتەوەو بەیەکجاری بارەگا سەرەکیەکەشی لەشاری بەغدا داخستووە[٢٩]. کەتائەوکاتەش ئەمان و فەرمانڕەوایانی نوێی کۆماری عێراق بەمەترسییەکی زۆر گەورەیان زانیووەبۆسەر ئەمنیەت و ئاسایشی جیهانی، ئەوەشی کەسوودمەندی سەرەکی بووەلەم هاوکێشیەو لەم

هاوپەیمانیەدا، سەرەڕای ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەو وڵاتەناوچەییانەی تری وەك تورکیاو ئێرانی شاهنشاهی بوون، کەبەردەوام بوون لە سەرکوتکردنی کوردو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لەهەموو بەشەکانی کوردستانی دابەشکراودا، هاوکات لەلایەکی تریشەوەدەنگی خۆیان خستۆتەپاڵ دەنگی ئەو وڵات و میللەتانەی، کەتائەوکاتەش لەخەبات و تێکۆشانانی بێ وچانابوون بۆ سەربەخۆیی و ڕزگاربوون لە کۆت وبەندی وڵاتانی داگیرکەر لەوانە : خەباتی گەلی جەزائیری لە داگیرکەریکی چەند ساڵەی وەك فەرەنسا یان میللەتانی عەمان و تایوان وەك ئەوەی لە درێژەو دەقی بەیاننامەکەیاندا ئاماژەیان بۆکردوە، جابۆیەبەڕۆحیەتێکی برایەتی و یەکسانییەوە، ئەمان داوایان کردووەو نووسیویانە:«پێویستەهەوڵ بدەین دەستی ئاشتی و برایەتی بۆهەموو گەلێکی ئاشتیخوازی جیهان درێژ بکەین و هەمووکاتێك بەهەموو هێزێکمانەوەبەرهەڵستی بکەین بۆئەوەی هێزی ئاشتیخوازان لە جیهاندا سەربکەوێت و بازرگانەدڕندەکانی شەڕ نابووت بکرێن»[٣٠]. لایەنێکی گرنگی تری ئەم نووسین و بەیاننامەیەی «لیژنەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە» لەسنووری گەرمیان، لەوەدایەکۆمەڵێك کەسایەتی ئەوتۆی لەپشتەوەبووە،کەبەزۆری ئاراستەو بۆچوونی فەرهەنگی و کۆمەلایەتی و سیاسی جیاوازو جۆراوجۆریان هەبووە، لەهەموو چین و توێژێکی کۆمەلایەتی ئەودەمانەی کەلارو ناوچەی شێروانە بوون، هەر لە جووتیار،کرێکار،خاوەن موڵك وزەویدار،مەلای مزگەوت، فەرمانبەر،خوێندکاری قوتابخانەونوێنەری ڕێکخراوی حیزبی، وەك ئەوەی بەوردی ناوەکانیان لەکۆتایی دەقی نووسین وبەیاننامەکەدا هاتووەو بەزۆری خاوەنی بیرورای جیاوازی نێوکۆمەلانی خەڵکی گەرمیان و کەلاری ئەوکاتەبوون.

ئەمەی خوارەوەش دەقی نووسینەکەیەو وەك خۆی و بۆسوودی گشتی و لێکدانەوەی زیاتربڵاوی دەکەینەوە.

## بانگی ئاشتی بۆ دانیشتوانی ناوچەی شێروانە

بۆسەربەستەبەشەرەفەکان، بۆژنان و پیاوانی ئازاد، بۆڕیش سپی و منالان بۆ ئەوکەسانەی پڕبەدڵ حەز لەئاشتی و برایەتی ئەکەن بۆئەوانەی بەرامبەر بەشەڕ هەڵگیرسێنەرەکان ڕق هەڵسان و بێزاری خۆیان دەرئەبڕن بەدەنگی بەرز بانگیان ئەکەین هەوڵبدەن و تێ بکۆشن بۆ ئاشتی چونکی بەهەوای سەرکەوتنی ئاشتییەوەلەجیهاندا جمهوریتەدیموکراتیەکەمان لەدەست دوژمنانی سەربەستی بۆ ئەپارێزێت و پلەی زانست و خوێندەواریمان بەرزئەبێتەوە، نیشتمانی خۆشەویستمان لەکشتوکاڵ کردن وپیشەسازیدا ئەچێتەریزی وڵاتەپێشکەوتووەکانی جیهان، کەوابوو پێویستەلەسەرمان بەهەموو توانایەکمانەوەلە ڕێگای ئاشتیدا هەوڵ بدەیت هەر لەبەر هەستی ئاشتی پڕ بەدڵ رق هەڵسان وە بێزاری ئاشکرا ئەکەین بەرامبەر ئەوپەیمانەعەسکەرییانەی ئەمریکا کەئەیەوێت لەگەڵ تورکیاو ئێران و پاکستاندا بی بەستێت چونکی بەستنی ئەوپ ەیمانەعەسکەرییانەدوژمنایەتیەکی زۆر گەورەیەبەرامبەر بەگەلەکانی جیهان بەتایبەتی بۆ میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بازرگانانی شەڕ ئەیانەوێت دراوسێکانمان بکەن بەبنکەی شەڕوجێگای دەست درێژکردن بۆتێکدانی ئاشتی و ئاسایشی جیهان،هەروەها ئەیانەوێت بەعەسکەری و ئابووری ئابڵۆقەی جمهوریەکەمان بدەن و دراوسێکانمان بکەن بەجێگای هەڕەشەو کەڵەکردن وهەوڵ ئەدەن لەهەمولایەکی جیهاندا ئاگری شەڕێکی کاولکەر هەڵگیرسێنن وەکو هەتاوەکو ئێستا لەجەزائیرو عەمان وتایوان خوێنی هەزاران بێتاوانیان بەگوناهی داوای سەربەستی ڕشتوە،وەئەیانەوێت لەچوار گۆشەی گێتی دا بنکەی بۆمبای ئەتۆم وساروخ دابنێن و بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاست بکەنەجێگای شەڕوپیلانەگڵاوەکانیان ئەی خوشك و برا خۆشەویستەکانمان بۆئەوەی نیشتمانی جوانمان لەدەست فڕوفێڵی پیلانگێڕەکان و بازرگانانی شەڕ بپارێزین پێویستەهەوڵ بدەین دەستی ئاشتی و برایەتی بۆهەموو گەلێکی ئاشتیخوازی جیهان درێژبکەین، وەهەمووکاتێك بەهەموو هێزێکمانەوەبەرهەڵستی بکەین بۆ ئەوەی هێزی ئاشتیخوازان لەجیهاندا سەربکەوێت و بازرگانەدڕندەکانی شەڕ نابووت بکرێن، پێویستەهەمووکاتێ هاوار بکەین، بەدەنگی بەرزبڵێین بژی ئاشتی لەبەینی میللەتانی جیهاندا، بژی پشتیوانی ئاشتیخواهان کاك عەبدولکەریم قاسمی خۆشەویست و مردن بۆشەڕ فرۆش و شەڕهەڵگیرسێنەرەکان.

لەلایەن کۆمەڵی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە

1 ئەحمەد فەتاح ڕۆستەم — جوتیار
2 محەمەد سەعیدبەگی جاف — خاوەن زەوی
3 جوامێر عەبدولقادر — جوتیار
4 عەبدولکەریم مەعروف — کرێکار
5 ڕەشید شێخ حەسەن — کرێکار
6 عەلی سەلیم جاف — جوتیار
7 مەلا ئەحمەد هۆرینی — مەلای مزگەوتی کەلار
8 محەمەدساڵح عەزیز — جوتیار
9 فەتاح عەزیز — تەلەفۆنەوان
10 حەسەن عەبدولکەریمی جاف (ئەندامی یەکێتی قوتابیان)[31].

## سەرچاوەو پەراوێزەکانی ئەم تۆژینەوەیە:

ذنون یونس حسین الطائی، الاوضاع الاداریةفی الموصل ١٩٢١- ١٩٥٨، رسالة (دکتوراه) غیرمنشورة، کلیة الاداب جامعة الموصل،(الموصل:١٩٩٨)،ص ١٠٧.

خێزانی مەلامحەمەدی جوانڕۆیی کەناوی (تەیبەخان)بووە، دەبێتەکچی شێخ ئەحمەدی شێخ ئەمینی شێخ قادری قەرەداغی، کەبەڕەسەن دانیشتووی گوندی بەڵخەی قەرەداغ بوون و دواتر هاتوونەتەکەلارو لێرەنیشتەجێبوون. بڕوانە: ئەحمەد باوەڕ، باشووری کوردستان لەبەررۆشنایی دەستنووس ویاداشتەکانی مەلامحەمەدی جوانڕۆیی دا ١٨٦٨-١٩٣٨، (تاران: ٢٠١٧)،ل ٢٠٥.

محەمەد عەلی قەرەداغی، ئەلبومی کەشکۆڵ،ب١،(هەولێر:٢٠٠٨)،ل ١٧٨- ١٧٩.

بەپێی گێڕانەوەی مامۆستا عەلی کوڕی مەلا ئەحمەدی دەککە(١٩٣٧) باوکی دووجار لەکەلار ژیانی هاوسەری پێکەوەناوەیەکەمیان ناوی : ئامینەی کچی حسین عەلی زەلام،کە لەهۆزی پالانی بووەو دوومنداڵی لێ هەبووەبەناوەکانی : محەمەد سدیق، کەبەپێی دەستنووسێکی مەلا ئەحمەد خۆی نووسیویەتی تولد فرزندی محمد صدیق لەشەوی جمعه(٥ی جمادی الاولی ١٣٣٤) دواتر بەمەلا سدیق ناسراوبووەو لەساڵی (٢٠٠٢)دا لە خانەقین کۆچی دوایی کردووە، هەروەها کچێکیشی هەبووە، بەناوی (فاتمە)، کەهەربەمنداڵی کۆچی دوایی کردووە، بەڵام هاوسەری دووەمی ناوی : ڕەعنا خانمی کچی شێخ محەمەدی هەنجیران بووەودەبێتەخوشکی شێخ بابا عەلی (بێدار)ی شاعیری بەناوبانگی گەرمیان، کە لە(گۆڤاری گەلاوێژ) دا شیعری بڵاوکراوەی هەیەو دواتریش بەشێک لەشیعرەکانی لەنامیلکەیەکدا کۆکراونەتەوە. بەجۆرێک لەم ژنەی، یەکەمین منداڵی کچێکەبەناوی عەتیەو لەبارەیەوەنووسیویەتی تولدی فرزندی عطیەلە شەوی یەک شەنبە(٣ی ذی لحجە)،هەروەها لەبارەی لەدایک بوونی کوڕەکانی تریەوەنووسیویەتی تولدی فرزندی عبداللە ( ٢٠ی شعبانی

١٣٤٤)، تولدی فرزندی محمد لەشەوی (٢٥ی شعبانی ١٣٥١)، تولد فرزندی محمد علی لەشەوی دووشەنبە(١١ی جمادی الاولی ١٣٥٦).دەستنوسێکی مەلا ئەحمەدی دەککە؛دیدەنی لەگەڵ مامۆستا عەلی مەلا ئەحمەدی دەککە، خانەقین (١٥ی شوباتی ٢٠٢١).

بڕوانە: ئەحمەد باوەڕ، چەند نامەیەکی بڵاونەکراوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس بۆمەلا سەید عەبدوڵڵای سەید ئەمینی موکریانی ١٩٠٥-١٩٨٦، شیکار(گۆڤار)، ژمارە(٢٢)، بەهاری ٢٠١٨، ل ١٩١- ٢٠٧.

عەبدوڵڵا بەگی کەیخەسرەوبەگ: لەنەوەی مەحموود پاشای جافەو تەنها یەک برای هەبووەبەناوی حمە ئەمین بەگەوە، بەڵام عەبدوڵڵا بەگ لەساڵی (١٨٩٠)دا هاتۆتەدونیاوە، دوای مردنی کەیخەسرەوبەگی باوکی کاروباری ناوچەی قزرەباتی گرتووتە ئەستۆ، خێزانەکەی ناوی (فاتمەخان)ەو دەبێتەکچی فەتاح بەگی حمەپاشای جاف، بەڵام هیچ منالێکی لێ نەبووە، لەژنی دووەمی کە(سەلمەخانی کچی حسین بەگی مەحمووپاشا) بووەتەنها یەک کچی لێ بووەبە ناوی : (ئامینە) کەدواتر بووەبەخێزانی حەسەن بەگی عەلی بەگی مەحموود پاشای جاف، بەڵام لەژنی سێیەمی کەناوی (نوریەخانی کچی حسێن بەگی ئەحمەدبەگی کەرە)ی خەڵکی سلێمانی بووە، تەنها کچێکی لێی هەبووەبەناوی (حەسیبە) و دواتر بووەبەخێزانی عەلی بەگی کوڕی ڕەزابەگی جاف و بەزۆری لەناوچەی قزرەبات ژیاوەو لەساڵی (١٩٤٤)دا، هەرلەوێ کۆچی دوایی کردوەو لەمزگەوتی مەحموودپاشای جاف نێژراوە.

خەسرەوجاف، مێژووی مزگەوت ومنارەو میحراب و مینبەرو مەزار،(هەولێر: ٢٠٢٠)،ل ٨٧.

مەلا سەعیدی کوڵەجۆ: دەبێتەکوڕی مەلامحەمەدی کوڕی مەلا عەبدولرەحمانی زەند، لەساڵی (١٨٨٩)دا هاتۆتەدونیاوە، بەمەستی خوێندن زۆر ناوچەی کوردستان گەڕاوە، ماوەیەکیش لای مەلاسەعیدی موفتی کفری (١٨٥٨-١٩٤١) خوێندوویەتی و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، هەروەها بەپێی فەرمانێکی بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی کەرکووک وبەهەوڵی داود بەگی جاف کەئەوکاتەنوێنەری لیوای کەرکوک (کفری) بووەلەئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقدا لەساڵی (١٩٤٧) دا وەک ئیمام وخەتیبی مزگەوتی کوڵەجۆ دامەزراوە، ماوەیەکیش لەچەند شوێنێکی وەک: هەفتەغار، زەرداوی ژووروی سەربەشاری کفری

و ماوەیەکیش لەمزگەوتی مەحموود پاشای جاف بووەلەشارۆچکەی قزرەبات، ئەوەی شایانی باسەمەلا سەعیدی کۆڵەجۆ لەژیانیدا چوارجار ژیانی هاوسەرگیری پێکەوەناوە، یەکەم خێزانی ناوی مەحبوبەمەمەش بووە،تەنها مەلا عەلی (١٩٢٤-١٩٨٢/٢/٢٣)لێ بووە،خێزانی دووەمی ناوی نارنج بووە،تەنها یەک کوڕی لێ هەبووەبەناوی عەبدولرەحمان،سێیەمیان ناوی(ئامینەساڵح) بووە، بەهەمان شێوەتەنها کوڕێکی لێ هەبووەبەناوی عەبدولوەهابەوەو چوارەمیشیان ئایشەئیبراهیم کوڕێکی لێ هەبووە بەناوی عەبدولکەریمەوە،خۆیشی لە(٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٢)دا کۆچی دوایکردووەولەگۆڕستانی (تەپەی کەلان) لەناوچەی زەنگاباد نێژراوەو دواتریش کوڕەکەی(مەلاعەلی) جێگای گرتوتەوە، دەستنوسێکی فەتحوڵڵای مەلاعەلی کوڕەزای؛عبدالکریم محمد المدرس،علماؤنا فی خدمەالعلم والدین،عنی بنشرە:محمد علی القرداغی، (بغداد:١٩٨٣)، ص٢٢٧؛مەلاجەمیلی رۆژبەیانی، بەیان (گۆڤار)،ژمارە(١٦٩)، ساڵی(١٩٩٢)،ل ١١.

مستەفا سەعید،مزگەوتی کەلارلەبەڵگەنامەیەکی ساڵی ١٩٤٧ دا،یادی کەلا،بڵاوکراوەیەکی تایبەتەبەساڵیادی رۆژی کەلار،ژمارە(٣)، شوباتی ٢٠١٩، ل١٤٩-١٥٢.

عەبدوڵڵا قەرەداغی،نەوەکانی سەید ئیبراهیمی بەرزنجی،شێخانی شاکەل ١٧٨٤-٢٠١٨،(کەرکوک:٢٠١٨)،ل ٥٣-٥٤.

مستەفا نەریمان،شاعیرانی کفری و دەوروپشتی،دەزگای رۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی،(بەغدا:)، ل

وەک خوالێخۆشبوو حاجی مەحموودی محێدینی کەلار دەیگێڕایەوە: خاتووزێبای کچی شێخ عەبدوڵڵای قەڵاتەپزان کەخێزانی شێخ مەحموودی شاکەل بوو،وەک ژنێکی خواناسی قسەرۆیشتووی ئەوکاتەی کەلاروریزلێگیراوی نێوبەگزادەکانی جاف، بەدەنگێکی بەرز بانگی لەخوالێخۆشبوو داود بەگی جاف کردووەو وەک پێشبینیەکی پێشوەخت پێی وتووە: داود..داود نەکەن مەلامستەفا دەربکەن، چونکەدەرکردنی مەلامستەفا چارەنووسێکی خراپی بەدواوەدەبێت ورەنگەدوای ماوەیەک ئێوەش هەمان چارەنووستان هەبێت.

قیدی قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی ساڵانی :١٩٥٤-١٩٥٥، ١٩٥٥-١٩٥٦، ١٩٥٦-١٩٥٧، ١٩٥٧-١٩٥٨.

دیدەنی لەگەڵ مامۆستا ساڵح حاجی مەحموود ئەڵماس،کەلار(تەمووزی ٢٠٢٠)؛ هەروەها مامۆستا سەلاحی مەلائەحمەدی هۆرینی (١٩٤٠)، دهۆک،(تەمووزی ٢٠٢٠).

دیدەنی لەگەڵ مامۆستا سەلاح مەلائەحمەدی هۆرینی،(تەمووزی ٢٠٢٠).

دیدەنی لەگەڵ مامۆستا محەمەدی کوڕی مەحموودی ڕەزا بەگی جاف (١٥ی تەمووزی ٢٠٢٠).

خاک وخون (روزنامه)،فقدان یک شخصیت بزرگ کرد،شماره(٨٧)،سال دوم،خردادماه،١٣٤٥.

ئایەتوڵلاخلخالی : لەساڵی (١٩٢٩)لەگیوی سەربەخڵخاڵ هاتۆتەدونیاوەودەستی بەخوێندن کردوە، دواتریش لە ئەردەبیل درێژەی بەخوێندن داوە، پاشان لەسەرراسپاردەی باوکی چۆتە(قوم) لەوێش کتێبەکانی سیوتی و موتەوەل و موغنی خوێندوەومستەفا خومەینی ناسیوەلەسەردەستی مامۆستایانی وەک : عەباسی نەجەفئابادی،شێخ عەلی پەناە ئیشتهاردی، عەبدولجەوادی ئەسفەهانی وخومەینی درێژەی بەخوێندن داوە، لەرێگای خومەینیشەوەدەستی داوەتەکاری سیاسی و بەوهۆیەشەوەماوەیەک کەوتۆتەزیندانەوە، لەبەرپابوونی شۆڕشی ئیسلامی بەدواوە، بەفەرمانی خومەینی داگایکردنی بەرپرسانی سیستمی شاهنشاهی پێ سپێردراوە، دواتریش وەک نوێنەری قوم وتاران ئەندامی ئەنجومەنی شورای میللی و شارەزایان بوەو کۆمەڵێک دانراوی جۆراوجۆری هەیەو لەلایەن ولاتانی ئەورووپاو ئەمەریکاوەنازناوی ئایشمانی Eichman (١٩٠٦-١٩٦٢)پێدراوە، لە(٢٠٠٣)داکۆچی دوایکردوە.: ایام انزوا،ایت الله حاج صادق خلخالی،خاطرات،جلد١،چ٣،(تهران:١٣٨٠)،ص ٩-١٠.

کیهان(روزنامه)،سالارجاف أزدستگیری تااعدام،شماره(١٠٦٥٣)دوشنبه ١٤ اسفندماه ١٣٥٧- ٦ربیع الثانی ١٣٩٩،ص١-٢.

دیدەنی لەگەڵ دکتۆرحەسەن کەریم بەگی جاف، کەلار،(١٤ی تەمووزی ١٩٥٨).

دیدەنی لەگەڵ مامۆستا سەلاحی مەلائەحمەد هۆرینی،کەلار،(تەمووزی ٢٠٢٠).

وێنەیەکی مێژوویی عەبدولڕەحمان بەزازو مەلائەحمەدی هۆرینی وکۆمەڵێک لەدانیشتوانی شارۆچکەی جەلەولا، کە لە کۆتاییەکانی حوزەیرانی (١٩٦٦)دا گیراوەو بەسوپاسەوەلەئەرشیفی بنەماڵەی مەلائەحمەدی هۆرینیەوەبۆ توێژەری ئەم نووسینەنێردراوە.

خشتەیەکی فەرمی تۆمارکراو سەبارەت بەساڵ و خزمەتی مەلاکانی مزگەوتی گەورەی شارۆچکەی جەلەولا لەماوەی ساڵانی(١٩٥٨-٢٠٠٩).

ڕۆژنامەی (ژین)،ژمارە(١٤٤٨)، ١٩٥٩/٥/٢٥.

دیدەنی لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد شاکەلی (١٩٤٨)،کەلار،(١٧ی نیسانی ٢٠٢١).

عبدالرزاق الحسنی،تاریخ الوزارات العراقیە، ط٧،(بغداد:١٩٨٨)،ص ٢٩٧و٣٠١و٣٠٢و٣٠٥ و٣٠٧و٣٠٩ و٣١١و٣١٣و٣١٥. ( شایانی باسەداود بەگی جاف لەخولەکانی: شەشەم، نۆیەم، دەیەم،یازدەیەم، دوازدەیەم ،سیازدەیەم،چواردەیەم،پازدەیەم و شازدەیەم و تاکاتی بەرپابوونی شۆڕشی(١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) وەک نوێنەری لیوای کەرکووک ( کفری ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی سەردەمی پاشایەتی بووە).

دیدەنی لەگەڵ دکتۆرحەسەن کەریم بەگی جاف، کەلار(١٢ی شوباتی ٢٠٢١).

هەتاو(گۆڤار)،ژمارە(١٥٥)،ساڵی ٦،یەک شەمەجۆزەردان،(٣١مایس ١٩٥٩)، ل ٥.

The Shah of Iran The Iraqi Kurds and The Lebanese- p82. Arash Reisine-،(London:2019)،Middle East Today،Shia ،zhad

- بڕوانە: هەتاو(گۆڤار)، ژمارە(١٥٥)، ل ٦.

- بڕوانە: هەتاو(گۆڤار)، ژمارە(١٥٥)



# گۆڕانی زمان و دروستبوونی شێوەزاری گەرمیان

ئاریا یاسین عەبدوڵا
مامۆستا لە بەشی زمانی کوردی/
کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەتیی زانکۆی گەرمیان

شێوەزاری گەرمیان بەپێی دابەشبوونی جوگرافی زارە کوردییەکان، دەکەوێتە ئەو بەشەوە کەپێی دەڵێن زاری ناوەڕاست، تایبەتمەندییەکی هەیە ئەویش ئەو ناوچانەی ئەم شێوەزارەی تێدا بڵاوبووەتەوە، کۆمەڵێك شێوەزاری زارەکانی تری زمانی کوردی تێدا کۆبووەتەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆز و تیرانەی کە لەناوچەکەدا نیشتەجێن، هەریەکەیان سەر بەژینگەی زمانیی جیاوازن، بەوێنە هۆزی (باجەلان، زەنگەنە و کاکەیی) بەرێژەیەکی بەرچاو لەناوچەکەدا نیشتەجێن، لەکاتێکدا ئەم هۆزانە لەڕووی شێوەی دەربڕینی زمانییەوە سەربەزاری گۆرانن، هەروەها هۆزەکانی (زەند، لەك، پاڵانی، گێژ و داودە... هتد) لەناوچەکەدا هەن، کە سەر بەزاری خواروون، ئەمە جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆر تیرەی (جاف)ی لێ نیشتەجێن، کە لەڕووی شێوەی دەربڕینی زمانییەوە لەشێوەی ئاخاوتنی سلێمانییەوە نزیکن.
گۆڕان لەزمان واتا گۆڕانکاری لە هەموو ئاستەکانی زمان گۆڕانی زمان لەهەموو ئاستەکانی زمان ڕوودەدات و لەئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر جیاوازی هەیە، ئەم گۆڕانانەش بەپێی تێپەڕبوونی کات لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دوای خۆی ڕوودەدات، بێ

ئــەوەی مــرۆڤ هەســتی پێبــکات، ئــەو گۆڕانانــەی بەســەر زمانــدا ڕوودەدەن لەلایــەن ئــەو خەڵکانــەی کــە ڕاهاتــوون لەســەر شــێوازە کۆنەکــەی ئاخاوتنیــان، ڕووبــەڕووی ڕەخنــە و نارەزایــی دەبێتــەوە و حــەز بــە بەکارهێنانــی نوێیەکــە ناکــەن، کەســە بەتەمەنەکانــی هەریەکــە لەهــۆزە جیاوازەکانــی ناوچەکەرکــە زۆر بــە تاســەوەن بــۆ بەکارهێنانــی زارە کۆنەکــەی خۆیــان، ڕەخنەدەگــرن لەنــەوەی نوێیــان، بــەوەی کــە هیــچ زانیارییــان نییــە لەســەر شــێوازی ئاخاوتنــی باوانیــان و پێــی نادوێــن.
مــەرج نیــە هەمــوو گۆڕانێــك زمــان بــەرەو تێکــدان و هەڵوەشــانەوە و لەناوچــوون ببــات، بەڵکــو ڕەنگــە ببێتــە هــۆی ئاســانکردنی بەکارهێنانــی زمــان، ئەوەتــا هەمــوو ئــەو گۆڕانکارییانــەی بەســەر زارو و شــێوەزارەکانی ناوچــەی گەرمیانــدا هاتــووە، بووەتــە هــۆی پەیدابوونــی شــێوازێکی تایبەتــی ئاخاوتــن کــە ئەویــش شــێوەزاری گەرمیانــە، ئاخێوەرانــی هەریــەك لەهۆزەکانــی ســەربەم ســێ زارانــەی کــە تێــدا نیشــتەجێن (زاری گــۆران، زاری ناوەڕاســت، زاری خــواروو) ڕەنگــە لەکۆنــدا زۆر بــە ئاســتەم توانیبێتیــان لەیەکــتری تێبگــەن، چونکــە ئاخاوتنیــان زۆر جیــاواز بــووە لەیەکــتری بۆنموونــە لەڕســتەیەکی وەکــو (لەبەهارانــدا دەڕۆیــن بــۆ ســەیران) ئەگــەر لەکۆنــدا وەربیگریــن بــەم شــێوانە وتــراون:
أ-(جــە وەهــاران مەلیمــی پــەی ســەیران) شــێوازی ئاخاوتنــی هۆزەکانــی ســەر بەزاری گــۆران.
ب-(ئــێ ڤەهــاران مەچینــە گەشت)شــێوازی ئاخاوتنــی هۆزەکانــی ســەر بــە زاری خــواروو.
ت-(بەهــاران ڕۆیــن ڕای سەیران)شــێوازی ئاخاوتنــی هۆزەکانــی ســەر بــە زاری ناوەڕاســت.
کەچــی لەئێســتادا هەرســێ زار بــووە بــە شــێوەزاری گەرمیــان بــەم شــێوەیە دەگوترێــت:
(لە بەهارانا ئەڕۆین بۆ سەیران).

ئەمەش ئەوەدەگەیەنێت کە گۆڕانی زمان لەم ناوچەیە کاریگەری ئەرێنی بووە و وای کردووە کە دانیشتوانی بەئاسانی لەیەکتری تێبگەن، ئەگەرچی سەربە سێ زاری جیاوازیش بن.

## هۆکارەکانی گۆڕینی زار و شێوەزار لەناوچەی گەرمیان

بابەتی گۆڕانی زمان لەلایەن زمانەوانەکان مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە، بەڵام تا ئێستا نەگەیشتون بە ئەنجامێکی شیاو بۆ ئەو بابەتە ڕێژەی ئەم گۆڕانانە لەناوچە جیاوازەکانی کوردستان جیاوازە، بەپێی ڕادەی کارتێکردنی فاکتەرەکانی جا کەباس لەو گۆڕانانە بکەین کە بەسەر شێوەزاری گەرمیاندا هاتوە، دەبێت تەنها ئەو فاکتەرانە دەستنیشان بکەین کە تایبەتن بە گۆڕان لەم شێوەزارە، بۆیە لای خوارەوە دەیانخەینەڕوو.

### ١-هۆکاری جوگرافی:

سەبارەت بەم هۆکارە دەبێت لەپێشدا باس لەوە بکەین کە پەیوەندی جوگرافی بەزمانەوە ئەوەیە کە دیاردە جوگرافییەکان کار لەڕادەی تێکەڵ بوونی گوندەکان دەکەن و ڕێژەی گۆڕان سنوردار دەکەن، هۆکاری جوگرافی یەکەمین هۆکارە کە ڕاستەوخۆ کاریگەری خۆی هەبووە لەسەر ئەو گۆڕانانەی کە لەم ناوچەیە و بەسەر ئەم شێوەزارەدا هاتووە، چونکە شوێنی جوگرافی ناوچەکە وایکردووە لەکۆندا ئەم هەموو هۆزە جیاوازە ڕووی تێبکەن و بە شوێنێکی گونجاوی لەوەڕداری و کشتوکاڵکردن زانیویانە، دواتر بووەبە ناوچەیەکی گونجاوی بازرگانی ئابووری

## ٢ -هۆكاری ڕامیاری:

ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ مێژووییەكـی كـۆن بـۆ ئـەو كاتـەی كـە ڕێكەوتننامـەی زەهـاو سـاڵی(٩٣٦١) لەنێـوان عوسـمانییەكان و سـەفەوییەكان مۆركـرا، لەوكاتـەوە زۆر لەهـۆزەكان بەهـۆی ئـەو بڕیـارەوە ناچـار كـران كـە واز لەژیانـی كۆچەرایەتـی بێنن و چیـتر نەیانتوانـی لەنێـوان ئـەو دوو وڵاتـە كۆچەرایەتـی بكـەن، ناوچـەی كۆچەرایەتییەكەیـان فراوانیەكـەی جارانـی لەدەسـتدا، بۆیـە هەندێكیـان لـەم ناوچـەی گەرمیانـەی ئێسـتادا نیشـتەجێبوون و دیـارە ئەمـە بۆخـۆی هۆكارێكـی ڕامیارییـە، لەلایەكـی تریشـەوە فەرمانـڕەوای میرنشـینی بابـان و پاڵپشـتیان بـۆ هـۆزی جاف و پێدانی زەویوزارێكـی زۆر بـە بەگزادەكانـی ئـەم هـۆزە، بووەهـۆی ئـەوەی جۆرێـك لەدەسـەڵات لای ئـەم هـۆزە پەیـدا ببێـتو لـەم ڕێگایەشـەوە لەهەمـوو لایەنەكانـی ژیانـدا كـە شێوەزارەكەشـیان دەگرێتـەوە زاڵبـوون بەسـەر هۆزەكانـی تـری ئـەم ناوچەیـە.

ا- ئـەو حەمكـە بەرگـە جوانـەت هەیـە، ئەمـە چیـە كردتەتـە بـەر! (جـاف)

ب- ئـەو حەمكـە كەلپـەل جوانتـە هەیـە، ئەمـە چیـە كردتەتـە بـەرت! (گەرمیانـی)

لـەم دوو نموونـەدا ئەوەمـان بەرچـاو دەكەوێـت كـە جیاوازیەكـی ئەوتـۆ نابینیـن لەنێـوان ئاخاوتنـی شـێوەزاری گەرمیانـی و ئاخاوتنـی هـۆزی جـاف بـە بـەراورد بـە ئاخاوتنـی هۆزەكانـی تـری ئـەم ناوچەیـە لـە كۆنـدا.

سـەرەڕای ئەوانـەی كـە باسـمان كـرد، بەهـۆی سیاسـەتی بەعەرەبكردنـەوە زۆر لەخێزانەكانـی ئـەم ناوچەیـە بـەر پرۆسـەی ڕاگواسـتن كەوتـن و گواسـترانەوە بـەرەو باشـوری عێـراق و ناوچـە عەرەبنشـینەكان، ئەمـە وایكـرد كـە كاریگـەری زمانـی عەرەبیـش لەلایەكـی تـرەوە بكەوێتـە سـەر ئـەم شـێوەزارە،، هەتـا سـاڵانی دوای ڕاپەڕیـن دیسـانەوە بـاری سیاسـی ئـەو سـەردەمە و نەمانـی ڕژێمـی

بەعس لەم ناوچەیە دیسانەوە کاریگەری هەبوو لەسەر ئەم شێوەزارە،، بەجۆرێك خەڵكی ئەم ناوچەیە هەوڵی بەکارهێنانی زمانی کوردی پاراویان دەدا لەبری زمانی عەرەبی، ئیتر وردە وردە وشە و زاراوە و ناوی کوردییان بەکاردەهێنا، دیارە ئەمەش هۆکاری تری وەکو رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و دەروونی لەپشتەوە بوو، ئەوەی جێگای باسە هۆکاری ڕامیاری لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆڕێت، بۆ نموونە لەدوای ڕاپەڕین ناوچەی خانەقین هەر لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس مایەوە بۆیە کاریگەری زمانە عەرەبییەکە لەو ناوچەیە هەر بەردەوام بوو، بگرە هەتاوەکو ئێستاش لەشاری خانەقین و دەوروبەری ئەو کاریگەرییە زۆر بەئاسانی لەئاخاوتنیان هەست پێدەکرێت وەکو:

ا- بەو لەی شارەعە عبر بکەیمن...

ب-مقەیەت سیارە بە فرە سرعەتن...

کەچی لە ناو شاری کەلار و دەوروبەری دەوترێت:

ا- بێ لەم جادەوە بکەینە ئەوبەرۆ...

ب-مەقەیەت سەیارەوە زۆر سەریعن...

ئەگەر تێبینی نموونەکان بکەین، دەبینین وشەکانی(شارەع، عەبر، سیارە و سرعەت) وشەی خوازراوی زمانی عەرەبین و لە شێوەزاری خانەقینی بەکار دەهێنرێن، لە نموونەکان کە شێوەزاری گەرمیانییە لەبری(شارەع)، (جادە) بەکارهاتوە و لەبری (عبر)، (کردنە ئەوبەر)ەوە بەکارهاتوە، هەرچی وشەکانی(سەیارە، سرعەت)ە هێشتا لە هەردوو شێوەزاری (خانەقینی و گەرمیانی) بەکار دەهێنرێن، ئەمەش ئەو ڕاستیەمان بۆ ئاشکرا دەکات لە شێوەزاری خانەقینی وشە و زاراوەی عەرەبی زۆرتر بەکاردەهێنرێن وەك لە شێوەزاری گەرمیان، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕادەی کاریگەری زمانە عەرەبییەکە بۆ هەریەك لەو ناوچانە.

## ٣- هۆكاری كۆمەڵایەتی:

یەكێكیتر لەهۆكارەكانی گۆڕانی شێوەزاری گەرمیان، هۆكاری كۆمەڵایەتییە، پێویستییەكانی مرۆڤ لەگەڵ گۆڕانی كۆمەڵایەتی گۆڕانیان بەسەردا دێت، یەكێك لەو پێویستیانەش زمانە، زمانیش وەك هەر دیاردەیەك خۆی لەگەڵ گۆڕانكارییەكانی كۆمەڵگە دەگونجێنێت، واتا ئەو گۆڕان و تێكەڵاوییەی كە لەنێو كۆمەڵگەدا ڕوودەدات گۆڕانی زمانی لێدەكەوێتەوە.

دانیشتوانی ناوچەی گەرمیان بەوە ناسراون كە پەیوەندییەكی كۆمەڵایەتی توندوتۆڵیان هەیە لەنێو یەكتردا، لەهەموو بۆنە كۆمەڵایەتییەكان پێكەوەن و سەردانیكردنی یەكتریان بەردەوامە، ئەمە جگە لەو تێكچڕژانەی هۆزەكان لەگەڵ یەكتردا بەهۆی ژن و ژنخوازییەوە كە بەشێوەیەك لەشێوەكان كاریگەری ڕاستەوخۆی هەبووە و بەردەوامیشە لەسەر شێوەزارەكە، ئەم تێكەڵاوبوونە بەشێوەیەكی لەسەرخۆ و بەبێ ئەوەی هەستی پێبكرێت هەموو شێوەزارەكانی لەیەك نزیك كردۆتەوەو وشەو زاراوەیان لەیەكتر خواستوە تا گەیشتۆتە شێوەزاری گەرمیانی ئەمڕۆ، هەروەها لەم ساڵانەی دوایدا پەیوەندیەكی پتەوی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە دروستبووە لەگەڵ ناوچەی سلێمانی، ئەویش بە سەردانی كردنی بەردەوامی خەڵكانی هەردوولا بۆ ناوچەكانی یەكتری بەتایبەت سەردانی كردنی گەرمیانییەكان بۆ شاری سلێمانی چ بەمەبەستی چوونە لای پزیشك یاخود بازاڕكردن یان بۆ گەشتوگوزار بێت، هەروەها دیاردەی هاوسەرگیری لەنێوان گەنجانی هەردوو ناوچەی (گەرمیان و سلێمانی) پێكەوە، ئەمانە هەمووی وای لەشێوەزارەكە كردووە لەشێوەزاری سلێمانی نزیك بێتەوە.

بۆنموونە كاتێك گەنجێكی گەرمیانی و گەنجێكی سلێمانی هاوسەرگیری دەكەن، لەكاتی ئامادەكاری بۆ ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە كۆمەڵێك وشە و زاراوە كە تایبەتن بە شێوەزاری سلێمانی و دابونەریتی ئەو ناوچەیە بەكار دەهێنرێت لای

کەسوکاری گەنجە گەرمیانییەکە وەکو وشەکانی (پاشتێلانە و شەکراو خواردنەوە...هتد).

## ٤-هۆکاری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن:

ڕۆشنبیری یەکێکی ترە لەو هۆکارانەی کە گۆڕانی زارەکانی لێدەکەوێتەوە و بەرەو زارێکی زیندووی دەبات، زاری زیندووش بەپێی کات و سەردەمی جیاجیا لە گۆڕاندایە و توانای وەرگرتنی هەیە، لە بوارەکانی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری و ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا بەکادەهێنرێت، ئەمەش واتە زیاتر دەستگا و هۆیەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەری و ئێستگە و تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و سینەماکان ڕۆڵی تێدا دەبینن و دەبنە هۆکارێك بۆ بەکارهێنان و بڵاوکردنەوەی وشە و زاراوەی تایبەت بەو سەردەمەی کە تێیداین، هەربۆیە ئەم هۆکارە لەگۆڕانی شێوەزاری گەرمیانیشدا ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە و بەردەوامیشە، ئەگەر لەپێش ڕاپەرینەوە دەستپێبکەین و بگەڕێینەوە بۆ ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە عەرەبیانەی کە ڕۆشنبیرانی ئەم ناوچەیە دەیانخوێندنەوە، هەروەها ئەو کەناڵە ناوخۆیانە کە تەنها بەزمانی عەرەبی پەخشیان دەکرد (ئەوکاتە ئامێری سەتەلایت نەهاتبووە عێراقەوە) هەموو منداڵان تەماشای فیلم کارتۆنیان بە زمانی عەرەبی دەکرد، ئەمانە و زۆر هۆکار و بڵاوکراوەی تر کە جێپەنجەی خۆیان جێهێشتبوو لەسەر دانیشتوانی ئەم ناوچەیە، بەجۆرێك زۆربەی وشە و زاراوەکانمان بە زمانی عەرەبی بوو، دواتر و لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی(١٩٩١) وەوە وردە وردە خوێنەری گۆڤارە کوردییەکان زیادی کردوو کەناڵە کوردییەکان دامەزران و دۆبلاژی کوردی دانرا بۆ فیلم و فیلم کارتۆنییەکان و خوێندنگا کوردییەکان زیادیان کرد، تا هەموو خوێندنگاکان بوونە زمانی کوردی...هتد، ئەمانە هەمووی گۆڕانی زۆر گەورە و بەرچاوی دروستکرد لەشێوەزاری گەرمیاندا، هەروەها زیادبوونی کەسانی ڕۆشنبیر و خوێندەوار، بەرامبەر بەمە کەمبوونەوەی ڕادەی نەخوێندەواری بووە هۆکارێك بۆ بەکارهێنانی

وشە و زاراوەکان بە شێوە دروستەکەی، بۆنموونە ئەو کەسانەی بەتەمەن و نەخوێندەواربوون، زۆر وشەیان بە هەڵە بەکاردەهێنا وەك (ئەزراق لەبری ئەرزاق، جوعمە لەبری جومعە،، تلْف لەبری تفڵ یان منداڵ، پەنجا و دە لەبری شەست...هتد) بەڵام وردە وردە ئەم دیاردەیە بەرەو کاڵبوونەوە ڕۆشتووە لە ئێستادا، لەلایەکی تریشەوە ڕۆشتنی خوێندکارە گەرمیانییەکان بۆ شاری سلێمانی و شارەکانی تری کوردستان بەمەبەستی خوێندنی زانکۆیی، هەروەها دامەزراندنی زانکۆی گەرمیان و هاتنی خوێندکارانی شارەکانی تری کوردستان بۆ ئەم ناوچەیە، هەمووی هۆکاربوون بۆ شارەزابوونی شێوەزارەکانی یەکتر و کاریگەریان لەسەر یەکتر دروستکرد، بەتایبەتی شێوەزاری سلێمانی کاریگەری لەسەر شێوەزاری گەرمیان دروستکرد، بەو پێیەی کە شێوەزاری سلێمانی نزیکترین شێوەزارە لەزمانی فەرمی(کتێبی) کوردییەوە، بەڵام ئەمە بەومانایە نایەت کە بڵێین دانیشتوانی ئەم ناوچەیە ئاخاوتنیان نزیکە لەشێوەزاری سلێمانییەوە، بەڵکو هەتاوەکو ئێستاش زۆر وشە و زاراوەی جیا لەزارو شێوەزارەکانی تری زمانی کوردی لەناوچەی گەرمیان بەکاردەهێنرێن و هێشتا ئەم شێوەزارە خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی لەهەموو ئاستەکانی زماندا.

## ٥- هۆکاری ئابوری:

پێگەی جوگرافی ناوچەی گەرمیان هۆکارێکە بۆ دروستبوونی پەیوەندی ئابووریو بازرگانی لەنێوان ئەم ناوچەیە و ناوچەکانی دەوروبەری، لەبەرئەوەی زۆر ڕێگای سەرەکی شارەکانی لەسەرەو ناوچەیەکی سنوورییە لەگەڵ ناوەڕاست و خوارووی عێراق و وڵاتی ئێرانیش، ئەمانە هەمووی هۆکارێکن وەکو ناوچەییەکی بازرگانی و پڕکار دەرکەوێت، لەزۆر شار و شارۆچکەوە بەمەبەستی بازرگانی ڕووی تێدەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ناوچەیە خاوەنی جۆرەها بەرهەمی کشتوکاڵییە، لەگەڵ وڵاتی ئێران ئاڵوگۆڕی بازرگانی گەرموگوڕی هەیە،

((بەهـۆی ئـەو ئاڵوگۆڕکردنـی شـتومەکەی لەنێـوان وڵاتانـی زمـان جیـاواز دەکرێـت، وشـە و زاراوەی نـوێ دێتـە ئـاراوە، چونکـە نـاوی هەندێـك شـوێن و کاڵای بازرگانـی لەهەندێـك وڵاتـدا جیـاوازە لەگـەڵ وڵاتێکیـتر، ئـەم بازرگانیکردنـە وایکـردووە خەڵکێکـی زۆر ڕۆژانـە ڕوو لـەم ناوچەیـە بـکات و بـە پێچەوانەشـەوە خەڵکـی ئـەم ناوچەیـە ڕوو لـەزۆر شـوێنی دیکـە دەکـەن بـە مەبەسـتی بازرگانـی، هەمـوو ئـەم تێکەڵاویکردنـەی کـە بـۆ مەبەسـتی بازرگانـی ئابـووری ئەنجامدەدرێـت، دەبێتەهـۆی ئـەوەی کاریگەریـان لەسـەر زمـان و زار و شـێوەزاری یەکـتر هەبێـت و بەبـێ بەئاگابـوون لەخۆیـان وشـە و زاراوەی یەکـتر بەکاربهێنـن، لەئەنجامـدا و دوای ماوەیەکـی زۆر گـۆڕان لەزمـان(زار، شـێوەزار)ەکەیان دروسـتببێت، بوونـی زمانـی بێگانـە لـەو کاتـە گـۆڕان لەزمـان دورووسـت دەکات، کاتێـك چەنـد زمانێـك لەگـەڵ یەکـتری پەیوەندیـان دەبێـت بەتایبەتـی لەناوچـە سـنوورییەکان، بەجۆرێـك دانیشـتوانی ئـەو ناوچانـە بەشـێوەیەکی گشـتی ئاخێـوەری چەنـد زمانێکـن، جـا لەوکاتـەدا زمانـەکان کاریگـەری لەسـەر یەکـتری دەکـەن.

سـەرەڕای ئەمـەش، هەنـدێ هـۆکاری لاوەکـی تـر هـەن کـە تەواوکـەرن بـۆ هـۆکارە سـەرەکییەکان، لەوانـە هـۆکاری دەروونـی کـە دەگەڕێتـەوە بـۆ بیـر و بۆچـوون و دەروونـی تـاك و ئـەو پاڵنەرانـەی کـە وای لێـدەکات تـا چ ئاسـتێك قبوڵـی ئـەو گۆڕانـە بـکات، کەسـە بەتەمەنەکانمـان گۆڕانـی زمـان بـە کارێکـی نەرێنـی تەماشـا دەکـەن و پێیـان قبـوڵ نیـە،، لەهەمـان کاتـدا هەندێـك کەسـیتر لەبـەر هەسـتی نەتەوایەتـی تـا ئـەو ئاسـتەی لەتوانایـدا بـووەو لەژێـر ویسـتی خۆیـدا بـووە پـاراوی زمانەکـەی خـۆی پاراسـتوە بەرامبـەر بـە زمانـی بێگانـە، یاخـود هەسـتی ناوچەگەریـی لای هەندێـك کـەس بەهێزتـرە لـەو کاریگەرییانـەی کـە زارێـك هەیەتـی لەسـەر زارێکـی تـر، بـەو شـێوەیە کەسـی خـاوەن هەسـتی ناوچەگەریـی بـەردەوام پابەنـد دەبێـت بـە بەکارهێنانـی زار یـان شـێوەزارەکەی خـۆی.
حاڵەتێکـی ترمـان هەیـە بـۆ گۆڕانـی زمـان ئەویـش مـۆدە (بـاو)

بوونـه، واتـا بەکارهێنانـی شـێوەزار یـان زارێـك یـان زمانێکـی بـەدەر لـەوەی خـۆت بەهـۆی خـۆ دەرخسـتن و بەمـۆدە بـوون، وەك ئـەوەی کـە ئێسـتا تێبینـی دەکەیـن لای زۆر لەگەنجانـی ناوچـەی گەرمیـان کاتێـك بـە شـێوەزاری سـلێمانی دەدوێـن بەتایبـەت ئـەو گەنجانـەی کـە خوێنـدکاری زانکۆکانـن، ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ دەرونـی تاکەکـەسو حـەز و ئارەزووەکانـی هەمـوو ئـەو هۆکارانـەی کـە باسمان کـرد، ژینگەیەکـی زمانیـی وایـان دروسـتکردووە بـۆ شـێوەزاری گەرمیـان کـە گۆڕانـی تایبـەت بەخـۆی هەبێـت و جیـای بکاتـەوە لەشـێوەزارێکی تـری خـاوەن ژینگەیەکـی زمانـی جیـاواز، بـۆ نموونـە لـە ناوچـەی گەرمیـان بـە پێـی سنوری ئیـدارەی گەرمیـان کـە خانەقینیـش دەگرێتـەوە، شـێوەزاری گەرمیـان خـاوەن تایبەتمەنـدی جیـاوازە بـە بـەراورد لەگـەڵ شـێوازی ئاخاوتنـی ناوچـەی خانەقیـن، ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو کاریگەرییـە جیاوازانـەی کـە لەسـەر هەریـەك لـەو دوو شـێوەزارە هەبـووە،، کاتێـك دەڵێـن دوو شـێوەزار ڕەنگـە ئەمـە پێویسـتی بـە بەڵگـە و کاری زۆر هەبێـت، نـەك بـە لێکۆڵینەوەیـەك، بەڵکـو بـە دەیـان لێکۆڵینـەوەی پێویسـت بێـت بـۆ دەرخسـتنی ئـەو جیاوازیانـە بەشـێوەیەکی پڕاوپـڕ، بـەڵام لـەم کارەمانـدا تەنهـا دەتوانیـن ئاماژەیـەك بـۆ ئـەو ڕاسـتیەیی پێـی گەیشـتووین بدەیـن ئەوەیـش ئەوەیـە کـە ژینگـەی زمانیـی هۆکارێـك بـووە بـۆ دروسـتکردنی گـۆڕان لەسـەر هەریـەك لەشـێوەزاری گەرمیـان و شـێوازی ئاخاوتنـی ناوچـەی خانەقیـن و وایکـردووە کـە جیـاوازی هەبێـت لەنێوانیـان.

## گۆڕان لەئاستەکانی زمان لە شێوەزاری گەرمیان

لەشـێوەزاری گەرمیانـدا گۆڕانێکـی زۆر بەسـەر ئاخاوتنـدا هاتـووە بـە بەراوردکردنـی ئاخاوتنـی دانیشـتوانی ئـەم ناوچەیـەو لەکـۆن و نوێـدا، کاتێـك بـاس لەگـۆڕان لەئاخاوتـن دەکەیـن واتـا گـۆڕان لەئاسـتەکانی زمانـدا.

### ١- گۆڕانی مۆرفۆفۆنیمی:

گرنگتریـن جۆرەکانـی گـۆڕان، گۆڕانـە لەئاسـتی دەنگسـازی، چونکـە ئاسـتی دەنـگ یەکێکـە لـەو ئاسـتانەی زمـان کـە زیاتـر لەئاسـتەکانی تـر دەگۆڕێـت و زۆر تریـش هەسـتی پێدەکرێـت، ئـەم گۆڕانـە دەنگیانـەش لـە چوارچێـوەی وشـەدا هەسـتی پێدەکرێـت، واتـە دەستنیشـانکردنی قاڵبـە جیاوازەکانـی مۆرفیـم، کـە لەئەنجامـی کارتێکردنـی ژینگـەی فۆنۆلۆجیـی جیـاوازەوە سـەرهەڵدەدەن، پەیوەنـدی مۆرفۆلۆجییـە فۆنۆلۆجییـەوە دەخاتـەڕو و یاسـاکانی بـە مۆرفۆفۆنیمیـی نـاو دەبرێـن.

گۆڕانـی دەنگـی لـە ئاسـتی وشەسـازیدا واتـە گۆڕانـی دەنگـی هەندێـك لـە وشـەکە، نـەك گۆڕانـی هەمـوو وشـەکە پێکـەوە، ئەمـەش بـە دوو شـێواز ڕوودەدەن کـە بریتیـن لـە:

١- گۆڕانـە پێکهاتەییـەکان، ئـەو گۆڕانەیـە کـە تووشـی دەنگـەکان دەبێـت لـە ئەنجامـی دراوسـێتییان لـە زنجیـرەی ئاخاوتنـدا، ئەمـەش لـە ڕێگـەی لێکچـون و نەگونجـان و لـە ناوچـوون و جێگۆڕکێـی دەنگ...هتـد دەبێـت، واتـە دەنگەکـە لـە پێکهاتەکەیـدا دەگۆڕێـت بـە دەنگێکـی تـر، ئەمـەش لـە وشـە داڕێـژراو و لێکدراوەکانـدا ڕوودەدەن.

## ٢- گۆڕانە مێژووییەکان:

هەردوو شێوازەکەی گۆڕانی دەنگی، وشە و زاراوەی نوێی لێدێتە بەرهەم و دەچنە نێو فەرهەنگەوە، بەمەش پەیوەندی لە نێوان هەردو ئاستی (دەنگ و فەرهەنگ)دروست دەبێت و بەم دیاردەدیەش دەگوترێت(فۆنۆلێکسیك)، فۆنۆلێکسیك((بەو گۆڕانە دەنگییانە دەگوترێت کە بەسەر وشە فەرهەنگییەکاندا دێت، دەبێتەهۆی دروستبوونی جیاوازی گۆڕانی دەنگی لە نێوان وشە فەرهەنگییەکانی دوو زمان، یان دوو زار، یاخود شێوەزاری هەمان زمان، بەمەش ئاستی فۆنۆلۆجی بە ئاستی فەرهەنگەوە دەبەستێتەوە. ئەو گۆڕانانەی کە لەدەنگەکاندا ڕوودەدەن، دەبنەهۆی ئەوەی گۆڕان لەفۆرمی وشەکاندا دروست بکەن، کەچی دیاردەی گۆڕان لەئاستی مۆرفۆلۆجی و یاسا مۆرفۆلۆجییەکان بە بەراورد بە ئاستی دەنگسازی کەمترە، ئەگەر ڕویش بدات ماوەیەکی زۆری دەوێت.

شێوەزاری گەرمیانیش هاوشێوەی هەموو زمان و زارو شێوەزارەکانی دونیا، ئەم جۆرە گۆڕانەی بەسەردا هاتووە هەر لەمێژوویەکی کۆنەوە هەتا ئەمڕۆی شێوەزارەکە بەردەوام گەشە و گۆڕانکاری بەخۆیەوە دیوە بۆنموونە:

هەندێك لە ئاخێوەران پاشگری (دا) یان گۆڕیوە بە (ا) و /د/ توشی کرتاندن هاتووە لە وشەی( بەهاراندا) کە بوە بە (بەهارانا). لە ڕستەی لەبەهارانا ئەچین بۆ سەیران

## ٢-گۆڕان لە ئاستی ڕستەدا:

ئەم گۆڕانە لەسەرخۆ و بەپێی تێپەڕبوونی کات لە زماندا ڕوودەدات، بەڵام ئەم گۆڕانە کەمتر هەستی پێدەکرێت و ڕێزمانیش توندتر و کەمتر خۆی بەدەستەوە دەدات، لەم ئاستەشدا هۆکاری دەرەکی ڕۆڵ دەبینێت لەگۆڕانی زماندا، بەتایبەتی تێکەڵاوی

دوو زمان یان ململانێی نێوان دوو نەتەوەی جیاواز، واتە گۆڕان لەئاستی ڕستەدا زۆر سستەو ماوەیەکی زۆری دەوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ گۆڕان بەسەر ئاخاوتنی هەندێك لەو هۆزانەدا هاتووە کە بەشێکن لە پێکهاتەی شێوەزاری گەرمیان، بەمەش گۆڕانەکە شێوەزار گەرمیان دەگرێتەوە، وەك ئەم نموونەی خوارەوە:

کوڵاژدم وە ژنەکەوەی دا
ئەمە نموونەیەکە لە شێوەزاری گەرمیانی کە ڕستەیەکی تەواوە و ڕیزبوونی کەرەستەکانی بەم شێوەیەیە:
بکەر+ بەرکار+کردار

بەشێوازێکی تریش دەگوترێت کە ئەویش:
- کوڵاژدم دایە ژنەکەوە یاخود ئەگەر بەرکار لابەرین دەڵێن:
- کوڵاژدم دای پێوە. یان - کوڵاژدم پێوەی دا.

هەموو ئەمانە لە شێوەزارەکە بەکار دەهێنرێت لەلایەن ئەو کەسانەی کە پابەندن بە شێوەزاری گەرمیانەوە، بەڵام لە ڕستەیەکی وەکو:
- کوڵاژدم دا ژنەکەوە.

دەبینین(ی) کە جێناوی لکاوی بکەریە نەماوە و تیاچووە، خۆ ئەگەر بەرکارەکە لابەرین کە (ژنەکەیە) ئەوا ڕستەکە دەبێت بە:
- کۆڵاژدم دا پێوە یان کوڵاژدم پێوەدا دیسانەوە دەبینین کە (ی) ی جێناوی لکاوی بکەرییەکە نەماوە، هەروەها لە جیاتی(پێ) دەڵێن (پی).

هەندێکی تر لە ئاخێوەرانی سنوری ئەم شێوەزارە دیسانەوە پابەندنین بە بەکارهێنانی شێوەزارەکە و لە ڕستەی هاوشێوەدا دەڵێن:
- کوڵاژدم دادە پێوە.

لێرەدا دەبینین (وە) کە نیشانەیە بۆ ڕابردووی تەواو بەکار هاتووەو فۆرمەکەی گۆڕاوە بۆ (دە).
هەمان ڕستە لای کۆمەڵێکی تری ئاخێوەرانی ئەم شێوەزارە بە شێوازە کۆنەکەی ئاخاوتنیان دەگوترێت، هەتاوەکو ئێستاش پابەندنین بە گۆڕانی شێوەزارەکەوە وەك.
کوڵاژدم دا چە زەنەکەوە.

دەبینین ئامرازی پەیوەندی(چە) لەبری (بە) بەکارهاتووە، لە ڕستەییەکی تردا کە دەگوترێت:
- کوڵاژدم چە زەنەکەشەوە دان.

لێرەدا (ش) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاك کە بکەر بەهۆی ڕێککەوتنی لەگەڵ بەرکاردا بەخشیویەتی، هەروەها(ن) ئەسپێکتە بۆ ڕابردووی تەواو.

## ٣-گۆڕان لەئلستی واتای فەرهەنگیی:

گۆڕان لەم ئاستەدا گۆڕانە لەواتاو فۆرمی گشتیی وشەو مۆرفیمەکان بە ڕێگای جیاواز، ئەم پرۆسەیەش ڕەنگدانەوەی گۆڕانی ژیانی کۆمەڵایەتی ئاخێوەرانیەتی، گۆڕان لەواتا واتە خواستنی وشە و فۆرمی نوێ بۆ ناو زار یان زمانەکە، کە هاو واتایی، یان فرەواتایی دروستدەکات.
لەشێوەزاری گەرمیاندا لەناو هەموو گۆڕانەکانی ئاستەکانی زماندا، گۆڕانی فەرهەنگی شانبەشانی گۆڕانی دەنگی دەبینرێت، دیارە یەکێك لەو هۆکارانە بوونی هۆز و تیرەیەکی زۆر و جیاوازە

لەم ناوچەیەدا، کە کاریگەریان کردۆتەسەر یەکتر، بەتایبەت ئەو کاریگەرییە بەهێزەی کە هۆزی جاف هەیبووە لەڕووی ئاخاوتنەوە لەسەر هەموو هۆزەکانی تری ئەم ناوچەیە، وایکردووە گۆڕان بەسەر ئاخاوتنی هۆزەکانی تر ڕووبدات، ئەم شێوەزارەی ئێستای لێ دروست ببێت. لەلایەکی تریشەوە وشەی نوێ هاتۆتە ناو شێوەزارەکەوە، نابێت ئەوە لەبیر بکەین ناوچەی گەرمیان، ناوچەیەکی سنورییە لەگەڵ بەشی خوارووی عێراق و وڵاتی ئێران، هەربۆیە کاریگەری زمانی (عەرەبی و فارسی) کەوتۆتە سەرشێوەزارەکە، لە ئێستاشدا جگە لە کاریگەری ئەو دوو زمانە لەسەری، کاریگەری شێوەزاری سلێمانیش کەوتۆتە سەری و زۆر وشە و زاراوەی نوێ خوازراوە بۆ نێو شێوەزاری گەرمیانی، جیاوازە لەوانەی کە لەکۆندا بەکاردەهێنران.

هەندێک لە جۆرەکانی گۆڕانی واتا، دیاردەی (فراوانبوون و تەنگبوونەوە)ی واتایە نموونەش بۆ ئەم دیاردانە وشەی(پسپۆر) کەلەکۆندا بەکەسێك وتراوە شارەزای هەبێت لەئاژەڵ و ناسینەوەی بارودۆخی ئاژەڵ، دەبینین بەپێی تێپەڕبوونی کات ئەم زاراوەیە واتاکەی فراوان بوو بۆ هەرکەسێك کە شارەزا بێت لەبوارێك یان زانستێك بەکار دەهێنرا وەك پسپۆر لەبواری (زەویوزار، ئۆتۆمۆبیل، زمان...هتد)، بەمشێوەیە دوو واتا لەخۆ دەگرت و هەتا وردە وردە واتای یەکەمی لەدەستدا و واتاکەی تەنگ بویەوە بۆ پسپۆر لەهەموو بوارێك، یان زاراوەی (محەلە)، کە لەکۆندا بۆ شوێنی خەرمان بەکارهێنراوە دواتر واتاکەی لای ئەوانەی لەلادێوە ڕۆشتوونەتە شار فراوان بووە بۆ مانای وشەی(گەڕەك)ی ئێستا، پاشان وردە وردە واتاکەی تەنگ بۆتەوە و تەنها بەکارهێنراوە بۆ مانای دووەمی و لەئێستادا لەناوچەی گەرمیان بە تایبەت لەشاری کفری و دەوروبەری بەرانبەر بە وشەی (گەڕەك) زاراوەی (مەحەلە)بەکاردەهێنرێت.

جگە لەو دیاردانەی باسمان کرد، گۆڕانی زمان ئەگەر لەڕێگەی خواستنی وشەو زاراوەی نوێوە ڕوبدات بۆ ناو زمان، گۆڕانی واتای دروست دەکات واتا دیاردەی هاو واتای دروست دەبێ.. ئەمەش

گۆڕانی فەرهەنگی لێ دروست دەبێت، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ فەرهەنگی کۆنی شێوەزاری گەرمیان، دەبینین لەکۆندا کۆمەڵە وشەیەك بەکارهێنراون، کە لەئێستادا یان بەتەواوی نەماون یان زۆر بەکەمی بەکاردەهێنرێن، جا ئەو وشانە چ زاراوەو وشەی عەرەبیو فارسی بن یاخود زاراوەو وشەی هەریەك لەو هۆزانەی کە لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بوونەو لەپێکهاتەی ئاخاوتنی کۆنی گەرمیاندا هاوبەش بوونە، لەئێستادا ئەو وشانەیان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

هەروەها ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو زاراوانەی کە هۆزەکانی ئەم ناوچەیە لەکۆندا هەریەکە و بە شێوازێك بەکاریان هێناوە، ئێستا نەماون یان بەدەگمەن بەکاردەهێنرێن ئەوە ئەم نموونانەی خوارەوە بەڵگەن بۆ ئەو ڕاستییە.

١- وشەی (بەرخ) لە ئێستادا لەشێوەزاری گەرمیانیدا بەکار دەهێنرێت، کەچی هەندێك لە ئاخێوەرانی ئەم ناوچەیە بەرانبەر بەم وشەیە وشەکانی(وەرك، ساوا، کاوڕ، ڤەر) بەکاردەهێنن.

٢- وشەی(بەرد) ئەمیش بەهەمان شێوە لە ئێستادا لە شێوەزاری گەرمیانیدا بەکار دەهێنرێت، لەبەرانبەر ئەم وشەیەدا وشەکانی(کوچك، کەمەر، سەنگ) لای هەندێك لە ئاخێوەراندا بەکاردەهێنرێن.

٣- وشەی(قوڕ) وشەییەکە لە شێوەزاری گەرمیانیدا بەکاردەهێنرێت، پێشتر لە بەرانبەر ئەم وشەیە وشەکانی(خەرگ، خەڕی، هەڕە) بەکارهاتووە، تاکو ئێستاش هەندێك لە ئاخێوەرانی سنوری شێوەزاری گەرمیان ئەم وشانە بەکاردەهێنن.

٤- وشەی(مێروچە، مرۆچە) وشەییەکی تایبەتە بە شێوەزاری گەرمیانی، لەبەرانبەر ئەم وشەیە وشەکانی(مێروولە، موریژە، مورژە، مۆریلە، موری، مرۆلە، مۆریلە، مۆریچە) لای هەندێك ئاخێوەرانی سەربەم ناوچەیە بەکاردەهێنرێن.

٥- وشەی (کولاژدم) ئەم وشەیە لە شێوەزاری گەرمیاندا بەکاردەهێنرێت بەشێوەیەکی گشتی، هەروەها لەبەرانبەر بەم

وشــه، وشه‌كانی(دووپشــك، كۆله‌نجــی، ئه‌قــره‌ب) لای هه‌ندێــك لــه ئاخێــوه‌ران.
بــه‌راوردی نێــوان ئاخاوتنــی كۆنــی یــه‌ک بــه یه‌کــی هه‌مــوو ئــه‌و هۆزانــه‌ی كــه وه‌ك نموونــه وه‌رمانگرتــوون، هه‌روه‌ها شــێوه‌زاری به‌رهــه‌م هاتــوو كــه شــێوه‌زاری گه‌رمیانــه له‌یــه‌ك ڕســته‌دا.

أ- ئه‌و هه‌موو جله جوانه‌ت هه‌یه، ئه‌مه چیه له به‌رت كردووه !
(سلێمانی)
ب- ئه هه‌مگه كراسێ ڕه‌نگین دیری، یه چییه كردیته ئێ ڤه‌ر !
(له‌كی)
ت- ئه گشت كه‌لوپه‌ل جوانه‌ت هه‌نن ئینه چێش چه به‌رت كه‌رده‌ن!
(باجه‌ڵان)
پ- ئا فره جل جوانانه‌ت هه‌نه‌ن، ئینه چێشه‌ن چه وه‌رت كه‌رده‌ن!
(زه‌نگه‌نه)
ج- ئه‌و هه‌مگه دڵنگ ڕه‌نگینه دیری، ئه‌و چه‌س كردیده‌سه وه‌ر!
(كه‌لهوڕ)
ح- ئا گشت گجی جوانت هه‌نن ئینه چیشن چه وه‌رت كردنه !
(كاكه‌یی)
خ- ئه‌و حه‌مگه كه‌لپه‌ل جوانه هه‌یه‌سه‌دو ئه‌یه چه‌یه ها له به‌رد!
(سوره‌میری)
د- ئه‌ی هه‌موو كه‌لوپه‌له جوانه هه‌یته، ئه‌یه چه‌یه له‌به‌رت!
(گه‌ڵاڵی)
ژ- ئه‌ی حه‌مكه كه‌لپه‌ل جوانته هه‌یه، ئه‌یه چه‌یه كردیده‌سه‌ی وه‌ر!
(پاڵانی)
ر- ئه‌ی حه‌مكه كه‌لپه‌ل جوانه هه‌یته، ئه‌یه چه‌یه كردیته‌سه‌ی به‌ر!
(وه‌رمزیار)
ز- ئه‌و حه‌مكه كه‌لپه‌ل جوانه‌ت هه‌یه، ئه‌یه چه‌س كردیته‌سه‌ی وه‌رت!
(گێژ)
س- ئه‌م حه‌مكه كه‌لپه‌ل جوانته هه‌یه، ئه‌یه چیه كردته‌ته به‌ر !
(ده‌لۆ)

ش- ئەو حەمكە بەرگە جوانەت هەیە، ئەمە چیە کردتەتە بەر !
(جاف)
ص- ئەو حەمکە کەلپەل جوانتە هەیە، ئەمە چیە کردتەتە بەرت !
(گەرمیانی)

دیاردەی ململانێ تەنها لەناو زمانەکاندا ڕوونادات، بەڵکو لەنێوان زار و شێوەزارەکان، هەروەها لەنێوان ئاخاوتنی تاکێك بۆ ئاخاوتنی تاکێکی تر ئەم دیاردەیە بەدی دەکرێت.
ئەو گۆڕانە زمانییانەی کە لە سنوری ناوچەی گەرمیان ڕویانداوە، هۆکارن بۆ درووستبوونی شێوەزاری نوێی گەرمیان.
لە پێکهاتەی ئاخاوتنی شێوەزاری گەرمیاندا، ئاخاوتنی ئەو هۆزانە دەبینرێت، کە لەکۆندا لە ناوچەی جیاجیادا ڕوویان کردۆتە سنوری گەرمیان و تیایدا نیشتەجێبوونە، شێوەزارەکانیان کاریگەری کردووە لەیەکتری، گۆڕان لەشێوەزاری گەرمیان هەموو ئاستەکانی زمانی گرتۆتەوە، گۆڕانی واتای فەرهەنگی و گۆڕانی دەنگی لە ڕیزبەندی یەکەم و دووەمی گۆڕانەکاندان، ڕێژەی گۆڕانەکان لە ئاخاوتنی هەریەك لەو هۆزانە لەکۆنەوە بۆ ئێستا جیاوازن لەیەکتری، هۆزی جافیش باڵادەستترین هۆزە کە ئاخاوتنی تا ڕێژەیەکی باش زاڵ بووە بەسەر ئاخاوتنی هۆزەکانی تری ئەم ناوچەیە.
ئاخێوەرانی سنوری ناوچەی گەرمیان لەکۆندا ڕەنگە بە ئاستەم لەیەکتر گەیشتبێتن پشت بەست بەو ڕاستییەی کە شێوازی ئاخاوتنی هەریەك لەو هۆزانە زۆر جیاواز بووە لەیەکتر، بەڵام نەوەی نوێی ئاخێوەرانی شێوەزاری گەرمیانی لەئێستادا زۆر بەئاسانی لەیەکتری دەگەن و بەیەك شێوەزار دەدوێن، ئەویش شێوەزاری گەرمیانە.



# یادگەم پڕە
# لە یادەوەرییەکانی شارەکەم


خالد مەحمود کەریم

ماستەر لە مێژوو


شارەکان چەشنی مرۆڤ ئەوانیش یادگەیان هەیە، هەروەها گوندەکان و وڵاتەکانیش. مرۆڤ ئەگەر یادگەی دۆڕاند دەبێتە کەسێکی نامۆ، لەدەستدانی یادگە بۆ مرۆڤ واتا ونبوون و سەرلێشێوان. ئەی ئەگەر شارەکان یادگەی خۆیان دۆڕاند؟

بێگومان ئەو شارانەی یادگەی خۆیان دەپارێزن، بە نرختر و ڕەسەنترن، هەمیشە یادگەی شوێن و خەڵکەکەی، مرۆڤ بۆ خۆیان ڕادەکێشن، ئەمە جیاوازییەکان دروستدەکات لە نێوان شوێنەکاندا. هەر شوێنە و یادگەی تایبەت بەخۆی هەیە، یادگەیەک کە ڕوخسارێکی جوان و بریقەداری هەیە، کە پێدەچێت لای خەڵکەکەی نەبینراوو هەستپێنەکراو بێت.

یادگە نیشتمانی نموونەیی یادەوەرییەکانە، ئەگەر یادگە چالاک نەبوو، یادەوەرییەکان دەمرن و دەفەوتێن، هەروەها یادگەی شوێنیش، کە هەندێ جار لەبەر گەلێک هۆکار، بەها و نرخی خۆی دەدۆڕێنێت و نامێنێت. یادەوەری باڵانسی ئێمەیە لە ژیاندا، بە تیاچوون و نەمانمان یادگەش دەمرێت. باڵانسی شارەکان و شوێنەکانیش دەشێت بە کرداری بکەرێک بمرێت، یان بەهۆی پشتگوێخستن وە یان ئەو کاتەی پێمانوایە نرخ و بەهایەکی ئەوتۆیان نییە، هەر ئەمەش وای کردووە زۆر شار و ناوچە، وێڵ و سەرگەردان بن، ژینگە و مێژوو خەڵک و کەسایەتییەکانی خۆی بدۆڕێنێت.

یادگەی هەر یەکێکمان پڕە لە یادەوەرییەکانی شوێنەکەی، گوندەکەی یان شارەکەی، شوێنگەلێک کە پێکیهێناوین و ناتوانین لە مێژووی خۆمانی

جیابکەینەوە.. یادگەی منیش پڕە لە یادەوەرییەکانی شارەکەم کەلار، کە نامەوێت بفەوتێت و هەوڵەدەم تیشک بخەمە سەریان، و بیانکەمە بەشێک لە یادگەی گشتی.

لە پاش نسکۆی ساڵی (١٩٧٥)، حکومەتی عێراق بڕیاریدا لەسەر سنوورەکانی لەگەڵ ئێران، تورکیا و سوریا، بە درێژایی (٣٠-٤٠) کم، لە قوڵایی خاکی کوردستان، پشتێنەیەکی ئاسایش دروستبکات و بیکاتە خاکێکی قەدەغەکراو (موحەڕەمە)، بڕیاریشیدا دانیشتوانی ئەو گوند و شارۆچکانەی دەکەوتنە ناو ئەو پشتوێنەیە، دووربخرێنەوە. ئەوەبوو لە پاش نسکۆی نێوبراو، هەزارەها خێزان کە ئاوارەی ئێران بوون، لە پاش دەرچوونی دەرکردنی بڕیاری لێبوردنی گشتی، ڕژێمی بەعس ڕێگەی نەدا ئەو خێزانانە بگەڕێنەوە سەر خاکی دێرینەی خۆیان. هەموویان پەراگەندەی پارێزگاکانی باشوور و ناوەڕاستی عێراق کران، هەر چەند خێزانیک و لە گوند و ناوچەیەکی باشووردا نیشتەجێکران. لێپرساوێکی عێراقی، لە تشرینی دووەمی ساڵ (١٩٧٥ز)دا، باسی لە نزیکەی (پەنجا هەزار) کورد کردووە، کە ڕاگوێزراون بۆ ناوچەکانی باشووری عێراق، بێگومان ژمارەکە زۆر لەوە زیاتر بوو.

خێزانەکەی ئێمەش یەکێک بوو لەو هەزارەها خێزانەی، گوندەکەیان بەر ئەو پشتێنە ئاسایشییە کەوت، پاش ئاوارەبوونمان بۆ وڵاتی ئێران، لە کاتی گەڕانەوەدا، دورخراینەوە بۆ یەکێک لە گوندەکانی ناحیەی گەرمە، لە پارێزگای ئەنبار. لەژێر فشاری بزاڤی ڕزگاریخوازی ئەو کاتەی کورددا، لە بەهاری ساڵی (١٩٧٧)دا، ڕژێمی عێراق ڕێگەی بە گەڕانەوەی خێزانە دوورخراوەکان بۆ کوردستان دا. زۆرینەی خەڵکی ئەو گوندانەی کەوتبوونە نێوان خانەقین و مەیدان، بەهۆی ئەوەی گوندەکانیان بوو بە بەشێک لە ناوچە قەدەغەکراوەکان، ناچاربوون بگەڕێنەوە بۆ قەزای کەلار و دەوروبەری.

ساڵانی یەکەمی نیشتەجێبوونی خێزانەکەمان لە کەلار، هەرگیز لە خەیاڵ و وێژدانمدا کاڵنابێتەوە، لە پاش گەشتێکی دووروودرێژ و تاقەتپڕوکێن، کە زیاد لە بیست و چوار کاژمێری خایاند! دەمەو نیوەڕۆیەک گەیشتینە کەلار. کە ئەو کات لە شارە دێیەک زیاتر نەبوو، ژمارەیەکی دانیشتوانی زۆر کەم، بازاڕێکی زۆر سەرەتایی و بچوک و هەژارانە و چەند گەڕەکێکی نارێک و پەرشوبڵاو.

لـه حەمـەی کەریـم ( گەرەکـی سـیروانی ئێسـتا)، لـە گۆڕەپانێکـدا دابەزیـن، کـە لـە سـاڵی دواتـردا (١٩٧٨ز)، قوتابخانـەی ( ئەڵـوەنی بنـەڕەتی) لەسـەر بونیادنـرا. هـەر لـە کۆڵانێکـی بەرامبـەر ئـەو گۆڕەپانەشـدا نیشـتەجێبوین، نزیـک ماڵـی حەمـەی کەریـم. جێـی ئاماژەیـە قوتابخانـەی ئەڵـوەن، یەکێـک بـوو لـەو چـوار قوتابخانـەی، کـە لـەو سـاڵەدا، لەلایـەن حکومـەتی عێراقییـەوە، بڕیـاری بونیادنانیـان لـە کـەلار دەرچووبـوو. هێنانی ئـەو هەموو بـەردە سـپییە، بـۆ بینـای قوتابخانـەی ئەڵـوەن و ڕێکخسـتن و داتاشـینیان لەلایـەن کرێکارەکانـەوە، تـا بـۆ بیناکـردن دەسـتبدەن، بـۆ ئێمـەی منداڵ زۆر سـەرنجڕاکێش بـوو. چەندیـن ڕۆژ پێـش دەسـتپێکردنی بیناکـە، بـەردەکان لـە قاڵبێکـی ڕێـک و گونجـاودا ئامادەدەکـران، ئێمـەی منـداڵ و پیـاوە بەتەمـەن و بێـکارەکانی گـەڕەک، لـە دەور دەسـتی ئـەو وەسـتایە کۆدەبوینـەوە، کـە بەشـێوەیەکی هونـەری و جـوان بـەردەکانی لـە بیناکـەدا ڕێکدەخسـت و بەکاردەهێنـا و بـە چیمەنتـۆ بۆشـاییەکانی پڕدەکـردەوە.

گەڕەکـی سـیروان لـە بناغـەدا گوندێـک بووە، کەسایەتی (حەمـەی کەریم)، لـە سـەرەتای پەنجـاکانی سـەدەی بیسـتەم ئاوەدانیکردۆتـەوە، سـەرەتا تەنها ماڵـی خـۆی بـووە، پاشـان ماڵـی برایـەک و چەنـد خزمێکـی پەیوەندییـان پێوەکـردووە. سـەرەتای ئاوەدانکردنـەوەی بـە ڕەشـماڵ و زنـج بـووە، پاشان بە قـوڕ و خشـت ماڵیـان دروسـتکردووە.

بەگوێـرەی بەڵگەنامەیـەک، کـە مێژووەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ (٢٢ شـوباتی سـاڵ١٩٦٠ز)، ماڵـەکانی حەمـەی کەریـم، بریتیبـوون لـە تەنهـا (٩) مـاڵ، ئەوانیـش ماڵـی حەمـەی کەریـم و فـەرەج کەریمـی بـرای و نەوەکانیـان بـوون. لـە سـاڵی دواتریشـدا حـەوت مـاڵ لـە خزمـەکانی، لـە گونـدی مچـە شـەلەوە هاتـوون و ئـاوەدانی زیاتریـان خسـتۆتە ئـەم شـوێنە.

قۆناغـی یەکەمـی گـەورەبـوونی گەڕەکـی حەمـەی کەریـم، دەگەڕیتـەوە بـۆ ڕۆژگارەکانی نسـکۆی سـاڵی (١٩٧٥ز)، کاتێـک بەشـێک لـەو خێزانانـەی، کـە نەیانویسـت لـە پـاش نسـکۆی نێوبـراو، ئـاوارەی ئێـران بـن، ڕوویـان لـە کـەلار کـرد و ڕاسـتەوخۆ لـە دەوروبـەری ماڵـەکانی حەمـەی کەریـم نیشـتەجێبوون، بەتایبەتیـش هەنـدێ لـە دانیشـتوانی گونـدەکانی: باریکـە، تـۆپ عەسـکەر، گاکـول، مـوسی عوسـمان، سـەنگەر و گۆڕەشـەلە.

قۆناغـی دووەمـی گـەورەبـوونی ئـەم گەڕەکـە، لەگـەڵ گەڕانـەوەی ئـەو خێزانانـەی کـە ئـاوارەی پارێزگاکانی باشـووری عێـراق ببوون دەسـتیپێکرد،

پاش گەڕانەوەی ئاوارەکان، تا دەهات گەڕەکەکە گەورەتر دەبوو، بەردەوام خانووی نوێی تیا بونیادەنرا، کە لە دروستکردنیدا قوڕ و خشت بەکاردەهێنرا.

هێشتا کارەبا پەیدانەبوبوو، خەڵکی ئەم گەڕەکە و گەڕەکەکانی تری ئەم شارە، بۆ ڕاییکردنی کارەکانی خانوو دروستکردن، سوودیان لە ئاوی ڕووباری سیروان وەردەگرت، کە ئەو کات لقێکی بە تەنیشت گەڕەکی حەمەی کەریمدا تێدەپەری. خەڵکی بە زۆری ئاویان بە جەوەنە و گوێدرێژ و یان بە مەنجەڵ و سەتڵ لە ڕووبارەکە دەهێنا. بۆ خواردن و خوارنەوەش، ژنان بەسەر ئاویان دەهێنا بۆ ماڵان، ئەو کۆڵانەی ئێمەی تیا نیشتەجێبوو، دەڕۆیشتەوە سەر کەناری ڕووبارەکە، کە بە درێژای ڕۆژ، هەر لە بەیانی تا ئێوارە، کاروانی ژن و منداڵی لێنەدەبڕا، ئیتر هەر کەسە و خەریکی ئەنجامدانی کارێک بوو، هەنێک ئاوی دەبرد و هەنێکی تر خەریکی قاپ و جل شوشتن بوون، هەندێک لە منداڵەکانیش لە تەنیشتیانەوە مەلەیان دەکرد، بەتایبەتیش لە کۆتایی وەرزەکانی بەهار و هاویندا.

بەلێشاو هاتنەوەی خێزانەکان لە باشووری عێراق، وایکرد خەڵکێکی زۆر ناچاربن، بەشێوەیەکی کاتی زنج دروستبکەن بە قامیش و حەسیر و تێیدا بژین. لەو ماوەدا سەدان ماڵم بینیوە کە لە کەپر و زنجدا ژیاون. لە بەرزاییەکی گەڕەکەکەدا، خەڵکانێک هەبوون لە دروستکردنی خانووەکانیاندا، دارو پەردووی خانووە داروخاوەکانی گوندەکانیان بەکاردەهێنایەوە. بێگومان بەزەحمەتییەکی زۆرەوە دەیانهێنایەوە. ڕووباری سیروان یارمەتیدەرێکی باش بوو، بۆ گواستنەوەی دار و قامیشی چەمی خورخوڕ و بەرلوت و سەنگەر، ئەمەش لەو ڕۆژگارە ناهەمووارەدا، بووە سەرچاوەی بژێوی خەڵکانێکی ئەم گەڕەکە.

لە گەڕەکی حەمەی کەریم، لەو شوینەی کەوتۆتە بەرامبەر قوتابخانەی (مرواری بنەڕەتی)، بازرگانێکی دارچنار و حەسیر هەبوو، بازاڕی زۆر گەرم بوو، ڕۆژانە دەیان منداڵ و مێردمنداڵ، بە برە پارەیەکی کەم، توێکڵی دارچنارەکانیان بۆ دەکردەوە، پێموایە هەر دارە و بە بیست و پێنج فلسی ئەو کاتە پاکدەکرایەوە.

ژمارەی ماڵەکانی گەڕەکی حەمەی کەریم، تا دەهات زۆرتر دەبوو، بە جۆرێک لە سەرژمێری (١٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧)دا، واتا پاش نزیکەی پێنج مانگ لە گەڕانەوەی ئاوارەکانی باشووری عێراق، ژمارەی خانووەکانی حەمەی کەریم گەیشتە (٤٤٩) خانوو، ژمارەی خێزانەکانیشی بەرزبوویەوە بۆ (٤٤٩) خێزان، کە تێکرا بریتیبوون لە (٤٠٦١) کەس، ئەم ڕێژەیەش دەیکردە ٤٤،٢% تێکڕای دانیشتوانی قەزای کەلار، کە بەگوێرەی سەرژمێری نێوبراو، بریتیبوو لە (٩١٧٧) کەس.

شانبەشانی بەرزبوونەوەی ژمارەی ماڵەکانی گەڕەکی حەمەی کەریم، هەر لەو قۆناغەدا بۆ لەخۆگرتنی ئەو ماڵە ئاوارانەی لە باشووری عێراق دەگەڕانەوە، لە چەند شوێنێکی جیاوازی کەلاردا، بناغەی چەند کۆمەڵگەیەک دانران، کە بریتیبوون لە کۆمەڵگەکانی: بەردەسوور، گازینۆ و پێنج سەد ماڵەکە، بەڵام کۆنترینیان ماڵە سەبەکانی بەرامبەر گەڕەکی حەمەی کەریم بوون، کە لە ئێستادا بە گەڕەکی سەرکەوتن ناسراوە.

یەکێک لەو شتانەی لە یادەوەریمدا جێگیرە، دیمەنی ئەو ژمارە زۆرەی مێردمنداڵ و گەنجانەیە، کە لە ڕووی بەردەمی گەڕەکی سەرکەوتن، کە تازە بناغەی خانووەکانی دانرابوو، لە تەنیشت ئەو تاوێر و بەردانەی، کە بۆ دروستکردنی خانووەکانی هەڵڕژابوون کۆدەبوونەوە، ئەوکات نە کارەبا و نە هیچ ئامرازێکی تر بۆ کات بەسەربردن نەبوو، ئەو مێردمنداڵ و گەنجانە، ئێواران هەروەها شەوانیش کۆدەبوونەوە، زۆرێکیان کاتیان بە هەڵماتێن (تەشیلان) بەسەردەبرد، کە یەکێک بوو لە بەربڵاوترین یارییەکانی ئەو ڕۆژگارە، زۆرجاریش زۆرانبازی و کێبەرکێی بەرزکردنەوەی بەردە قورسەکانیان دەکرد، ئەو بەردانەی بۆ دروستکردنی خانووەکان بەکاردەهێنران. یەکێک لە ناودارترین زۆرانباز و یاری بەرزکردنەوەی بەردە قورسەکان لەو کاتەدا، کەسێک بوو بەناوی (مستەفای ڕەحیم پلیس). قول قولان یەکێکی تر بوو لە یارییەکانی ئەو ڕۆژگارە، کە مێردمنداڵانی گەڕەک، بەتایبەت لەو شوێنانەی خۆڵ و لمی هەبوو، لە کەنار سیروان ئەنجامیان دەدا.

هەر لەو ساڵانەدا، بە دیاریکراوی لە بەهاری ساڵی (١٩٧٩)، ئیتر کەمە کەمە تۆپی پێ، وەک یارییەکی میللی، بووە بەشێک لە

خولیـای منـداڵانی گەڕەکـی حەمـەی کەریم، بیرمـە کۆمەڵێـک لـەو منداڵانـەی ئـارەزووی فێربـوونی (توپـی پـێ) یـان هەبـوو، لـە دەوری (ابراهیـم عەبدولڕەحـمان سـەعید- مامۆسـتا ابراهیـم) کۆبوبوونـەوە، ئـەو چەنـد سـاڵێک لـە ئێمـە گەورەتربـوو، ئەرکـی ڕاهێنـان و فێرکـردنی ئـەو یارییـەی لـە ئەسـتۆگرتبوو، لـەو شـوێنەی دەکەوێتـە بەرامبـەر شـاری یـاری، زەوییەکـی بـەردەڵان و نارێـک بـوو، پـاک و ڕێکخرابـوو، گۆڵـی لـە دار دروسـتکردبوو، ڕاهێنـانی جۆراوجـۆری پێدەکردیـن و بەگشـتی فێـری جوڵـە وەرزشـییەکانی دەکردیـن.

بۆ یەکـەم جار لـە هاوینـی سـاڵی (١٩٧٨)، لـەم گەڕەکـەدا ئاشـنابووین بـە سینەمای گـەڕۆک، کەسێک بەنـاوی (محەمـەد ئەمیـن سـەعداوی)، بـۆ یەکـەم جار (سینەمای گـەڕۆک)، هەروەهـا (کێبخانـەی گەڕۆک)یـشی هێنایـە قـەزای کـەلار. بیرمـە لەو شـوینەی ئەمـرۆ حەوشـەی (قوتابخانەی زانسـت)ە، لـە شـەوێکی هاوینـەی سـاڵی (١٩٧٨)، پـەردەی سـپییان بـۆ داتاشـۆی سـینەماکە هەڵخسـتبوو، تـا فیلمەکـەی پـێ نمایشـبکەن. بـە سـەدان منداڵـی حەمـەی کەریـم و دەوروبـەری، لەسـەر ئـەو زەوییـە دانیشـتبووین، بەچێژیکـی زۆر تایبەتەوە سـەیری فیلمە نمایشـکراوەکەمان دەکـرد. بێگومـان شـتێکی سـەرنجکێش و تایبەتبـوو، بـۆ کەسـانێک، کـە تـا ئـەو کاتـە ئامێـری تەلەفزیۆنیشـیان نەدیبـوو. دەزانـم فیلمەکـەی کـە نمایـش دەکـرا بیانیـی بـوو، بـەڵام بەداخـەوەم، نـە نـاوی فیلمەکـە، نـە وردەکارییەکانیـم بیـر نەمـاوە. جێـی باسـە، هێنـانی سـینەمای گـەڕۆک لـە سـاڵی دواتـردا دووبارەبوویـەوە، ئەمجارەیـان لـە کاتی نمایشـکردندا، شـەڕو پشـێوی دروسـتبوو، سـینەماکەیان دایـە بـەر بـەرد، بـەو هۆیـەوە چەندیـن کەسـیان گـرت و شـەوێکیش لـە بنکـەی پۆلیـس مانـەوە.

لـە سـەرەتاکانی هەشـتاکانی سـەدەی بیسـتەمدا، سـەعداوی بـۆ یەکـەم جـار کتێبخانـەی گەڕۆکـی هێنایـە کـەلار، لـە بـەردەم چایخانەکـەی سـاڵح چەتـاڵ دا دەوەسـتا، ئـەو شـوینەی کـە ئەمـڕۆ کراوەتـە چێشـتخانەی دەریـا، مـن بۆخـۆم لـە ڕێگـەی ئـەو کتێبخانـە گەڕۆکـەوە، کـە بریتیبـوو لـە ئۆتۆمبیلێکـی سـنووقی، لـە ناوەڕاسـتی هەشـتاکانی سـەدەی بیسـتەم دا، ئاشـنای بەشـێک لـە بڵاوکـراوە و گۆڤـارەکانی ئـەو ڕۆژگارە بـووم، لەوانـە گۆڤـارەکانی ئەلـف بـاء و الحـوادث، هەروەهـا ڕۆژنامـەی المحرر، کـە لـە فەرەنسـا دەردەچـوو.



# له لیواکه دابه‌زین هه‌یه!

## (ئەزموونی مامۆستایەك، كە یەكەم دامەزراندنی لە كەلار بووە)

كامیل محه‌مه‌د قه‌ره‌داغی

ماسته‌ر زمانی ئینگلیزی

هاتەوە یادم شەوێکی قەندیل
هێنایە گریان دڵەی مات و دیل
ئەو دەستەی لەوێ بەفراو ئەتەزاند
داخ کراوە لێرە بە ئاگر و ژیل
بە دەم ڕێگەوە بە نوکتە بازی
پیشانمان ئەدا وەزعی ناڕازی
نەمان ئەزانی، چۆن ئەبڕێ وا زوو
ڕێ ی دووری بەرە و لوتکەی هەورازی

شیعری شه‌هید مه‌لا عه‌لی

(١)

هەر لە پردەکەی قەترەوە، تەمی ڕوباری سیروان وەک پەردەیەکی سپیی تەنک داباریوەتە سەر ڕێگای هاتوچۆکە و باران و شێی شەوی ڕابوردووش وای کردوە، شەقامە یەک سایدەکەی هاتوچۆکردن بەرەو کەلار بە ڕەنگێکی تۆختر بێتە پێش چاو.

لە کۆستەرێکداین، کە بیست و یەک دانە نەفەری تێدایە و تەمی دەمی نەفەرەکان، جامەکانی پاسەکەی تەڵخ کردوە و بینینی دەرەوەی ئەستەم کردوە، درێژیی ڕێگاکە وادەکات زۆر بابەتی دەمەتەقەی

گەشتیارەکان تێکەڵ بە یەکتری بىن. کۆستەرەکە وەک مارێک لەگەڵ پێچ و لۆفەی شەقامەکەدا لۆقەی دێ و بە گوڕەگوڕی قورسی دەنگی مەکینەکەیەوە دەیەوێت بگاتەوە بە هەوار، هەموان بۆ کەلار دەچین.

پێش گەیشتن بە فولکەی یەکەمی ناوشار، شۆفێرەکە هاوار دەکات: کێ بۆ ناو کەلار ئەچێ، با لەیرە دابەزێ، تا گەراج ناوێسم.

منیش یەکێکم لەوانەی، کە لە فولکەی یەکەم دادەبەزم، یەکەم جارمە دێمە کەلار، لە ناوەڕاستی فولکەکەدا پەیکەری دوو ئاسکی لە برۆنز دروستکراو دەبینم، کە بەبەرزییەوە دانراون، گۆرانییەکم بیر دەکەوتەوە کە دایکم زۆر حەزی لێی بوو: [یەژی ئاسکەکەی دەشتی کەلاری].

لەگەڵ تێکەڵبوونم بە خەڵکدا دەکەومە پرسیاری ئەو شوێنەی، کە بۆی هاتووم[ئامادەیی پیشەیی کەلار]، هەندێک پێم دەڵێن لە حەمەی کەریمە و هەندێکی تریش دەڵێن لە گەڕەکی فەرمانبەرانە، تا دواجار ئەفەنییەکی لاجانگ سپیی باڵابەرز ئیشەکەم بۆ ئاسان دەکاتەوە و دەڵێت، کاکە هەر بە ئەم ڕاستە جادەدا بڕۆ تا ئەگەیت بە مەکتەبەیەک لە لەوحی ڕەنگی کەوە دروست کراوە، لەوێوە لابدە، کە جادە سەبەکە بوو بە خۆڵ سەیر بکە، ئەو ئامادەییە لەپێش چاوتە.

بەرواری ئەو ڕۆژە ١٩٩٣/١١/١٣ یە و منیش وەک مامۆستایەکی تازە دامەزرێندراو لە سلێمانییەوە نێردراوم بۆ ئامادەیی پیشەیی کەلار، بە ناو گەڕەکی فەرمانبەراندا دەڕۆم و هێشتا پێش نیوەڕۆیە و بارانی شەو شەقامە سەبەکەی بە باشی شۆردۆتەوە و منییش دەمەوێت بگەم بە ئامادەییەکە، ئەوەی سەرنجم ڕادەکێشێت ئەوەیە

لەسەر دیواری هەموو حەوشەکانی گەڕەکی فەرمانبەرانەوە داری پرتەقاڵ پەل و پۆیان لێ بڵاوکردۆتەوە و زۆربەشیان گوێزیلکەی پرتەقاڵی سەوزیان پێوەیە و خەریکە بگەن.

لە ناوەندێکی دابڕاو و چۆڵدا، لە بەینی گەڕەکی فەرمانبەران و حەمەی کەریمدا ئامادەییەکە دەبینم، بەڵام بۆئەوەی بگەم بە ئەوێ دەبێت بە ناو قوڕدا بڕۆم، خەمم لێهات، قوڕی زۆر دەنیشێتە سەر پێڵاوەکانم و ئەوەیان پێوە دیار نامێنێت، کە تازە بۆیاخ کراون، جانتاییەکی ڕەشی بچوکم لەشاندایە، کە ناوبەناو وەک دیکۆر ڕەنگی خۆڵەمێشیی تێکەڵ کراوە، هەر جێگەی پانتۆڵێک و خاولییەک و دوو کراس و دوو سابون و تاقمی ڕیش تاشین و ددان شوشتنێکی تیادا دەبێتەوە، لەڕاستیدا خۆشم هەر ئەوەندەم پێ بوو.

هەر هێندە دەزانم، کە من دەبێت لەوێ وەک مامۆستا دابمەزرێم، ئیتر زۆر بیرم لە گریمانەکانی تری دوای ئەوە نەکردبۆوە،چونکە تەمەنم بیست و دوو ساڵ بو و لە دەستی نەداری و بێکارییەکی سەخت هەڵهاتبووم. بوون بە مامۆستا بۆ من لە ئەوکاتەدا باشترین گریمانە بوو، کە بیری لێ بکرێتەوە.

دەچمە ژورێ بۆ ناو ئامادەییەکە، بەدوای ئەو شوێنەدا چاو دەگێڕم، کە لێی نوسرابێت [بەڕێوەبەر] لە پڕدا مامۆستایەکی تەمەن ناوەندیی باڵا بەرزی [چاو کەوە] دێتە پێشم و فەرموم لێدەکات، بەرگێکی پۆشتەی جوان و قاپوتێکی ئەورووپیی یەخەفەروی لەبەردایە، دووایی تێدەگەم، کە ئەم بەڕێزە یاریدەدەرە، ناوی [ئەنوەر موحەمەد موراد] ە. من پێیدەڵێم، کە دەمەوێت بەڕێوەبەر ببینم، فەرموی لێکردم بۆ ژوری ئیدارە و گوتی ئەبێت هەندێک چاوەڕوان بکەیت، چونکە ئێستە بەڕێوەبەر لە ناو تەلەبەکانە و دێتەوە.

بەڕێوەبەر دێت و بەخێرهاتنم دەکات، [مامۆستا حسین زۆراب محمد – ئەندازیاری کشتوکاڵی] جارێکی تر خۆم دەناسێنمەوە، کە من مامۆستای تازەم و بۆ ئێرە نێردراوم، یەکەم پرسیاری مامۆستا حسەین لە من ئەوە دەبێت،[تۆ ماڵت لێرەیە؟] من دەڵێم [نەخێر] ئەو دەڵێت، ئەی بۆ شوێن چی دەکەیت، منیش پێی دەڵێم [بەنیازم لە ناو بینای مەکتەبەکەدا بمێنمەوە، ئەگەر شوێن هەبێت و ئێوە ژورێکم بدەنێ] مامۆستا حسەین تێدەگات، کە ئەوەی من باسی دەکەم شتێکی ئاسان نییە، بەڵام لەبەرنەبوونی هیچ چارەسەرێکی تر، دەڵێت، باشە شوێنت بۆ دابین ئەکەین، بەڵام تا ئەوەندە ئەو ژورە دەڕەخسێت، وەرە لە ماڵی ئێمە بمێنەرەوە.

وادیارە مامۆستا ئەنوەر لەلای مامۆستاکان هەواڵی هاتنی مامۆستایەکی تازەی داوە، کە لە سلێمانییەوە دێت و شوێنیشی نییە، بۆیە ناو بەناو و یەکەیەکە زۆریان دێن و بەخێرهێنانم لێ دەکەن.

من لە وەڵامی پێشنیاری میواندارییەکەی بەڕێوەبەردا سوپاسگوزاری دەردەبڕم، بە زوویی لەوە تێدەگەم، کە ئەولە ناو ئیدارەی خوێندنگەکەیدا بەرپرسە لە کارەکانی من، نەوەک لە ناو ماڵەکەی خۆیدا، بۆیە پێی دەڵێم شوێنێکی مانەوە شک دەبەم، دەتوانم لەوێ بمێنمەوە تا پێکەوە ئیش لەسەر ئەوە دەکەین ژورێک بڕەخسێنین و وای لێ بکەین، کە کەڵکی تیادا مانەوەی هەبێت.

(٢)

پەلامارە بەدناوەکانی هێرشی ئەنفالی ساڵانی ١٩٨٨ و ١٩٨٩ ولە پاش ئەویش ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ ی خەڵکی کوردستان، دوو خاڵی وەرچەرخانی گەورەی ناو مێژووی نوێی ئێمەن، کاریگەری و شەقڵ و شوێنکەوتەیان هەرگیز لەسەر ژیانی خەڵکی ئێمە کەم نابێتەوە.

دوژمنەکەمان تێگەشتنی قووڵی لەسەر کۆمەڵی کوردی هەبوو. بۆیە دەیزانی لێدان و سوتان و داگرتنی ئاواییەکانی ئێمە، بریتییە لە لێدانی ژێرخانی ئابوریی کۆمەڵگەیی خەڵکی ئێمە و مایەپووچکردنیشی. بۆیە بە مەبەست و بەرنامەی تەواوەوە لێدان و سوتانی تەواوی گوندەکانی کرد بە بەرنامە.

ئەگەر لە ڕوانگەی کۆمەڵناسییەوە سەیری کۆمەڵی کوردەواریی ساڵانی هەشتاکان و نەوەدەکان بکەین، دەبینین، کە ئەم کۆمەڵگەیە پێکهاتەیەکی جوتیاری و کستیاریی هەیە، شوانکارەیی دەکات، بەڵام چاوی کەوتوە بە ژیانی شارنشینی و خەریکە ڕسکانێک تیایدا ڕوودەدات بۆئەوەی لە نێوانی شێوازی بەرهەمهێنانی جوتیاری و شێوازی شارنشینی و موچەخۆریدا خۆی یەکلایی بکاتەوە. لە پاش ڕوداوە گەورەکانی ١٩٨٨ شانسی دەست گرتن بە شێوازی بەرهەمهێنانی جوتیاری زۆر کەم بوبۆوە، چونکە سەرچاوەکانی بەرهەمهێنانمان لە ئاواییەکاندا کوێر کرابونەوە و زەوییەکانیش خرابونە ناو سنوری حەرام کراوەوە، کەس بۆی نەبوو پێیان بگات و بیر لەوە بکاتەوە وەک سەرچاوەی بەرهەمهێنان سوودیان لێ وەربگرێت. ئەم کارەساتە ئابورییە، کە تا ئاستێکی زۆر کۆتایی بە شێوازی بەرهەمهێنانی ئاژەڵدارییش هێنا، لە ڕۆژگارێکدا بوو، کە تەواوی بونیادی ئابوری و سیاسیی دەوڵەتی عیراق بەدەست

نـۆ ســاڵی شــەڕی کوشــندەو کارەســاتباری دژی ئێرانــەوە تەپیوبــوو، کار گەشــتبوو بــەوەی دەزگا ئەمنــی و موخابەراتییــەکان مــاڵ بــە مــاڵ دەگــەڕان ئاڵتونیــان لــە ژنانــی نــاو ماڵــەکان دەســەند و دەیانگــوت دەبێت (ئاڵتونەکانــی خــۆت -یــان هەندێکیــان- تەبــەڕوع بکەیــت بــۆ قادســیەی ســەدام).

بۆیــە کــە بەهــاری ســاڵی ١٩٩١ ئەگــەری ڕاپەڕینــی خەڵکــی کوردســتان هاتەپێشـــەوە، هەمـــوو خەڵکـــی خۆمـــان تەنهـــا لایەنـــە سیاســـییە چــاوەڕوان کراوەکــەی بەرهەمــی ڕاپەڕینــمان دەبینــی، کــە بریتــی بــوو لــە ڕزگاربــوون لــە دەســتی ڕژێمــی ســەدامی ئەنفالچــی، هەمووشــمان کارمــان بــۆ ســەرخســتنی کــرد.

گەیشــتنی ڕاپەڕیــن بــە شــاری کەرکــوک لــە ئێــوارەی نــەورۆزی ١٩٩١ و شـــەڕکردنی خەڵکـــی کەرکـــوک و پێشـــمەرگە و بەرنگاریکردنیـــان هەتــا شــەوی ٣١ ئــاداری ١٩٩١ داســتانێکی گــەورە و مێژوویــی بــوو، بــەڵام کــە لــە ئەوشــەوەدا خەڵــک و پێشــمەرگە لــە کەرکــوک شــکان، ئیــتر دەســکەوتی ســەرکەوتنی داســتانی ڕزگارکردنــی شــارەکانی تــری کوردســتانیش بــە کەرکوکــەوە کەوتنــە بــەرمەترســی و ئیــتر ئەوەبــوو کۆڕەوەکــەی یەکــی نیســانی هەمــان ســاڵی بــەدوادا هــات، کــە هەمــوو، یــان زۆربــەی دەســتکەوتەکانی ڕاماڵــی.

کــۆی ئــەم ئاڵۆزییانــەی کە لە ئــەم چەند دێــڕەدا باســکران، هەلومەرجێکی ئابوریــی قــورس و گرانبونــی کاڵاکان و ئەســتەم بونــی ژیانیــان بــۆ زۆربــەی خەڵــک دروســت کردبــوو. ژیــان لــە ئــەم وڵاتــەی خۆمــان زۆر قــورس بــوو. ئەوکاتــەی کــە دنیــا ســەیری ڕوداوەکانــی ڕاپەڕینــی کوردســتانیان دەکــرد، لــە دیــوی دەرەوەی عیراقــەوە هەمــوو خەڵــک گوێیــان لــە ڕاگەیاندنــە عیراقییــەکان دەگــرت، بۆئــەوەی بزانــن کــە داخــۆ ئــەوەی لــە نــاو باکــوری عیراقــدا ڕوودەدات چییــە، لــەوێ دەگوزەرێــت؟

عیراقیش هەموو پرۆسەکەی ناونا [ئاژاوەی کۆمەڵێک خەڵکی فەوزاچی، کە بە زوویی کۆتاییان پێ دەهێنرێت]. بەڵام کۆڕەوی گشتیی خەڵک، وای کرد، جیهان بیر لە شتێکی تر بکاتەوە، کە ڕاگەیاندنەکانی دوڵەتی عیراقی هەرگیز دانیان پێدانەدەنا، ئەویش بوونی خەڵکێکی چەوساوەییە، لە ناو کوردستانی عیراقدا، کە بۆ پاراستنی ژیانی خۆی ڕاپەڕیوە. ئەوەبوو، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هاتنە ناوەوە، ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٩١ دا بڕیاری ٦٨٨ ی بۆ پاراستنی خەڵکی کوردستان دەرکرد، بڕیاریدا بەبێ گوێدان بە کاردانەوەی حکومەتی عیراقی، ڕێکخراوە مرۆڤدۆستە نێودەوڵەتییەکان بنێرنە ناوەوەی کوردستان بۆ خزمەتکردنی خەڵک و دوای ئەوەش هێڵی پانیی ٣٦ یان کرد بە ناوچەی دابڕاو لە فڕۆکە جەنگییەکانی عیراق و ناویان نا {ناوچەی دژەفڕین}.

بە ئەم بڕیارە نێودەوڵەتییانە جۆرێک لە ئارامی لە ناوچەکەدا هەستی پێکرا، ئەوکەسانەی کە ئاوارە بوبون، گەڕانەوە، گەڕاوەکان لەلای ئاژانسەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان ناوی خۆیانیان دەنوسی بۆئەوەی لە سەرلەنوێ نیشتەجێبونەوەدا هاوکاری بکرێن. بەڵام گەمارۆ ئابورییەکان [ئەوەی سەر عیراق و، لە ناوەوەی عیراقیشدا ئەوەی سەر کوردستان هەر بەردەوام بوون.]

هاتنەناوەوەی ڕێکخراوەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ کوردستان لە کاتێکدا بوو، کە زۆربەی فەرمانگە حکومییەکانی سەر بە دەوڵەتی عیراقی لەناو هەرێمدا دەستیان کردبۆوە بە کارکردن، بەڵام لە ئاستی فەرمیدا دایرە ئەمنی و سەربازییەکان نەگەڕابونەوە. بەڵام لە ڕۆژی ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١ حکوومەتی عێراق دەستی کرد بە کێشانەوەی تەواوی دامودەزگا ئیدارییەکانی سەر بە خۆی لە ناوچەکانی کوردستان. کە ئەوان کشانەوە حەوت حزبی

کوردستانی، کە ناویان [بەرەی کوردستانی] بوو، هەوڵیاندا بێ ئیدارەیی ناوچەکە ئیدارە بدەن.

بەڵام ئەم سەردەمەش دیسانەوە ژمارەیەکی کەم لە خەڵک دەیانتوانی لە کۆمەکە نێوودەوڵەتییەکان سودمەندبن و بەدەر لەوە ژیان زۆر قورس بوو. بەهای دیناری عیراقی زۆر نزم بوو،نرخی کاڵا و شتومەکەکان بەشێوەی ئاگرین بەرزبونەوە.

ئەو دەمە من گەنجێکی تەمەن بیست و یەک ساڵ بووم، سێ ساڵ بوو، لە پەیمانگای کەرکوک خوێندنم تەواو کردبوو، بە بێکاری مابومەوە، لەبەرئەوەی کە پارەم نەبوو دەستم بە هیچ کارێکدا نەدەگەشت، ڕۆژانە چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد، کە باوکم لە موچە کەمەکەی خۆی هاوکارییەکم بکات. کە دیارە ئەوەش بەشی هیچی نەدەکرد.

بێکاریی زۆرم چەشت، بەڵام خواست و داواکاریی زۆرم نەبوو، کاتی زۆرم لە ماڵەوە بەسەردەبرد، زوو زوو دەگەڕامەوە لای کتێبەکانم، کە هەر لە قۆناغی سەرەتایی خوێندنەوە کتێبی زۆرم بۆ خۆم کۆکردبۆوە، ساڵان و مانگانێکی زۆرم بە خوێندنەوەوە بەسەردەبرد و باکم نەبوو، کە گیرفانم چۆڵن و هیچیان تیادا نییە.

باوکی من پۆلیس بوو، ساڵی ١٩٧٣ دامەزرابوو، لەبەرئەوەی بڕوانامەی هەبوو، لە ساڵی ڕاپەڕینەکەدا پلەی گەشتبوو، بە کۆمیسیۆن [مفەوەز]. کە موچەکەی خراپ نەبوو. بەڵام بەرەی کوردستانیی ئەوکاتە دەزگای پۆلیسی بە دەزگایەکی سەر بە حکومەتی عیراقی هەژمار کرد، لەبەرئەوە هەمو پلەدارەکانیانی لەکارخست، بە باوکی منیشەوە، هەموویانی بە زۆرەملەیی خانەنشین کرد. بۆیە ئیتر موچەکەی باوکیشم نەما.

چاو کەوتە سەرمن، کە ئایا من لە بارودۆخێکی وەهادا دەتوانم چی بکەم، ئێ منیش هیچ پیشەیەکیشم نەبوو، بە ناچاری چاکەتێکی شینم پەیداکرد و ڕوم کردە بازاڕ، گوتم ئەچم حەماڵی دەکەم. ئەوەم نەدەزانی، کە حەماڵی کردنیش پێویستی بە توانای لەش و باڵای بەرز هەیە. کە لەڕاستیدا من هیچیانم نەبوو، لە ناو حەماڵەکاندا دادەنیشتم، بۆ ئیش، کەچی کەس نەبوو بانگی من بکات، لەبەر سیسی و لاوازیی لەشولارم لە ئەو کاتی ئیشکردنەدا. ڕۆژگارمان قورس بوو.

پاشان لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩١ دا بەرەی کوردستانی بیری لە دروستکردنی حکومەتێکی خۆجێی کردەوە، ئەوەبوو ئەنجومەنێکی ١٥ کەسییان لە هەموو حزبەکان راسپارد کە وەک ئەنجومەنێک بکەونە کارکردن لەسەر دروستکردنی حکومەت. ئەم ئەنجومەنە لە رۆژی ١٩٩١/١٢/٢٣ وە تا ١٩٩٢/١/٢٨ بە بەردەوامی کۆبونەوەی کرد تا لەم بەروارەی دوواییدا گەشتن بە بڕیاری گەڵاڵەکراوی خۆیان لەسەرئەوەی پەرلەمانێک بۆ کوردستان دروست بکەن، بڕیارەکەی خۆیانیان ناولێنا [یاسا] و گوتیان ئەمە یاسای ژمارە [١] ی یاسای هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان- عیراق ە . سەرکردایەتیی بەرەی کوردستانییش یاساکەی پەسەند کرد و پێنج مانگ بۆ پرۆسەکە دانرا و ئەوەبوو، لە رۆژی ١٩٩٢/٥/١٩ دا یەکەم دەنگدان بۆ پەرلەمانی کوردستان ئەنجام درا. پاشان ئەو پەرلەمانە دروستکردنی حکومەتی لێ کەوتەوە، کە حکومەت گەڵاڵە بوو، دەستی بەسەر سەرچاوەی داهاتدا گرت، هەموویی بردەوە لا خۆی، ئەوانەی لە حکومەتدا بوون تێگەشتن کە کێکی دەستەڵات مانای چی دەدات، ئیتر جارێکی تر شەڕی ناوخۆ وەک ئەڵتەرنەتیڤێکی خراپی حوکمداری خۆیی سەپاندەوە.

## (٣)

ئەنفال وەک شەپۆلی سەختی لافاوێکی شووم زۆربەی جوانییەکانی ژیانی ئێمەی ڕامالی. ئەو دوو ساڵەی کە ئەنفال ڕوویاندا و شۆڕشی کوردییش بە گشتی بەرگەی پەلامارەکانی نەگرت و لەبریی مانەوە و شەڕکردن، هەڵاتنی هەڵبژارد، نائومێدیی گەورەی لەلای خەڵک دروست کرد، نائومێدی، وەک کپبونەوەی دەنگی تەقەی ناو چیاکان [کە پشت و پەنای کورد بوون] کەشێکی ڕەشبینی و نائومێدبوونی بەسەر هەمواندا زاڵ کرد، ئێمەی گەنجی ئەوکات و ڕۆژگارە ئومێدی گەورە و جوانمان لەسەر شۆڕشەکانی کورد هەڵچنی بوو، هەر پەرتوک و بڵاوکراوەیەکی ئەوان بگەشتبایەتە ناوشار ، ئێمە بە پیرۆزی وەرمان دەگرت و بە نهێنیش دەمانخوێندنەوە. بۆیە کۆتاییهاتنە قورسەکەی ئەوان لە ئەنفالدا بۆ ئێمە زۆر قورس بوو. ئەزم نەدەکرا. ئەوان ڕۆشتن و ئێمە پەخشنامە و بڵاوکراوەکانی ئەوانمان هەر بە پیرۆزی لەلای خۆمان هێشتبۆوە و سەرباری مەترسییدارییەکەیان هەر دەمانپاراستن.

لە پاش ئەنفالەوە [حزبی کۆمەنستی کرێکاریی ئێران] هەوڵیدا ئەو بۆشاییە سیاسییە پڕ بکاتەوە، کە حزبە چەکدارە سیاسییەکانی کوردستانی عیراق لەپاش خۆیان بەجێیان هێشتبوو. خۆیی وەک ئەڵتەرنەتیڤی جێگرەوەی ئەوان ناساند و پێشکەش کرد و ئەمەش سەرنجی زۆر کەسی ڕاکێشا.

پاش ئەنفال و هاتنەناوەوەی حزبی کۆمەنستی کرێکاریی ئێران و دەرکەوتنی مەنسووری حیکمەت، وەک کەسێکی مونەزیر و تیۆریستی ئەو حزبە و تەرجەمەکردنی نوسینەکانی ئەو بۆ سەر زمانێکی کوردیی تایبەت بە کۆمەنستەکان، کاریگەرییان هەبوو. من خۆم لە ساڵی ١٩٨٩ دا لە کەرکوک چاوم بە کەسایەتییەکی

ئـەوان کـەوت، کـە وابزانـم، ئەوەنـدەی لەبیـرم مابێـت، نـاوی [سـادقی کەمانگەر]بـوو، هەندێـک پرەنسـیپی بنچینەیـی چەپـڕەوی لـە ئـەوەوە فێربـووم.

ئەودەمـە مـن وام دەزانـی، ئـەو ئاراسـتە چەپڕەوییـە نوێیـە، کـە خەریکـە شـێوە دەگرێـت، هـەر تەنهـا شـتێکە تایبەتـە بـە ئێمـە، کـە چەنـد گەنجێکـی خوێنـەری باشـی نـاو پەیمانـگای تەکنیکیـی کەرکـوک بوین، بـەڵام دووایـی بـۆم ڕوون بـۆوە، کـە مـن کاتێـک بـە مەسـەلەکەدا گەشـتووم، خەڵکـی تـر دوو ڕێکخـراو و ئینشیقاقێکیشـیان دروسـت کـردوە. بەهەرحـاڵ ئەودەمـە قسەوباسـەکان لەسـەر مانیفێسـتی حزبـی کۆمەنسـتی بـوون، پرسـیاری گـەورەی بوارەکـە ئەوەبـوو، کـە ئەگـەر کوردسـتانی عێـراق، بیەوێـت باڵێکـی [ح ک ک ئ] بـۆ خـۆی دابمەزرێنێـت، ئایـا دەتوانێـت ڕێـک بەرنامـە و مانیفێسـتەکەی ئـەوان بهێنێـت و لێـرە کاری خۆیـی پـێ بـکات، یـان بـۆی هەبـوو بەرنامـەی تایبـەت بـە خـۆی لـە کایـە فکرییەکـەی ئەوانـدا دابنێـت، کـە ئەودەمـە ئێمـە پێیـان دەگـوت [بەرنامـەی موشـەخەس].

هـەر ئـەم تـۆزە بیرکردنەوەیـە دوو ئاراسـتە و پاشـان دوو حزبـی چەپڕەوی دژ بەیەکـی دروسـت کـرد، ئەوانـەی کـە پێیـان وابـوو کوردسـتانی عێـراق پێویسـتی بـە بەرنامـەی موشـەخەس نییـە و ئێمـەش ڕاسـتەوخۆ بەرنامەکـەی [ح ک ک ئ] دەهێنیـن و لێـرە کاری پـێ دەکەیـن، بـوون بـە حزبێـک ناویـان لـە خۆیـان نـا [ڕەوتـی کۆمەنسـت]، ئەوانەشـی کـە بۆچونیـان وابـوو، کـە بەرنامـەی نـاو ئێـران بـۆ ئێمـە نابێـت و ئێمـە تایبەتمەندیـی جیاوازمـان هەیـە لـە ئەوانـەی ئێـران، ناویـان [دەسـتەی پێشـڕەوانی پرۆلیتاریـا] بـوو، کـە مـن سـەر بـە ئەمـان بـووم، ئێمـە دەمانگـوت، لـە ئێـران کـە خەڵـک لـە دژی دەسـتەڵاتی دەوڵەتـی سـەرمایەداری شـەڕ دەکـەن، زیاتـر شـەڕی مەزهەبـی دەکـەن، بـەڵام

کایەی ڕوداوەکانی لای ئێمە لە بواری مەزهەبیدا نییە، بەڵکو لە بواری قەومیدایە. بۆیە ئێمە وامان دەزانی کە دەبێت کوردستانی عیراق بەرنامەیەکی تایبەت بە خۆیی هەبێت.

من کە ئێستە لە پاش سی ساڵێکەوە وەک مێژوو ئەم شتانە باس دەکەم دەبێت ئاماژە بە ئەو ڕاستییەش بدەم، کە من لەوێدا کۆمەنستێکی ئاسوودە نەبووم، بەڵام هۆکاری مانەوەم ئەوەبوو، کە جێگرەوەی ترمان بۆئەوان لەبەردەستدا نەبوو.

بە هەرحاڵ من کە وەک مامۆستا دامەزرام و هاتمە کەلار، خوێنەرێکی باش بووم، کۆی ئەم کێشانە و دەیان کێشەی تری فکری و فەلسەفی لە مێشکمدا بوونیان هەبوو. لەبەرئەوە بێ ئاگا نەبووم.

(٤)

لە ساڵی ١٩٩٣ دا چەند پلەیەکی خاڵی بۆ دامەزران لەسەر پەروەردەکانی گەرمیان ڕاگەیەندرا و منیش لە خوام دەویست، کە یەکسەر داواکاریی دامەزاران پێشکەش بکەم. چووم پرسم بە باوکم کرد و گوتم کاکە دەمەوێت دابمەزرێم بە مامۆستا، تۆ دەڵێیت چی؟ یەکەم پرسیاری ئەو، ڕاستەوخۆ ئەوەبوو، کە گوتی لە کوێ؟ چونکە ئەو دەیزانی، کە هەر کەس وەک مامۆستا دابمەزرێت، دەبێت چەند ساڵێک لە دەرەوەی شارە گەورەکان خزمەت بکات. من گوتم دوو بژاردەم لەبەر دەستدایە، یان چەمچەماڵ یان کەلار، لەبەرئەوەی ئەو پەروەردەیەی کە پلەی وەزیفیی هەیە بۆ ئەو دوو شووێنە دەیەوێت، پەروەردەی گەرمیانە. باوکم گوتی: چەمچەماڵ نزیکترە، بەڵام کەلار سەلامەت ترە. مەبەستی ئەو، لە ناسەلامەتییەکەی

چەمچەماڵ ئەوەبوو، کە لە ئەو ساڵانەدا لەبەرئەوەی هێڵی سی و شەش دەکەوتە نزیکی چەمچەماڵەوە و لە بانی مەقان بوو، ڕژێمی نەفرەتیی بەعس بە بەردەوامی لەوێوە تۆپبارانی ناو چەمچەماڵی دەکرد و خەڵکی بێتاوانی ئەوێی دەکوشت. ڕێک کەوتین کە داوای کەلار بکەم و هەرواشم کرد.

بەهەرحاڵ باسی ئەوەمان کرد، کە چۆن گەشتم بە ئامادەیی پیشەیی کەلار. لە ڕۆژی دووەمی دەوامکردنی مامۆستاییمدا، چومەوە ئیدارەی قوتابخانە، هەندێکی مامۆستایان هاتنەوەکەمیان بەلاوە سەیر بوو، چونکە وای بۆچووبون، وەک ئەو مامۆستایەی پێش من لە سلێمانییەوە بۆیان چوبوو، تەنها ڕۆژی یەکەم لەوێ بمێنم و ئیتر بڕۆمەوە، بەرگەی کارکردنی ناو ئەو شوێنە دووردەستە نەگرم، بەڵام لای من شتەکان وا دەرنەچوون، لە ئەو بەروارەی ڕۆژی دووەمەوە من تا پێنج ساڵی دواتر لە کەلاردا مامەوە.

لەبارەی وانە وەرگرتنیشەوە، لەگەڵ مامۆستا ئەنوەری یاریدەدەردا هەندێک قسە کەوتە نێوانمانەوە، ئەو گوتی حەفتەی پازدە وانەی کرداری و پێنج وانەی تیۆرییت لەگەڵ پۆلی سێیەمی بەشی کارەبادا بۆ دادەنێم، کە هەموی دەکاتە بیست وانە و زۆر باشە، بەڵام من دەمزانی کە پۆلی سێیەمی پیشەسازی واتە تاقیکردنەوەی گشتی و بەکالۆری، بۆیە گوتم من ئەمەی ئێستە یەکەمین دامەزراندنمە، پێشتر ئەزموونی وانەگوتنەوەم نییە، لەبەرئەوە نامەوێت وانەی پۆلی سێیەکان وەربگرم، بەدەر لە ئەوان هەر قۆناغێکی ترم بۆ دابنێن ، کێشەم نابێت دەیانڵێمەوە، مامۆستا حسەین ۆرابی بەڕێوەبەر قسەکەی منی پەسەند کرد و حەزی لەوە هەبوو کە گۆڕانکارییەک بکات و من پۆلی سێیەم وەرنەگرم، بەڵام مامۆستا ئەنوەر کە یاریدەدەری بەشە کردارییەکان بوو سور بو لەسەر قسەی خۆی،

گوتی نەخێر، بواری هەڵبژاردەی ترمان لەبەردەستدا نییە، ئەوەمان هەیە، دەیلێیتەوە، فەرمو بیلێرەوە و ئێستە بچۆ بۆ پۆلەکەت، ئەگەر نایلێیتەوە، ئەوە بە کەڵکی ئێمە نایایەیت هەر ئێستە بە نوسراوێک دەتگەڕێنمەوە بۆ پەروەردە داتبنێن بۆ شوێنی تر، بۆیە بە نابەدڵی پەسەندم کرد بچمە پۆلەوە. سەرۆکی بەشی کارەبا بریتی بوو لە مامۆستا (بەرزان غەیدان زەندی کوڵەجۆیی) کە هاوڕێیەکی زۆر دڵساف و دڵسۆز و بەوەفا بوو، لە یەکەم حەفتەی پەیوەندیکردنمەوە ئەم مامۆستا بەرزانە وەک هاوڕێیەکی دڵسۆز و وەک برایەکی بە ئەزموون پشتگیریی لێکردم، دەرگای ماڵی خۆیی بۆ خستمە سەرپشت، من ڕازی بومایە یان نا، ئەو هەر بەزۆر دەیبردمەوە ناو ماڵی خۆی و ئەمجا خۆی و خێزانە گەورە و شەریفەکەشی، منیان وەک برابچووکی خۆیان پەسەند کردبوو، بەبێ ئەوەی بە ڕوونی ئەوەم پێ بڵێن ، ئاوا هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردم. بەهەرحاڵ مامۆستا بەرزان بردمی بۆ نهۆمی دووەمی خوێندنگەکەو کردمی بە ناو پۆلی سێی بەشی کارەبادا، کە پۆلێکی تێکەڵی نزیکی ٢٥ خوێندکارێک دەبوو، منی ناساند، ئەمە ناوی مامۆستا کامیلە، وانەی عەمەلی و وانەی زانستی پیشەسازییشتان بە تیۆری پێدەڵێت، لەبەرئەوە زۆر لەگەڵتاندا دەمێنێتەوە، مامۆستا بەرزان گوتی فەرموو مامۆستا و خۆی چوە خوارەوە. ئەوان بەخێرهاتنیان کردم و چاوەڕوانی منیان دەکرد بکەومە قسەکردن و شتێکیان پێ بڵێم، بەڵام من شەرم و ترسێکی عەجایەب و پسێنەر گرتبوومی، هەردوو چۆکم کەوتبونە لەرزین و هەوڵیشم دەدا لەرزینەکەم پێوە دیار نەبێت. بۆیە بە خۆمم گوت، شێخەگیان ئەوە تۆیت و بوویت بە مامۆستای سەناعە، ئەگەر ئێستە ئاوا لاواز بیت، ئەی کەی بواری هەستانەوەت بۆ دروست دەبێت! دەبێت بجووڵێیت ، شتێک بکەیت. خۆمم گرتەوە و هەندێک زانیاریم دابە خوێندکارەکانم و ئیتر

یەکەم وانەی خۆمم ئاوا تێپەڕاند، تا گەشتم بە ئاستێکی باش و خوێندکار و ئیدارەش ستایشی شێوازی وانەگوتنەوەی منیان دەکرد.

(٥)

مامۆستایی تەنها وانەگوتنەوە نیە، پەیوەندیی نێوانی مامۆستا و خوێندکارە و مامۆستاکانیش لەانو خۆیاندا پەیوەندیی تریان بۆ دروست دەبێت. یەکەم ساڵی دامەزرانم، من تاکە مامۆستای ناو ئیدارەکەی خۆمان بووم، کە خەڵکی کەلار نەبووم، ئیتر ئەوانی تر هەمویان لە توێژە تێکەڵەکەی ناو کەلار خۆی بوون، واتە هیی کەلار و خانەقین و کفری. حەوت مامۆستامان هەبوون کە لەڕووی تەمەنەوە لە لەپێشی ئێمەوەبوون، ئەوانی تر زۆربەمان هاوتەمەن بووین، کاتی زۆرمان هەبوون بۆ قسە و گاڵتەکردن و دەرچوون بە یەکەوە. مامۆستا بەرزان غەیدان ئۆتۆمبێلی تایبەتیی خۆیی هەبوو، کە جێبێکی ڕووسیی ڕەنگ شینی تۆخ بوو، لە جۆری واز، ئەوەی کە لە ناو کەلاردا پێیدەگوترا جێبەڕوبعە، پاش ئەویش مامۆستا عەلی شوکر ئەلیاسی کاکەیی ئۆتۆمبێلی تایبەتی خۆیی کڕی و هێنایە ناو قوتابخانەوە، کە بریتی بوو لە ڤۆکس ڤاگنێکی بەرازیلیی ڕەنگ سپیی قەیتان، ئەویش لەسەرەتاوە کە ئۆتۆمبێلی کڕی، شۆفێرییەکەی باش نەبوو، بەڵام دەیتوانی بیهێنێتە ناو قوتابخانە و پێشی بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. ئەم دوو گەڕێنە وەک ئۆتۆمبێلی ڕەخساوی لای مامۆستایان سودی زۆریان لێ بیندرا.

ککێشە و ناکۆکی لە نێوانی مامۆستاکاندا نەبوو، هەمومان بەبێ جیاوازی دەمانتوانی هاوڕێی یەکتری بین، لەبەرئەوە ڕۆژگاری خۆشمان پێکەوە ڕابوارد. مامۆستا (عامر نادر نەجەفی کاکەیی)

مامۆستای فیزیابوو و لەگەڵ ئێمەدا دامەزرابوو، بۆ گوتنی هۆرەی گەرمیانی دەنگێکی زۆر قووڵ و خۆشی هەبوو. مامۆستا (خەلیل عەبدولکەریمی فیزیا) لە هەڵبژاردنی جلوبەرگەکانی بەریدا زۆر بەسەلیقە و شیک پۆش بوو، لە جلپۆشیندا لە پێشی هەموومانەوە بوو، دەنگی زۆر نەرم و خۆش بوو، کە گۆرانیی مەزهەری خالقیی دەگوت، حەزت دەکرد گوێی بۆ شل بکەیت. مامۆستا (ئەیاد حامید شەوکەت، کە ئەندازیاری کارەبا) بوو، دەنگی بۆ گۆرانیی فارسی زۆر خۆش و لەبار بوو، کە گۆرانییەکانی موعینی ئەسفەهانیی دەگوتەوە هەموانی بێدەنگ دەکرد. مامۆستا (ئیبراهیم حسەین. کە ئەندازیاری کارەبا بوو) گۆرانیی نەدەگووت، بەڵام تەواوی گۆرانیەکانی موعینی لەبەربوو. مامۆستا (ئەحمەد محەمەد قادر ی کوردی- کە پێیان دەگوت ئەحمەدی شنەی بەیان) بە شیعر و قسەی نەستەق بەناوبانگ بوو. مامۆستا (محەمەد جاف) دەتگوت هەویری شێلدراوی ئامادەیە، هەرشتێکت بویستایە بە ئاسانی لە کەسایەتیی لالە حەمەدا بەردەست دەبوو. مامۆستایان ( ساڵح مەحموود - ئومێد داوود- دیار دەلۆیی- مامۆستا ئیبراهیمی ئەندازیاری میکانیکی -عەباسی ڕەشید وەلی- نادیە زەهاوی- سوهەیلە یاوەر- جەلال حەمیدی یاریدەدەر- ئەحمەد ئەمینی ئابوری- عەبدولقادری بازرگانی- چیمەنی پیشەیی- عاسی قاسمی زمانی عەرەبی- مامۆستا شوکرییە - مامۆستا سیامەند و یەک مامۆستای بەڕێزی خانەقینیی تریشمان هەبو، کە ناوەکەیم نایەتەوە یاد*، بەڵام ئەوەیم لەیادە، کە سۆزێکی زۆری بۆ خانەقین هەبوو، لەگەڵ هەمو گۆرانی گوتنێکی حەسەن هەیاسدا ئەو سۆزی بۆ خانەقین دەجولا و دەگریا.) هەموویان کەسایەتیی جوان و پڕ لە سیفەتی کەسایەتیی

مامۆستا نەسرین ڕەزا، خوشکی خوالێخۆشبوو ڕزگار مەشەیی «ئامادەکاران»

بەرز و باڵا بوون، ئەمانە هاوکاری ناو پیشەی مامۆستایی ئێمە بوون. بەیەکەوە کارمان دەکرد. لە ئەو کەشی نەداری و ئابوورییە قورسەدا زوو زوو لەسەر چونەدەرەوە بۆ سەیران ڕێک دەکەوتین و بە هەریەکەمان چەند هێلکەیەکی کوڵاو و چەند پەتاتەیەکی کوڵاو و ئۆتۆمبێلەکەی مامۆستا بەرزان و ئیتر چونە دەرەوە و گاڵتە و پێکەنینمان بۆ دروست دەبوو. چەند ساڵێکی خۆشی مامۆستاییمان بەڕێ کرد.

## (٦)
## هاوڕێیەتی

لە باسی دۆستان و هاوڕێیانی گەرمیاندا ناکرێت ئاماژە بە کەسایەتییەکی گەورە و پاکی ناو کەلار نەکەم، کە ماوەی چەند ساڵێک لە پشتی من بوو، تا ئەوکاتەی، کە توانیم لەوێ لە ناو پیشەکەمدا جێگیر ببم، هەر لە پشتم بوو، ئەو کەسایەتییە ناوی (ڕەحمەتی: شێخ کەریمی شێخ ڕەزای قەڵاگەیە) ئەم پیاوە لە ڕۆژگارێکی سەختی خەباتی سیاسیی ساڵانی شەستەکان و حەفتاکانی باوکمدا، کە باوکم گەنج بوە و پێش دامەزرانی لە ئیشی حکومیدا ئیشی سیاسیی کردوە و چەند جارێک کەوتۆتە بەر مەترسی، بەڵام کە لە بارودۆخی خۆی هەڵدێت و پەنا دەبات بۆڵای شێخ کەریم، ئەو وەک دەڵێن بە ڕۆحی خۆی پاراستویەتی، هاوکاری بوە، بۆئەوەی سەری لە مەسەلە ئاڵۆزبووەکان دەربچێت. لە پاش بیست و پێنج بۆ سی ساڵ کە ئەمجا من چومە کەلار و پەنام بۆڵای کاک سێخ کەریم بردەوە، دیسانەوە جەنابی ئەو، پشتگیریی کردم تا توانیم لەسەر پێی خۆم ڕابوەستم. ئەمە شتێکە دەبێت بگوترێت.

بەهەرحاڵ. مامۆستا ساڵەح مەحموودی کەلار کۆنی کەسایەتییەکی بە سەلیقەبوو، مەیل و ئاراستەی چەپڕەویی هەبوو. ڕۆشنبیری و دنیابینییەکی پێشڕەفتەی باشی هەبوو، کە مەیلی چەپڕەویی لە مندا بینی، وەک برایەکی گەورە و وەک هاوڕێیەکی نزیک بە تەنگ ئیشوکاری منەوە بوو، چەندان ئێوارەی گەڕان و پیاسەکردنمان پێکەوە هەبوە سەدان بابەتی فیکری و ڕۆشنبیریمان بەیەکەوە باسکردوە، لەبەرئەوە ئێستە هەندێک لە وێناکردنەکانی ئەو بەرامبەر بە کۆی ڕەوشیکانی دنیا تێدەگەم.

مامۆستا حسەین زۆراب ڕۆشنبیرییەکی مەزهەبیی باشی هەبوو، دەیتوانی لەسەر زۆر مەسەلەی ئاینی قسە بکات، حەزیشی لەوە هەبوو لە بواری پسپۆرییەکەی خۆیدا کە ئەندازیاری کشتوکاڵی بوو، تاقیکردنەوەی نوێ بکات. لەبەرئەوە سودی لە حەوشەی قوتابخانەکە و ئاوە زۆرەکەی ناو قوتانبخانەکە دەبینی و تاقیکردنەوەی شتی نوێی پێ دەکرد، من یەکەم جار لەلای ئەو بینیم، کە دەیگوت داری بی بە قەڵەم ناڕوێت، لەبەرئەوەی کەتیرەیەکی زۆر و زیرەک لە ناو لقی داربیدا هەیە، لە هەر کوێدا لقی بی ببڕیت بۆ قەڵەم ئەو کەتیرەیە بە زۆری دەڕژێت و ناهێڵێت بڕووێتەوە، بۆیە بۆئەوەی کاریگەریی ئەو کەتیرەیە نەهێڵێت، دەبێت قەڵەمی لێ وەربگریت و قەلەمەکان لە ناو ئاودا بکوڵێنێت تاکاتی داچۆڕانی تەواوی کەتیرەکە، ئەمجا پاش ئەوە بە قەڵەم بیڕوێنیت، سەردەگرێت.

## (٧)
## شیعر و قسەی (هین)

لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٩٢/١١/١١ دا کە من هێشتا هیچ باسی دامەزرانم لە ئارادا نەبوو، مامۆستا شێرکۆ بێکەسی شاعیری گەورە، لە هۆڵی ڕووناکیی ناو زانکۆی سلێمانی لە کۆڕێکی شیعریدا دیوانی شیعریی (دەربەندی پەپولە)ی خۆیی خوێندەوە و منیش وەک گوێگرێک و هەوادارێکی شیعری لەوێ بووم. ئەوکاتە هەم مامۆستا شێرکۆ و هەم کۆی شیعرەکانیشیان زۆر بە گەورەیی دەبینی و ئێستەس هەروای دەبینین. بۆیە وا دەزانم کە مامۆستا شێرکۆ زیانی لێداوین، جەنابی لەئاستێکی ئەوەندە بەرزدا شیعر و زمانی شیعری و گێڕانەوەی شیعریی پێشکەش کردین، کە لە پاش نەمانی خۆیەوە کەسی تر نەتوانێت بگات بە ئاستی ئەو، بۆیە ئێمەش نەتوانین گوێ لە کەسی تر بگرین. بۆیە ئەو بەرزبینینەی شێرکۆ لە گەرمیان دووجار زەرەری لە من دا.

لە جاری یەکەمیاندا: ئەوبوو، لە پاش منەوە مامۆستایەکی بەڕێز لە ئامادەیی کەلاری پیشەیی دامەزرا، کە ئادابی زمانی ئینگلیزیی خوێندبوو، زۆریش حەزی لە ئەدەب و شیعریش هەبوو، ئەم مامۆستایە ناوی مامۆستا فەریق بوو. وابزانم دواتر لە ئەمریکا دکتۆرای زمانی ئینگلیزیشی خوێند. جارێک ئەم مامۆستا فەریقە بە دڵ و بە گیان شیعرێکی درێژی نوسیبوو، بە جافی شین لەسەر کاغەزی فولسکابی پاک بە خەتێکی ڕون نوسیبووی و هێنای پیشانی منی دا، گوتی ئەو شیعرەم نوسیوە، تۆ بیخوێنەرەوە، بزانە چۆنە و دوایی ڕەئیی خۆتم پێ بڵێ. لەڕاستیدا من کە ماوەیەک بوو شێرکۆم ناسی بو شیعرەکانی ئەوم دەبیست و دەمخوێندەوە، هیچ چێژێکم لە خوێندنەوەی شیعرەکەی مامۆستا فەریق نەبینی.

لەبەرئەوە لەبیرمە، کە بۆم گەڕاندەوە، دامەوە دەستی و هیچم نەگوت، ئەویش وەریگرتەوە و گوتی پێت نەوتم ، کە ڕات چییە لەسەر شیعرەکە. منیش بەبێ وەستان گوتم: کورە شیعری چی، کاکە، ئەوە هەمووی قسەی قۆڕە، شیعر کەی وایە؟ مامۆستا فەریق ئەم بۆچونەمی زۆر پێ سەیربوو، بەڵام لە وەڵامدا هەر تۆزێک پێکەنی و شیعرەکەیی پێچایەوە و هیچی نەگووت.

ساڵان تێپەڕین و من گەڕامەوە ناو سلێمانی و لە زانکۆی سلێمانیدا کۆلیژێکی تازە کرایەوە، بەناوی کۆلیژی مامۆستایانەوە، منیش بە بڕوانامەی شەشی ئامادەییەوە داواکاریم پێشکەش کردو لەوێ لەبەشی ئینگلیزی وەگیرام، بومەوە بە خوێندکار. ڕۆژێک گوتیان ئەمڕۆ مامۆستایەکی تازە دێت وانەمان پێدەڵێت، کە لە ئەمریکا خوێندنی تەواوکردوە.

کە هاتە پۆلەوە، ئەو مامۆستا بو و منیش خوێندکاری بەردەستی، یەکسەر یەکتریمان ناسییەوە، هەمان مامۆستا فەریقە شاعیرەکەی ناو ئامادەیی پیشەیی کەلار بوو. کە سەیری کردم، پێکەنی، یەکسەر گوتی، هەمووی قسەی قۆڕە، وانییە؟ بوینەوە بە هاوڕێکەی جاران، بەڵام ئەمجا من هەر ڕێزم لەوە دەگرت، کە ئەو مامۆستای منە، بۆیە بوارم دەدا، ئەو لە قسەدا زاڵ بێ.

جارێکی تریش، لە وەزی بەهاردا، کە جموجوڵ و چالاکییە ئەدەبییەکان هەندێ بزوتنەوە و جوڵەیان تێدەکەوێت، لە هۆڵی ڕۆشنبیریی کەلار کۆڕێکی شیعری بۆ کاک عیسا چیایی ساز کرا و ئەویش هەندێک دەقی شیعریی زۆر جوانی خوێندەوە، بەڵام تەوەری سەرەکیی هەمو شیعرەکان لە دەوری عیشق و ڕۆمانسیەت و ڕەگەزی مێ و ئەو شتانە دەسوڕایەوە، لەبیرمە هەر بە ڕۆحی شیعرەکانی شێرکۆوە، کە وەک پانۆراما باسی هەموو شتێکی کوردیان دەکرد، هەستام

بە تووڕەیی بە کاک عیسام گوت، ئێ باشە باسی عیشقمان گوێ لێ بوو، ئەی باسی ئەو هەمو نەهامەتی و کارەساتی ئەنفال و ئۆردوگای سمود و قەیرانە داراییانە کوان؟ بۆ وێنەکانی ئەوانەمان لەڕێگەی شیعرەکانی تۆوە نەبینی؟ کاک عیسای خۆشەویست وەڵامی دامەوە، بەڵام پرسیارێکی لە ئەو شێوەیەی چاوەڕوان نەکردبوو، بۆیە وەڵامەکەیی لە کورتی بڕییەوە. ئێستە و ئەوکاتەش پێموایە، کە کاک عیسا چیایی یەکێکە لە ئەو شاعیرە کەم نوس و زۆر باشانەی، کە دەبێت بخوێندرێنەوە.

## (٨)
## شیوعییەکانی گەرمیان

شەوێک لە شەوەکانی ساڵی ٢٠٢٠ کاتێکی درەنگ بوو، نزیک بوبوینەوە لە بەرەبەیانی ڕۆژێکی نوێ، لەگەڵ هیوای برامدا بەرەو فڕۆکەخانەی سلێمانی بەڕێکەوتین، بۆئەوەی کاک هیوا لەوێوە گەشتێک بکات، ئەو کاتەش بەرنامەی فڕۆکەخانەکە وەهابوو ڕێگەیان نەدەدا بە گەڕێنی تایبەتی خۆتەوە گەشتیار ببەیتە ناووەوە بۆ شوێنی فڕین و هەستانی فڕۆکەکان، بۆیە ئێمەش بە یەکێک لە ئەو پاسانە سەرکەوتین، کە گەشتیارانی دەگەیاند بە شوێنی فڕین. لەو کاتەدا بڕێکی زۆر لە گەشتیارانی کەلاری، کە بەرگی وەک یەکیان لەبەردابوو، لە هەمان پاسەکەی ئێمەدا سەرکەوتن و ئێمەش تێگەشتین، کە ئەم بەڕێزانە گەشتی ئاینیی عەمرە دەکەن و دەچنە سەردانی شوێنە پیرۆزەکانی مەکە و مەدینە. لە ناو ئەو کەسانەدا، یەکێکیان پیاوێکی کاملی ڕۆح سووک بو، کە دەیەوسیت هاریکاری و خزمەتی ئەوانی تر بکات و زۆر سەرقاڵ بو بە خزمەتکردنی ئەوانەوە و بە بەردەوامییش دەمو لێوی دەجولا و بەبێ ئەوەی دەنگی بێتە دەرەوە ویردی ئاینیی دەخوێند، من هەندێک بە وردی سەیرم کرد و بەباشی ناسیمەوە، ئەوە کاک [ئەحمەد قولەسوتاوی]

ی کادر و هەوادارى حزبى شیوعیى کوردستان بو، کە لە کەلار دادەنیشت، من بۆ خۆشکردنی جەوەکە، بە هیوای برامم گوت، دەفەرمو کاکە سەیری بکە، ئەم پیاوە بەڕێزە لە گەرمیان ئێمەی کرد بە شیوعی و وا خۆشی لێرەوە دەچێت بۆ گەشتی عەمرە. کەسێک لە کەلارییەکان گوێی لە قسەکەی من بوو، پێکەنی و گوتی، ڕاستە کاک ئەحمەد شیوعییەکی پاک و ئیماندارێکی گەورەیە. منیش لەگەڵیدا هاورا بووم، کە کاک ئەحمەد مرۆڤێکی گەورەیە، گومانی تێدانییە. ساڵانی سەختی و گرانی، کە ژیان بۆ هەموان زۆر قورس بوو، کاک ئەحمەد دوکانی وشکەی هەبوو، ئامادە بوو هەمو پێداویستییەکان بۆ کەسانی فەرمانبەر و خەڵکی ئاسایی دابین بکات و بە قەرز بیانداتێ، بەبێ ئەوەی کە پێیان بڵێت، کەی دەتوانیت پارەم بۆ بهێنیتت؟ ئەمەش بۆ کاتی نەداری دەستکەوتێکی باش بوو، بۆ ئەو خەڵکانەی سوودیان لێ دەبینی.

هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیی کەلار وەهایە، کە دراوسێی ناوچەیەکی بەرفراوانی عەرەب نشینن، ئەو عەرەبانەی ئەو ناوچانەی دراوسێی کەلار، بە درێژایی مێژووی دوورودرێژ پەروەردەی دەستی فاشیزمی عەرەبی بوون و هەمیشە وەک دوژمن سەیری کوردیان کردوە. کوردی کەلاریش زۆرجار لەگەڵ ئەواندا ناچاری پێکداهەڵپژان و شەڕکردن بوون، ئەگەرچی کە کەلارییەکان خۆیان شەڕخواز نیین. بۆیە هەر شۆڕشێک بە ناوی کوردەوە لە دژی چەوساندنەوەی دەستی فاشیزمی عەرەبی کەوتبێتە خەبات کردن، لە ماوەیەکی کەمدا خەڵکی خەباتکاری کەلار و گەرمیان لەناو ڕیزەکانیاندا دەرکەوتوون و ئامادەی گیانبازی بوون.

بەدەر لەمەش مەسەلەی موڵکداریی زەویی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی، یەکێک بوە لەو مەسەلانەی، کە بە کردەوە لە ناوچەی گەرمیاندا بوونی هەبوە و خەڵک بەدەستیەوە ناڵاندویانە و کێشەیان هەبوە، بە تایبەتییش لەبەرئەوەی کە توێژی بەگ و ئاغا لە ئەو ناوچەیەدا بوونیان هەبوە.

ئەم دوو هۆکارەی کە باسکران وایان کردوە، کە خەباتکاری بە کردەوە و هەوادار و لایەنگری حزبی شیوعی لە ناوچەی گەرمیاندا زۆر ببێت، بەڵام شیوعییەکانی گەرمیانیش وەک هەموو یان زۆربەی شیوعییەکانی ناو کوردستان ئەو لایەنەی حزبی شیوعیيان بەدڵ بووە، کە داوای دادپەروەریی کۆمەڵایەتییان کردوە، کە دیارە دادپەروەریی کۆمەڵایەتییش ئاکارێکی بەرزە، دەکرێت[لە کاتی سەرگرتنیدا] ببێت بە هۆی دابینکردنی ئاسوودەیی. ئیتر بەدەر لەم دروشمانە ڕەنگە وردەکاریی زۆر لە ناو پەیڕەو و پرۆگرامی حزبی شیوعی، وەک حزبێکی ئایدیۆلۆژی، زۆر نەگەشتبێت بە ناو خەڵک.

دەڵێن، جارێک کادر و پێشمەرگەی دێرین [عوسمانی قالە منەوەر] لە بۆنە و کۆبونەوەیەکدا گوێی لێیە، کە کادرێکی کۆمەڵەی ڕەنجدران باسی مارکس و لینین و فکری چەپوون بۆ خەڵک دەکات و دەڵێت مارکس لە ئەڵمانیاوە و لینینیش لە ڕوسیاوە. لەم کاتەدا عوسمان لە هاوڕێیەکی خۆی دەپرسێت، ئەرێ ئێوە بە من بڵێن: مارکس و لینین خەڵکی وڵاتێکیش نیین؟ ئەویش دەڵێت نەخێر، خەڵکی وڵاتێک نین و سەردەمەکەشیان جیاوازە، کە لینین لەدایک بوە، دەساڵ پاش ئەوە مارکس مردوە. عوسمانیش دەڵێت، دەی تەڵاقم کەوتبێت تا ئێستە من هەروام زانیوە ژن و مێردن.

بەڵام ئەستەمە نمونەکەی کاک عوسمان منەوەر[ئەگەرچی بە گەڵتەشەوە گوتویەتی] بەسەر کادرەکانی حزبی شیوعیدا گشتگیر بکەیت، چونکە حزبی شیوعی خەڵکی ڕۆشنبیری زۆری دروست کرد، زۆر کادری خەباتکاری پێ گەیاند، کە پاستر لە شۆڕشەکانی تریشدا سودیان لێ بیندراوە.

یەکەمین کادری شیوعی، کە هەواداریان بو و من لە گەرمیان ناسیم بریتی بوو لە مامۆستا [ساڵح مەحموود ئەڵماس] ماۆستا ساڵح یاریدەدەری بەڕێوەبەری ئامادەییەکەی کەلاری پیشەیی بوو. توانایەکی باشی گفتوگۆکردن و ئیدارەدانی قسەوباسی ڕۆشنبیریی هەبوو، کە لەوە تێگەشت من هەندێک ئاراستەی چەپڕەوییم تێدایە،

دەستی گرتم بردمی بۆ ئیزگەی گەرمیانی [دەنگی ئازادی] کە ئیزگەی ئەوکاتەی حزبی شیوعیی کوردستان بوو، لەوێ کارێکی ڕۆژنامەنووسییان پێ سپاردم و لە بەرامبەری ئەو کارەدا مانگانە پێنج سەد دیناریان دەدامی، کە بۆ ئەوکاتەی من زۆر باش بوو.

بەدەر لە دهاتی داراییش، کارکردنم لە ئەو دەزگایە وای کرد، کە من لەڕووی دەست گەیشتن بە سەرچاوەی ڕۆشنبیریی عەرەبیدا تینوێتیم بشکێت، چونکە ئەوودەمە سەقافەت و ڕۆشنبیریی عەرەبیی ڕێگەپێدراو لە ناوەوەی عیراقدا هەر ئەو سەقافەتە لەرزۆکە نارەسەنە هەبوو، کە گۆرانییان بەباڵای سەدام حسەیندا دەگوت و وەک سەرکردەی سەرکردەکان پێشکەشیان دەکرد، کە ئەمەش کەڵکی ئێمەی نەدەگرت. بۆیە کە شیوعییەکان هەندێک ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێبی تازە چاپکراویان لە سوریاوە دەهێنا و دەیانخستە بەردەستی ئێمە بۆ خوێندنەوە زۆر بەلامانەوە گرنگ بوو. کەوتینە هەڵپەکردن بۆئەوەی هەندێک لە ئەو بابەتە نوێیانە لە عەرببییەوە تەرجەمە بکەین بۆ زمانی کوردی و بڵاوی بکەینەوە. من بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٩٦ دا گوتارم لەبارەی [عەولەمە- جیهانگیری] م لە ناو ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی ئەواندا خوێندەوە، هەر ئەو حەفتەیە وتارێکم لەسەری کرد بە کوردی و زاراوەی [بەجیهانیکردن] م لەبریی عەولەمە بەکارهێنا و لە حەفتەنامەی [ڕێگای کوردستان] دا بڵاوم کردەوەو تا ئێستەش زاراوەی بەجیهانیکردن لەبریی عەولەمە بەڕاست دەزانم.

لە بواری کۆمەڵناسیدا و لە ناو زانا عیراقییەکاندا خەڵک زۆرتر ناوی [عەلی وەردی] ی بیستوە، لەبەرئەوەی کە کاری جدی و زۆر باشی لەسەر کۆمەڵگای عیراقی کردوە. بەڵام بەدەر لە عەلی وەردی و لە ئەم سەردەمە نوێیەدا دوو ناوی تر لە ئەم بوارەدا هەن و دەرکەوتوون، کە زانای زۆر گەورەن و ئێمە ئەو سەردەمە توانیمان کتێب و گوتارەکانیان بخوێنینەوە، کە ئەوانیش بریتین لە (فالح عەبدولجەبار) و (موفید ئەلجەزائیری)، هەردووکیان بڕوانامەی دکتۆرایان لە بواری خۆیاندا هەیە، بە دنیابینیی نوێ و

سەردەمییانەوە سەیری کۆمەڵگای عیراقی و ڕەوشە سیاسییەکانی ناو ئەم کۆمەڵگایە دەکەن، چونکە هەردووکیان پسپۆرییان لە بواری سۆسیۆلۆژیای سیاسیدا هەیە، (بەڵام موفید زیاتر لە ڕاگەیاندنەوە نزیکە).

لە ئەو سەردەمەدا موفید ئەلجەزائیری داوەت کرا و هاتە کەلار، بۆئەوەی کۆڕی ڕۆشنبیری و پێگەیاندن بۆ ئەو چوار پێنج کەسە بکاتەوە، کە لە ڕادیۆی ئازادیی گەرمیان کارمان دەکرد، کۆڕەکەی سودی زۆری هەبو بۆمان، بە تایبەتی لەسەر هەواڵی ڕادیۆیی و چۆنیەتیی نوسین و ئامادەکردنی هەواڵ و ئەو خاڵانەی کە دەبێت لە هەر هەواڵێکدا زەق بکرێنەوە. لەبیرمە، کە ئەو گوتی هەواڵی ڕادیۆیی هەر وەکو هەرەمێکی هەڵگەڕاوە وەهایە، کە لەبریی ئەوەی لەسەر بنکە پانەکەی لەنگەربگرێت، ئەم لەسەر نوکە تیژەکەی ڕادەوەستێت، ئەو نوکە تیژەش لە هەرەمی هەواڵدا، بریتییە لە پرسیاری (چی؟) واتە لە هەر هەواڵێکدا دەبێت پێش هەموو شتێک ئەوە بزانرێت، کە چی ڕویداوە، ئەمجا، کەی؟ ئەمجا کێ؟ هتد، ئەو وردەکارییانەی تر، کە قەواڵەی هەواڵەکە گەڵاڵە دەکەن.

ئەوکاتانەی کە کوردستان ماوەی سێ ساڵ دەبوو لە دنیای دەرەوە دابڕابوو، بابەتی ڕۆشنبیریش وەک هەر بابەتێکی تر نەدەگەشت بە خەڵکی ئێمە، دەست گەیشتنی من بە شیوعییەکان و کایە ڕۆشنبیرییەکانی ئەوان شتێکی باش بوو. هێشتا هەر لە ئیزگەکە کارمەند بووم، کە بوێریم کرد و دەستم بۆ وەرگێڕانی کتێب برد، لەبەرئەوەی زۆر بە حەزەوە ئیشم تیادەکرد، بە ئاسانی یەکەمین دەستنوسی یەکەمین کتێبی وەرگێڕدراوی خۆم پەیدا بوو. دیاربوو ئەوکاتە هێشتا کۆمپیوتەر زۆر بەردەست نەبوو، بۆیە کتێبەکە وەرگێڕدراوەکەی منیش بۆ ماوەیەکی زۆر، لەلای خۆم مایەوە، هەتا ساڵی ١٩٩٩ لە ناو پرۆژەی دەستپێشخەریی پاراستنی دەستنوسەکاندا کە هیی تەلەڤزیۆنی خاک بوو، لە سلێمانی کتێبەکەی منیش چاپ کرا و گەشت بە خوێنەران.

(٩)

لە کاتی دامەزرانی ئێمەدا بە مامۆستا، مەرجی خزمەت کردنی دەرەوەی شار تەنها بریتی بوو لە سێ ساڵ. بەڵام من سێ ساڵەکەم لەوێ تەواو کرد و پاش ئەوەش دوو ساڵی تر مامەوە، خۆم نەمدەویست بڕۆم، بەهۆی باشی و بەخشندەیی خەڵکی کەلارەوە لەگەڵ مندا. زۆر خێزانی بەڕێزی کەلاری لەپاش ناسینێکی کەمی منەوە ، وەک کوری خۆیان و وەک ئاشنای زۆر نزیک مامەڵەیان لەگەڵدا کردم، دەرگای ماڵەکانی خۆیانیان بۆ کردمەوە. بۆیە ڕەنگە ئەوەندە بەس نەبێت کە بڵێم سوپاسیان دەکەم، بەڵام ئەوە دەزانم، کە دەبێت بە وەفاداری بەرامبەر بە چاکەکانی ئەوان بمێنمەوە.



# کەلار وەك ئەوەی دێتەوە بیرم

شێخ ئەحمەد شاکەلی قڵاتۆبزانی

کەلار، وەکو دێتەوە بیرم دێیەکی٩٩ ماڵە لەسەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، قوتابخانەیەکی لەقوڕ کراوی جوانی هەبوو، مەکینە ئاوێکی ئیرتیوازی لەژوری ئاواییەوە بوو، پاش نیوەڕوان ئەبوو بە حەشری ژنان، بە تەنەکەو سەتڵ و دیمەنی ڕازاوەی کەم وێنەوە ئەو ژن و کچانە بۆ ماڵەکانیان ئاویان دەبردەوە، لەم گەرمیانە لە سەرقڵاوە بۆ دەربەندیخان، لە دەربەندەوە بۆ گوڵاڵە (جەلەولای ئەوسا) لەوێوە بۆ شاری کفری تاکە شوێنێک کە ئەوەندە ئاوەدان بووبێت، مەگەر هەر کەلار بوبێت. هەر کەلاریشی بەو پەڕی شایستەی لەیادا ماوەتەوە و خەڵکێکی زۆر بەشداری ئەو بوونە ڕازاوەیەن... زۆر نیشانەی جیاوازی، یان ڕونتر باس بکرێت، نیشانەی پێشکەوتنی زۆری دیار بوو، مزگەوتێکی گەورە، دەزگای تەلەفۆن، نەخۆشخانەیەکی (بیناکەی لە گەچ و بەردی ئەستور دروست کراو)، لە ١٩٣٢ قوتابخانەی تیادا کرابووەوە، بەپشتگیری بەگزادەکان، کەلار کانگەی جموجوڵی کۆمەڵایەتی بوو. ئەندامی پەرلەمانی بەغای تێدابوو(داود بەگی جاف)، پێشتر حەمەبەگی جاف ناوی هەبوو (ئەندامی پەرلەمان بووە بەناوی کەرکوکەوە)، لەماڵی خۆیانا بۆ قوتابخانە جێی دابین کردوە، لەبیری خەڵکی کەلاران. کە پاش نیوەڕوکان، لەماڵ دەردەچووم، دەگەڕام، کۆڵانی

باریک باریک، پیایدا دەڕۆشتم، دەبوو ئاگام لە جموجوڵی سەگەلی ناو ئەو کۆڵانە باریکانە بێت لەناکاتدا، دەرنەپەڕن و پیامدا هەڵ نەپۆڕێن، زۆرتر لەکۆمەڵە سەگ دەترسام سڵیان نەدەکرد، کۆڵیان نەدەدا، دەبوو هەرچەندە لەگیانما بوایە (جار جار یەکێ لەوپیاوانەی بۆ نوێژی عەسر بۆ مزگەوت دەچون فریام دەکەوتن (با چوکڵێ، لقەداریَ بەدەستەوە بێت، هەرباشە، ئە ئاوا بەتەنها و دەسی بەتاڵ .....و سەگەلی بەرەڵا...)ئاگات لە خۆت بێت... کەلاری پێش ٦٣ ساڵ... ساڵی ١٩٥٦ یان ١٩٥٧، قوتابی پۆلی دووی سەرەتایی بووم، دوای نیوەڕوان، بەناو کۆڵانەکاندا بۆ هاوڕێ، بۆ یاری، هەلوکان، تەشیلان، دەگەڕام، بازبازانێکم بدیایە نزیک دەبوومەوە، بەشداریم دەکرد، تەشیلان لای ماڵ.... ناوەکەیم لەبیر نەماوە تۆزێ لە ژوور ماڵی وەستا جەلالی ناڵبەندەوە بوو (الی رحمە اللە) مناڵێ زۆر کۆبووبووینەوە، یەکترمان دەڕفاند، ئاگامان لێ بوو، بەرەو لای ماڵ فەقی ڕەشید(بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێ) مناڵ دادەباری، دڵنیا بوین ئەم ڕاکە ڕاکە، لە بەلاش نییە، ئێمەش بەناو ئەو لێشاوەدا گلبوینەوە... ئۆتۆمبیل زۆر کەم بوو، وەکو لەبیرمە، بۆ هاتوچۆی خەڵک، کفری تەنها دوو جێبی تێدا بوو، جیبەکەی ئەحمەد بچکۆل و یەکێکی تر ناوی خاوەن وسایەقیم نایەتە بیر، ئێمە گوێمان لەدەنگەدەنگێک بوو، دەڕوانین پیکابێ لەبەر دەرگای دەرەوەی ماڵێکدا چەقیوە، خەڵک و پیاو ماقوڵانی ئەودەوروبەرە لێی خڕبوون، مناڵیش دەڕۆنە سەر و کاکی خاوەنیش بە قاڵە قاڵ وپاڕانەوە دایان دەگرێت، لەم لا دایان دەگرێ و لەولاوە سەردەکەون، یەکێ لەپیاوەکان وتی: بەخوا ئێستە عەلی کەریم بەگ پێی بزانێ هەر ئێستە دەری ئەکا. هەرچۆنێ بوو یەکێ لەپیاوەکان، بۆ خۆشی، وەکو وتمان کە ئۆتۆمبیل کەم بوو، خڕ بوون لەدەور ئۆتۆمبیل و هەرکارێ پەیوەندی بە ئۆتۆمبیلەوە هەبوایە، خەڵک بە تایبەتی گەنجان یەکسەر پیادەگەیشتن، وەڵا، کاک عەلی(الی رحمە اللە) ئاگادارکرا و گەیشتە لای پیکابی چەقیو، کاکی خاوەن پیکاب پیاوێکی عەرەب بوو بەکوردی جار جار بەعەرەبی هاوار دەکات، (دابەزن)کە عەلی بەگ هات، بەسایەقەکەی وت: وازیان لێبێرە، بۆ ئێمەیش: یەڵا سوار بن،،،سەرکەوتین. ئێستە ئەزانم، سەرخستنەکەی

ئێمە بۆ قورس بوونی پیکابەکە بوو، خاڵۆی خاوەن ئۆتۆمبیل پێی نەدەزانی، ئێمە لە خانەی دواوە و ئەوانیش لە پێشەوە سەرکەوتن..... پیکاب کەوتە خۆی جارێ بۆ پێشەوە و جارێ بۆ پاشەوە (پەرتەناش ئەکا)... و لە قوراو دەرچوو، کابرای خاوەن پیکاب هەر زۆر پەلەی بوو دامان بگرێت، (دابەزن یەڵا دابەزن) عەلی بەگ وتی: نە نە جارێ ماومانە، مناڵ سەرکەون، خۆتان باش بگرن. بە ناو ماڵەکانی کەلارا بەبەردەرگای ماڵەکان دا، بۆ لای مەکتەبەکەی (کە ئێستاش مەکتەبەو ڕوی لەخۆرئاوایە)، پیکاب پێچی کردەوە بەرەو مەکینەی ئاوەکە پاشان بەرەو نەخۆشخانە کۆنەکە، تاگەیشتە، شوێنی چەقینەکەی خۆی، بەو بارە قورسەوە خێرا دای لەقوراوەکەو یەکسەر پاش پەرێنەوە...ڕایگرت و.... یەڵا مناڵ دابەزن. وەڵا مناڵ دابەزین. دوای ......٦٣ ساڵ، هێشتا لەبەرچاومە..... ئەو شارەدێیە، لایەکی کارەبا بوو، تادرەنگانی شەو دەنگی چەق چەقەی ماتۆڕی کارەبا، دنیای دەگۆڕی،(شارەزایەک ئالەم چەند ڕۆژەی ڕابوردودا بەیەک گەیشتبوین، باسی کەلار و گۆڕانی سیاسی ساڵی ٥٨ ی عێراق کرا) ئەو بەرێزە دەیووت: ئەو کوشتارەی لە عیراقی پەنجاو هەشتا کرا زۆر نارەوا بوو. : یانی گۆڕانەکە هەر دەبوو ببوایە بەڵام درندەییەکە!!!... : بە پلە، بە نۆرە، خۆ زۆر وڵاتی جیهان هەیە هەنگاوی گەورەی ناوە و ژیانی خەڵکەکەی گۆڕیوە و کوشتار و تاڵانی تیا نەکراوە، ئیستاش ئاسودەن. : وەکو .... : وەکو ئوردون. من ئەوەم هاتەوە بیر لە فرۆکەخانەی ئوردون بوین، بەنییەتی سەفەرێ بۆ دورتر، پارەیەک بەدەستمەوە بوو، ویستم هەندێکی بکەم بە پارەی ئوردنی بۆ سەندنی هەندێ بابەتی پێویست، بۆ خۆم و خێزانەکەمان، کەپارەکەیان گۆڕیەوە، پارە ئوردونییەکە زۆر پەرپوت بوو، بە گەنجە پارە گۆڕەوەکەم ووت: ئەم پارە وەردەگیرێت؟؟ : اش حدل ما یاخاذە؟ علیە صورە الملک! (چۆن ئەتوانن پارەیەک وەرنەگرن کە وێنەي شاي ئوردونی لەسەربێت).

جیاوزییەکی زۆر لە نیوان پێکهاتەی ئەم دوو وڵاتەدا هەیە و ناشکرێ بە یەک پێوەر بپیورێت، لێرە کورد و عەرەب و کەمایەتی تریش جۆری مامەڵەکەی لەگەڵ ئوردون و هاوشیوەی ئوردوندا دەگۆڕێت. کەلار، بە بوونی هەندێ خانەوادەوە، خەڵکەکەی پشتی

قایم بووە. ئەو هەموو دامودەزگا فەرمیە، بەبوونی ئەوانەوە دامەزراوە، کەڵکی لێ بینراوە، ئیتر دوای چواردەی تەمموزیش، رەنگدانەوەی ئەو رووداوەیش دیسان دیار و کاریگەر بووە، شوێن و کۆبونەوەی خەڵک لە شارو دێهات زۆر بووە، بەلاّم لە هەموو شوێنێ وەکو کەلار، دەنگدانەوەی رووداوە سیاسیەکان دیار نەبووە، ئەگەر هەشبوبێت وەکو کەلار درێژەی نەکێشاوە، وەکو کەلار ئەنجامەکانی لە دەوروبەرەوە دیار نەبووە، ئەمە هەقیقەتێکە زۆر کەس دەتوانێ لەسەری بنووسێت، سەرچاوەی نوسینەکان تا چەندساڵێکی نزیک لە ئێستا مابوون. لە ماڵی باوکی دایکما، باوکم هەمیشە کتێبی هەمە جۆری هەبوو، زۆر دەچوە لای حەمە سەعید بەگ، زۆر جار کتێبی دەدایە، بەینیان زۆر خۆشبوو، باسی هەمەجۆریان هەبوو، پاش چواردەی تەمموزی پەنجاو هەشت، کەلار بووبووە دوو بەشەوە، لای خواری دێ زۆربەیان کۆمۆنیست بوون و لای ژووریش پارتی، بارەگایان هەبوو، لەوێ هەموو رۆژێ کۆدەبوونەوە، ئەوانەی کە لەگەڵ خەتی نەتەوییدا بوون بێگومان پارتیەکان بوون و خەتەکەیتر کۆمۆنیست بوون. بۆ هەردوولا رۆژانە هەمەجۆر رۆژنامە و گۆڤار دەگەیشت، [خەبات (لەبەغدا)وە دەهات،هەتاو لە (هەولێر)ەوە، رۆژی نوێ لە (سلێمانی)یەوە، صوت الشعب (لەبەغدا)وە ) ئازادی (لەبەغدا)وە ]... هیتریش، ئەم رۆژنامەو گۆڤارانە دەگەیشتە لایەنگرانی پارتی وشیوعی و بڵاوەی دەکرد، ئەگەر بەزۆر لەخۆکردنیش بوایە، دەخوێندرایەوە، چونکە خەڵکی کۆلکەخوینەواریش هەبوو، ئەو زۆر لەخۆکردنە دەیگرتەوە، بۆ وریاکردنەوەش، کاریگەری زۆری هەبوو. بەڕیوەبەری قوتابخانەکەی ئێمە، لەو رۆژگارەی سەرەتای شۆڕشی تەموزدا (بەڕێز حسین علی البیاتی)، لەو چالاکیە سیاسیانەدا بەشدار دەبوو، بابەتی بۆ تێگەیاندنی خەڵک دەخوێندەوە، ئەو پیاوە، لەگەڵ حزبی کۆمۆنیست دا بوو. هەقیقەتێک هەیە منیش حەز دەکەم لێی بدوێم، سەرەتای شۆرشی تەمموز تا کۆتایی ساڵی ١٩٥٩، مەیدانی سیاسی لەعێراق دا مەیدانی حزبی شیوعی بوو، قەرەباڵغترین کۆبونەوە لەو دووساڵەدا قەرەباڵغی حیزبی شیوعی بوو، زۆرجار لە خەڵکی شارەزای ناو سیاسەتم بیستووە، گلەییان لە سەرکردایەتی شیوعی

عیراق کردوە کە نەیان توانیوە لەو دوو ساڵەدا کەڵک لە توانای بێسنووری خەڵک ببینن کە بە شاڵاو ئاسا لەگەڵیانا بوون و ئەو فرسەتەیان لەدەستدا و ئیتر دوبارە نەبووەوە. + ساڵی خوێندنی ٥٩-١٩٦٠، لە قوتابخانەکەی کەلار (هەرئەوەی کە ئیستا ڕوی لە خوراوایە) قوتابی بوین، بەیانی بوو وەستابوین بۆ بەسەرکردنەوەی پاک وخاوێنی، پاشان خوێندنی سرودی لەبەر کراو، هەندێ بابەتی ئاسایی خوێندرایەوە: (عبدالکریم کل القلوب تهواک عبدالکریم رب العباد یرعاک) دواتر قوتابییەک لەپۆلی سێ بوو یان چوار، دەم وچاوێکی تازەبوو، نەمان دەناسی، دیار بوو، لەقوتابخانەیەکی ترەوە هاتبوو، چوە سەر زەوی نێو بۆشایی ناوەڕاستی قوتابیەکان و دەستی بە وتنەوە کرد... بەلامانەوە سەیر بوو، زۆر پێمان خۆش بوو، بەکوردی، ئێمە بەر لەو ڕۆژە لەناو قوتابخانەدا، گوێمان لە خوێندنەوەی دەقی کوردی نەبوبو (ڕیشۆڵەی هەژار ڕیشۆڵەی هەژار )، پارچە هۆنراوەیەکی (وەکو بێتەوە بیرم، دارشتنەکەی لە هی قانع ی دەکرد)، پاش تەواو بونی هۆنراوەکە، چەپڵەیەکمان لێدا، بەر لەو جارە بۆ هیچ هۆنراوەبێژێک چەپڵەی وامان لێ نەدابوو، ئەوەش هەر ڕەنگدانەوەی گۆڕانکاری دوای چواردەی تەمموز بوو، لە بیر و خواستی ئێمەی منداڵاندا، بەو چەپڵەلێدانە توند و گەرم و گورە، دەردەکەوت. ساڵی ١٩٦١ لە سەرەتایی کەلارەوە گواستمەوە بۆ خوێندنی ناوەندی، بەڵام تایبەتمەندی کەلارم هەر لەبیرا بوو. لە نێو کەسە دیارەکانی کەلار دا باسی زۆر گەورە پیاوان و ژنان کراوە، من باسی خاتوو زیبا دەکەم لێیەوە نزیک بووم، ئافرەتێکی موسڵمان بوو، زۆر جار گەورە پیاوی کەلاریم دەدی، سەردانیان دەکرد، ماڵی لەناوەراستی کەلارا بوو، تا ساڵانێکی درەنگ هەر چوار دار خورماکەی هەر مابون، یەک داری ڕوتاب و دوو داری برحی بون یەک داری تلقیح. بابەتەکانی ساڵانە، لەسەرەتای هاویندا، تۆو دەکرا و پاشان لە پێگەیشتنی خورمادا (مانگی ئاب ) وەکو بە عەرەبی دەوترا (یقل العنب ویکثر الرطاب ) خەڵکی شارەزا دەچونە سەر دارەکان بۆڵ بۆڵ بە داس دەیان بری ودەیان هێنایە خوارەوە، تاکە دیمەنێک لەکەلارا، هەموو ساڵێ منیش بە دیار ئەو دیمەنەوە لەگەڵ منالانی تردا دەوەستاین وتەماشامان دەکردو دەمان بردە

ماڵـەوە لێـیان دەخـوارد، بەشـی زۆر کـەس و ماڵـە هـەژاری لـێ دەدرا، ئـەو ئافرەتـە بـۆ خـۆی جێـگای ڕێزلێنـان بـوو، گوێـی لـێ دەگیـرا. یـادی بەخێـر. ـــ باسـی کـەلار -لـە دانیشـتنێکدا، کۆمەڵـێ هـاو تەمـەن بویـن باسـی هەنـدێ شـار و شـوێن کـرا، ئـەم هـەوارە و ئـەو هـەوار زۆر وتـرا، یەکێکیـان ئامـاژەی کـرد بـۆ نەبوونـی نیشـانەی مێـژووی کـەلار، زۆر لە شـارە کۆنـەکان، وەزیـر و نـاوداری گـەورەی هەیـە، سـەرەڕێی گـەورەی هاتوچـۆی هەبـووە. منیـش وتـم: لێـت تـێ دەگـەم، دەزانـم مەبەسـتت کوێیـە، پیرۆزیـان بێـت، مایـەی شـانازیە، ئـەم خاڵـە گرنگانـە بەشـی(کەلار) ی نەخـواردوە، ئێسـتا کـەلار لـە دروسـتکردنی وێسـتگە گرنگەکانـی مێژوودایـە، بەهـاوکاری خەڵکانێکـی زۆری کوردانـی هەمـوو لایـەک، بنەرەتەکـەی سـەد ماڵێـک دایاننـا، بـەڵام توانـاو شـارەزایی هەمـوو لایەنـەی لەسـەر کۆبۆتـەوە. ـ عەسـکەر بویـن لـە (بـەسرە)، بەنـاو بـازاڕا بـۆ پارچـەی ئامێرێکـی دەگمـەن دەگەڕایـن، زۆر ئەمـلا و ئەولامـان کـرد، نەمـان دۆزیـەوە... وەسـتابوین لەبـەر دەرگای دوکانێکـی گـەورەدا، خـاوەن دوکان تەماشـای ئێمـەی دەکـرد، هـەر بەبـێ دەنـگ تەماشـای دەکـرد.... دوایـی وتـی: ئنتـو کـراد مـوو؟؟ واتە(ئێـوە کـوردن، وانییـە؟؟) : ئێـی، کـراد: هـای اللـی تـدورون علیّـە، تلگونهـا یمکـم....( ئەمـەی ئێـوە بـۆی دەگەڕێـن، لای خۆتـان دەسـتان دەکـەوێ، :شـلون؟ ویـن ؟(چـۆن؟ لەکـوێ؟) : تلگونهـا ب(کلار )، کلار تندەللونـە!! مـوو؟ (لەکـەلار هەیـە، خـۆ کـەلار بەڵـەدن). ئێمـە تەماشـای یەکترمـان دەکـرد، لێـرە، لـە بـەسرە، کـەلار دەناسـن.... دەشـزانن چـی تێدایـە، ئەمـە باسـی سـەرەتای حەفتاکانـی سـەدەی ڕابـوردوە، نیشـانەی بەربـڵاوی کـەلار و شـارەزایی لێزانینـی ئـەم شـارەیە، مێـژووی هەیـە و مێـژوو دروسـت دەکات..... ناشـاردرێتەوە. بـۆ ئـەوەی یەکـەم خشـتی بـۆ بینـای دانـا، تـا ئەگاتـە ئـەوەی ئێسـتا خەریکـی ڕێکخسـتنی نـاو بازاڕەکەیەتی،.......... پیرۆزبایی.......



# سەرەتایەك لەبارەی دروستبوون و گەشەکردنی زانکۆی گەرمیان

د. یادگار عەلی

دکتۆرای شەرەفی یەکەم لە ڕاگەیاندن و

مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان.

## دەستپێك

زانکۆی گەرمیان، ناوەندێکی گرنگی ئەکادیمی و ڕووناکبیرییە لە گەرمیان و کامپی سەرەکی زانکۆکە دەکەوێتە سەنتەری شاری کەلار. لەماوەی (١٢) ساڵی ڕابردوودا؛ خزمەتێکی زۆری بەبواری زانست کردووە و سەدان دەرچووی لە بوارە جیاوازەکان پێگەیاندووە و بەردەوام لە گەشە و بەرفراوان بووونددا بووە و خاوەنی چەندین کۆلێژ و بەشی جیاجیایە لە شارەکانی کەلار، کفری و خانەقین، لەم زانکۆیە؛ سەدان ئەکادیمی سەرقاڵی فێرکردن و پێگەیاندنی خوێندکارانی ناوچەکە و شاروشارۆچکەکانی تری هەرێمی کوردستانن. لەم باسەدا؛ هەوڵدەدەین بەکورتی لەسەر چەند لایەنێکی زانکۆکە قسە بکەین.

## زانكۆی گەرمیان (دامەزراندن و گەشەكردن)

تا پێش ساڵی (٢٠٠٤)، لەگەرمیان، وەك دامەزراوەكانی كەرتی خوێندنی باڵا، تەنها پەیمانگەی تەكنیكی كەلار (ئێستا گۆڕاوە بۆ كۆلێژی تەكنیكی كەلار) هەبوو، بەڵام لەو ساڵەدا؛ بەهۆی پێویستی ناوچەكە بە كردنەوەی كۆلێژ، بە چەند قۆناغێك، چوار كۆلێژ لە ناوچە جیاجیاكانی گەرمیان كرانەوە، كە بریتی بوون لە كۆلێژەكانی: (پەروەردە ٢٠٠٤ لە كەلار)، (پەروەردەی بنەڕەت ٢٠٠٥ لە كەلار)، (ئاداب ٢٠٠٥ لە خانەقین) و (پەروەردەی وەرزش ٢٠٠٩ لە خانەقین). هەریەك لەم كۆلێژانە سەر بە زانكۆی سلێمانی بوون، تا پێش دامەزراندنی زانكۆی گەرمیان، لەڕووی كارگێڕی و داراییەوە لەلایەن زانكۆی سلێمانییەوە بەڕێوەدەبران.

زانكۆی گەرمیان، لە (٢٠١٠/٤/١٤) و لە ساڵیادی تاوانی ئەنفال، لەلایەن (د. بەرهەم ئەحمەد ساڵح - سەرۆكی كابینەی شەشی حكومەتی هەرێمی كوردستان)، بەردی بناغەی دانرا و (پرۆفیسۆر د. فاروق عەبدوڵڵا كەریم) بە سەرۆكی زانكۆ و (د. سیروان حەسەن ساڵح) بە یاریدەدەری سەرۆكی زانكۆ لە (٢٠ی شوباتی ٢٠١١) دەستبەكاربوون.

ژمارەی خوێندكارانی زانكۆی گەرمیان نزیكەی (٧٠٠٠) حەوت هەزار خوێندكار دەبێت و (١٣١١)یان دەرچووی ساڵی خوێندنی (٢٠٢٠-٢٠٢١) بوون، بەجۆرێك (١٠٧٨) خوێندكاریان دەرچووی خوێندنی بەیانیان و (٢٣٣) خوێندكاریشیان دەرچوونی خوێندنی ئێواران بوون.

ستافی مامۆستایانی زانكۆی گەرمیان لە (٤٠٣) مامۆستا بە پلەی زانستی (پرۆفیسۆر - پرۆفیسۆری یاریدەدەر - مامۆستا- مامۆستای یاریدەدەر) پێكهاتووە و (١٣٠) خوێندكاری ماستەر و دكتۆراشی لە ناوەوە و دەرەوەی هەرێمی كوردستان سەرقاڵی پرۆسەی تەواوكردنی خوێندنی باڵان. هەروەها زانكۆی گەرمیان لەئێستادا لە چەندین بەش خوێندنی دبلۆمی باڵا، ماستەر و دكتۆرای كردووەتەوە و

دەرفەتـی خوێندنـی بـاڵای بـۆ (٨٢) خوێنـدکار ڕەخسـاندووە.

زانکـۆی گەرمیـان لـە (نـۆ) کۆلێـژ و (دوو) بەشـی سـەربەخۆ و (٣٠) بەشـی زانسـتیی سـەر بـە کۆلێـژەکان پێکهاتـووە، تاوەکـوو ئێسـتا سـێ سـەرۆکی هەبـووە، یەکەمیـان؛ پسـپۆری یاسـا (پرۆفیسـۆر د. فـارووق عەبدوڵـڵا کەریـم) لـە (٢٠١١/١/١٩ - ٢٠١٧/١٠/١٢) بەشـێوەی هەمیشـەیی، هەروەهـا پسـپۆری بایۆلـۆژی (پرۆفیسـۆر د. سـیروان حەسـەن سـاڵەح) لـە (٢٠١٧/١٠/١٢ - ٢٠٢٠/١/٢٠) بەشـێوەی وەکالـەت و پاشـان پسـپۆری ئەدەبـی کـوردی (پرۆفیسـۆر د. فەرهـاد قـادر کەریـم) لـە (٢٠٢٠/١/٢٠ تاوەکـوو ئێسـتا) بەشـێوەی هەمیشـەیی سـەرۆکایەتی زانکۆکەیـان کـردووە.

## * ئاڵا، لۆگۆ و سروودی زانکۆی گەرمیان

- ڕەنـگ: زانکـۆی گەرمیـان، وەك زۆر دامـودەزگای تـری حکومـی و تایبـەت، خاوەنـی ڕەنگـی تایبـەت بەخۆیەتـی کـە ڕەنگـی (پرتەقاڵییـە)، بەوشـێوەیەی کـە ڕوونکراوەتـەوە.



- لۆگـۆ: لۆگـۆی زانکـۆی گەرمیـان لـە کۆمەڵـە تیشـکێك پێکهاتـووە، لەهەناویـدا؛ قەڵایـەك، پردێـك و پێنووسـێك هەیـە. لەخـوارەوە هەمـوو واتـا و ئاماژەکانـی نێـو لۆگۆکـە ڕوونکراوەتـەوە.

١. تیشـــکەکان: هێمایــە بــۆ (٢١)ــی مانگــی نــەورۆز، ســاڵی نوێــی کــوردی.

٢. قەڵا: هێمایە بۆ قەڵای شێروانە لە کەلار.

٣. پرد: هێمایە بۆ پردی ڕووباری ئەڵوەن لە خانەقین.

٤. پێنووس و کتێب: هێمایە بۆ زانست.

سروود: سرودی زانکــۆی گەرمیــان، لەلایــەن یەکەمیــن ســەرۆکی زانکــۆی گەرمیــان نــووسراوە و لەلایــەن هونەرمەنــدی میوزیکــژەن (ئەنــوەر قەرەداغــی) کاری دابەشــکردنی بــۆ کــراوە و لە بۆنــە و یادەکانی پەیوەســت بــە زانکــۆ دەگوترێتــەوە. تێکســتەکەی بەمشــێوەیەی خوارەوەیــە:

زانکۆی گەرمیان، زانکۆی گەرمیان

تۆ چاوی گەشی گەرمیانی

چەپکە گوڵی شەهیدانی

ئاسۆی کەلی پڕ لە نوری

قەڵای زانستی سنوری

زانکۆی گەرمیان، زانکۆی گەرمیان

هێمای گەشی شارستانی

ناسنامە بۆ کوردستانی

شایەتی زانستخوازیهان

هیوای ئەمڕۆ و داهاتومان

زانکۆی گەرمیان، زانکۆی گەرمیان

نەخشە ڕێگای بۆ سبەینێ

بڕواو متمانەت ئەدەینێ

بەتۆ ژیان جوانتر ئەکەین

کوردستان ئاوەدان ئەکەین

زانکۆی گەرمیان، زانکۆی گەرمیان

## ئەنجومەنی زانکۆی گەرمیان

بەرزترین دەسەڵاتی زانکۆیە و پێکهاتووە لە ڕاگری سەرجەم کۆلێژەکان و بەڕێوەبەری سەنتەری توێژینەوەی زانکۆ و نوێنەری گشتی مامۆستایان و کەسێکیش بەناوی ئەمینداری ئەنجومەن کە کۆنووسی کۆبوونەوە و بڕیارەکان ئامادە دەکات. لەو خشتەیەی خوارەوە ناو و پۆستی کارگێڕی هەموو ئەندامەکان تا ڕێکەوتی (٢٠ی شووباتی ٢٠٢٢) خراوەتەڕوو.

| | ناو | پۆستی کارگێڕی |
|---|---|---|
| ١ | پ.د فەرهاد قادر کەریم | سەرۆکی زانکۆ و سەرۆکی ئەنجومەن - هەمیشەیی |
| ٢ | پ.ی.د عزالدین جمعە دەرویش | یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری کارگێڕی و دارایی – بە وەکالەت. |
| ٣ | د. یادگار عەلی مەحمود | یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ کاروباری زانستیی و خوێندنی باڵا – بە وەکالەت. |

| ٤ | پ.د حسین ئیسماعیل عەلی | ڕاگری کۆلێژی پەروەردە – وەکالەت. |
|---|---|---|
| ٥ | پ.ی.د ئاسۆ لەتیف عەزیز | ڕاگری کۆلێژی زمان و زانستەمرۆڤایەتیەکان - بەوەکالەت |
| ٦ | د. محەمەد ئیبراهیم خەلیل | ڕاگری کۆلێژی زانستە ئەندازیارییە کشتوکاڵییەکان – بەوەکالەت. |
| ٧ | د. سامان محەمەد ئەمین | ڕاگری کۆلێژی پزیشکی گشتی - بەوەکالەت |
| ٨ | پ.ی. جەعفەر حسین عەلی | ڕاگری کۆلێژی پەروەردەی جەستەیی و زانستە وەرزشییەکان- بەوەکالەت |
| ٩ | پ.ی.د کۆمار نیعمەت شەوکەت | ڕاگری کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت – بەوەکالەت. |
| ١٠ | پ.ی.د عومەر یونس عەبدولحەمید | ڕاگری کۆلێژی زانست – بەوەکالەت. |
| ١١ | پ.ی.د عەلی جەبار قادر | ڕاگری کۆلێژی کۆمپیوتەر و تەکنەلۆیای زانیاری – بەوەکالەت. |
| ١٢ | پ.ی.د دڵشاد محەمەد غەریب | نوێنەری گشتی مامۆستایانی زانکۆی گەرمیان |
| ١٣ | کامەران عەبدولڕەحمان عەلی | ئەمینداری ئەنجومەنی زانکۆ |
| ١٤ | پ.ی.د ئەیاد فائق دەرویش | بەڕێوەبەری سەنتەری توێژینەوەی زانکۆی گەرمیان |

## بەڕێوەبەرایەتییە کارگێڕییەکانی زانکۆی گەرمیان

لەم زانکۆیەدا؛ چەندین بەڕێوەبەرایەتی بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارە کارگێڕیی و دارایی و زانستییەکان هەن و هەریەکەیان و لەقۆناغێك و بەپێی پێویستی و لەگەڵ فراوانبوونی زانکۆ لەڕووی ماددی و مرۆیی کراونەتەوە. هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکان لەسەنتەری شاری کەلارن، بەجۆرێك زۆربەیان لە سەرۆکایەتی زانکۆ لە سەر

ڕێگـەی سـەرەکی (کـەلار – کفـری) و چەنـد دانەیەکـی کەمیشـیان کەوتوونەتـە نـاو کامپـی سـەرەکی زانکـۆ لـە بەردەسـوور. لەخـوارەوە ئامـاژە بەهەمـوو بەڕێوەبەرایەتییـەکان بەپێـی مێـژووی کردنەوەیـان دەدەیـن.

| ناوی بەڕێوەبەرایەتی | | مێژووی کردنەوە |
|---|---|---|
| ١ | کارگێڕی و هونەری | ٢٠١١/٣/١٦ |
| ٢ | نوسینگەی سەرۆکی زانکۆ | ٢٠١١/٣/١٦ |
| ٣ | یاسا | ٢٠١١/٣/١٦ |
| ٤ | دارایی | ٢٠١١/٣/١٦ |
| ٥ | تەجهیزاتی ناوەندی | ٢٠١١/٣/١٦ |
| ٦ | تۆمار | ٢٠١١/٣/١٦ |
| ٧ | کاروباری خوێندکاران | ٢٠١١/٣/١٦ |
| ٨ | نووسینگەی یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ | ٢٠١١/١/٢٠ |
| ٩ | گەنجینەی تاقیگەکان | ٢٠١٢/١٠/٢٤ |
| ١٠ | پلاندانان و ئامار | ٢٠١٤/١٢/١٤ |
| ١١ | فێرکردنی بەردەوام | ٢٠١٤/١/١٥ |
| ١٢ | تەکنەلۆژیای زانیاری | ٢٠١١/١٢/٢٧ |
| ١٣ | وردبینی | ٢٠١١/١٠/١٠ |
| ١٤ | ئەندازیاری و پرۆژەکان | ٢٠١١/١١/٢٩ |
| ١٥ | پەیڕەو و پرۆگرامەکان | ٢٠١٤/١/١٤ |
| ١٦ | کتێبخانەی ناوەندی | ٢٠١١/٩/٢٤ |
| ١٧ | کامپی زانکۆ | ٢٠١٤/١/٧ |
| ١٨ | سەرپەرشتی و دڵنیایی جۆری | ٢٠١١/٧/٥ |

| ١٩ | تەندروستی و سەلامەتی | ٢٠١٤/١/٧ |
|---|---|---|
| ٢٠ | سەرچاوە مرۆییەکان | ٢٠١١/٣/١٦ |
| ٢١ | گرێبەستەکان | ٢٠١٣/٨/٢٧ |
| ٢٢ | چالاکی وەرزشی | ٢٠١٣/٨/٢٧ |
| ٢٣ | ڕاگەیاندن – دواتر کراوەتە هۆبە و لەسەر بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندییە ئەکادیمییە نێودەوڵەتییەکان دانراوە. | ٢٠١٣/٨/٢٧ |
| ٢٤ | خوێندنی باڵا | ٢٠١٣/٨/٢٧ |
| ٢٥ | پەیوەندیە ئەکادیمییە نێودەوڵەتییەکان | ٢٠١٥/٣/٥ |
| ٢٦ | سەنتەری توێژینەوە | ٢٠١٦/٧/٢٧ |
| ٢٧ | سەنتەری زمان | - |
| ٢٨ | سەنتەری گەشەپێدان بۆ کار | - |
| ٢٩ | گۆڤاری زانستیی زانکۆ | - |

تێبینی: بەڕێوەبەرایەتییەکان چەندجارێك گۆڕانکاری بەسەر ناوەکانیان هاتووە، یاخود هەندێك لەنێو هەندێکی تر و بەهۆکاری قەیرانی دارایی کەمکراونەتەوە و خراونەتە سەر یەکدی.

*پرۆژەکانی زانکۆی گەرمیان

زانکۆی گەرمیان لەڕووی بینا و باڵەخانەوە، ژمارەیەك پرۆژەی تێدا جێبەجێکراوە، بەشێك لەو پرۆژانە تەواو بوون و خراونەتە خزمەتی ڕەوتی زانست و خوێندن، بەشەکەی تریشیان؛ لەقۆناغی جێبەجێکردندان و بەهۆی قەیرانی دارایی هەرێمی کوردستان کارکردن تێیاندا ڕاوەستاوە، ئەوە سەرباری ئەوەی چەندین پرۆژەی تر کە لەسەر بودجە جیاوازەکان کە بەشێوەی (جێبەجێکردنی ڕاستەوخۆ) ئەنجامدراون. لەخوارەوە بەخشتەیەك زانیاری لەسەر بەشێك لە پرۆژە دیارەکان دەخەینەڕوو.

| | ناوی پرۆژە | بوودجە | | ڕێژەی تەواوبوون |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بەشەناوخۆیی کچان | | ٢٠١٢/٨/١٣ | تەواو بووە |
| ٢ | بەشە ناوخۆیی کوڕان | | ٢٠١٣/٩/٢٩ | تەواو بووە |
| ٣ | یاریگای چیمەنی دەستکرد | ٢٧٣,٣٢٠,٠٠٠ | ٢٠١٠/١/٧ | تەواو بووە |
| ٤ | بینای سەرۆکایەتی زانکۆ | | ٢٠١٣/٨/٢٥ | ٪٥٠ـی تەواو بووە |
| ٥ | بینای کتێبخانەی ناوەندی | | ٢٠١٣/٩/٢٩ | ٪٥٠ ـی تەواو بووە |
| ٦ | بینای کۆلێژەکانی پەروەردە و پەروەردەی بنەڕەت | | ٢٠١٠/٨/٢٥ | هەردو پرۆژەکە تەواو بوون |
| ٧ | بینای کۆمەڵگەی تاقیگەکان | $ ٦,٠٨٩,٠٠٠ | ٢٠١٣/٩/١٦ | ٪٤٠ـی تەواو بووە |
| ٨ | بینای کۆلێژی زانست | $ ٣,٥٥٠,٠٨٥ | ٢٠١٠/٩/٢ | تەواو بووە |
| ٩ | بینای کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان و وەرزش/ خانەقین | $ ٤,٧٨٤,٣٥٠ | ٢٠١٢/١٠/٤ | تەواو بووە |
| ١٠ | پرۆژەی بنکەی پۆلیس و بنکەی تەندروستی و کۆگای زانکۆ | $ ١,٠٥٠,٠٠٠ | - | ٪٧٥ـی تەواو بووە |
| ١١ | پەرژینی دەرەوەی کۆلێژی پەروەردەی وەرزش / خانەقین | ١٦١,٠٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٠/٢/١١ | تەواو بووە |
| ١٢ | کۆمەڵگەی وەرزش/ خانەقین | | ٢٠١٢/٧/١٨ | تەواو بووە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٣ | پرۆژەی دیزاینکردنی ماستەر پلانی کامپی زانکۆی گەرمیان | $ ١٩٢,٠٠٠ | - | تەواو نەبووە |
| ١٤ | نۆژەنکردنەوەی سکولی وەرزش/ خانەقین | ١٩٩,٠٦٢,٠٠٠ | ٢٠٠٩/١٢/٢٤ | تەواو بووە |
| ١٥ | هۆڵی داخراوی ئۆلۆمپی/ خانەقین | | ٢٠١٠/٢/١١ | تەواو بووە |
| ١٦ | یاریگای داخراوی کامپی زانکۆ | $ ٣٣٥,٨٠٥ | ٢٠١٤/٤/٢٨ | تەواو بووە |
| ١٧ | یاریگای داخراو بە چادر/ خانەقین | ٤٨٠,٠٠٠,٠٠٠ | ٢٠١٢/٦/٢٥ | تەواو بووە |
| ١٨ | پرۆژەی کۆگای زانکۆ | $ ٣٢١,٠٠٠ | ٢٠١٤/٦/١٥ | ٪٦٠ـی تەواو بووە |
| ١٩ | ئامێرو پێداویستی تاقیگەی بەشەکانی بایۆلۆژی، فیزیا و کیمیا | $ ٩٦١,٣٩٦ | - | |
| ٢٠ | ئامێرو پێداویستی بەشی ئەندازیاری شارستانی | $ ١,٨٩٤,٠٥٨ | - | |

### * کۆلێژەکانی زانکۆی گەرمیان

لە ئێستادا؛ زانکۆی گەرمیان لە (١١) کۆلێژ و (دوو) بەشی سەربەخۆ پێکهاتووە، لەخوارەوە لەسەر هەریەك لەو کۆلێژانە دەوەستین و هەندێك زانیاری پێویست و بەردەست لەبارەیانەوە دەخەینەڕوو.

## یەکەم: کۆلێژی پەروەردە – بەیانیان

ڕەنگی ئاڵاکەی (مۆری کاڵ)ـە، لە ساڵی خوێندنی (٢٠٠٤-٢٠٠٥) لەکەلار کراوەتەوە، بەگەورەترین کۆلێژی زانکۆکە لەڕووی ستاف و ژمارەی بەش و خوێندکار ئەژماردەکرێت، لە ئێستادا؛ (پرۆفیسۆر د. حسین ئیسماعیل عەلی) ڕاگری کۆلێژەکەیە و پێکدێت لە بەشەکانی: (جوگرافیا، زیندەوەرزانی، فیزیا، کیمیا، ماتماتیك، زمانی کوردی، زمانی عەرەبی، زمانی ئینگلیزی، دەرونناسی، مێژوو) و ژمارەی خوێندکارانی (٤٤٣) خوێندکارە، تاوەکوو ئێستاش (٦٣٢٣) خوێندکار بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان لە بەشە جۆربەجۆرەکانی کۆلێژەکە وەرگرتوە.

## دووەم: کۆلێژی پەروەردە – ئێواران

ئەم کۆلێژە لەهەمان بینای کۆلێژی پەروەردە – خوێندنی بەیانیان ـە و لەئێستادا؛ هەمان ڕاگری هەیە و لەساڵی خوێندنی (٢٠١٧-٢٠١٨) دامەزراوە. ئەم بەشانە لەخۆدەگرێت: (زمانی ئینگلیزی، پەروەردە، دەروونناسی، کیمیا). ژمارەی خوێندکارانی دەرچووی کۆلێژەکە بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠٢٠-٢٠٢١) بریتی بووە لە (٧٢) خوێندکار.

## سێیەم: کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت – بەیانیان

ڕەنگی ئاڵای ئەم کۆلێژە (پەمەیی تۆخ)ـە، سەرەتا بەناوی کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی کەلار/ زانکۆی سلێمانی دامەزرابوو، دواتر لەساڵی خوێندنی (٢٠٠٧- ٢٠٠٨) بەپێی فەرمانی زانکۆیی زانکۆی گەرمیان ژمارە(٤٥٩/٣/٧) لە ڕێکەوتی (٢٠١١/٧/٢) ناوەکەی گۆڕدرا بۆ سکولی پەروەردەی بنەڕەت، پاشان جارێکی تر

بەفەرمانی زانکۆیی زانکۆی گەرمیان ژمارە (٥٤٩٩) لە ڕێکەوتی (٢٠١٥/١٢/١٩) ناوەکەی بۆ کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت گۆڕا. لەئێستادا؛ بەڕێز (پ.ی.د. کۆمار نعمت شوکت) ڕاگری کۆلێژەکەیە. ئەم کۆلێژە لە پێنج بەشی سەرەکی پێکدێت، کە ئەمانەن: (زمانی کوردی، زمانی عەرەبی، پەروەردەی وەرزش، زانستەکۆمەڵایەتیەکان و باخچەی منداڵان)، ژمارەی گشتی خوێندکارانی کۆلێژەکە بریتیە لە (٨٠٨) خوێندکارو تاوەکوو ئێستاش (٢٢٧٩)خوێندکار بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان لەپسپۆریە جیاوازەکانی ئەم کۆلێژە وەرگرتوە.

## چوارەم: کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت – ئێواران

بە فەرمانی زانکۆیی ژمارە (٣٨٠٥) لە ساڵی (٢٠١٢) دامەزراوە. ئەم بەشانە لەخۆدەگرێت: (زمانی کوردی، زمانی عەرەبی، پەروەردەی وەرزش، باخچەی منداڵان، زانستە کۆمەڵایەتییەکان)، پێشتریش هەریەك لە بەشەکانی (ماتماتیك و زمانی ئینگلیزی) لە کۆلێژەکە هەبوون. ژمارەی خوێندکارانی دەرچوو لەم کۆلێژە بریتییە لە (٦٧٥) خوێندکار و لەئێستاشدا؛ (٢٤٨) خوێندکار لە بەشە جیاجیاکانی کۆلێژەکە درێژە بەخوێندن دەدەن.

## پێنجەم: کۆلێژی زانست

ڕەنگی ئاڵای کۆلێژی زانست (مارۆنی) یە، لەساڵی خوێندنی(٢٠١٥-٢٠١٦) فەرمانی کردنەوەی دەرچووە، سەرەتا بەکردنەوەی بەشی زانستیی کۆمپیوتەر و بەفەرمانی ژمارە (٩٧٨٥) لە ڕێکەوتی (٢٠١٣/٥/٢١) دەستپێکرد، پاشان بەشی زانستی کیمیا بە فەرمانی ژمارە (٢٥٣٦) لە ڕێکەوتی (٢٠١٥/٢/٤) لە کۆلێژەکە کرایەوە. لەئێستاشدا؛ تەنها ئەو دوو بەشە زانستیەی لەخۆگرتوە و بەڕێز (پ.ی.د. عومەر یونس عبدالحمید) ڕاگری کۆلێژەکەیە.

کۆلێژەکە لە کاتی دامەزراندنییەوە، تاوەکوو ئێستا بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بە (٣٢٠) خوێندکار بەخشیوە و پێنج خوولی دەرچووانی ئەنجامداوە.

## شەشەم: کۆلێژی زمان و زانستە مرۆڤایەتییەکان

ڕەنگی ئاڵای ئەم کۆلێژە (وەنەوشەیی تۆخ)ـە و لە قەزای خانەقینـە، دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس و گەڕانەوەی خانەقین بۆ سەر ئیدارەی هەرێمی کوردستان، لە ڕێکەوتی (٢٠٠٤/٧/٢٠)، بڕیاردرا؛ بەکردنەوەی یەکەم کۆلێژ لە قەزاکە بەناوی (کۆلێژی زمان)، ئەم کۆلێژە؛ لەیەك بەش پێکهاتبوو کە ئەویش بەشی (زمانی کوردی) بوو، ئەو تەنها بەشەش سەر بە زانکۆی سلێمانی بوو، هەر لەگەڵ بڕیاری دامەزراندنی زانکۆی گەرمیان، کۆلێژەکە بۆ سەر زانکۆی گەرمیان گوازرایەوە و ناوەکەی بۆ (کۆلێژی زمان و زانستە مرۆڤایەتیەکان) گۆڕدرا. لەئێستادا بەڕێز (پ.ی.د ئاسۆ لەتیف عەزیز) ڕاگری کۆلێژەکەیە. لەچەند بەشێکی زانستیی پێکدێت، ئەمانەن: (زمانی کوردی، زمانی عەرەبی، زمانی ئینگلیزی، جوگرافیا، دەروناسی و مێژوو). تا ساڵی (٢٠١٤): ژمارەی خوێندکارانی ئەم کۆلێژە (١٣٥٤)خوێندکارە بووە، (٢٢٥٠) خوێندکار بڕوانامەی بەکالۆریۆسیان لەم کۆلێژە وەرگرتووە.

## حەوتەم: کۆلێژی زانستە ئەندازیارییە کشتوکاڵییەکان

ئەم کۆلێژە لە قەزای کفرییە، ڕەنگی ئاڵاکەی بریتیە لە: (سەوزی تۆخ)، لە ساڵی خوێندنی (٢٠١٣-٢٠١٤)، بەفەرمانی وەزاری ژمارە (١٠٣٨٩)ـی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستیی و لەڕێکەوتی(٢٠١٣/٥/٢٧) یەکەم بەش کە (سامانی ئاژەڵی) بو کرایەوە و سەر بە سەرۆکایەتی زانکۆی گەرمیان بوو، لەسەرەتا

ئـەم بەشـە تەنها (٥٦) خوێنـدكاری هەبـوو، پاشـان بەفەرمانـی وەزاری ژمـارە(٢٢٣٧) و لەڕێكەوتـی (٢٠١٣/١٢/٣١) بڕیـار لەسـەر كردنـەوەی كۆلێـژی كشـتوكاڵ لەقەزاكـە درا. لەئێسـتادا بەڕێـز(د. محەمـەد ئیبراهیـم خەلیـل) ڕاگـری كۆلێژەكەیـە و خاوەنـی دوو بەشـی زانستییە بەناوەكانـی بەشـی (سـامانی ئـاژەڵ) و بەشـی (بەروبوومـی كێڵگەیـی) كـە ئەمـەی دواییـان؛ تائێسـتا خوێنـدكاری وەرنەگرتـووە.

## هەشتەم: كۆلێژی پەروەردەی جەستەیی و زانستە وەرزشییەكان

ڕەنگـی ئـاڵای ئـەم كۆلێـژە (سـپی + قاوەیی)ـیە. دەكەوێتـە قـەزای خانەقیـن و لـە سـاڵی خوێندنـی (٢٠٠٨-٢٠٠٩) بـە فەرمانـی زانكۆیـی زانكـۆی گەرمیـان ژمـارە (١٢٤٢٧/٥/٧) لـە ڕێكەوتـی (٢٠٠٨/٩/٢٧) دامـەزراوە. سـەرەتا نـاوی كۆلێژەكـە بریتـی بـووە لـە: (پـەروەردەی وەرزش)، دواتـر لـە سـاڵی (٢٠١٩) ناوەكـەی بـۆ ئـەوەی ئێسـتا گـۆڕدرا. لەسـاڵی (٢٠١٦-٢٠١٧) بەشـی خوێندنـی ئێـواران لـە كۆلێژەكـە كرایـەوە و لەسـاڵی خوێندنـی (٢٠١٩-٢٠٢٠) یەكـەم خولـی خوێنـدكاران ئاهەنگـی دەرچوونیـان ئەنجامـداوە.

## نۆیەم: كۆلێژی كۆمپیوتەر و تەكنەلۆژیای زانیاری

ڕەنگـی ئـاڵای ئـەم كۆلێـژە نیلـی ـیە. دەكەوێتـە شـاری خانەقیـن. لـە سـاڵی (٢٠١٩) بەفەرمانـی وەزارەتـی خوێندنـی بـاڵا و توێژینـەوەی زانسـتیی دامـەزراوە و دوو بەشـی لەخۆگرتـووە، ئەوانیـش: (بەشـی تەكنەلۆجیـای زانیـاری و بەشـی نیتـۆرك). ئـەم كۆلێـژە لەئێسـتادا؛ تەنها خوێنـدكاری قۆناغـی یەكـەم و دووەمـی هەیـە و كـۆی ژمارەیـان بریتییـە لـە: (١٤٢) خوێنـدكار.

## دەیەم: کۆلێژی پزیشکی گشتی

ڕەنگــی ئاڵاکــەی ســوورە. لــە مانگــی ئەیلوولــی (٢٠١٨) بەفەرمانــی وەزارەتــی خوێندنــی بــاڵا و توێژینــەوەی زانســتیی کراوەتەوە. سیســتەمی خوێنــدن لــەم کۆلێــژەدا؛ سیســتەمێکی تێهەڵکێشــە کــە سیســتەمێکی نوێــی بەریتانییــە. مــاوەی خوێنــدن شــەش ســاڵە و خوێنــدکار لەپــاش تەواوکردنــی سمســتەرەکانی خوێنــدن بڕوانامــەی بەکالۆریــۆس لــە پزیشــکی گشــتی وەردەگرێــت. لەئێســتادا؛ ئــەم کۆلێــژە ســێ قۆنــاغ خوێنــدکاری هەیــە، وانــە تیۆرییــەکان لــە نــاو کامپــی ســەرەکی زانکــۆ لەبەردەســوور و وانــە پراکتیکییەکانیــش لەنەخۆشــخانەی فێــرکاری کــەلار دەخوێنــن. لــەم کۆلێــژەدا؛ هەڵگرانــی ماســتەر و دکتــۆرا لــە زانســتە بنچینەییــەکان و (پزیشــکە دکتــۆرەکان) کــە هەڵگــری بڕوانامەی (بــۆردی عێراقی)ــن وانــە دەڵێنــەوە.

لەزانکــۆی گەرمیــان ســەرباری کۆلێــژە ســەربەخۆکان، دوو بەشــی ســەربەخۆش هــەن کــە ڕاســتەوخۆ بەســتراون بــە ســەرۆکایەتی زانکۆکــەوە، ئەوانیــش: ئەندازیــاری شارســتانی، یاســا-ن و لەخــوارەوە بەکورتــی لەســەر هەریەکەیــان دەدوێیــن.

## یەکەم: ئەندازیاری شارستانی

ڕەنگــی ئــاڵای ئــەم بەشــە بریتییــە لــە (شــینی کاڵ). بــە فەرمانــی وەزاری ژمــارە (١٠٣٩١) لــە ڕێکەوتــی (٢٠١٣/٥/٢٧) دامــەزراوە و لەســاڵی خوێندنــی (٢٠١٤-٢٠١٥)ــدا، خوێنــدکاری وەرگرتــوە و ژمــارەی خوێندکارانــی (١٢٥) خوێنــدکارە. هەروەهــا ســتافی ئەکادیمــی بەشــەکە لــە (١٠) مامۆســتای میلاکــی هەمیشــەیی پێکدێــت و شــەش مامۆســتای وانەبێــژی دەرەکــی هەیــە و بەڕێــز (د. غــازی بەهــرۆز جمعــە) ســەرۆکی بەشــەکەیە.

## دووەم: بەشی یاسا

بەشێکی سەربەخۆیە و ڕاستەوخۆ بەستراوەتەوە بە سەرۆکایەتی زانکۆی گەرمیان، بەفەرمانی وەزاری ژمارە (٣٥٩) لە (٢٠١٦/٦/٣٠) کراوەتەوە. بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠١٦-٢٠١٧) کە ساڵی یەکەمی کردنەوەی ئەم بەشە بووە، (٥٩) خوێندکاری وەرگرتووە، لەئێستادا؛ ژمارەی خوێندکارەکانی (٢٠٢) خوێندکارە لە خوێندنی (بەیانیان – ئێواران) و ماوەی خوێندن لەم بەشە (پێنج) ساڵە و بەڕێز (د. هۆشمەن عەلی کەریم) سەرۆکی بەشەکەیە.

# قوتابخانەی ئاینیی کەلار



جاسم کەلاری

پێشنوێژ و وتاربێژی مزگەوتی

شێخ عبد القادری گەیلانی لە کەلار

لە ساڵی ١٩٩٣ لە پۆلی دووی ناوەندی بووم، پاش ئەوەی بە هۆی کۆڕەو ساڵێك لە خوێندن دواکەوتبووم؛ لە ناو خوێندن بووین جەنابی باوکم (خوا بیپارێزێت) فەرمووی: مامۆستا مەلا مەحموودی قەسڵانی (خوا لە ڕەحمی خۆیدا داڵدەی بدات) پێی فەرمووم: کە قوتابخانەیەکی ئاینی لە کەلار دەکرێتەوەو تۆش کوڕێکی ١٥ ساڵەت هەیە، بۆ ناوی نانووسیت؟

منیش شاگەشکە بووم بەم هەواڵەو خێرا بڕیارم دا ناو بنووسم و بۆ دواجار ماڵئاوایی لە قوتابخانەکانی پەروەردە بکەم.

ئەم ناونووسینە پێش تاقیکردنەوەکانی سەری ساڵ بوو، منیش خواخوام بوو، چوونکە تەواو لە دەوامی قوتابخانە بێزار بووم بە هۆی چەند هۆکارێکەوە کە ئێرە جێگەی نییە باسی بکەین.

ئەوە بوو چاوەڕێی دەستپێکردنی دەوام بووین، بەڵام دەوامی ساڵی نوێ لە دەوامی قوتابخانەکانی پەروەردە دواکەوت، بە هۆی کەمیی ناونووسینی قوتابیانی ئەو سەردەمە بۆ فەقێیەتی.

بڕیار بوو ناوی ١٠ قوتابی بنووسرێت پاشان دەست بە خوێندن بکرێت.

دوای دواکەوتنی ٤٠ – ٥٠ شەو، دواجار ڕۆژی سێشەممە بەرواری ١٠ مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٤١٤ ی کۆچی. ٢٥/ ١١/ ١٩٩٣ ی زاینی دەستمان کرد بە خوێندن لە قوتابخانەکە.

سەرەتا ڕەحمەتی جەنابی مامۆستا مەلا مەحموودی قەسڵانی (خوا نغرۆی ڕەحمەتی خۆی بکا) ئیدارەی قوتابخانەکەی پێ سپێردرابوو، بەڵام بە هۆی نەخۆشیی دڵەوە دەستبەرداری ئیدارەکە بوو، و ڕادەستی مامۆستا مەلا حەمەئەمینی کردبوو کە ئێستا بەرپرسی لقی گەرمیانی یەکێتیی زانایانی ئاینیی ئیسلامییە، و پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی کەلارە.

ئەوە یەکەم ڕۆژە سێشەممەیە ١٠ مێردمنداڵی ١٥ ساڵە کۆبووینەتەوە لە مزگەوتی گەورەی کەلار، کە ئەمانە دەستپێکی فەقێیەتیی فەرمی بوون لە گەرمیان.

ناوی سیانیی فەقێکان ئەمانە بوو بە زنجیرەی ئەلفوبێیی:

١- جاسم محمد أمين
٢- حسين محمد كريم
٣- ديار سعيد حمەغريب
٤- سۆران محمد محمدغريب
٥- كاوە حسن قادر
٦- كمال محمدعلي عثمان
٧- محمد حمەأمين عبد القادر
٨- محمد طاهر قمر
٩- نوزاد هيدايت محمدغريب
١٠- هێمن علي محمد

تەنها چوار لە مامۆستاکان لەوێ بوون:

١) م. مەلا حەمەئەمین عبد القادر حسین / بەڕێوەبەر.

٢) م. مەلا طاهر قمر حسین.

٣) م. عبد العزیز حسێن أحمد (خوا بیخاتە بەر ڕەحمی خۆی).

٤) م. مەلا عثمان صالح أحمد.

هەموان دانیشتین و گوێمان شل کردبوو بۆ گوفتاری مامۆستایان، کە چەند ڕێنماییەکی سەرەتاییان پێمان دا، وەکوو: ئەم دوو ڕۆژەی هەفتە ماوە وەرن بۆ مزگەوت بۆ وەرگرتنی هەندێك کتێب، و ڕۆژی شەممەی داهاتوو خوێندن دەست پێدەکات، و مانگانەی فەقێیەتیتان ٧٠ دینارە و ساڵانە قاتی کوردیتان بۆ دەدروین، و... هتد.

لێرە ئێمە بووین بە یەکەم کاروانی دامەزراندنی فەقێ لە گەرمیان، ئەگەرچی لە حوجرەی هەندێك لە مزگەوتەکان فەقێ هەبوون، بەڵام ئەوانە شێوەی فەرمییان وەرنەگرتبوو، لە لایەن ئەوقافەوە پشتگیرییان وەکوو ئێمە نەبوو.

دوای مانگێك لە دەستپێکردنی دەوامی فەقێیەتی شەڕی براکوژیی نێوان یەکێتی و بزووتنەوەی ئیسلامی هەڵگیرسا لە بەرواری ٢٥/ ١٢/ ١٩٩٣ تا ٢٧/ ١٢/ ١٩٩٣ بەردەوام بوو، پاش کوشتار و دەربەدەرکردن کۆتایی هات.

ئێمە وەکوو فەقێکانی مزگەوت هیچ نەبووین لەم شەڕ و پێکدادانە، بەڵام نزیکەی ٣–٤ ڕۆژ دەوامان پەکی کەوت و کۆمەڵێکی زۆر لە گەنجانی کەلار لەوانەی کە بەشداری شەڕەکە بوون و لەوانەشی کە هاوسۆز بوون لە گەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی دەستگیرکران.

پاش دوو مانگ کەمتر لە ٢٤ ی شەعبانی ١٤١٤ ی کۆچی ٦/ ٢/ ١٩٩٤ ی زاینی یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان ڕاگەیەنرا.

مەبەستم لـەم بـاس و خواسـەی حیزبـەکان بابەتێکـە دێمـەوە سـەری و ئـەم سەرگوزشـتەیە دەمباتـەوە سـەر چەنـد بابەتێـك کـە دەمگێڕێتـەوە سـەری.

کـە دەسـتمان کـرد بـە وانەکانـی فەقێیەتـی وانەکانمـان بریتـی بـوون لـە: قورئانـی پیـرۆز، تەفسـیری قورئـان، لـە کتێبـی (زبـدة التفسـیر)، و فەرمـوودەی پێغەمبـەر (درووودی خـوای لـە سـەر بـێ) لـە کتێبـی جواهـر البخـاري وشرح القسـطلاني) و فیقهـی ئیسـلامی لـە مەتنـی نـاسراو بـە (فتـح القریـب) و زانسـتی (نەحـوو) لـە کتێبەکانـی عەواميلـی جورجانی و کتێبـی (الآجرّومیـة) ی ئیمامـی صِنهاجـی، و زانسـتی (صـەرف) لـە کتێبـی (بنـاء الافعـال) ی مـەلا عەبـدوڵای دەنقـەری. و زانسـتی تەجوید لـە کتێبـی (هدایـة المسـتفید في أحـکام التجویـد)، و زانسـتی بیـرکاری و زمانـی ئینگلیـزی کـە لـە لایـەن خوالێخۆشـبوو مامۆسـتا عبـد العزیـز ەوە دەوترایـەوە. (خـوای گـەورە پلـەی بـاڵا بـکات).

هەندێـك لـە کتێبەکانمـان پـێ درا، هەندێکـی دەسـت نەکـەوت، ئەوانـەی کـە دەسـت نەکەوتـن کۆپیـی مامۆسـتاکانمان بـرد بـۆ دووکانـی لەبەرگرتنـەوە ئـەو سـەردەمە لـە کـەلار تەنهـا یـەك دوو دووکانـی لەبەرگرتنـەوە هەبـوون، کتێبێکـی بچووکـی وەك عەواميلـی جورجانـی وتیـان: بـە ١٥ دینـار لەبـەری دەگرینـەوە، ئێمـەش تەنهـا یـەك دینـار ڕۆژانەمـان بـوو، ئەگـەر بکـرێ هـەر پەرتووکێـك لەبـەر بگرینـەوە دەبوایـە ڕۆژانـەی ١٥ ڕۆژمـان هەڵبگرتایـە، ئـەوەش زۆر قـورس بـوو، وە ئارامگرتنێکـی لـەو جـۆرە بـۆ مێردمنـداڵان ئاسـان نییـە.

مـن بـە هـۆی ئـەوەی خەتـم خـۆش بـوو، بـە قەڵـەم دەسـتم دایـە نووسـینەوەی کتێبـەکان، عەواميلـی جورجانیـم نووسـییەوە، مەتنـی (الآجرّومیـة) م نووسـییەوە، مەتنـی (بنـاء الأفعـال) نووسـییەوە، مەتنـی (الأمثلـة المختلفـة) و زۆری تریـش.

کـە کتێـب لـە بەردەسـتم بـوو، وای کـرد هاوڕێکانـم داوای بکـەن، ئەوانـەم بەخشـی، مامۆسـتاکانیش داوای نووسـینەوەیان کـرد، ئـەوەی بێتـە بیـرم وابزانـم تەنهـا مەتنـی (الآجرّومیـة) م ١١ جـار نووسـییەوە،

ئیتر ئەم نووسینە بوو بە پیشەم، هەر کتێبێکم خۆش بویستایە بە قەڵەمی خۆم دەمنووسییەوە.

تەنانەت لە قۆناغی ٣ بووم خولێکمان بۆ کرایەوە، کتێبەکانم نووسییەوە، یەکێك لەو کتێبانە کتێبی (تحقیق الوصول إلى علم الأصول) کە زیاد لە ١٠٠ لاپەڕە بوو هەموویم نووسییەوە، کە پێم وابێت ئەم نووسراوەم ئێستا لای هاوڕێی خۆشەویستم مامۆستا مەلا ئەحمەد فەرحانە.

ئەم نووسینەوانە کتێبی زۆر لا خۆشەویست کردم.

جا هەر بە کەلارییەکەی خۆمان: (قسە تێ قسە ئەوڕێ) من پێش ئەوەی ببم بە فەقێ حەزم لە نووسین بوو، هەر خەتم خۆش بوو، یەکەم کتێب کە وەرمگێڕایە سەر زمانی کوردی هێشتا دەستمان بە خوێندنی فەقێیەتی نەکردبوو، ساڵی ١٩٩٣ بوو کتێبەکە ناوی (الأحادیث القدسیة) کە دانراوی ئیمامی نەوەوی بوو، سەرەڕای لاوازیم لە زمانی عەرەبی و نەزانینی نەحو و صەرفی عەرەبی، کتێبەکەم تەواو کرد و ئێستا لای خۆمە، کە لە تەمەنی ١٥ ساڵی نووسیومە، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوە بوو، بەرواری خۆیم لێ نەدا، بەو پێیە ساڵی ١٩٩٤ نزیك بوو نووسیومە ١/ ١/ ١٩٩٤ تەواو بووم.

بە هەر حاڵ لە گەڵ هاوڕێکانمان ئەو ساڵەمان بە کولەمەرگی بڕی، قاتێکی قاوەیی خەتخەتیان بۆمان کرد، کە چەند ساڵێك لە بەرمان کرد، و کاتێك سپی بوویەوە لای بەرگدروو هەڵمانگێڕایەوە، و ماوەیەکیش بەو لایە لە بەرمان کردەوە.

ئەو ساڵەمان بە باشی بڕی، بەس خوا وەکیلە سەرەڕای ئەوەی بە پلەی یەکەم قۆناغەکەم بڕی دوو کتێبمان لە نەحوو و دوو کتێبمان لە صەرف خوێند هێشتا بە باشی نەمئەزانی جیاوازیی نێوان ئەو دوو زانستە چییە!!

هەرچۆن بێت، ساڵ تێپەڕی، چووینە پۆلی دوو، ١٠ قوتابیی گەنجی ترمان بۆ هاتن، کە هاوڕێم مامۆستا مەلا ئەحمەد فەرحانیان تیا بوو، بە داوای من هات بوو بە فەقێ، ئیتر کەشەکە بۆ من لە بار بوو، نزیکترین هاوڕێی کۆڵان و دەر و دەشتم هات لە گەڵما بوو بە فەقێ.

جا ئەم هاتنەی مامۆستا مەلا ئەحمەد سەرگوزشتەیەکی خۆشی هەبوو بە کورتی باسی ئەکەم بۆتان:

- بۆ نایەی لە گەڵمان ببیت بە فەقێ؟

+ وەڵا من حەزم لە فەقێ نییە ئەمەوێ ببم بە دکتۆر.

- ئاخر ئێمە دەرسی ئاینی ئەخوێنین، قاتی کوردیمان بۆ ئەکەن، قورئان لە بەر ئەکەین.

+ بە خوا من دکتۆریم پێ خۆشە.

بەم شێوەیە ماوەیەك چوو قەناعەتی کرد، ئینجا وتی: باوکم ڕێ نادا.

وتم کاکە من داوا لە باوکت ئەکەم ڕێ بدا.

وتی: من باوکی خۆمە، ئەزانم ڕێم نادا واز لە مەکتەب بێنم بۆ فەقێیەتی.

چووم بۆ لای باوکی، وتم: مامە بۆ ئەحمەد نەبەم بۆ دەرسی فەقێیەتی؟

وتی: جاسم ئەوە چەند ساڵێکە من تۆم لە ژێر چاودێریدا داناوە، زۆر سەیرت ئەکەم، بۆم دەرکەوتوویت ئەخلاقت زۆر جوانە، ئەوە ئەحمەدە ئەیدەمە دەستت خۆت داهاتووی بۆ هەڵبژێرە.

ئـەم ڕسـتـەیە هەرگیـز لـە بیـرم ناچێتـەوە، مامۆسـتای هاوڕێیشـم لـە یادیەتـی کـە باوکـی وای پێـمان وت، ئـەوە بـوو مامۆسـتا بـوو بـە هاوڕێی فەقێیەتیم و لـە هـەردوو قۆناغەکـە بـە هەمـوو ٢٠ قوتابییەکـە تەنها مـن و ئـەو بووین بـە مـەلا بـە شـێواز و جـل و بـەرگ و پیشـە.

سـاڵی دووهـەم کتێبـەکان گـۆڕان و ئەمجـارە ئەوقـاف لـە بـاری نووسـینەوەی کتێـب منیـان ڕزگار کـرد و خۆیـان کتێبەکانیـان بـە لەبەرگرتنەوەیەکـی کاڵ و کـرچ بۆمـان نـارد، ئەمجـارە دەرسـی تـازە و کتێبـی تـازە و پاشـان مامۆسـتا مـەلا (کریـم فـرج محمـد) نـاسراو بـە مامۆسـتا کەریمـی شـافیعی هـات، بـوو بـە مامۆسـتامان، کـە جەنابیـان حوجرەیەکـی لـە مزگەوتـی شـافیعی هەبـوو، ڕۆژانـە وانـەی بـە ئێمـەش دەوتـەوە، کـە وانـەی نەحـوو لـە کتێبـی (الأنمـوذج) ی زەمەخشـەری، و وانـەی صـەرف لـە کتێبـی (المقصـود) ی بـە ئێمـە دەوتـەوە.

گوێـم بـۆی گـرت ئەبینـم مامۆسـتا وانەکـە زۆر نایـاب ڕوون دەکاتـەوە، سـەیر ئەکـەم تێدەگـەم نەحـوو جیـاوازە لـە صـەرف، ئەمـە سـەرەتای ڕێـڕەوی تێگەیشـتنم بـوو کـە جەنابـی مامۆسـتا مـەلا کەریمـی شـافیعی بـوو بـە سەرمەشـقم و تـا مـردن هـەر هەنگاوێـك بنێـم پشـکێکی بـۆ ئـەم زاتەیـە، خـوای گـەورە تەمەنـی درێـژ بـکات.

دەفتەرێکـی ٦٠ لاپەڕەییـم پەیـدا کـرد و دەسـتم کـرد بـە نووسـینی قسـەکانی جەنابـی مامۆسـتا مـەلا کەریـم، بـە عەرەبییەکـی نوقسـان، ئـەو یاسـا و ڕێسـایانەی کـە ڕوونـی دەکـردەوە دەمنووسـییەوە و کـە دەگەڕامـەوە سـەری سـوودم لـێ دەبینـی.

ئـەوەی کـە بـاس ئەکـەم بۆتـان ١٦ سـاڵم و سـاڵی ١٩٩٤ ه و لووتکـەی موراهیقـی و گەرموگـوڕی، لـە گـەڵ ئـەوەش هاروچـار و بزێـو، ڕۆژانـە وانەمـان دەخوێنـد، و هەندێـك جـار قوتابییەکانـی پۆلـی یەکـم بانـگ دەکـرد بـۆ ئـەوەی: ئـەوەی لـە دەسـت ئێمـە چـوو ئـەوان زوو پێـی ئاشـنا بـن.

ئـەو سـاڵە کتێبـمان بـۆ هـات بـەڵام قاتیـان بـۆ نەکردیـن، ڕۆژانـە لـە گەڕەکـی مەجمووعـەی ٥٠٠ ماڵەکـە کـە لـە سـەردەمی ڕژێمـی سـەددام نـاوی (حـي البعـث) بـوو، وە ئێسـتا نـاوی گەڕەکـی (شۆڕش)ـە: بـە پـێ بـە ڕێ دەکەوتیـن بـۆ مزگەوتـی گـەورەی کـەلار بـۆ خوێنـدن.

ئەم ساڵەشمان بڕی، بە ئەنجامێکی باش و فێربوونی زانستی نوێ.

لـە پشـووی هاوینـی سـاڵی ١٩٩٥ ڕابیتـەی ئیسـلامی مەرکەزێکـی لەبەرکردنـی قورئانیـان کـردەوە لـە بەرانبـەر مزگەوتـی شـێخ ئیبراهیـم، لـە گـەڵ هەندێـك لـە هاوڕێکانمـان ناومـان نووسـی و دەسـتمان کـردە لەبەرکردنـی قورئانـی پیـرۆز، مـن لـەم هاوینـە بڕیـارم دا جامانـە لەسـەر بکـەم، وەکـو ڕەمـزی فەقێیەتـی، ئیـتر لـەو سـاتەوە لـە کـەلار بـە مـەلا جاسـم بانگیـان کـردووم.

ئەمـە یەکێکـە لـەو سـاتانەی کـە پەیوەسـتە بـە باسـی حیزبـەکان کـە لـە سـەرەوە ئامـاژەم پـێ دا، شـتی تریـش هـەن بـەڵام پـێ ناچێـت لـەم باسـە کورتـە فریایـان بکـەوم.

پاشـان پایـز هـات و دەوام دەسـتیپێکردەوە، لـە قۆناغـی سـێیەمان، دەسـتمانکردە خوێندنـی کتێبـی نـوێ، وەکـو: (الإظهـار) ی بەرکـەوی لـە زانسـتی نەحـوو و تەصریفـی زەنجانـی و لـە زانسـتی صـەرف و میـنهاجـی ئیمامـی نـەوەوی، لـە فیقهـی شـافیعیدا. و چەنـد زانسـتێکی تـر.

لـەم سـاڵەدا چەنـد مامۆسـتایەکی نوێـمان بـۆ هـات، وەکـوو مامۆسـتا مـەلا ڕەئـووف حەیـدەری (بـە ڕەحمـەت بێـت) و مامۆسـتا مـەلا محمـدی گردەگۆزینـە (تەمەنـی درێـژ بێـت)، دەسـتمان کـرد بـە خوێندنـی دەرسـەکان، لـە دوای وانـەکان مامۆسـتا مەلا ڕەئووف دەرسـی مامۆسـتا مـەلا محەمـەدی دەدایـەوە لـە کتێبـی (مـەلا جامـی) لـە زانسـتی نەحـوو کـە بـە منـی دەوت تـۆش وەرە گوێگـر بـە، منیـش دەچـووم گوێـم لـە دەرسـەکە ئەگـرت و سـوودی خۆمـم دەبینـی.

ئەمە لە دوای تەواوبوونی دەرسە فەرمییەکان بوو، کە لەویشەوە مامۆستا مەلا طاهر و مامۆستا مەلا عوسمان پێکەوە پێداچوونەوەی فیقهی ئیمامی شافیعییان دەکرد» هەندێك جار سەرم ئەکردە دەرسەکەی ئەوانیشدا.

ئەوە ئەمساڵ ١٠ قوتابیی نوێش هاتووە و ئێستا ژمارەی قوتابییەکانمان ٢٩ قوتابییە، کە یەکێك لە قوتابییەکانمان (دیار) ماڵیان لە کەلار نەما و وازی هێنا لە خوێندن.

ئەو ساڵە بەکالۆریامان هەبوو، کە لە شاری سلێمانی ئەنجامان دا؛ مامۆستا مەلا مەحموودی قەسڵانی (قەبری پڕ نوور بێت) فەرمووی: هەرکەسێك یەکەمی سەر ئاستی قوتابخانەکەمان بهێنێت لەم تاقیکردنەوەیە دیارییەکی دەدەمێ.

ئەوە بوو من لە تاقیکردنەوەکان لە دە یەکەمەکانی هەرێمی کوردستان بووم، جەنابی مامۆستا زەرفێکی بە دیاری پێ دام، فەرمووی: جاسم خۆت ئەزانی لەم گرانییە و کەم مووچەییە هەر ئەوەم پێ هەڵئەسووڕێت، دەستخۆشیم لێ کرد، و هێنام کردمەوە بینیم ٤٠ دیناری تێدایە، چوار ١٠ دیناری.

هەرگیز ئەم پاڵپشتی و چاکەیەی جەنابی مامۆستام لە بیر ناچێتەوە، تا دەمرم هەر کات بیرم بێتەوە دوعای خێری بۆ دەکەم.

پاشان چووینە پۆلی چوار و ئەو ساڵەش مامۆستا مەلا یاسین عیسا لە رزگارییەوە هێنایان، بوو بە مامۆستامان کە دەرسی تەصریفی مەلا عەلی و مینهاجی پێ دەوتین، زانایەکی شارەزا و لێزان لەوەی پێمانی دەوت، لە گەڵ ئەوە وریا و چوست و کەمێکیش توورە، کە چەند جارێك بە دەستی لێدانم خواردووە.

لەم ساڵە کتێبی (الکافیة) ی ئیبنولحاجیبی کوردیمان بە دەرس خوێند لە زانستی نەحوو، پێشا ئەم وانەیان دا بە مامۆستا مەلا ڕەئووف، بەڵام مامۆستا لە بەر تەمەنی وازی هێنا و سپاردی بە مامۆستا مەلا کەریمی شافیعی.

ئـەم ساڵەشـیان تـەواو کـرد، مـن بەخشـینی گشـتی (العفـو العـام) م بـۆ دەرچـوو کـە بەشـداری تاقیکردنەوەکانـم نەکـرد، بـۆ هـاوکاری و دەرس وتنـەوە بـە فەقێکانـی پۆلـی سـێ، مـن بـووم بـە هاوڕێیـان و چـووم بـۆ سـلێمانی لـە گەڵیـان تـا تاقیکردنەوەکانیـان بـە سـەرکەوتوویی ئەنجام دا.

کـە چووینـە پۆلـی پێنـج مامۆسـتا مـەلا ئەحمـەدی پیـرۆز (ئەلیپـەکان) هـات بـوو بـە مامۆسـتامان لـە زانسـتی مەنطیـق، کـە کتێبـی (مغنـي الطـلاب) ی پێـمان دەوتـەوە، درووود بـۆ گـۆڕی چ دەریایـەك بـوو لـە زانسـت!، کـە تووشـی شـۆك بـووم کاتێـك یەکـەم دەرسـی پێـمان وت، بـە هاوڕێکانـم وت، ئـەم زانـا زۆر شـارەزایە بـا سـوودی لـێ ببینیـن، کەچـی قسـمەت لـە خزمەتیـا نەگەشـتینە دوو مانـگ وەزارەتـی ئەوقـاف بڕیـاری دا قۆناغـی ئامادەیـی لـە هەمـوو شـارۆچکەکان دا بخـات و هەمـوان لـە سـەنتەری شـارەکانی هەولێـر و سـلێمانی و دهـۆك لـە بەشـی ناخۆیـی جـێ بکاتـەوە.

یەکێـك لـە قوتابییەکانمـان (کـمال) کـەوت لـە پۆلـی چـوار، سـیانیش کـە بریتـی بـوون لـە (کاوە و هێمـن و نـەوزاد) وازیـان هێنـا، ماینـەوە ٥ قوتابـی کـە چووینـە سـلێمانی لەوێـش دوو قوتابیـی ترمـان وازیـان هێنـا، کـە بریتـی بـوون لـە (حسـین و سـۆران) تەنهـا مـن و هـەردوو محەمەدی کـوڕی مامۆسـتا مـەلا حەمەئەمیـن و مامۆسـتا مـەلا طاهـر ماینـەوە لـە سـلێمانی.

لـە سـلێمانی قوتابخانـەی ئیمامـی شـافیعی بـوو لـە گەڕەکی مامۆسـتایان و ئێمـەش چووینـە حوجـرەی مزگەوتـی شـەهیدان لـەو گەڕەکـە کـە مامۆسـتا مـەلا ئیبراهیـم ماوەتـی وتاربێـژی بـوو، کـە ئـەم وتـارە باسـی قوتابخانـە و سەرگوزشـنەکانی سـلێمانی هەڵناگرێـت.

هەرچـۆن بێـت لەوێـش سـاڵەکانمان بـە سـەرکەوتوویی بـڕی و ئـەوان چوونـە پەیمانـگای پێشـنوێژ و وتاربێـژان، منیـش سـوپاس بـۆ خـوا یەکەمـی هەرێـم بـووم لـە زانکـۆی سـەلاحەدین لـە هەولێـر وەرگیـرام.

پـاش ئێمـە چەنـد سـاڵێکی تـر قوتابخانەکـە لـە کـەلار بـەردەوام بـوو، بـەڵام بەداخـەوە دوای ماوەیـەك داخـرا و ئێسـتا هەمـوو مەلەفەکانـی قوتابخانەکـە لـە قوتابخانـەی ئاینیـی ئەوقافـە لـە هەڵەبجـەی تـازە.

لـە کۆتایـی ئـەم باسـە دروود بـۆ گیانـی ئـەو مامۆسـتا بەڕێزانـەی کـە یارمەتیدەرمـان بـوون لـە خوێنـدن، ئەوانـەی کـە مـاون خـوای گـەورە تەمەندرێـژ و عاقیبـەت خێریـان بـکات و ئەوانەشـی کـە گەڕاونەتـەوە بـۆ لای خـوا، داواکارم لـە خـوای گـەورە پلـەی بەرزیـان پـێ بـدات و بـە قـەدد هەمـوو پیتێـك کـە سـوودمان بینیـوە خـودا بـە هـەزاران قـات پاداشـتیان بداتـەوە.

ئێسـتا منیـش وەك وەفایـەك بـۆ ئـەو مامۆسـتایانە لـە مزگەوتەکـەی خـۆم حوجـرەی فەقێـم کردۆتـەوە کـە بـەردەوام دەرس و وانـە لـە مزگەوتەکەمـان هەیـە.



# شاری کەلار وەکو قەزایەك وەکو پایتەختی تیرەکانی هۆزی جاف

مامۆستا سەلام عەزیز/
کۆلەرادۆ...ئەمریکا...

شارەکانی کەلار و کفری وچەمچەماڵ و خورماتو سەر بە پارێزگای کەرکووک بوون...بە مەبەستی بچووککردنەوەی پارێزگای کەرکووک لەو شارە کوردیانە،داماڵران وکرانە پاشکۆی پارێزگای سلێمانی وسەلاحەدین ودیالەش...شاری کەلار،بەندە لە ساڵی ١٩٨٠ بە خێزانی شاری سلێمانیمان جێهێشت و لەو ڕۆژگارەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ، کەس وبرا خزمەکانم نیشتەجێی ئەو شارەن...لە بیرمە،ناوجەرگەی شار،بریتی بوو لە کۆمەڵە خانوویەکی بەزۆریی لەقوڕ دروستکرابوون،سەنتەری شار گەڕەکی بنگردی پێدەوترا،بنگرد ناوی ئەو دێیە بوو،بووبوە مەرکەزی شار...شاری کەلار،تەنها دوو خوێندنگای ئامادەیی تێدا بوو،ئامادەیی کەلارو دواتر گۆڕیم بە ئامادەیی،،شەهید ئارام،، وئامادەیی سەورە،دواتر گۆڕدرا بە ئامادەیی حەمرین... بیریشم نەچێ،معهد المعلمین،، ی کەلار،بەندە،فەرمانی کردنەوەیم لە کاک کۆسرەت وەرگرت...کاتێ کاک کۆسرەت هاتە مەڵبەندی دوو،خەڵکێ زۆر داوای ماشین بۆ فەرمانگەکانیان کرد،بەند رجام لێکرد،پەیمانگایەکمان بۆ بکاتەوە، فەرمووی،،وەرە هەولێر،بڕیاری کردنەوەی پەیمانگاکە وەرگرە...وەرمگرت و بیستم،ئەمڕۆ پەیمانگاکە داخراوە...ئەمڕۆ کەلار شوکور بۆ خوا،زانکۆیەکی تێدا بەرقەرارە..

بیرم نەچێ،تیرەکانی هۆزی جاف،شاری کەلار،پایتەختیان بوو..
تیرەکانی جاف،بە شاری کەلاریان دەگوت،،شێروانە،،...

ئەگەڕێمەوە رۆژگاری سەرەتای هەشتاکان،کاتێ بەعسێکان حاکمی نارەوای عێراق بوون،رۆژگارێ،جەنگی عێراق..ئێران بو..
رۆژانە کوڕی خڵکی ئێمە،لە تابووتێکەوە،لاشەی هەلڵا هەلڵا بوویان دەگەشتەوە دەستی کەسوکاریان...جەنگی ئێران...عێراق...
هەتا دەهات خوێناوییتر دەبوو..بەعسێکان هەتا دەهات،خوێناوییتر ودڕتر دەبوون...مامۆستای خوێندنگاکانیان بە زۆر دەکردە بەعسی وبەزۆریش دەیکردنە جەیشولشەعبی...تەنانەت بارەگای بەعس لە کەلاردا،کۆبوو ونەوەیان بە مامۆستایان کرد،کە بیانێرنە جەنگی دژ بە ئێران...ساڵی ١٩٨٢ کەریم مونەزەمە هەبوو،کە بەعسیەکی توندڕەوی تکریتی بوو،لە کۆبوونەوەیەکی زۆرەملێی مامۆستایان دا،وتی هەرکەسێ پیاوەو شەرەفی نیشتمانپەروەری بۆ عێراق،هەیە وئامادەیە بچێتە جەنگی دژ بە ئێرانەوە هەستن دەستی راستی هۆڵەکە بگرن و لەوێڕا دانیشن....هەرکەسێکیش جەبان و بێ غیرەت و ترسنۆک هەیە،هەستن دەستی چەپ بگرن ولە چەپی هۆڵەکەدا دانیشن...ئێمەومانان لەترسنۆکو جەبانەکان بووین....کەریم مونەزەمە،پیاوێکی دەمپیس و بەڵام زۆریش لە پێشمەرگە دەترسا..
هەزارو یەک جنێوی پێدایین...زۆری پێنەچو،مامۆستا حسێن کەلاری خۆی کرد بە هۆڵەکەدا...پێش ئەوەی دانیشێ،کەریم مونەزەمە،بۆی روونکردەوە،کە خەڵکانی دەستی راست،کە دوو سێ کەسێکیش بوون وتی ئەوانە قارەمانن،ئەوانەی دەستی چەپ هەموویان،بێ غیرەت و ترسنۆکن ئامادە نین بچنە جەنگی دژ بە ئێران...خوا شاهیدە،مامۆستاحسێن بەدوای من دا دەگەڕا،کە دۆزیمیەوە...هات لەپاڵما خۆی ماتدا..شەریکی بێ غیرەتەکان بوو ەوە.لەهۆڵەکە بوو ە پێکەنین وهەراو فیکە...کەریمیش،،دەهەری،، بوو، هەزارو یەک جنێوی کەی داینێ...کەریم مونەزەمە،خەڵکی شارەدێی زلوویعیە بوو..لەهۆزی جبوور بوو..بیستم لەم چەند ساڵەی دواییدا،مردوە..

## ساڵەکانی دوای راپەڕین و ژیانی مامۆستاییم...

بەعسـیـیـەکان،بە بڕیارێکـی کۆماریی،لـە وەزیفـەی مامۆسـتایی دەریانکـردم وکرامـە کارمەنـدی ئیـداری...دوای راپەڕینـی خەڵکـی کوردسـتان،بە بڕیـاری بـەرەی کوردسـتانی گەڕاینـەوە سـەر ئیشـوکاری پێشـووی خۆمان...بەندە،وەکـو مامۆسـتایەک لـە ئامادەیـی حەمرین دەسـتبەکاربووم...بەڵام لەهەمـان کات دا،کادرێکـی کارامـەی یەکێتی بووم...رۆژانە،رۆژنامـەوان لـە وڵاتانـی دونیـاوە دەهاتنـە کوردسـتان و جێگەیـان مەڵبەنـدی دووی کەرکـووک بـوو ولەوێشـەوە دەگەیشـتنە کـەلار و جیبـێ شـڕی کۆمیتـە هەبـوو بـەردەرگای خوێندنـگای لێدەگرتم و دەیـوت،کاک کوردۆ،دەڵـێ بگاتـە کۆمیتە،ئیشـان هەیـە وبـڕێ اجنبی هاتـون نازانیـن داوای چـی ئەکەن...بەهەرحـاڵ دەگەیشـتمە کاک کـوردۆ دەموت،ئێـوە بیرتـان چۆتەوە،مـن مامۆسـتای سـانەویەکم...وناکرێ هەمـو رۆژێ خوێندکارەکانـم جێبهێڵم...ئەویـش دەیوت،ئەمسـاڵ،مۆڵەت وەرگـرەو هـەزار ئیشـان هەیە....کەچـوم،دوو رۆژنامەوانـی ژاپۆنـی بوون،داوایاندەکـرد بیانبەمـە سـنوورەکانی کوڵەجـۆو هێـزە عێراقیـەکان وتەماسـی پێشـمەرگە...جارێکیان،بۆ یەکەمیـن جار،کۆمەڵـێ کارمەنـدی نەتەوەیەکگرتـوەکان هاتـن ویسـتیان ئۆفیسـی خۆیـان لەشـاری کـەلار بکەنـەوە..وداوای خانوویەکیـان دەکرد...کەجێگـەی خۆیـان وماشـینەکانیان بێتـەوەو نزیکـی جـادەی قیـری شـارێ بێ...خانوەکـە دووسـێ هـەزار مەتـر چـوارگاە بـێ..کا کاک کـوردۆو سـمایل برایـم مەردانـم ئـاگادار کردەوە،گەلـێ پێکەنین،سـمایل وتی،،باوەحیزێلـە،داوای خانوەکـەی مسـەفا بـەگ ئەکەن....منیـش پێمراگەیاندن،کەلـەم شـارە،خانووی وای تیـا نیـە... وتیـان دانەیـەک هەیە...برادەرانـم ئـاگادار کردەوە،کـە خانـووی وایانـە بینیـوە لـە کەلار،،سـمایل،، وتـی هەڵبەتـە بەکاوێـژ ژیاوم،وەهەرچـوار مـەزەو داوای خانیەکـەی مسـەفا بـەگ ئەکەن...بـرادەران وتیـان لێلیانا بـڕۆن و ئێمـە هەشـت نـۆ پێشـمەرگە بـە دواتانەوەین،بـۆ پارێزگاریان،کوڕگەلـی نەتـەوە یەکگرتـوەکان رازی بوون..چـوار خولەکـی نەبرد،کردمیانـە نێـو گۆڕەپانـی حەوشـەی ماڵـە مسـەفا بگ....وتیان،ئـەم خانوومانـە گەرەکە....مـن زۆرم وت و ئـەوان

هیچیـان نەبیسـت....چوومە خزمـەت مەرحـووم مسـتەفا بەگ،(مسـتەفا بەگ)،فەرمووی،کەسـێ هەیـە خانـووی نیشـتەجێی خـۆی بداتـە کـرێ ؟! ئێمـە زۆر رجامـان کرد،مسـتەفا بەگ،گوێـی نەداینێ...ئـەوێ رۆژێ حاجـی حسـێن دەروەنیخـان کـە شـیربرای مسـتەفا بـەگ بـوو، لـە مسـتەفا بـەگ تـوورە بـو، وتـی ئەمانـە بـۆ پارێـزگاری خەڵکەکـە هاتوون،خانـووت بۆچیە،لـە پشـتەوە قەسرێکـی کـەت هەیەوبـڕۆرە ئـەوێ وبیاندەرێ...حاجـی حسـێن فەرمـووی مـن داومە...مسـتەفا بـەگ دەپاڕایـەوە لـە حاجـی حسـێن، حاجیش،ئەیوت،گوێـت لێناگـرم مـن داومەتـە کـرێ بـەم میوانانە...مـن خانوەکـەم داوەتـە کـرێ مسـتەفا بـەگ فەرمـووی،دەی ئـەوە منیـش رازیم،بـەڵام کرێکـەی دوو هـەزار دینارە،دینارەکـەش بـە نرخـی بانـق بگۆڕدرێتـە دۆلار...بـەدۆلار وەری دەگرم...حاجـی حسـێن زۆر لـە مسـتەفا بـەگ تـوورە بوو،وتـی انشـالله ئەمسـاڵ لـە برسـا دەمری...پـارەت بۆ چیـە ؟؟ مسـتەفا بەگیـش فەرمووی ئێمـە بـە تورکـی ترین..ئـەوان چوزانـن ئێمـە چیهانوت...بـە گوڕگەلـی نەتـەوە یەکگرتوەکانـم وت خـاوەن خانو،سـەرۆکی هۆزێکـی گـەورەی کوردسـتانە ئـەم پاڵاسـە،جێژیانی خـۆی وخێـزان وکوڕەکانیەسـی..ئەم پاڵاسـە،خەریتەی قەڵایەکـی کۆنـی ئیتالیایە..ئـەم داوا دەکا کرێکـەی بـە دۆلار بدرێتـێ....ئەوانیش وتیان،کـە داخلـی عێـراق بـوو وین،خـەرج مەسرەفیـان لەسـەر عێراقە..عێـراق بـە پـارەی خـۆی خەرجـان دەداتـێ نەوەکـو دۆلار...ڕێککەوتـن لەسـەر مانگـی دوو هـەزار دینـار.. کـە چوومـەوە کۆمیتە،وتیـان شـێری یـا ئەوەکە،سـایل وتی،یاخـوا ئاژاوەیەکـی نەنابێتەوە،ئیـتر قەینا...وتـم وەڵا،خـۆت نەیکـەی خـوا بیـکا،کاک کـوردۆ وتـی هەرکەسـێ کردوویەتی،ئیشـەکە بـوو و ؟ وتـم بەڵـێ، حاجـی حسـێنی دەروەنیخـان زڕ بـرای مسـەفا بەگ،قەناعەتـی بـە مسـتەفا بەگ،هێنا...بـە مانگـی دوو هـەزار دینـار ڕێکەوتن،کوڕگەلـی نەتـەوە یەکگرتوەکان،نزیکـەی دووسـاڵ لـەو خانـوە مانەوە...ئـەو خانـوە بـوو ە ئۆفیسـی دووهەمـی بەندە..گەلـێ جـار سـوپای عێراق،پەلامـاری شـاری کفـری ودیهاتەکانـی دەداو خەڵکـی ئـەو ناوچانـە دەهاتنـە کـەلارو لـە بـارەگای نەتەوەیەکگرتـوەکان کۆنفرانسـێ ئامـادە دەکـرا.. مەڵبەند،وتیان،نابـێ لـەو کۆنفرانسـانە تەنها چرکەسـاتێک دوا کـەوی...

رۆژێ کۆنفرانس بەستراو عێراق بەخەستی شاری کفری ودێهاتەکانی دەوروبەری بۆمبارانکرد..زەرەروزیان زۆر بوو..برادەرانی کۆمیتەو مەڵبەند..چاوم گێڕا،نجم شێخ علی لەوێ بوو..وتم وەکو نوێنەری مەڵبەند و یەکێتی قسە بەکە منیش،وتەکانت تەرجومە دەکەم... نجم،قسەکەرێکی خێل وخیچ بوو..دکتۆر جلال ئەو رۆژگارە گەنج بوو،پێکەوە مامۆستا بووین...گوێم لەوە نەبوو نجم شێخ علی چی ئەڵێ خۆم،قسەم دەکرد..مامۆستا جلال وتی،مامۆستا تۆ باسی خانوو ودێی سووتاوو ئەنفال ئەکەی،کەی شێخ نجم وا ئەڵێ،منیش وتم پێی بڵێ بەردەوام بێ لەقسەکردن دا،من کوا تەرجومەی قسەکانی ئەو دەکەم...من خۆم ئەزانم،چی باشە،ئەوە دەڵێم...



# كۆشكی مەحمود پاشای جاف

محەمەد عەلی شوێنەوار



دیمەنی هەرسێ بەشەكەی كۆشك

ئەم كۆشكە لە ڕووی بیناسازییەوە پێكهاتووە لە بەشێكی سەرەكی كە خودی كۆشكەكەیە؛ لەگەڵ دوو بەشی دیكەی لاوەكی. كۆشكەكە دەكەوێتە ناو دۆڵێك و ڕووی لە ڕۆژهەڵات كردووە، بیناكەی پێكهاتوە لە دوو نهۆم، كەهەشت ژوور و دوو هۆڵ و دیوەخانێكی گەورە لە خۆ دەگرێت. ئەم بەشە جگە لە دیوەخانەكەی نهۆمی یەكەم، لە ڕووی بیناسازییەوە هەردوو نهۆمەكە هاوشێوەن و هەروەها هەریەك لە نهۆمەكانیش جگە لە چەند جیاوازییەكی بچوك پیكهاتووە لە دولای بەرامبەری هاوشێوە.



بەشی سەرەکی کۆشك لە ڕووی پشتەوە و لاتەنیشت

بەشـی دووەمی کۆشـك لەسـەر تەپۆلکەیەکی سروشـتی دروسـتکراوە دەکەوێتـە پشـتەوەی بەشـە سـەرەکیەکەی کۆشـك ڕووی لـە باشـوورە و دەڕوانێـت بەسـەر ڕووبـاری سـیرواندا، پێکهاتـوە لـە ژوورێکـی بچـوك و دیوەخانێك.



بەشی دووەمی کۆشك(بینای سەرگردەکە)، هەردوو ڕووی پشتەوەوە و پێشەوەی

هەرچـی بەشـەکەی تـرە دەکەوێتـە بەرامبـەر بەشـی سـەرەکی کۆشـك، دۆخـی بیناکـەی زۆر خراپـە و پێکهاتـووە لـە دوو ڕیـزە ژوور بـە تەنیشـت یەکـترەوە.

## شوێنی کۆشك:

دەکەوێتـە ڕۆرهەڵاتـی گونـدی تـازەدێ، تەنهـا (١٠)کـم لـە باکـوری ڕۆژهەڵاتـی شـاری کـەلارەوە دووره. خـودی کۆشـکەکە لـە نیـو دۆلێکـدا بنیادنـراوە کـە لـە هەرسـێ لاوە باکـوور، ڕۆژهـەڵات، ڕۆژئـاوا، بەرزاییـە و تەنهـای بـە ئاراسـتەی باشـور کـراوە و تەختانییـە، لـە ئیسـتادا یـەك کیلۆمەترێـك ڕوبـاری سـیروانی لـێ دورکەوتۆتـەوە.

## نـاوی کۆشـکەکە : (قـەڵای کانـی چەقـەڵ، قـەڵای پاشـا، کۆشـکی مەحمـود پاشـای جـاف)

ئـەوەی لـە گێڕانـەوە و سـەرچاوەکانی تایبـەت بـە مێـژووی جـاف و کەسـایەتیەکانی نـاو جافـدا هەیـە نـاوی (هەوراگـەی کانـی چەقـەڵ، قـەڵای کانـی چەقـەڵ، قـەڵای پاشـا و گونـدی گردەبـان هاتـووە، ئەمانـەش پێکـەوە سێگۆشـەیەك دروسـت دەکـەن و دەکەونـە سـنوری گونـدی تـازەدێ.

سـەرەتا بـە قـەڵای کانـی چەقـەڵ ناوزەنـد کـراوە، لـە کتیبـی تاریخـی جـاف؛ کەریـم بەگـی فەتـاح بـەگ کـە دێتـە سـەر باسـی ئـەو بینایانـەی کە(محەمـەد پاشـای کەیخسـرۆ بەگـی جـاف) دروسـتیکردوون لـە کۆتاییـدا دەڵـێ: ”قـەڵای شـێروانە و قیسـمێ لـە قـەڵای کانـی چەقـەڵ بینـای ئـەون“ واتـە بیناکـە سـەرەتا ئـەم نـاوەی هەبـووە. کانـی چەقەڵیش دەکەوێتـە باکـوری بیناکـەوە بـە دووری نزیکـەی کیلۆمەترێـك. هەوارگـەی کانـی چەقـەڵ ناوبانگـی خـۆی هەبـووە و جـێ هـەواری زسـتانەی بەگزادەکانـی جـاف بـووە لـەو سـەردەمەدا، تاوەکـوو ئێسـتاش لـە سـەرزاری بەگزادەکان و خەڵکـی ناوچەکـە ماوەتـەوە، پـاش نەمانـی هەوارگەکـەش جافـەکان ناوبەنـاو ئاویتـەی یادەوارییەکانیـان دەبـوون و لـە کانـی چەقـەڵ کۆدەبوونـەوە.

دوای نەمانی هەوارگەی کانی چەقەڵ و تێپەرینی کات خەڵکی ناوچەکە بە بیناکانی کۆشکیان وتووە قەڵای پاشا، ئێمە نازانین مەبەست لە پاشا مەحمود پاشای جاف بووە یان محەمەد پاشای باوکی بووە، چونکە بیناکان سێ بەشە و هەردووکیان لە سەردەمی جیا جیا بنیادیاننناوە. دیارە تاوەکو ئێستاش لای خەڵکی ناوچەکە هەر بەم ناوە ناسراوە، هەروەها لەبەر ئەوەی پێشتر هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەسەر ئەم کۆشکە ئەنجام نەدراوە و لایەنە فەرمییەکان و نووسەرانی نوێش بە هەمان شێوە بە قەڵای پاشا ناویان بردووە، بەڵام لە ڕاستیدا بینا سەرەکیەکە کۆشکێکە نەك قەڵا، بۆیە بەشێوەیەکی فەرمی لە ساڵی ٢٠١٠وە لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گەرمیانەوە بە (کۆشکی مەحمود پاشای جاف) ناسێنراوە.

## مەحمود پاشا و گەڕانێك بۆ مێژووی بنیادنانی کۆشك

ئەم کۆشکە لە لایەن(مەحمود پاشای کوری مەحەمەد پاشای کەیخسرۆ بەگی جاف)ەوە بنیاد نراوە. تا ئێستا بە شێوەیەکی تەواو مێژووی بنیادنانی نەزانراوە، ئەو سەرچاوانەی ئیمە پێیگەیشتوێن بەروونی باس لە بنیادنانی کۆشکی مەحمود پاشای جاف ناکەن. بۆیە هەوڵماندواوە لە ریگەی وردبوونەوە لەو سەرچاوانەی باس لە مێژووی جاف و ژیانی مەحمود پاشای جاف دەکەن، بگەینە دەرئەنجامێك. بەم پێیەش لە مێژووی نزیکتریانەوە بەرەو کۆنتر دەستپیدەکەین، بۆ ئەوەی بەروونی لە قوناغەکانی ژیانی مەحمود پاشای جاف بگەین، وا پێویستیش دەکات بەشیکی زۆری باسەکەمان تەرخان بکەین بە سەردەمی(مەحەمەد پاشای کەیخسرۆ بەگی جاف).



وێنەی مەحمود پاشای جاف

لە ٢٢/شەعبانی/١٣٢٠ك – ٢٣/نۆفمبر/١٩٠٢ز مەحمود پاشای جاف نازناوی (خانی)ی وەرگرتووە لە لایەن (شاە موزەفەرەدین قاجاری).



پیرەمێردی شاعیر لە ڕۆژنامەی ژیانی سالی ١٩٣٦،ژ ٤٩٩ دەڵێ:»والی کرماشان دارو سوتەمەنی ناردووە بۆ مەحمود پاشای جاف بۆ قەلای شێروانە و هەوارگەی کانی چەقەڵ». دیارە مەستەکەمان ناو هێنانی کانی چەقەڵە لەو سەردەمەدا.

١٣٠٩ك -١٨٨٩ز سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی بەمەبەست بڕیار دەدات مەحمود پاشای لە شوێنی خۆی دور بخاتەوە و بیکات بە موتەسەریفی (ئورفە) لە تورکیا و نازناوی(بیگلەربیگ)یشی پێ بەخشیوە. بەڵام مەحمود پاشا بەم فەرمانە زۆر دڵگران دەبێت و ئەیەوێت نەچێتە ئورفە. پیرەمێردی شاعیر لە یاداشتەکانیدا هاتووە و دەڵێت:»مەحمود پاشایان کردبوو بە (متصرف)ی ئورفە بەڵام نیازی نەبوو بچێت، تا شەوی ٢٥-ڕەمەزانی -١٣٠٦ك کە دەکاتە ٢٥-مایۆ-١٨٨٩ز لە کەناری زەڵم مەحمود پاشام ئیقناع کرد کە بچێت بۆ ئەستەنبول».

مەحمود پاشا لە ئەستەمبول داوا دەکات نەکرێتە متصرفی ئورفە، بەڵام دواتر سوڵتانی عوسمانی فەرمانی مانەوەی هەتا هەتایی لە ئەستەمبول بۆ دەردەکات. مەحمود پاشا لە هەلێکدا لەگەڵ مەلا حەمدی سنەیی بە پاپۆڕێك لە دەریای ڕەشەوە دەپەڕنەوە بۆ قەوقاز و باکۆ پاشان بە دەریای خەزەردا دەگەنە ئێران و پاشانیش بەرەو پێنجوێن. پیرەمێرد دەڵێت:»لە ١٥-شەوالی-١٣٠٨ك -٢٤-مایۆ-١٨٩١ز بە بەری باکۆدا هاتۆتەوە. بەهۆی جموجوڵەکانیەوە سولتان عەبدولحەمید سوپایەکی هەزار کەسی بۆ دەنێرێت، بەڵام مەحمود پاشا دەچێتە چیاکانی شەمێران و زمناکۆ».

پاش ماوەیەك دوای ئەوەی داوا لە سوڵتان دەکرێت لە مەحمود پاشا خۆش بێت، لە ١-مایسی-١٣٠٩ك -٢٦-فبرایری-١٨٩٢ز، مەحمود پاشا دەچێتە ئەستەمبول لەوێ دەمێنێتەوە تاوەکو لە ٢-جمادی یەکەم١٣١٢ك – ٣١-ئۆکتۆبەری-١٨٩٤ز هاتۆتەوە. کەواتە مەحمود پاشا لە نێوان ساڵەکانی ١٨٨٩ز تاوەکو ساڵی ١٨٩٤ز لە ئەستەمبول بووە و پێناچێت لەم ماوەیەدا سەرقاڵی دروستکردنی بینا و کۆشك و تەلار بوبێت.

لـە هەمـوو ئەمانـەش گرنگـتر سـەبارەت بـە مێـژووی کۆشـکەکە، لەسـاڵانی هەشـتاکانی سـەدەی نۆزدەیـەم بوونـی مێـژووی لەدایـك بوونـی یەکێـك لەنەوەکانـی محەمـەد پاشـای جافـە وەك لـە کتێبـی( تاریخـی جـاف)دا هاتـووە کـە کەریـم بەگـی فتـاح بەگـی محەمـەد پاشـا، کـە دەکاتـە بـرازای مەحمـود پاشـا لـە دێـی گردەبـان هەوارگـەی کانـی چەقـەڵ لەسـاڵی ١٣٠٢ك -١٨٨٥ز لـە دایـك بـووە. ئـەم مێـژووە وەسـمان پاشـای مامـی کەریـم بـەگ بـە شـیعرێکی فارسـی مێـژووی لـە دایـك بوونـی تۆمـار دەکات:

شب نوروز گشت کریم از داور

کوکب سحد بی چاکریش بست کمر

شکر حق گردید از پشرس دل روشن

بهر تاریخ ببرسید زمن گفتم من

چون بهاراست ریاحین بسراید از بیخ

بلبل و سروسمن نسترن و گل تاریخ

١٣٠٢هـ

بـەم پێیـەش لـە پێـش سـاڵی١٨٨٥ز هەوارگـەی کانـی چەقـەڵ هەبـووە و زۆریـش فـراوان بـووە، چونکـە گردەبـان چەندکیلۆمەترێـك لـە کانـی چەقەڵـەوە دوورە.

پێـش ئـەم مێـژووە مەحمـود پاشـا لەسـاڵی ١٨٨٣ز لـە ناوچـەی گەرمیـان نەبـووە و چونکـە لـە هەڵەبجـە قایمقـام بـووە و هـەر لـەم ساڵەشـدا بـوو کـە سـوڵتان عەبدولحەمیـدی عوسـمانی پلـەی میـری میرانی پێبەخشـیوە.

ئەگـەر بروانینـە حەفتاکانـی سـەدەی نـۆزدە سـالی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ مەحمـود پاشـا بەسـەر جافـەوە بـووە، چونکـە مەحەمـەد پاشـای باوکـی بـە هـۆی ناکۆکـی لەگـەڵ دەسـەڵاتی عوسـمانیەکان لـە قائیمقامـی هەڵەبجـە نەمـاوە و ڕۆیشـتووە بـۆ سـنووری دەسـەڵاتی قاجـاری. ئـەوەی

هاتــووە  مەحمــود پاشــا لەگــەڵ جافــدا گەرمیــان و کوێســتان دەکات و لــەم ســاڵەدا ماڵــی لــە قــەڵای شــیروانە بــووە. پێدەچێــت مەحمــود پاشــا تاوەکــوو ئــەم مێــژووە کۆشــکەکەی بنیــاد نەنابــێ. بــەڵام لــە ســاڵی ١٢٩٤ك-١٨٧٧ز پــاش دووجــار لــە هەوڵــدان بــۆ گەراندنــەوەی مەحەمــەد پاشــای جــاف بــۆ ســنووری دەســەڵاتی عوســمانی، والــی بەغــداد دێتــە کانــی چەقــەڵ بــۆ تەکلیفکردنــی مەحمــود پاشــای جــاف بــۆ جــاری ســێ یــەم، بــۆ ئــەوەی هەرچونیــك بێــت ئەمجــارە مەحەمــەد پاشــا بگەرێتــەوە. لــەم ماوەیــەدا ئــەوەی کــە ڕوون نیــە ســەبارەت بــە مێــژووی کۆشــك لــە ســەرچاوەکەدا تەنهــا نــووسراوە  کانــی چەقــەڵ نــەك هەوارگــەی کانــی چەقــەڵ یــان قــەڵای کانــی چەقــەڵ. ئەگەرچــی ئــەم هاتنــەی والــی بەغــدا دەمانگەیەنیتــە قەناعەتێــك کــە پیدەچێــت مەحمــود پاشــا لــە هەوارگــە نوێکــەی کــە نزیکــە لــە کانــی چەقــەڵ پیشــوازی لــە والــی کــرد بێــت. مەحمــود پاشــا هــەر لــەم ماوەیــەدا بــووە کــە ســەرقاڵی کرینــی موڵکێکــی زۆر دەبێــت لــە (قزرابــات، زەهــاو، ناوچــەی دەککــە لــە خانەقیــن، ســەرقەڵا و کۆکــس لــە ناحیــە کفــری کــۆن). پاشــانیش لــە ســاڵی ١٢٩٥ك- ١٨٧٨ز  بــە ماڵــەوە لــە بەغــدا دەبێــت. وەکــو پیشــتریش ئاماژەمــان  پێکــرد مەحمــود پاشــا لــە ســاڵی ١٨٨٣ ەوە بــووە بــە قائیمقام لــە هەڵەبجــە.

لــە ڕوانگــەی ئــەم ژیاننامەیــەی مەحمــود پاشــاوە ئێمــە پێمــان وایــە کــە بەشــە کۆشــکەکەی مەحمــود پاشــای جــاف لــە نێــوان ســاڵانی ١٨٧٤ – ١٨٧٧ز بنیادنــراوە یــان ڕونتــر لــە نێــوان ســاڵانی١٨٧٤ز – ١٨٨٢ز بنیــاد نــراو.  لــە کۆتــا ســاڵەکانی ئــەم ســەدەیەش زیاتــر بایەخــی بــە ناوچــەی قزرابــات و خانەقیــن داوە و مزگەوتەکــەی قزراباتــی لــە ســاڵی ١٨٩٨ز دروســتکردووە. پاشــا لــە ١٥ی مانگــی شــەعبانی ســاڵی ١٢٣٩ك کۆچــی دوایــی کــردووە، لــە مزگەوتــی قزرابــات بــە خاکیــان ســپاردووە.

ئــەوەی ماوەتــەوە ســەبارەت بــەم، کامەیــە ئــەو بەشــەی کۆشــك وەك دەوترێــت کــە مەحەمــەد پاشــای باوکــی دروســتی کــردوە؟ وەك لــە ســەرچاوەکاندا هاتــووە مەحەمــەد پاشــا لــە هەڵەبجــە و پێنجوێــن دوو مزگــەوت و گەرمــاو و قەیســەری و چایخانــە و هەروەهــا خانویەکــی

گەورەشی لەسەر گردی شوێنەواری (بەکراوە) دروست کردووە، لە قەرەداغییش کۆمەڵێ دوکان و چایخانەیەکی دروستکردوە، هەروەها لە گەرمیانیش جگە لە قەڵای شێروانە بەشێك لە قەڵای کانی چەقەڵ کە مەبەست لێی قەڵای پاشایە دروستکردووە، بۆیە ئێمە پێمان وایە کە لەم سێ بەشەی کۆشك بەلای کەمەوە بینای سەرەگردەکە کە دەکەوێتە لای ڕۆژئاوای کۆشکەکەوە، مەحەمەد پاشای جاف دروستیکردبێت، لە هەمانکاتدا دەشێ بەشی سێیەمی کۆشکیش وەك ئەوەی ئێمە ناوزەدمانکردووە بە هەمان شێوە مەحەمەد پاشا دروستیکردبێت، چونکە کەریم بەگی فەتاح بەگ لە کتێبەکەیدا دەڵێ:«مەحمود پاشا لە کانی چەقەڵیش زیاد لە بیناکانی مەحەمەد پاشای باوکی بینایەکی گەورەی دروستکردووە»، کەواتە بینا گەورەکە کە بەشە سەرەکیەکەی کۆشکە تایبەتە بە مەحمود پاشا و بیناکانی تریش تایبەت بوون بە باوکی. جگەلەمانەش لە ڕووی هونەرییەوە چەند تێبینیەکی ترمان لەم ڕووە خشتۆتە ڕوو.

مەحەمەد پاشا بینا تایبەتەکانی خۆی وەك قەڵای شێروانە و خانوی سەر گردی (بەکراوە) لە سەر گرد و شوێنی بەرز دروستی کردوون، ئەمەش پێچەوانەی بەشە سەرەکیەکەی کۆشکە کە لە دۆڵ و نزمایی بنیاد نراوە. لە هەمانکاتدا بەشی دووەمی کۆشك بەسەر گردیکی سروشتیەوە دروستکراوە.

لە ڕووی یەکەکانی بیناسازییەوە بەشی دووەمی کۆشك (بینای سەرگردەکە) جیاوازی زۆرە لەگەڵ بەشە گەورەکەی کۆشك، بە ئاسانی هەست بەم جیاوازییانە دەکرێت.

هاوشێوەیی لەگەڵ قەڵای شێروانە کە هەردووکیان ڕوویان لە باشوورە و لەمەش گرنگتر لە ڕووی بیناسازییەوە تاقەکانیان بەشێوەی دوو ڕیزی ئاسۆیی بەسەر یەکەوە دروست کراون. هەروەها بوونی تاقی گەورە و داخراو بە پانتایی لاتەنیشتەکانی بیناکە، ئەمانەش بە تەواوی لە دوو بەشەکەی دیکەی کۆشك نابینرێن.




## نەخشەی دیوارەکانی ژورە گەورەکەی بەشی دووەمی کۆشك(بینای سەر گردەکە)

ئەو نوسراوەش کە لەسەر دیواری یەکێك لە بەشەکانی کۆشکدا بنیاد نراوە بینای سەر گردەکە بووە، بەڵام بەداخەوە لە ئێستادا نەماوە و ئەوەش کە پێشتر لێی خوێنراوەتەوە جگە لە سڵاواتێك ( اللهم صلی علی محەمەد ) بەخەت و زمانی فارسی نوسراوە ( در قلم از عبارت یاقوت ). ئەڵبەتە ئەمە بەشێکی کەمی نوسینەکانی سەر دیوارەکە بووە، بە هەرحاڵ ئەم چەند وشەیە هیچ ئاماژەیەکی خاوەندارێتی یان مێژووی بنیادنانی نادات بەدەستەوە.

## یەکە بیناسازییەکانی کۆشك :

*کەوانی ژێر بنمیچەکان: یەك جۆر کەوانی نوك تیژ بەکارهاتووە، بەڵام بە دوو شێوەی جیاواز.



*گومـەد : بنمیچـی بەشـەکانی کۆشـك بـە دوو جـۆر هەڵچـنراون. بنمیچـی ئـەو بەشـانەی گرێـی تیـدا بەکارنەهاتـووە گومەدەکـەی شـێوەیەکی کەوانەیـی نیمچـە تونێلـی وەرگرتـووە، هەرچـوار گۆشـەکانی بەشـەکەش چەمانـەوە بـە خۆیـەوە دەبینـی. بـەڵام ئـەو بەشـانەی لـە بنمیچەکانیـان گـرێ بەکارهاتـووە، گومـەدەکان شـێوەی گـرێ ریزکراوەکانـی وەرگرتـووە وەك گومـەدی هـۆڵ و دیوەخانـەکان.



*تـاق : بـە گشـتی تاقـی کـراوە و تاقـی داخـراو بەکارهاتـووە، ئەمانـەش بـە چەنـد شـێوەیەکی جیـاواز وەك تاقـی سـادە، واتـە ڕووی سـەرەوەیان هیـچ چەمانەوەیەکـی بـۆ نەکـراوە و ڕێکـە. هەندێکـی تریـان بـە شـێوەی تاقێکـی نیـوە کەوانەیـی ڕووی سـەرەوەیان تەواوکـراوە کـە بەشـێکی زۆری تاقەکانـی کۆشـك بـەم شـێوازە دروسـت کـراون. لـە هەمـان کاتـدا جۆرێکیـتر لـە تـاق دەبینرێـت کـە ڕووی سـەرەوەیان بـە شـێوەی کەوانێکـی نـووك تیـژ تـەواو کـراون.



( هێلکاری لێکۆڵەر)

* دەلاقە(ڕۆچنـــە): دەلاقــەكان پێنـــج دانـــەن بەشـــێوەی بازنەیـــی دروســـتكراون تیرەكانیشـــیان یەكســـانە بـــە (٤٠سم). ئـــەم دەلاقانـــە بـــە هاویـــن بـــۆ هـــەوا گۆڕكـــێ و هێنانـــە ژوورەوەی هـــەوای فێنـــك و هەروەها ڕۆشـــنایی ســـودی لـــێ بیـــنراوە، ئەمانـــەش تەنهـــا لەبەشـــی ســـەرەكیەكەی كۆشـــك دەبینرێـــن.



ئاگردان : لە زۆربەی شوێنەكانی كۆشك ئاگردان دروستكراوە ڕووی سەرەوەیان بە شێوەی نیوە كەوانەیی تەواوكراون، لە ڕووی ناوەوەش دیوارەكانیان بە شێوەی نیوە بازنەیی دروستكراون.

* داركێشـــی دیـــوارەكان : ئـــەم دارانـــە قەبارەیەكـــی بچوكیـــان هەیـــە و تیرەكانیـــان لـــە چەنـــد ســـانتیمەترێك تێناپەڕێـــت، لـــە نێـــو دیـــوارەكان و بـــە تایبـــەت لـــە نێـــوان هـــەردوو تاقدا دەبینرێـــن، ئەمـــەش بـــە مەبەســـتی بەســـتنەوەی دیـــوارەكان و بەهێزكردنیـــان بەكارهاتـــووە.





## ئـەو مـاددەو کەرەسـتانەی لـە دروسـتکردنی کۆشـکەکە بـەکار هاتـووە :

ئـەو مـاددەو کەرەسـتانەی لـە دروسـتکردنی کۆشـکەکە بـەکار هاتـوە بریتیـن لـە : قسـڵ، گـەچ تاوێـری لمیـن sandstone، خـڕە بـەرد bolder، دار و خشـت.

قسـڵ: ماددەیەکـی سـەرەکی پێکهاتـەی بیناکەیـە و لـە تـەواوی بەشـەکانی کۆشـك بـەکار هاتـووە وەك کەرەسـتەیەکی هـاڕاو و پـاش گرتنـەوەی وەك موونـە بەکارهاتـوە بـۆ هەڵچنینـی تاوێـرو بـەرد و خشـتەکان. لـە هەمانکاتـدا لـە گـەڵ گـەچ لـە ڕووپۆشـکردنی دیوارەکانیـش بـەکار هاتـووە.

تاوێـری لمیـن (sandstone): بەشـێکی زۆری دیوارەکانـی کۆشـك بـە تاوێـری لمیـن هەڵچـنراوە بەتایبـەت بەشـی سـەرەکی کۆشـك کـە زۆربـەی دیوارەکانـی گرتۆتـەوە.



هێڵکاری ڕووی پێشەوە و پشتەوەی بە شی دووەمی کۆشك، دۆخی ئێستای بیناکە

هەروەها لە بەشی دووەمی کۆشك (بینای سەر گردەکە) بەکار هاتووە، بەڵام بە شێوەیەکی کەمتر. لێرەدا ئەو تاوێرانە کە بە قەبارەیەکی گەورە و چوارگۆشەیی داتاشراون، لە بەشی خوارەوەی دیوارەکان بەکارهاتوون.



هێڵکاری ڕووی پێشەوە و پشتەوەی بەشی دووەمی کۆشك، دۆخی ئێستای بیناکە

بەڵام ئەوانەی بە قەبارەیەکی بچوکتر و لاکێشەیی داتاشراون،لە بەشەکانی سەرەوەی دیوارەکان بەکارهاتوون.ئەوەی تێبینی دەکرێت تاوێرەکان لەو بەشەی دەکەوێتە بەرامبەر بەشی سەرەکی کۆشك زۆر بە کەمی دەبینرێت لە پێکهاتەی دیوارەکانی.

خڕەبەرد (bolder): یەکێکە لەو کەرەستانەی کە لە هەموو بەشەکانی کۆشك بەکارهاتووە بە تایبەت لە بەشەکەی بەرامبەر کۆشك کە زۆربەی دیوارەکانی بەم جۆرە بەردە هەڵچنراوە. ئەگەرچی بەشێکی زۆری ڕووخاوە بەڵام تاکوتەرا تاوێری لمین لەگەڵ خڕەبەردەکان دەبینرێت.



هەروەها جگە لەوەی لە بەشی سەرەکی کۆشک دەبینرێت، بەڵام پێکهاتەی بەشێکی زۆری دیوارەکانی بینای سەر گردەکەی پێکهێناوە.

خشت: بەکارهێنانی خشت زۆر بەکەمی دەبینرێت، ئەویش تەنها لە نێوان هەندێ لە تاقەکاندا بەکار هاتووە کە بەم هۆیەوە تاقەکانی پێ داخراون.

دار : جگە لە دروستکردنی دەرگاو پەنجەرەکان لە دار، کەلە ئێستادا نەماون، دار لە چەند ژوورێکی کۆشکەکە بەکارهاتووە بۆ بەهێزکردنی دیوارەکانیان.

## بەشی سەرەکی کۆشک:

بەشی سەرەکی کۆشک پێکهاتووە لە دوو نهۆم کە خۆی لە چەندین ژورو هۆل و دیوەخانێك دەبینێتەوە. دەرگای سەرەکی کۆشك لە سەر هۆلی نهۆمی یەکەمدایە و رووی لە رۆژهەڵاتە، ئەم هۆڵەش دوو ژوور لای باکور و دوانیش لای باشوریەوە لای رۆژئاواو لە کوتایی هۆڵەکە دەرگای دیوەخانەکەی لەسەرە. بەهۆی تاکە پلاکەنەیەکەوە کە لە ژووی ژمارە (١)دایە دەگەینە نهۆمی دووەم، ئەم نهۆمەش جگەلە دیوەخانی بەشی دوواوەی کۆشك هاوشێوەیە لەگەل نهۆمی یەکەم.




نەخشەی نهۆمی یەکەمی

نهۆمـی دووەمـی کۆشـك تەنهـا چەنـد بەشـێکی کەمـی ماوەتـەوە و ئەوانیـش بریتیـن لـە ژوورەکانـی ژمـارە (٩) و ژمـارە (١٠) و بەشـێك لـە هۆلـی نهۆمـی دووەم (٦).




نەخشەی نهۆمی دووەمی کۆشك

## بەشی دووەمی كۆشك (بینای سەر گردەكە )

دەكەوێتە سـەر گردێكی سروشـتی بە دووری ٥٠ م لە ڕۆژئاوای بەشـە سـەرەكیەكەی كۆشـكەوە دوورە، ڕووبەرەكـەی نزیـك دەبێتـەوە لـە٧٦م دووجـا، بـە گشـتی پێكهاتـووە لـە ژوورێكـی بچـوك لای ڕۆژهـەڵات بـە پێوانـەی(٤،٣٠م بـە ٢،٢٠)، دیوەخانێـك لای ڕۆژئـاواوە بـە پێوانـەی (٨،٣٠م) بـە (٣،٣٠م)، ئەسـتوری دیوارەكانـی ئـەم بەشـەی كۆشـك لـە ژورە گەورەكـەی یەكسـانە بـە یـەك مەتـر، بـەڵام لـە ژوورە بچوكەكـە كـەم دەبێتـەوە بـۆ نزیـك لـە نیـوە. تـەواوی ئـەم بەشـەی كۆشـك ڕووی لـە باشـوورە و دەڕوانێـت بەسـەر ڕووبـاری سـیرواندا.




نەخشە بەشی دووەمی كۆشك (بینای سەر گردەكە)

پێدەچێـت ئـەم بەشـەی كۆشـك بـۆ ئـەم مەبەسـتانەی خـوارەوە بـەكار هێنرابێـت.

وەك شـوێنی سـەرەكی كـۆڕ و كۆبونـەوە و نیشـتەجێبوون، بـە تایبـەت كاتێـك لـە لایـەن مەحمـەد پادشـاوە بـەكار هێـنراوە واتـە پێـش دروسـتكردنی بەشـە سـەرەكیەكەی كۆشـك.

دوای دروسـتكردنی بەشـی سـەرەكیەكەی كۆشـك، وەك وێسـتگەیەكی پێشـوازی كـردن بـووە بـۆ ئەومیوانانـەی دەهاتنـە كۆشـك.



(وێنە لێکۆڵەر) ٢٠٠٨ز ٢٠١١ز ٢٠١٤ز

## بیناکەی بەرامبەر کۆشك :

بەرامبەر کۆشك واتا لای ڕۆژهەڵاتەوە بینایەکی لاکێشەیی درێژ دەبینرێت، بیناکە لە دۆخێکی خراپدایە و بەشێکی زۆری ڕووخاوە، بەڵام ئەوەی تیبێنی دەکرێت پێکهاتووە لە دوو بەش؛ بەشێکیان ڕووی لە کۆشکەکەیە و بریتییە لە چەندین ژوور بە ڕیزی یەکترەوە، بەشێوەیەك هەر سێ ژووریان پەیوەنی بەیەکەوە هەیە کە دەرگای سەرەکییان لە ژووری ناوەراستدایە و دەرگای دوو ژوورەکەی تریش دەکەوێتە سەر ژووری ناوەراست. پێدەچێت بەکار هاتبێت بۆ حەوانەوەی میوانەکان. بەڵام هەرچی بەشی پشتەوەیە کە ڕووی لە ڕۆژهەڵاتە پێدەچێت پێکهاتبێت لە سێ ژووری لاکێشەیی درێژ لە ڕیزی یەکتردان کە کۆمەڵێك تاقی داخراویان هەیە و ڕووی سەرەوەیان تەواوکراوە بە شێوەی کەوانەیی نیوە بازنەیی. ئەم ژوورانە وەك تەویلەیەك بۆ جێی مانەوەی ئاژەڵ و بارەکانیان بەکارهێنراوە.

## سەرچاوەکان:


- ئومید ئاشنا: محەمەد پاشای جاف، سلیمانی، ساڵی ١٩٩٣ز.
- رۆژنامەی ژیان، ژ/٤٩٩، ساڵی ١٩٣٦ز.
- کریم بەگی فەتاح بەگی جاف : تاریخی جاف، بغداد ١٩٩٥ز.
- محەمەد علی کریم: کۆشکی مەحمود پاشای جاف، گۆڤاری سوبارتۆ، ژ/٨،ساڵی٢٠١٤.
- سوارە حسن باجەلان: مێژوی کەلار،چ/ یەکەم، سلیمانی، ساڵی ٢٠١١.
- محەمەد علی: کۆشکی مەحمود پاشای جاف، رێبەری شوینەوارەکانی گەرمیان:٢٠١٠
- كريم بةطي فةتاح بةطي جاف : تاريخي جاف، بغداد ١٩٩٥ز.
- محەمەد علي كريم: كؤشكي مەحمود ثاشاي جاف، طؤظاري سوبارتؤ، ذ/٨،ساليَ٢٠١٤.
- سوارة حسن باجةلان: ميَذوي كةلار،ض/ يةكةم، سليماني، ساليَ ٢٠١١.
- محەمەد علي: كؤشكي مەحمود ثاشاي جاف، ريَبةري شوينةوارةكاني طةرميان:٢٠١٠



# بەشێك لە كارە هونەرییەكانم، لە گەرمیان.

د. بەیان مانی

لەیادی بەقەزابوونی شاری كەلاردا من وای بەباش دەزانم لەهەربوارەو كەسانی تایبەتی بوارەكە باسی لێوە بكەن بۆمنیش لێرەوە تەنها باسی هونەری پەیكەرسازی دەكەم بەتایبەتی ئەو كارە هونەرییانەی كەلە گەرمیان دامناون یان وەكو پێشانگا نمایشم كردووە لەلایەكی دیكەوە پێم باشە باسی هونەر هو هونەرمەندان و شێوازی كاركردنیان و ڕۆڵیان لەناوچەی گەرمیان بهێڵمەوە بۆهونەرمەندانی گەرمیان خۆیان چونكە لەئێستادا ئەوان لەمن باشترو ئاشناترن لەهونەری ناوچەی گەرمیان لەلایەكی دیكەوە دەمەوێ ئەوەش بڵێم: كەمن لەماستەرنامەكەمدا بەشێوەیەكی كورت ئاماژەم بەچەندكەسێك كردووە كەهەندێ كاری هونەرییان ئەنجامداوە وەكو سەرەتایەك، بەتایبەتی لەسەر سندوقی بوراق ئەمەش خاڵێكی دیكەیە كەوادەكات وەكو پێویست ئاماژە بەكارە هونەرییەكانی خۆم بدەم لەناوچەی گەرمیان و كەلار بەتایبەتی.لێرەدا دێمەوە سەر ناوەخنی بابەتەكە كە باسێكە دەربارەی كاری هونەری خۆم.
كاری هونەری من دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی پێنجەمی ئامادەیی، كەئەوكاتە زیاتر كاری وێنەكێشانم دەكرد ئەگەرچی پێشتر وێنەم دەكێشا بەڵام زیاتر سەرقاڵی شیعروئەدەب و هونەری موزیك بووم

بەپشتیوانی و هاوکاری مامۆستا (مستەفا سعید) کەئەو پێش من لەو بوارە شارەزابوو، ئەو هونەرەی لەپەیمانگای مامۆستایان فێربوو لەکاتی پشووەکان دەهاتەوە کەلارو یەکترمان دەبینی و سودم لێوەردەگرت.



بەڵام بەهاتنی مامۆستا (محمود شیخ) زۆر هانی دام بۆهونەری شێوەکاری.بەتایبەتی هونەری وێنەکێشان بەرەبەرە وام لێهات بەردەوام وێنەم دەکێشا و زۆرجاریش بەشداری پێشانگام دەکرد ئەمەش وایلێکردم بیرلەکۆلێجی هونەر بکەمەوە، کە سەر بەزانکۆی بەغدایە،بۆیە لەپاش تەواوکردنی قۆناغی شەشەمی ئامادەیی لەکۆلێجی هونەر تاقیکردنەوەی زارەکی و کرداریم ئەنجامدا سەرکەوتوبووم و وەکو خوێندکار لەکۆلێجی هونەری زانکۆی بەغداد وەرگیرام لەساڵی (١٩٨٥) لەهەمان ساڵ بەبۆنەی کاری سیاسی و بەهاندانی ئیزگەکە پەیوەندیمان نەکرد بەسەربازگەکانی (جیش شعبی) لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لەخوێندکارانی زانکۆی بەغداو زانکۆکانی دیکە لەزانکۆ دەرکراین پاشان دەستمکرد بەکرێکاری بۆماوەی سێ ساڵ کرێکاریم کرد.پاش روداوی ئەنفال کردنی خەڵکی کوردستان

حکومەتــی بەعــس لێبوردنــی گشــتی دەرکــرد بــۆ هەمــوو کــورد....
منیـش بـەر ئـەو لێبوردنەکەوتـم، جارێکیـتر پـاش سـێ سـاڵ گەڕامـەوە
زانکـۆ بـەڵام بۆجـاری دووەم کـە گەڕامـەوە زانکـۆ بەبیرکردنەوەیەکـی
قوڵـتر وانەکانـم دەخوێنـد بەتایبەتـی وانـە پراکتیکیـەکان. زۆربـەی
کاتەکانـم لەکۆلێـج بەسـەر دەبـرد هەتـا ئێـوارە کارم دەکـرد تەنانـەت
ڕۆژێ سـەرۆکی بەشـەکەمان پێـی وتـم: ئـەرێ تۆکەسـت نییـە؟ کەسـت
خۆشـناوێ؟ کـەس خۆشـی ناوێیـت؟ وابـەردەوام لـەم هۆڵـە ناچیتـە
دەرەوە.منیــش بەپێکەنینــەوە پیــم وت: بیرتــان چــوو چەندســاڵ منتــان
لـە زانکـۆ دەرکـرد وتـی بیرمـە وتـم سـیقەمان پێتـان نەمـاوە ئەترسـم
لەنـاکاوە دیسـان دەرمکـەن بۆیـە ئەمـەوێ شـتێ فێربـم پێـش ئـەوەی
دەرمکــەن جارێکیــتر ! زۆر پێکەنــی و تەماشــایەکی کــردم ورۆیشــت
بــەڵام کەســێکی وابــوو مــن و کوردەکانــی زۆر خــۆش دەویســت.پێم
باشـە ئـەوەش باسـکەم مـن کـە بۆجـاری دووەم وەرگیرامـەوە هاوڕێکانـم
گەیشــتنە قۆناغــی چــوارەم منیــش ســەرلەنوێ لەقۆناغــی یەکەمــەوە
دەســتمپێکرد.بەڵام مامۆســتاکان هەتابلێیــی باشــبون لەگەڵــم هەرگیــز
منیـان بـە نەهاتـو نەدەنوسـی ئەگـەر ئامادەنەبوومایـە لەوانەکانـدا بۆیـە
ئـەو سـاڵەم هەمـوی لەگـەڵ قۆناغـی سـێیەمی پەیکەرسـازیدا بەسـەربرد
جارجاریــش لەقۆناغــی چــوارەم ســیرامیکدا کارمدەکــرد.

زۆربـەی خوێنـدکارەکان هـەر وایاندەزانـی لەقۆناغـی سـێیەمی پەیکـەرم
تەنانـەت ڕۆژێکیـان مەرجیانکـرد بـو کۆمەڵێکیـان وتبویـان لەقۆناغـی
یەکەمــە کۆمەڵێکــی دیکەیــان وتبویــان لەقۆناغــی ســێیەمە.پاش
ئەوسـاڵە بۆسـاڵی دواتـر گەیشـتمە قۆناغـی دووەم بەشـی پەیکەرسـازی
وەرگیـرام بەئـارەزوی خـۆم لـەم قۆناغـەدا بـەردەوام کارمدەکـرد جگـە
لــەو کارانــەی مامۆســتاکان داوایــان لێدەکــردم چەندیــن کارێکتــەرم
دروســتکرد یەکێــک لــەو کارانــە پەیکــەری پــەری دەریابــوو لەنــاو
کۆلێـج دانـرا لەگـەڵ پەیکـەری بەدرشاکرسـیاب وجـان جـاک ڕۆسـۆ.



پەیکەری شەهید سەید محەمەد

مایــکل ئەنجیلو،دیدرۆ.قۆناغــی دووەم تــەواو کــرد بەســەرکەوتووی گەیشــتمە قۆناغــی ســێیەم زۆر دڵخۆشــبوم بەبەشــەکەم بــەردەوام لەنــاو هۆڵــی پراکتیکــی کارم دەکــرد مامۆســتاکانیش زۆر هانــدەرم بــون کۆلێجیــش بــەردەوام پڕبــوو لەژیــان وجوڵــە بــەردەوام هونەرمەندانــی نــاوداری ئەوکاتــە ســەردانیاندەکرد بــەردەوام نمایشــی هونــەری هەبــو لەشــانۆو شــێوەکاری و دیزایــن و موزیــک شــەو ڕۆژی بۆنەبــوە بۆیــە هەرگیــز هەســت بەتەنیایــی و بێتاقەتــی نەدەکــرد لەهەمانکاتــدا ئەمەریکا بــەردەوام هەڕەشــەی دەکــرد لەعێــراق و بارودۆخەکــەش ئاڵــۆزو ناخــۆش بــو برســێتیش تینــی بۆخەڵــک هێنابــوو.

هــەر لــە قۆناغــی ســێیەم کــە لــە کۆتایــی دەوام نزیــک بوینــەوە شــەڕی ڕزگارکردنــی کویــت دەســتی پێکــرد ئێمــە پێــش ئــەوە کۆلێجــان دیســان بەجێهێشــت گەڕاینــەوە کوردســتان،کە ڕاپەڕیــن دەســتیپێکرد لای هەمــوان ئاشــکرایە خەڵکــی چەنــد دڵــی خۆشــبوو جگــە لــە ڕزگار کردنــی کوردســتان کــەس هیچــی تــری بیــر نەبوو.بۆیــە ئێمــەش زانکۆمــان بیــر نەمابــوو بــۆ جــاری دووەم بۆیــە لــە کاتــی کۆڕەوەکــە وەکــو زۆربــەی خەڵکــی کوردســتان ماڵــمان بەجێهێشــت و ڕەومــان کــردە ئێــران پــاش ماوەیــەک لــەوێ بــەرە بــەرە خەڵــک دەهاتنــەوە منیــش زۆر بێــزار بــووم لــە ڕەفتــاری ئێرانیــەکان بڕیارمانــدا بگەڕێینــەوە کوردســتان، بــەڵام کەس ئامــادە نەبــوو لەگەڵــمان بێتــەوە بۆیــە مــن ڕۆیشــتم نــاوی خــۆم بنوسم

لەگـەڵ مامۆسـتا نـەوزاد نەجمەدیـن و مامۆسـتا حسـێن میکایل.کـە چومـە خێمـەی ئێرانیەکانـەوە بـۆ ئـەوەی خـۆم ناونوسـبکەم بـۆ گەڕانەوە سـڵاوم لێکـردن کـەس وەڵامـی نەدایـەوە وتـم: ئاغـا بـۆ وەڵام نایەیتـەوە مـن سـڵاوم کـرد وتـی: تـۆ وەزیفەتـە سـڵاو بکەیـت وتـم مـن وەزیفەمـە سـڵاو لـە پیـاو بکـەم تـۆ پیـاو نیـت ئەوەنـدە تـوڕە بـووم وتـم بەسـەر مینەکانـدا ئەڕۆمـەوە ئیـتر مامۆسـتا حسـین و مامۆسـتا نـەوزاد منیـان هێنایـەوە و ئەوانیـش نـاوی خۆیـان تۆمـار کـرد بـۆ گەڕانـەوە.

لـە ئێرانیـش بـارو دۆخەکـە زۆر ناخۆشـبوو خـواردن زۆر کەمبـوو ئـاو بەزەحمـەت دەسـت دەکـەوت قـاپ و قاچاخ نەبـوو هەرچەنـد مـن لەگەڵ خوالێخۆشـبوو خاڵـۆ نەجیـم باوکـی م.نـەوزاد و مێـردی پـورم بیرێکـمان هەڵکەنـد زوو گەیشـتە ئـاو هەتـا ڕادەیـەک حەسـاینەوە دوایـش بـە یارمەتـی م.حسـین و م.نـەوزاد تەنورێکـم دروسـتکردبۆنان دروسـتکردن.

هەرچەنـدە پێشـتر کـەس ئامـادە نەبـوو بگەڕێتـەوە کوردسـتان بـەڵام کـە ئێمـە گەڕاینـەوە مـن وتـم ئەڕۆمـەوە چونکـە نزیـک سـەری سـاڵی خوێندنـە لەوانەیـە ئەمساڵیشـم لـە دەسـتبچێت ناچـار ماڵـی ئێمـە بڕیاریانـدا بگەڕێنـەوە ئەمجـار ماڵـی پـورم و خزمـان بڕیاریانـدا بگەڕێنـەوە لـە بـەر ئـەوەی ماڵـی خزمانـمان زۆرزۆر بـوون بـەرە بـەرە دراوسـێکانیش بڕیاریانـدا بگەڕێنـەوە لـە ماوەیەکـی کەمـدا زۆربـەی ئـاوارەکان خرۆشـان و تـا وای لێهـات خێوەتگـە بـەرەو چۆڵبـوون دەڕۆشـت، بـۆ ڕۆژی دوایـی ماڵـی ئێمـە و زۆربـەی خزمـان گەیشـتینە کـەلار مـن هـەر بـە زوویـی گەڕامـەوە کۆلێـج چومـە لای سـەرۆکی بـەش وتـم هاتومەتـەوە بـۆ دەوام ئەمەوێـت بەشـداری بکـەم لـە تاقیکردنەوکان.لـە وەڵامـدا وتـی: تـۆ لـە کـوێ بویـت تاقیکردنـەوە تەواوبـووە و هیـچ بوارێـک نەمـاوە وتـم مـن ئاوارەبـووم ئاسـان نەبـوو بێمـەوە داواکارم یارمەتیـم بـدەن چونکـە خۆتـان ئەزانـن مـن پێشـتر سـێ سـاڵ دواکەوتـوم سـەرۆکی بەشـی شـێوەکاری سـەرنجێکی دام بـە قوڵـی و وتـی: بـە مەرجێـک هەمـوو تاقیکردنـەوەکان دەبـێ بەیەکـەوە بکەیـت لەسـەر سـەد نمـرە، نمـرەی پێشترحسـاب ناکرێـت. دەبـێ لـە مـاوەی مانگێکـدا کاری پراکتیکـی هەمـوو وانـەکان تـەواو بکەیـت ناچـار قبوڵمکـرد و مـاوەی مانگێـک لـە بەغـداد مامـەوە لـە ئوتێـل بـە

ڕۆژ تا ئێوارە بە تەنیا کارم دەکرد کە نمرەم وەرگرتەوە بە یەکەم دەرچووم!

پێش ئەوەی من نمرە وەگرمەوە برادەرێکم کە ئێستا لە ئیماراتە بەیەکەم دەرچوبوو دوایی من بووم بە یەکەم چونکە کۆنمرەکانم لەو زۆرتربوو.زۆری پێناخۆش بوو وتی: پێم ناڵێی تۆ لە کوێوە هاتیتەوە خوا نەتهێنێتەوە!

پاش مانەوەم بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێک گەڕامەوە کەلار، بەڵام زۆر بەزەحمەت چونکە ڕێگای سەرەکی بەغداد کەلار گۆڕابوو سەیارە ڕاستەوخۆ نەبوو بۆ کەلار زۆر جار لە جەلەولا و بۆ کەلار هەندێ جاریش لە ڕێگەی خورماتووەوە دەهاتینەوە کە زیاتر لە شەش بۆ حەوت بازگەی زۆر خراپ و کەسانی عەشایەری لێبوو. زۆر سوکایەتیان بە خەڵک دەکرد کە بیان زانیایە بەرەو کوردستان دەبێت چونکە لەم ماوەیەدا ڕاپەڕینی دووی خەڵکی کوردستان بەرپا بو.دام و دەزگاکانی حکومەتی عێراق لە کوردستان نەمابوو پاش ئەوەی کە ماوەیە بە شێوەیەکی لاواز مابووە بەڕێکەوتن لەگەڵ بەرەی کوردستانیدا،من لەم ماوەیە کە پشووی هاوینە دەستیپێکردبوو یەکەم کاری هونەریم دروستکرد ئەویش پەیکەرێک بوو بۆ مەولەوی شاعیر بە هاوکاری مامۆستا (محمود شێخ) کە لە ئامادەیی مامۆستامان بوو لەگەڵ کاک (سەروەر فایەق) و فتح اللە جهانگیر) و هەندێ برادەرین



((پەیکەری مەولەوی))

(بــورن ئەوانــە هــاوکارم بــوون ناویانــم بیــر نەماوە)پــاش تــەواو کردنــی پەیکەرەکــە بــە هــاوکاری بەڕێــز (شــێخ سـعید شــاکەلی) لــە نــاو کتێبخانــەی گشــتی کــەلار دامانــا لــە ڕۆژی پــەردە لادان لەســەر پەیکەرەکــە بــە ئامــادە بونــی جەماوەرێکــی زۆر لــە هونەرمەنــدان و نوســەران و مامۆســتایان ڕەوان شــاد مامۆســتا دڵشــاد و محمــد ڕووئف باسـێکی دەربـارەی مەولـەوی شـاعیر پێشـکەش کـرد ئەمـە بـووە یەکەم پەیکــەر لــە کــەلار و گەرمیــان دابنرێــت.

پــاش تەواوبوونــی پشــووی هاوینــە گەڕامــەوە بەغــداد لــە قۆناغــی چــوارەم دەســتکردن بــە خوێندنــی ســاڵی(١٩٩١-١٩٩٢) کــە لــەم ماوەیــەدا هەڵبژاردنــی پەرلەمانــی کوردســتان بەڕێــوە چــوو ئێمــە لــەو ڕۆژەدا تاقیکردنــەوەی مێــژووی هونــەری مۆدێرنــی ئەوروپامــان هەبــوو مامۆستاکەشـمان وەک باسـیان دەکـرد ڕاوێـژکاری عـودەی کـوڕی سـەدام بــوو لێــرەدا زۆر بــە پێویســتی دەزانــم باســی ئــەوە بکــەم ئەویــش پــاش گەڕانــەوەم بــۆ زانکــۆ خۆیــان واتەنی(مفصــول و مشــبوە)ئەمجار حوکومەتــی کوردســتانیش دروســتبوو کەچــی ئــەو ڕێــز و پایــەی مــن هەمبــوو لــەلای مامۆســتاکان بەگشــتی تەنانــەت لای بەعســیەکانیش کــەم کــەس هەیبــوو بەهیــچ شــێوەیەک کارێکــی ناشرینــم بــەدی نەدەکــرد بەرامبــەرم کــە لەزانکــۆ دەرکرایــن بڕیارێکــی سیاســی بــوو لەســەرەوە وەکــو ئێســتا نەبــوو کــە ســێ و دووقســە بــکات لــە خــوارەوە تــا ســەرەوەرقیان لێبێــت

ئــەو ماوەیــە کــە لــە قۆناغــی چــوارەم بــووم، بەشــی پەیکەرســازی لــە مــاوەی ســاڵەکە جــارێ یــان دوو جــار هاتینــەوە، چونکــە ڕێگــە زۆر خــراپ و ترســناک بــوو ســەیارە کــەم بــوو ڕێگاکانیــش گۆڕابــوون. جارێکیــان هاتمــەوە لەگــەڵ برادەرێــک گەیشــتینە جەلــەولا لــە گــەراج سـەیارە نەبـوو زۆریـش چۆڵبـوو لـە دەرەوەی گـەراج لە کەسـێکم پرسـی وتـم: بـۆ سـەیارەی کـەلار نەمـاوە وتـی: کـەس ناوێرێـت بڵـێ ئـەڕۆم بـۆ کــەلار ڕەش بگیــرە بینیــم کەســێک هــەر چــاو دەگێڕێــت وەکــو وتــی: بــەدوای کەسـێکدا بگەڕێـت منیـش چومـە پاڵیـەوە وتـم هەسـتەکەم بـۆ کەسـێک دەگەڕێیـت بەڵـێ دەگەڕێـم بـەدوای کەسـێکدا زۆر باشـبێت و

زۆر پیاوێکی پیاوانەبێت منیش وتم: کەم کەس هەیە لە من پیاو تر بێت لەم دونیایە بەخوا هەر زۆر پیاوم ئیشەکەت چیە وتی واللە سەیارەم پێیە و ناوێرم بە تەنیا بڕۆم بۆ سلێمانی.وتم: کەوایە بەدوای مندا دەگەڕێیت وتی چۆن بزانم وتم تاقیمکەوە پیاوی وەک من هەر نیە کردمانە سوعبەت وتی کەواتە با بڕۆین وتم شتێک ماوە بیلێم وتی: چیە؟ وتم: هاوڕێیەکم لەگەڵدایە ئەویش دێت وتی: کەسی تر سوار ناکەم وتم ئاخر بەیەکەوە هاتوین ناکرێت ئەو لەگەڵم نەبێت وتی ئەو چۆن کەسێکە وتم ئەویش زۆر باشە زۆر پیاوە بەڵام ناگاتە من پێکەنی و وتی: کامەیە؟ وتم: ئا ئەو باڵا بەرزەیە وتی ئەوە هەڵناگرم سەیارەکەم تەحەمولی ناکات زۆر پارامەوە وتم نابێت و ناکرێت ئاخر ئەو چۆن بێتەوە. هەرچۆنێک بێت قەناعەتی کرد وتی دوام کەون دوای کەوتین بۆلای سەیارەکە لە کۆلانێک دایناو دوور لە گەراج بیجۆیەکی زۆر کۆن و داڕزاو ئەوەندە ڕزیبوو لە هەندێ شوێنەوە ئەرزەکەت دەبینی کە گەیشتینە بازگەی دەرەوەی جەلەولا ئەوەی بەسەر ئێمە هات پێویست ناکات بیلێم هەمووتان بینیوتانە گەیشتینە شێخ باوە خەڵکێکی زۆر لەسەر جادە وەستابوون تەنها بۆ جوێندان تف کردن بو بەڕوی ئەوخەڵکانەی بەرەو کەلار دێن کە گەیشتینە کولەجۆ عەرەبەکان پیرو گەنج تفی لێدەکردین و سەیارەیان دا بەبەر تۆپەڵە قوڕ لە لایەکی دیکەوە جادەکە تەنرابوو بە تانک و زرێپۆش و سەرباز

جارجار هەربۆخۆشی و ڕابواردن سەیارەکەی ئێمەیان دەگەیاندە قەراخ جادەکە بۆئەوەی بکەوینە خوارەوە پاش ئەوەی کەلە کولەجۆ بەشی خۆمان بەزیادەوە لەتۆپەڵە قوڕو تف وەرگرت ڕزگارمان بو دوایی پرسیارمان کرد ئەرێ ئەوە چی ڕویداوە کوڵەجۆ کوردی لێنەمابو چی قەوماوە وتیان واللە ئەوەی ڕاستی بێت کولەجۆ تەسلیمی حکومەتی عێراق کراوەتەوە ئەڵێن مەسەلەکە سیاسەتە کەس دڵگران نەبێت !! پاشان کەگەیشتینە کەلار سوپاسی کابرای شۆفێرم کرد وتی ئەی کرێ نادەن وتم ئەی تۆ خۆئیشی تەکسی ناکەیت سیارەی تایبەتی خۆتە من واتێگەیشتوم ئەمجار تو هەر

نەتوێـرا بێیتــەوە ئێمــە نەبوینایــە وەلحاصــل (١٠) دینــاری لــێ وەر دەگرتیـت.

پـاش ئـەوە لەسـەر داواکاری مامۆسـتا عەلـی عبداللـە نـاسراو بـە مامۆسـتا عەلـی پەرلەمـان دەسـتمکرد بـە پەیکەرێکـی نیـوەی بـۆ شـەهید (سـەید محمـد) لـە کفـری ئـەم پەیکـەرە لـە هۆڵـی هونەرمەندانی ئەوکاتـە دروسـتکرد شـەهید محمـد وێنەیەکـی وا نەبـوو بـۆ ئـەوەی کاری لەسـەر بکەیـن تەنهـا یـەک وێنـەی زۆر کاڵ و لێڵـی هەبـوو زۆر بـە زەحمـەت وردەکاری دەموچـاوی دەردەکـەوت بۆیـە زیاتـر سـودم لـە هاورێیـان و برادەرانـی دەبینـی بـۆ دروسـتکردنی پەیکەرەکـە بـە تایبـەت مامۆسـتا عەلـی.



پەیکەری شەهید سەید محەمەد

لـە پـاش تـەواو کردنـی ئـەم پەیکـەرە دەسـتمکرد بـە دروسـتکردنی پەیکـەری شـەهید (مەحەمـەد تۆفیـق جـاوەر) کـە گەنجێکـی زۆر جـوان بـوو کـە وێنەکـەم دی هەسـتم کـرد ئەیناسـم و هاورێـم بـوو هەرچەنـدە مـن بـە هیـچ شـێوەیەک نەمبینیـوە لەلایەکـی دیکـەوە هاورێیانـی کـە دەرچـووی پەیمانـگای هونـەرە جوانەکانـی سـلێمانی بـوون زۆر باسـیان دەکـرد بـە تایبـەت (مامۆسـتا کەریـم حەسـەن)هونەرمەند چونکە شـەهید مەحەمەدیـش یـش دەرچـووی پەیمانـگای هونـەرە جوانـەکان بـوو.

ئەمـەش وای لێکـردم زیاتـر بـە پەرۆشـەوە هـەوڵ بـدەم بۆ دروسـتکردنی پەیکەرێکـی تایبـەت بـۆ ئـەو شـەهیدە هونەرمەنـدە دەسـتم کـرد

بە پەیکەرەکە لە بینای هونەرمەندانی ئەوکاتە وەکو زۆربەی پەیکەرەکان یەکەم جار بە قوڕ دروستمکرد کە پەیکەرەکەم تەواو کرد خزم و کەسوکار و هاوڕێیانی شەهید محەمەد ڕازی بوون لەسەر شێوە و لێکچونی لە ڕوخساری شەهید پاشان دەستم کرد بە قاڵب کردنی بەڵام لەبەر ئەوەی بۆرەک(گەچی فەنی)زۆر گرانبوو یەک کیسە بە ٢٥٠ دینار بوو، ئەمجا تەنها لە شاری سلێمانی هەبوو لە کەلار پەیدا نەدەبوو ناچار قاڵبەکەیم بە گەچ دروستکرد بەڵام لە کاتی تێکەڵکردنی قاڵبەکەی بە ماددەی چیمەنتۆ قاڵبەکە شکاو و ورد و خاشبوو

پاش چەندین مانگ لە کارکردن، هەندێ پارچەی قاڵبەکە کەمتر لە ٥سم بوو بۆیە داوام لە برادەران کرد کە یارەتیم بدەن بە زوترین کات چیمەنتۆکە لابەن و وردە قاڵبە شکاوەکان کۆبکەنەوە و بە ئاو بیشۆن بۆیە بە زووی هەندێ پارچەی قاڵبەکانمان کۆکردەوە و بە ئاو شتمان لەگەڵ هاوڕێیان ئەمجار پاش ئەوە هەموویم لە شوێنێک دانا هاوڕێیانی هونەرمەندانم وتیان ئەم پارچە گەچانەت بۆ چیە وتم بەتەمام هەمووی بەیەکەوە بنوسێنم و بیکەمەوە قاڵبەکەی جاران دوبارە دایرێژم و بیکەمەوە بە پەیکەری شەهید(محەمەد تۆفیق جاوەر) مامۆستا کەریم وتی مەحاڵە ئیتر ئەوە بێتە پەیکەر ئەگەر توانیت ئەوە بکەیت من مەرج دەکەم چیت بوێ بۆتی دەکەم با هەموو شایەدبن هاوڕێیان منیش کامێرایەکم هێناو وێنەیەکی پارچەکانم گرت دەستم کرد بە کۆکردنەوە و نوساندیانم بەیەکەوە پاش چەند ڕۆژێک دوبارە دامرشتەوە بە قاڵبەکەم لێکردەوە لەسەر بنچینەیەکی سادە لەسەر جادەی گشتی دامانا بێئەوی هەستیپیبکرێت کە ئەو پەیکەرە ئەو کارەساتەی لێرویداوە لە پاش دانانی پەیکەرەکە کۆڕێکی تایبەت بەسترا بە ژیان و خەباتی شەهید(محەمەد تۆفیق جاوەر) پاش تەواوبوونی کۆڕەکە بە مامۆستا کەریمم وت ئەوە پەیکەرەکەم دروست کردەوە دوبارە وەکو ئەیبینی ئادەی لەسەر وەعدی خۆت ماوی بزانم چیم بۆ ئەکەیت لە وەڵامدا وتی هیچ من مەبەستم هەر ئەوەبو هانت بدەم پەیکەرەکە دروست بکەیتەوە چونکە من هەرگیز بڕوام نەبوو جارێکی تر بێتەوە بە پەیکەر.



((چاککردنەوەی قاڵبی پەیکەری شەهید محمد تۆفیق جاوەر))

پاش ئەم پەیکەرە پەیکەری ئیبراهیم خانی دەلۆم دروست کرد لە ساڵی ١٩٩٣ لەسەر پێشنیاری مامۆستا عەلی پەرلەمان وەک باسمکرد(م عەلی)زۆر هاوکارم بوو بۆ پەیکەر و کاری هونەری هەمیشە حەزیدەکرد لەکاری هونەری و بەشداری لە کۆڕی هونەری و ڕۆشنبیری سەرەڕای پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی، بۆیە پەیوەندی پێوەکردم کە پێی باشە پەیکەرێک بۆ ئیبراهیم خانی دەلۆ دروست بکەم منیش زۆرم پێخۆش بوو پاشان لەڕێگەی(م عەلی)ەوە پەیوەندیمان کرد بە شەرەفخانی کوڕیەوە،شەرەفخان لەدایکبووی ١٩١٠ بوو لە سەردانیکردنمان بۆ ماڵیان کە مامۆستا(ئەحمەد محمد قادر)یش ئامادە بوو بەوردی باسی ئیبراهم خانی باوکی کرد بۆمان لە بارەی شێوە و باڵا و جلوبەرگەوە منیش بەوردی دەمنووسی بۆ ئەوەی سودی لێوەرگرم بۆ دروستکردنی پەیکەرەکە.کاتێ دەستمکرد بە دروستکردنی پەیکەرەکە لە هۆڵێکی تایبەت لە ئامادەیی حەمرینی ئەوکات چەند جارێک شەرەفخان سەردانی پەیکەرەکەی کرد و تێبینی خۆی لەسەر پەیکەرەکە دەوت هەتا کۆتایی تەواوبونی پەیکەرەکە بەردەوام شەرەفخان دەهات بۆ سەردانیی. ڕۆژێکیان(م عەلی)هات بۆ سەردانم بۆ ئەوەی پەیکەرەکە ببینێت پێشتریش بەردەوام دەهات بەڵام ئەمجارە کەسێک بە کامێرایەکی ڤیدۆوە بەدوای مامۆستا عەلیدا زۆر بە پەلە دەڕۆشت بۆ ئەوەی فریای مامۆستا عەلی بکەوێت چونکە زۆر تیژ دەڕۆیشت





((پەیکەری برایم خانی دەلۆ))

بەڕێکەوت من تازە دەگەیشتمە دەرگای ئامادەیی حەمرین(م عەلی) کە منی بینی وتی وەرە خێرا چاوپێکەوتنێ بکە بۆ تەلەفیزیۆنی گەلی کوردستان وتم: چیبووە مامۆستا بۆ وا بە پەلەیت؟ وتی: جەماعەتی ئەولا بە بێ پرسی بنەماڵەی ئیبراهیم خان وێنەیەکی ئیبراهیم خانیان بە هێڵکاری دروستکردوە لە ناو کفری دایان ناوە(وەکو ئەو هێڵکاریانەی کە ئێستا لەسەر قەبران دروستدەکرێن)منیش لە چاو پێکەوتنەکە باسی ئەوەم کرد کە ئێمە بە پرسی بنەماڵەی ئیبراهیم خان ئەو پەیکەرەمان دروستکردووە خۆیان پێیان خۆشە هەروەها پێش کەسانی تر دەستمان پیکردوە.پاشان بۆ جاری دووم لەگەڵ م عەلی و عەلی حسێن ساڵەح سەردانی شەرەفخانی کوڕی ئیبراهیم خانمان کرد باسی ئەو کارەی کرد کە ئەو کەس پرسی پێنەکردوە و زۆری پێ ناخۆشە هەروەها ئەمە کارێکی جوان نیە پەیکەریش وانابێت، بۆ کۆتا جار لەگەڵ مامۆستا (ئەحمەد محەمەد قادر) سەردانمان کردنەوە، پاش ماوەیەک پەیکەری ئیبراهیم خانم تەواو کرد لەسەرەتای شاری کفری دامنا لەسەر قاعیدەیەکی پەیکەری گەورە ئەوکاتە ئامێری بەرز کردنەوەی تەن (کرێن) لە کەلار نەبوو بۆیە دەبوایە قاعیدەکە گەورە بێت. بۆئەوەی بتوای لەسەر قالبەکان بە ئاسانی دایبێیت هەروەها جێگەش هەبێت بۆ دانانی

قاڵب و شکاندنی قاڵبەکان پاش داڕشتنی بە چیمەنتۆ.لەکاتی پەردە لادان لەسەر پەیکەرەکە خەڵکێکی زۆر لەشارەکانی کەلار و دەربەندیخان و چەمچەماڵەو بە تایبەت شاری کەلار هاتبوون.

پاش ماوەیەک لە دانانی پەیکەری ئیبراهیم خانی دەلۆ لەساڵی ١٩٩٤ دەستم کرد بە دروست کردنی پەیکەری شەهید (ئەحمەدی حاجی ڕەشید) بۆ شاری کفری. لەسەر داوای کاک(شکور قەرەبڵاخی)ئەم پەیکەرەش هەر لە هەمان هۆڵ کە پەیکەری ئیبراهم خانم تیادا دروست کرد دەستم کرد بە دروست کردنی بە بەردەوامی شکور قەرەبڵاخی و بنەماڵەی شەهید سەردانی پەیکەرەکەیان دەکرد ڕاو بیری خۆیان دەوت لەسەر شێوە و بەژن و باڵاو جل و بەرگی یەکێ لە تایبەتمەندی شەهید ئەحمەد بەستنی جامانەکەی سەری بوو کە زۆر جەختیان لە شێوە بەستنەکەی دەکردەوە.ئەم پەیکەرەش تائێستا ماوە بە یەکێک لەو پەیکەرانەی کە هەتاوەکو ئێستا بنەماڵە و کەسوکاری شانازی پێوەدەکەن کە زۆر جوان و شایستەیە.هەروەها ئەم پەیکەرە لە هیچ ڕوویەکەوە تێکنەچووە بەڵام هەندێجار لەلایەن کەسانی ناشارەزاوە بۆیاخ دەکرێت شێوەکەی تێک دەدات.



((پەیکەری شەهید ئەحمەدی حاجی رشید))

هـەر لـە هەمـان سـاڵدا واتـە سـاڵی ١٩٩٤ بیـرم کـردەوە کارێکـی هونـەری ئەنجـام بـدەم بـۆ بـەر جەسـتە کردنی کارەسـاتی ئەنفال پێشـتر لەگـەڵ هونەرمەنـد ئـاری بابـان قسـەم کرد،بیرۆکەکـەی زۆر بـەدڵ بـوو وتـم: زۆر بـاس دەکرێـت کـە ئەنفالکـراوەکان زیندەبەچاڵ کـراون منیـش دەمەوێـت ئـەم تاوانـە وەکـو خـۆی بەرجەسـتە بکـەم بـەڵام پیویسـتیم بـە هەندێـک پـارەو کەرەسـتەو شـوێنێک دەبێـت بـۆ مـن ئاسـان نەبـوو لـەو کاتـی گرانـی و قـات و قڕیـەدا لەگـەڵ مامۆسـتا (عەلـی عبداللـە) قسـەمان کـرد وەکـو هەمـو جارێـک زۆری پیخـۆش بـوو وتـی مـن هـەوڵ ئـەدەم هەنـدێ پـارە پەیـدا بکـەم ئیـتر منیـش زیاتـر بیـرم لـە چۆنیەتـی بەرجەسـتە کردنـی کارەکـە دەکـردەوە ڕۆژی دوایـی مامۆسـتا عەلـی (٥٠٠) دینـاری هێنـا بۆمـان زۆر کـەم بـوو چونکـە هەنـدێ شـت زۆر گـران بـو یەکسـەر کەوتمـە کڕینـی گـەچ و بۆیـاخ و کەرەسـتەی پێویسـت چەنـد خوێنکارێکـم هێنـا لـە ئامادەیـی حەمریـن کـە خۆشـم لـەوێ مامۆسـتا بـوم بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ کەوتمـە قاڵـب وەرگرتـن لەسـەر دەسـت و قـاچ و پشـت و سـنگ..... پاشـان قاڵبەکانـم دادەڕشـت هـەر بەگـەچ چونکـە بۆرەک(گەچـی فەنی)کـە زۆر قایـم بـوو دەسـت نەدەکەوت.هەندێکیـش لـە بـرادەران وەک (فتـح اللـە جهانگیـر) و ئـازاد کەریـم قاڵبەکانیـان لێدەکـردەوە بـەم شـێوەیە توانیـان لەمـاوەی یـەک هەفتـەدا ٥٠ پارچـە دروسـت بکەیـن دەسـت و قـاچ و پشـت و سـنگ و سـەر و دەموچـاو بـە قەبـارەی سروشـتی و بـە ڕەنگـی سروشـتی،

پاشـان هەنـدێ بابەتـی دیکـە وەکـو پێـڵاو، بوکـە شوشـەی منـاڵ، مەمـە شـیری منـاڵ، بـەڵام ئـەوەی کەزۆر گرنـگ بـوو هێزێکی زیاتری بەخشـی بەکارەکـە ئـەو جـل و بەرگانـە بـوون کەهـی ئەنفـال کـراوەکان خۆیـان بـو لێیـان بەجـێ مابـوون لـە قەڵاکـەی نزیـک حەوشـکورو ناوچـەی خانەقیـن زیاتـر لـە دوو گوێینـە بـو لای مامۆسـتا عەلـی پارێزراوبـوون. پێـش ئـەوەی دەسـت بکەیـن بـە دانانـی پەیکـەرەکان شـۆفلێکم بـرد زەویەکـەم شـیکردەوە نزیکـەی (٢٠٠مەتـر) ئەبـوو لەگـەڵ بـرادەران دەسـتمانکرد بەدانانـی پەیکـەرەکان هەندێکیـان جل و بەرگـی لەبەردابوو هەندێکیـان پێویسـتی بەجـل وبـەرگ نەدەکـرد دەمانکـردە ژێرخۆڵـەوە و هەنـدێ شـوێنی،خۆڵەکەمان دادەبـردو دەردەکـەوت هەندێـک دەم وچاوی

بەدەرەوەبــو هــاواری دەکــرد بەشــێوەیەکی وامــان بەرجەســتەکردبو هەســتت دەکــرد کۆمەڵێــک کەســی زینــدون لەمنــاڵ پیرێــژن وپیــاو کراونەتــە ژێــر خۆڵــەوە هەندێکیــان گیانیــان تیانەمــاوە و هەندێکیــان هێشــتا زینــدون کارەکــە لەگۆڕەپانێکــی نزیــک بــارەگای حیزبی شــیوعی نمایشــکرا بەتەلــی درکیــن و شیشــی ئاســن دەورەمانگرتبــوو هەنــدێ جلــەکان بەتەلــە درکاوییەکــەوە هەڵواسرابــو وەکــو ئــەوی هەولیــان دابێــت رزگاریــان بێــت بــەڵام تەلــە درکاویەکــە مۆڵەتــی نەدابــون دەربازبن.ئــەم کارە کاردانەوەیــەکی زۆری هەبــوو ڕۆژانــە ســەدان کــەس دەهــات بۆســەیرکردنی بەتەواوەتــی شــاری کــەلاری هەژانــد کــەم کــەس هەبــوو نەیــەت بۆبینینــی کەســانێکی زۆر بەدیاریــەوە ئەگریــان بیرمــە کۆمەڵێــک ژن بەشــین وگریانــەوە هاتــن جوێنــی زۆریاندا بەســەرکردەکان وبــۆ ئەو کەســانەی ئــەو کارەیــان کــردووە دەیــان وت: دیارە ئەمــە ئەزانێ کــەس وکاری ئێمــە ئــاوا زینــدە بەچــاڵ کــراون بۆیــە ئــەم کارەی کــردووە. لەبەرئــەوەی زۆر تورەبــوون بــاری دەرونیــان زۆرشــێوابو مــن نەمتوانــی هیــچ شــتێکیان بــۆ باســبکەم.لەبەرئەوەی کارەکــە ســەدایەکی زۆری هەبــوو لەناوچەکانــی دیکــەوە داوایانکــرد ئــەو کارە نمایــش بکرێــت بۆیــە پــاش ماوەیــەک بردمــە چەمچەمــاڵ لەناوەڕاســتی شــاردا نمایشــم کــرد شــەوبارانێکی زۆر بــاری و پەیکــەرەکان زۆریــان لەنــاو قــورو لیتــەوە دەرکەوتبــون زۆر لەکەســانی زینــدە بەچــاڵ دەچــوون کەلێیــان ورد دەبوویتــەوە هەســتت دەکــرد چەندیــن ســاڵ پێــش ئێســتا ئــەم کارە ڕوویــداوە ئێســتا ئــەم بارانــە دەریخســتون لــە چەمچەمــاڵ فتــح اللــە جیهناگیــرو صباح محمــود شــێوەکارم لەگــەڵ بــون شــەو لەماڵ مامۆســتا غــازی محمــد شــێوەکار ماینــەوە بــۆڕۆژی دووەم خەڵکــی ئەوەندەگریــان بەدیــار ئــەو کارەوە مــن ئیتــر نەمتوانــی خــۆم بگــرم بــەکاك (فەیســەل علــی) شــێوەکارم وت کاکــە مــن ئیتــر ناتوانــم لێــرە بمێنمــەوە دەرۆم بۆســلێمانی ئێــوارە دێمــەوە کەئێــوارە هاتمــەوە بینیــم کاک فەیســەل زۆر بێتاقەتــەو هــەردوو چــاوی زۆر ســوربۆتەوە وتــم کاکــە چیبــوە زۆر گــۆڕاوی وتــی واللــە کۆمەڵــی ژن هاتــن ویســتیان برۆنــە نــاو تەلبەنەکــەوە منیــش ویســتم نەهێڵــم ئــەو کارە بکــەن ســودی نەبــو چونــە ژوورەوە بۆنــاو پەیکــەرەکان دەســتیانکرد بەشــیوەن وگریــان و لەخــۆدان

قورو لیتەکەشیانکرد بەسەری خۆیاندا منیش خۆم پێنەگیرا بەردەوام گریام لەگەڵیاندا زۆربێتاقەتم ئەو وێنەیەم لەبەرچاو ناڕوات. کەنمایشەکە تەواوبوو هێنامانەوە بۆسلێمانی لەشوێنی نزیک بەمزگەوتی حوسینیەکەی ئێستا نمایشمانکرد پاش کردنەوەی کارەکەو کۆبونەوەیەکی جەماوەرێکی زۆر بەئاری بابانم وت من ئیتر ناتوانم بەدیار ئەم کارەوە بم وەکو جەستە و وەکو باری دەرونیش زۆر هیلاکم کەسێکم بۆ بدۆزەرەوە ئەم سێ ڕۆژە بەدیار ئەم نمایشەوە بێت پاشان هەڵبگرێت وبیانباتە نێوبینای کۆمەڵەی ڕوناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوک کەزۆر نزیک بولەنمایشەکەوە ئەوەشم بیرنەچێت هەموو جارێ مامۆستا علی سیارەی دابین دەکرد بۆ گواستنەوەی پەیکەرەکان پێشتریش پێی وتم کەو لەدەربەندیخان. ئاری بابان وتی کەسێک هەیە ناوی عومەرە زۆر کوری باشە پێویستی بەیارمەتیە ئەو راسپێرە چاودێری نمایشەکە دەکات دوایش لەپاش سێ ڕۆژەکە بۆت دەگوازێتەوە بۆناو بینای کۆمەڵەی ڕوناکبیری منیش کەعومەرم بینی قسەمانکرد زۆرم بەدڵ بوو (١٥٠)دینارم دایە بۆسێ ڕۆژ (٢٠)دینار بۆ جگەرە وتم کاک عومەر ئیتر من ئەڕۆم زۆر هیلاکم تۆش کاری خۆت دەزانی کاک ئاری بابانیش لێرەیە ئەگەر شتێکت پێویست بوو هەرکە خواحافیزیمکرد تەلەفیزیۆنی گەلی کوردستان هاتن وتیان حەزدەکەیت قسەمان بۆبکەین لەبارەی ئەم کارەوە منیش باسی کارەکەم کردو لەکۆتاییا زۆر سوپاسی ئاری بابانم کرد کەزۆر هاوکارم بووە بیرم چوو باسی مامۆستا علی بکەم،پاش تەواو بوونی نمایشەکە قسەم کرد بۆ علی پیم وت د وتم مامۆستا من بەتەمام سبەی پەیکەرەکان بێم بۆ دەربەندیخان وەکو بەڵێنم دابوو ئەویش وتی قوربان من پەیکەرەکانتم هێناوە ئێستا لەدەربەندیخانە چاوەڕێین جەنابت بێت نمایشەکە ڕێکبخەین سوپاسی ئاری بابان بکە دوای بۆ ئاری بابانم باسکرد زۆر پێکەنی و وتی واللە ناحەقی نیە لەساڵی ٢٠١٨ پێشانگایەکم کردەوە لەکۆلێجی هونەر زانکۆی سلێمانی مامۆستا علی هات بۆ پێشانگاکە کە هەر لەدورەوە وتم وەرە مامۆستا ئیشم پێتە بردم بۆبەشی شێوەکاری ئاری بابان دانیشتبوو وتم مامۆستا

ئـەوە ئـاری بابانـە سوپاسـی بکـە.

پـاش ئـەوەی کەنمایشـەکە لەدەربەندیخـان تـەواو بـوو گەڕاندمـەوە بـۆ کـەلار لەبەرئـەوەی هیـچ شـوێنێکم نەبـوو پەیکـەرەکان لەگـەڵ کۆمەڵێ پەیکـەری دیکـەی تـردا لەنـاو یانـەی وەرزشـی خانەقیـن دانـا لەگـەڵ جـل وبەرگـی ئەنفالکراوەکانـدا بەداخـەوە لـە (٣١)ئابـدا هەمـووی تیـا چـوو پەیکـەرەکان شـکێنرابوون جـل و بەرگەکانیـش هەمـووی برابـون.



((پانۆرامای ئەنفال))

لەبـەر ئـەوەی بابەتەکـە درێژئەبێتـەوە بۆیـە لێـرەدا باسـی پێشـانگاهونەریە هاوبـەش و وتایبەتـەکان و هەروەهـا باسـی پەیکەرەکانـی دیکـە ناکـەم کەدامنـاون لەکـەلارو گەرمیـان بەگشـتی جێـی دەهێڵـم بـۆ دەرفەتێکـی دیکـە لەوانـەش پەیکـەری (سـەیدعەلی ئەسـغەری کوردسـتانی) پەیکـەری (شـەهیدکەریم تایشـەیی ) پەیکـەری (مسـتەفا نەریمـان) لەکفـری پەیکـەری ئافرەتێـک لەتەنیاییـا پەیکـەری چاوەڕوانـی لەدەربەندیخـان و ئاسـکێک و ماسـییەک لـە فولکـەی کـەلار لەگـەڵ کارێکـی هونـەری بەنـاوی درەختـی کتێـب لەنـاو کتێبخانـەی کـەلار. بۆیـە لێـرەدا تەنهـا باسـی هێمای ئەنفـال دەکـەم وەکـو دوا بابـەت لـەم نوسـینەدا.هێمای ئەنفـال کەسـاڵی (٢٠٠٤) لـە (ڕزگاری – کـەلار) دانـراوە لەپێشـبڕکێی تایبەتـدا کەلـە شـاری سـلێمانی ئەنجامـدرا بـۆ مـن دەرچـو ئـەم کارە سەرپەرشـتی کۆمەڵـەی ڕوناکبیـری و کۆمەڵایەتـی کەرکـوک دروسـتکراوە لەگرێبەسـتی

نێوان من وکۆمەڵەدا داهاتووە کەبەرزی پەیکەرەکە (٦) مەتر بەبێ بنەچەکە (قاعیدەکە) بەرامبەر بە(١٥) ملیۆن دینار بەڵام لەسەر حسابی خۆم بەهەمان پارە بەرزی پەیکەرەکەم گەیاندە (١٠)مەتر بەبێ قاعیدە ئێستا بەرزی ئەو هێمایە نزیکی (١٥)مەتر دەبێت.

لێرەدا حەزدەکەم باسی پەیوەندی ئەم هێمایە بکەم بەکارەساتی ئەنفالەوە.هێماکە بەشێوەیەکی گشتی لەشێوەی فەرەنجیەک دەچێت کەئەمەش هێمایە بۆ کەلتوری کورد خاڵێکی دیکە هێماکە لەبەشی سەرەوەی سەری مرۆڤێک دەبینرێت ڕوی لەخوارەوەیە لەگەڵ دوودەست کەلەهەمان کاتدا بۆتە قۆڵی فەرەنجیەکە ئەمەشیان ئاماژەیە بۆ مرۆڤێکی (دیل) واتە هێمایە بۆکەسانی ئەنفالکراو لەهەمان کاتدا دەبینین لای ڕاستی هێماکە زیاتر هاتۆتە پێشە بەبەراورد لەگەڵ لای چەپ هێماکە ئەمەش هێمایە بۆئەوەی کەئەم مرۆڤە موسڵمانە واتە ئەنفال کراوەکان موسڵمان بون بەشێوەیەکی گشتی کەچی بەناوی ئیسلامەوە زیندەبەچاڵ کران. کەواتە حزبی بەعس لەڕێگەی ئەنفالەوە ویستی مرۆڤی کورد لەناوببات لەگەڵ کەلتورەکەی بەناوی ئیسلامەوە. بۆیە هێمای ئەنفال سێ شتی سەرەکی لەخۆی کۆکردۆتەوە مرۆڤێک کەهێمایە بۆ ئەنفال کراوەکان فەرەنجیەک کەهێمایە بۆ کەلتوری کورد.هاتنە پێشەوەی لای راستی هێمایە. هێمایە بۆ موسلمانی گەلی کورد بەشێوەیەکی گشتی کەچی بەناوی ئیسلامەوە ئەنفال کران کەگوایە کورد موسلمان نین و ئەنفالکردنیان ڕەوایە لەڕوی شەرعەوە بەبڕوای بەعسیەکان.





# کتێب، سەرچاوەی ژیانێکی شایستە

بەیان مەجید

ماستەر لە ئەدەبی کوردی

هەمیشە ئەو کەشەی منداڵێک، واتا کەسێک تێیدا گەورە دەبێت فاکتەرێکی سەرەکییە لە چۆنیەتی گەورە بوون و دروست بوونی کەسایەتی ئەو منداڵە یان ئەو مرۆڤە، جا ئەوە کەشێکی نەشیاو و بێ سەروبەرە بێت یان کەشێکی لە بار و ڕەوشت پەروەرانە بێت بە هەردوو دیوەکەیدا هەر ڕاستە. ئەو کەشەی منیش تێیدا گەورە بووم هەرگیز خاڵی نەبووە لە کتێب و بایەخدان بەبواری ڕۆشنبیری، ئەمەش هاندەری من بووە کە هەر لە منداڵییەوە و لە قۆناغی خوێندنی سەرەتاییمەوە ئارەزوویەکی زۆر و تایبەتم بۆ کتێب و خوێندنەوە هەبێت. بەجۆرێک ئارەزووی خوێندنەوەی کتێبەکانی مێژوو و جوگرافیای خوشکەکانم دەکرد کە لە قۆناغی ناوەندی بوون و دەیانمخوێندەوە. هەر بەمشێوەیە و لەگەڵ گەورەبوونمدا و تا گەشتم بەقۆناغی ناوەندی و ئامادەیی، لەسەر خوێندنەوەی هەر کتێب و نامیلکە و گۆڤارێک کە دەستم پێڕادەگەشت بەردەوام بووم.

## ئەو كەسانەی هاندەرو هاوكارم بوون :

هـەر لـەو كاتەیـا كاك(جەمیـل)ی زاوامـان كـە زانـی ئەوەنـدە ئـارەزووی خوێندنـەوەم هەیـە بـوو بـە هـاوكارم بـۆ دەستخستنی كتێب و هاندانـم بـۆ بـەردەوام بـوون. منیـش سـەرەڕای هەبوونـی وانەكانـی خوێندنگـەم ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتـر پـەرۆش و هۆگـری خوێندنـەوە دەبووم. تا ئـەو ڕادەیـەی كـە زیاتـر لـە وانەكانـم كاتـم بـە خوێندنـەوەی دەرەكـی دەدا و تـا درەنگانـی شـەو بەسـەر خوێندنـەوەی ئـەو كتێبانـەوە دەمامـەوە بـۆ ئـەوەی هەرچـی زووە تـەواوی بكـەم و كتێبێكـی تـر بگـرم بـە دەستمەوە.

زۆرجاریـش كتێبەكانـم لەگـەڵ خـۆم دەبـرد بـۆ خوێندنگـە بـۆ ئـەوەی كـە دەرسـێكی شـاغرمان دەبـوو یـان لـە فورسـەكاندا كاتـم بـە زایـە نـەدەدا و سـەرقاڵی خوێندنـەوە دەبـووم، و كـە دەسـتم دەدایـە كتێبێـك بـە زۆری نەمدەتوانـی دەسـت بـەرداری بـم تاتـەواوم دەكـرد و ئەنجامـی كۆتاییـم دەزانـی..



## چۆن و بەچی دەستم پێكرد ؟

لەیادمـە لـە سـێی ناوەنـدی بـووم بـە خوێـندنەوەی كتێبـی (هەقایەتـی ئەفسـانەیی و چیرۆكـی بەرئاگـردان ) دەسـتم پێكـرد ، زۆر نـاوازەو سـەیر بـوولام و چێـژم لەخوێندنـەوەی بینـی، هـەر ئەوكاتانـە بـوو بۆیەكـەم جـار ڕۆمانـم خوێنـدەوە ئەویـش ڕۆمانەكـەی ( عەرەبـی شـەمۆ) بـوو ( قـەڵای دمـدم ) ڕووداوەكانـی زۆر سـەرنجراكێش بـوون لام چونكـە هـەردوو لایەنـی قارەمانـی و دڵـداری لەخۆگرتبـوو، بەتایبـەت كەسـێتی هـەردوو پاڵـەوان (شـەباب و نانـێ)م زۆر لاجـوان بوون كەپـڕ بـوون لـە گیانـی وەفـاداری وقوربانیـدان هەستم دەكـرد لەگەڵ كەسایەتییەكان دا دەژیـم، ئەمە و ڕۆمانی (سـارا ) ی ( میـرزا عەلـی كیتابـی ) زۆركاریگەرییـان هەبـوو لەسـەرم و گەلـێ چێـژم لەخوێندنەوەیـان بینـی، پاشـان ڕۆمانـی (حەمـە دۆك ی یەشـار كەمـال ) و ڕۆمانەكانـی (حسـێن عارف

و شێرزادحەسەن و عەزیزی مەلا ڕەش ) م خوێندەوە، لەمە بەدوا بۆ هێنانی کتێب دەستم کرد بە سەردانیکردنی کتێبخانەی گشتی، کە لەوێش خاتوو(ژیان)ی لێبوو فەرمانبەری کتێبخانە، زۆر هاوکارم دەبوو لە پێدانی ناونیشانی کتێبە باشەکان و درێژکردنەوەی ماوەی پێدانی کتێبەکاندا.

یەکێکیتر لەوانەی کە زۆر هاوکارم بوو( م. گوڵڕەنگ ) کچی ئەدیب و کەسێتی ناسراوی شاری کەلار (ئەحمەد کەلاری.. ڕوحی شاد بێت ) ئەودەم هاوپۆل ودراوسێش بووین، باوکی کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو، ئەمەش دەرفەتێکی زێرین بوو کە لە ڕێی ئەووەوە کتێبی باش و دانسقەم لە کتێبخانەکەیان دەهێنا و دەمخوێندەوە.

پاشان هەر لەم کاتانەیا بوو کە بە هۆی کاک(جەمیل) ەوە هاوڕێیانی ڕادیۆی گەرمیانمان ناسی. لە ناو ئەو هاوڕێیانەش ( م. ئەحمەد محەمەد قادر) بوو بە هاوکارێکی ترم بۆ خوێندنەوە و یارمەتیدەرێکی ترم بوو بۆ پەیدا کردنی کتێب و بەدەست خستنی کتێبی باش و نایاب. بەم شێوەیە بەردەوام بووم تا زانکۆشم تەواو کرد هەرچەند لە قۆناغی زانکۆ بەو پێیەی لە دەرەوەی کەلار و لە هەولێر خوێندنی زانکۆم دەخوێند دەرفەتی خوێندنەوەم کەم بوو بوویەوە،

بەڵام دوای تەواوکردنی زانکۆ و پێکهێنانی ژیانی هاوسەری دەکرێت بڵێم بە تەواوی لە خوێندنەوە دابڕام، بەهۆی ئەرکی ماڵداری و نەبوونی کاتی پێویست بەداخەوە لە کۆمەڵگای ئێمەدا ژیانی هاوسەری واتا کۆت و بەند کردنی ژن بە هەموو ئەرک و بەرپرسیارێتییەکانی ژیانی هاوسەرداری، بە جۆرێک کە زۆرینەی ژن دوای هاوسەریکردن ئیتر هیچ کات و ساتێکی بۆ خۆی نییە و نابێت. ڕەنگە ئەمە بۆپیاوان وانەبێت وجیاوازییەکی ئەوتۆی تێدا نەبێت کەی و لە کوێ بیانەوێت خاوەنی هەمان کات و ساتی خۆیانن.



بەڵام خۆشبەختانە دواتر و لەگەڵ دەستپێکردنی خوێندنی ماستەرەکەمدا دووبارە گەڕامەوە سەر خوێندنەوەی دەرەکی و پەیوەندیم لەگەڵ کتێبدا دروست کردەوە و تا ئەمڕۆش لە سەری بەردەوامم و لەهەموو جۆر و بابەتێک دەخوێنمەوە ئەدەبیات ، مێژوویی، دەروونی، پەروەردەیی و،لە وەرگێڕاوی فارسی یان عەرەبی ڕۆمان تارادەیەکی باش،و ئارەزوو و حەزێکی زۆریشم هەیە بۆ وەرگێران و ئامانجمە وەرگێران بۆبەرهەمی باش ودانسقە بکەم گەر خوا تەمەن بدات و دەرفەت هەبێت..

## بۆچی خوێندنەوە ؟

چونکە کتێب، پێویستییەکی بوونیەتی مرۆڤە و درەنگ یا زوو مرۆڤایەتی لەو ڕاستییە بە ئاگا دێتەوە و پەنای بۆ دەبات. عەقاد ئەڵێ : (حەزم بەخوێندنەوەیە چونکە لەم دنیایە تەنها ژیانێکم هەیە، و تەنها ژیانێکیش بەشم ناکات و هەمووشت لەویژدانم ناجوڵێنێ، تەنها خوێندنەوەیە زیاتر لەژیانێک دەبەخشێ بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤ ) بەواتای ئەوەی مرۆڤ بەهۆی خوێندنەوەوە لە ژیانێک زیاتر دەژیت و هەرخوێندنەوەیشە دەرگای جیهانێکی تر بە ڕوومانددا دەکاتەوەو دەتوانین لەڕێیەوە گەڕان بەمێشک وهزری ئەوانیتردابکەین و پێویستییەکانی ڕۆح و ئاوەز وویژدان تێردەکات، بۆیە وەک ئەرکی پەروەردەیی و ڕۆشنبیرانەی خۆم هەموو کات ئەم پەیامەم بە خوێندکارەکانم گەیاندووە و هانمداون کە بخوێننەوە، بە تایبەتیش خوێندکارە کچەکانم خوێندن و خوێندنەوە بۆ کچان پێویستە وەک پێویستی خواردن و خەوتن، چونکە لە کۆمەڵگایەکی نێرسالاریدا دەژین. کچان، کە نیوەی کۆمەڵگا و دایکی نیوەکەی ترن، لە پێناو ژیانێکی شایستە و بونیاتنانی کۆمەڵگایەکی دروست لە داهاتوودا پێویستە خوێندنەوە و خۆپێگەیاندن لە ڕێگەی خوێندنەوەوە گەورەترین خەم و خەونی ژیانیان بێت و جێی شانازی و دڵخۆشیمە لەهەمان کاتدا کە زۆربەی خوێندکارەکانم بەدنیای کتێب و خوێندنەوە ئاشناکردووە و سوودێکی زۆریان لێ بینیوە،

## زۆری و بۆری لە کتێبخانەی کـــوردی

ئەوەشــی جێــی باســە و پێویســتی ئەزانــم بیڵێــم لــە ئێســتایا کتێبخانــەی کــوردی بــەراورد بەســاڵانی پێشــوو بەتایبەتیــش ســاڵانی نــەوەدەکان زۆر دەوڵمەندتــر و چــالاک تــرە، ئەمــە مایــەی دڵخۆشــییە بــۆ هەمــوو خوێنەران،لەگــەڵ ئەوەشــدا ناهــەق نیــم گــەر بڵێــم جــۆرێ لــە ( زۆری و بــۆری ) دەبینرێــت و چاپەمەنــی و کتێبخانــەی کــوردی زۆرێــک لەکتێبــی ناوەرۆکــی ئاســت نــزم و پــڕ کــەم و کــوڕی تێــدا بەرچــاو دەکــەوێ وەرگێــڕان بــێ یــان خۆماڵــی، دەبینیــن لــەڕووی ژمــارەو بــڕەوە یەکجــار زۆرکتێــب و چاپکــراو لەهەمــوو جــۆرو بابەتێــک هاتۆتــە کتێبخانــەی کوردییــەوە و بەشــێکی زۆریــان ناونیشــانێکی زەق و قەبــە و ســەرنجراکێش لەخــۆی دەگــرن بــەڵام لــەڕووی ناوەرۆکــەوە پــووچ و بــێ کەڵــک و کــرچ و کاڵــن،و پــڕن لەهەڵــەی ڕێنــووس وزمانەوانی،بەجۆرێــک کتێبــی واهەیــە ، لەپەرەگرافێکــدا چەندیــن هەڵــەی ڕێنووســی و خاڵبەنــدی و زمانەوانــی تێدایــە ! مخابــن خۆزگــە فلتەرێــک یــان سانســۆرێکی بــاش هەبــێ و ڕێگــر بــێ لەبەرهەمــی بــێ مەبەســت و بــێ ســوود و ئــەو کتێبانــەی دەنووســرێن یــان وەردەگێردرێــن پوخــت و پاڵفتــە بــکات و هانــدەر و کارئاســانی ئەوانــەش بــن کــە ناوەرۆکــی پــڕ ئامانــج و پوختیــان هەیــە و دەبنــە هــۆی پێگەیاندنــی خوێنــەر و ڕۆشــنبیران بەگشــتی و گەنجــــان بەتایبەتــی..

## چۆن ببیـــن بە خوێنەرێکی باش ؟

ڕەنگــە زۆرێــک هەبــن لــەخۆیان یــان لــەدەورو بــەرو خوێنەرانــی تــر بپرســن : چــۆن بتوانــم ببمــە خوێنەرێکــی بــاش، یــان چــۆن بتوانــم بــەردەوام بخوێنمــەوەو بێــزار نەبــم؟ وە چــۆن و لەچییــەوە دەســت پــێ بکــەم ؟ گومانــی تێــدا نییــە کــە خوێندنــەوەش وەکــو هــەر کــار و پیشــەو ومارەســـەیەکی تــر پێویســتی بــە ڕێکخســتن و هەنــدێ وردەکاری هەیــە بۆئــەوەی خوێندنــەوە ببێتــە عــادەت (خــوو ) یــەک لــەلات و دەســتبەرداری نەبیــت ،

وا باشــترە ســەرەتا بەخوێندنــەوەی ئــەو کتێــب و بابەتانــە دەســت پــێ بکەیــت کــە لەگــەڵ حــەزو خولیــاو کەســێتی و ویســتەکانتدا دەگونجێــن

و گرنگن بەلاتەوە، بەکتێبی سادەو ساکار و قەبارە بچووک ( ئەوانەی ژمارەی لاپەڕەیان ٤٠ - ٥٠ لاپەڕەیە ) دەست پێبکە بۆ نموونە کورتەچیرۆک و ژیاننامەو بابەتی چێژبەخش وئەوەی کەتوانای هزرو تێگەیشتنت بەسەریا دەشکێ و کاتێکی کەمی پێویستە ولێی بێزارنابی، دوور بکەوە لەو بابەتانەی لەحەزەکانتەوە دوورن،یان بابەتی پسپۆڕی لەخۆدەگرێ ( پزیشکی، دەروونی، فەلسەفی ) چونکە زۆروشەو زاراوەی ئاڵۆز و گران لەخۆ دەگرن بۆکەسێ لەسەرەتاو دەستپێکردندابێت قورسە !

خوێندنەوە گەر ئامانجداربێت، جا بۆخودپێگەیاندن وگۆڕانکاری بێت لەژیان و کەسێتی و مامەڵەکردنت لەگەڵ دەوروبەرەکەت، یان بۆ سوود وچێژوەرگرتن بێت هەرشتێکیش سوودت لێ وەرگرت ڕوونە کە چێژی هەیە و ئەوەشی چێژی لێ دەبینی حەتمەن سوودێکی بووەو دەبێت، ئەمەش بەردەوامی وبەرەو پێشچوون بە پرۆسەی خوێندنەوەکەت دەبەخشێت، مەبەستێکی تر لە خوێندنەوەی ئامانجدار ئەوەیە بۆخۆ دەرخستن، یان لەبەرکردنی چەند وشەو زاراوەی قەبە و بریقەدار نەبێت، یان کتێبەکانت تەنها بۆ پڕ کردنەوەی کتێبخانەو سووچێکی ماڵەکەت نەبێت..

خوێندنەوە کەش وژینگەی لەباری پێویستە،بەو مانایەی کاتێک بخوێنیتەوە کە تاڕادەیەکی باش لەڕووی دەروونی و هزرییەوە ئامادەبیت و مێشکت سەرقاڵ و ماندوو نەبێت ومەبەستت تەنها تەواوکردنی کتێبەکە نەبێت، وە بەپێی تواناو کاتی گونجاوی خۆت بخوێنەوە و لەکوێدابێزارو ماندوو بووی دەستی لێهەڵگرە، ڕوونە کە توانای جەستەیی و دەروونی مرۆڤ سنووردارەو لەکەسێکەوە بۆ یەکێکی تر و بەپێی تەمەنیش دەگۆڕێت..

# هەژدە ساڵ لە کەلار

یادگار فایەق



یەکەمجار کە مامۆستا و ئامادەکارە ئەزیزەکانی ئەم گۆڤارە لوتفیان نواند و داوایان لێکردم بابەتێک ئامادە بکەم، سەرەتا، زۆر دڵخۆشبووم و هەستم کرد کارێکی سانا و ئاسانە! دواتر، لە خۆمم پرسی لە کوێوە دەست پێبکەم؟ ئایا نوسینەوە و گێرانەوەی هەژدە ساڵ تەمەن لە کوچە و کۆڵان و بازاڕ و شوێنی ژیان و گۆڕستان و دەشتودەری کەلار، دوای دوورکەوتنەوە بۆ ماوەی زیاتر لە ١٨ ساڵ لەو شارە، کارێکی ئاسانە؟ بێگومان نەخێر.

بەهەرحاڵ، لێرەوە دەست پێدەکەم و ئەوەی دەیخوێنیتەوە گێڕانەوەی هەندێک لە یادگارییەکانە بەشێوەی چیرۆک و خستنەڕووی زانیاری و گوزەرکردن و هەندێکجار وەستان و تاسان بە دیار ئەو رۆژانەی دوبارەبوونەوەیان جگە لە خەیاڵپڵاوێک هیچی دیکە نییە.

من ناوم یادگارە و هێندەی ئاگادار بم لەو کاتەی لەدایکبووم ئەندامانی خێزان بە تیروپشک لەناو چەند ناوێکی دیکە ناوی [یادگار]یان بۆ دەرچووە و لەوساتەوە پێدەچێت تیروپشک و هەڵبژاردن لەنێوان چەند بژاردەیەک بووبێت بە بەشێکی گەورەی ژیانم! باوکم، حاجی فایەقی کوڕی حاجی سدیقی خەلیفە رەشیدی باجەڵانە، لەبەر ئەوەی شێوەقسەکردنی باوکم -خوا لێی خۆش بێت- لەناو ماڵ و لە دەرەوەی خێزانیش [ئەرا ئەرا] بوو هەربۆیە

تـەواوی بـرا و خوشـکانم بـە دایکیشـمەوە بەبـێ دوودڵـی ئەمانتوانـی بـە خانەقینـی قسـە بکەیـن. ڕەنگـە هـەر ئەمـە بێـت وای کردبێـت بـۆ وەڵامدانـەوەی پرسـیاری [خەڵکـی کوێیـت؟] دۆش دابمێنـم و نەزانـم بێـژم کەلاریـم یـان خانەقینـی، چونکـە بـۆ هـەردوولا سـۆز و هەسـتێکی تایبەتمـان هەبـوو، بۆیـە ئاسـانترین وەڵام ئەوەیـە هەمیشـە بێـژم [مـن گەرمیانیـم] و گەرمـای [گەرمەسـێر] دوای دوورکەوتنـەوەی زیاتـر لـە ١٨ سـاڵ هێشـتا دەرنـەچووە لـە گیانـم.

هەرچـی دایکیشـمە، کچـی شـێخ حەمەئەمینـی بنکورەیـە و کچـە شـێخە و بـە قەولـی کەلارییـەکان (بۆچـی بۆچـی) قسـەی ئەکـرد بـەڵام بەهـۆی هۆگربـوون و خۆشەویسـتیی بـۆ باوکمـەوە ئەویـش هاتبـووە سـەر دینـی باوکـم و شێوەقسـەکردنی بـۆ (ئـەرا ئـەرا) گۆڕیبـوو، بەشـێکی گـەورەی ئـەو پەروەردەیـەی شـار بـە شـار لەگـەڵ خـۆم دەمگێـڕا فەزڵەکـەی بـۆ تونديـی دايکـم بـوو لـە بابەتـە هەسـتيار و ئەخلاقییـەکان. ئـەو هەمیشـە سـوور بوو لەسـەر ئـەوەی -سـەرباری ئـەوەی دایکـم و حاجـی فایەقیش خوێندەوارییـان نەبـوو- کـە خوێنـدن بـە باشـترین شـێوە تـەواو بکەیـن و هـەر واشـیان کـرد.

کاتـی ئەوەیـە زۆربڵێـی نەکـەم و لاپـەڕەی یادەوەرییەکانـم لەگـەڵ کـەلار هەڵبدەمـەوە و گـەر زاکیـرە ناپاکیـم لەگـەڵ نـەکات، هـەوڵ ئـەدەم ورد بـم و چیـم لـە بیـرە و چۆنـی لـێ تێگەیشـتووم وا لەسـەری دەنووسـم. دیـارە ناردنـی منـداڵ بـۆ باخچـەی سـاوایان، هاوشـێوەی ئێسـتاکانێ، بـاو نەبـوو، ڕەنگـە خۆیشـم مەیلـی چـوون بـۆ باخچـەی سـاوایانم نەبووبێـت، کـە ئـەوکات لـە نزیـک قوتابخانـەی شـێروانەی کچـان و لەیـلا قاسـم دانەیـەک هەبـوو و ناوەکەیـم لـە بیـر نەمـاوە.

بیرمـە تەقـەی قاپییەکەمـان هـات و هـەرام کـرد بیکەمـەوە. ماڵمـان لـە بنگـرد بـوو، لـە هەمـان ئـەو خانییـەی گەڕەکـی [بنگـرد] کـە بـۆ ناونیشـان هەمیشـە ئەمانـوت فەرعـی گەراجـی بەغـداد، لـە کۆتایـی هاویـن و سـەرەتای پاییـز چـاوم بـە دنیـا هەڵهێنـاوە. کونـج و کەلەبـەری ئـەو ماڵـەم وەکـو ناولەپـی دەسـتم لـێ دیـار و ڕوون بـوو. بێمـەوە سـەر باسـەکەمان، کـە قاپییەکـەم کـردەوە یـەک یـان دوو کەسـم بینـی و

پێیان وتم، «هاتووین بۆ قەید کردن منالی ماڵەکە بۆ مەکتەب.» مامۆستا جوانی خوشکم گەیشتە بەردەرگە و فەرمووی لێکردن، وتیان ئەم کورەتان خوێندنی عەرەبی یان کوردی ئیختیار دەکەیت، دەمودەست وتم کوردی، خوشکەکەم بانگی کردمە ژوورەوە و پێی وتم، «تۆ کوردیت و کوردی هەر فێر دەبیت، بۆچی خوێندنی عەرەبی هەڵنابژێریت؟!» هەروام کرد و ماوەی ١٢ ساڵ بە عەرەبی خوێندنم و سەرچاوەی بەشێکی گەورەی دەستکەوتەکانی دواترم بوو.

قۆناغی یەک و دووی سەرەتاییم لە کەلار لە قوتابخانەیەک بەناوی [ریسالە خالیدە] تەواوکرد و دواتر ناوەکە بۆ [لەیلا قاسم] گۆڕدرا، کە لە کۆرەوەکە گەڕاینەوە دەرچووم بۆ پۆلی سێ و هاتینە قوتابخانەیەک لە نزیک ماڵی خۆمان بەناوی [باوەشاسوار] و تا تەواوکردنی پۆلی شەشەمی سەرەتایی لەوێ بووم. یەکێک لە یادگارییە ناخۆشەکانی ئەو سەردەمەم ئەوە بوو لە کۆڵانەکانی کەلار و بەری بنگرد و بەری قەڵای شێروانە منال و مێرمندال هەبوون کە شێوە [عەسابە] بوون و هەرجارە و شەڕیان بە یەکێک دەفرۆشت، بیرمە لە ماڵی خۆمانەوە تا ئەگەیشتمە قوتابخانەی [ریسالە خالیدە] کە هەموو شتێک بوو جگە لە ریسالەیەکی خالید، چەند کەسێک بە بەردەوامی شەڕیان پێدەفرۆشتم تا رۆژێک مامۆستا رزگاری برام لەگەڵ هات و کۆتایی بەو شەڕەفرۆشتنە هێنا، ئاخر مامۆستا رزگاری برام ڕاهێنەری کۆنفۆ بوو و بە [رزە جاکیشان] لەناو کەلارییەکان مەشهور بوو، بەڵام، ئەو رۆژە هیچ حەرەکەیەکی کۆنفۆی پێویست نەبوو بۆ ئەوەی ئەو منالانە تێبگەیەنێت کە بۆیان نییە چیتر شەڕم پێبفرۆشن. دیارە ئەم شەڕفرۆشتنە بە شێوەی جیاواز و لە تەمەنی جیاواز و لەگەڵ گرووپی جیاواز لە کەلار باوبوو.

یەکێک لەو یادگاریانەی هەرگیز بیرم ناچێتەوە لە کەلار، ئەو ماوەیە بوو کە لە یەک و دووی سەرەتایی بووم، مامۆستا [محەمەد پیروەلی] یادی پڕ خێر، هەڵە نەبم بەڕێوەبەر بوو لەوێ، خاڵۆژنێکیشم، مامۆستا سۆلاف، یاریدەدەر بوو. من تا تەمەنی ٦ ساڵی دیاربوو بە حەزی خۆم و بە حەزی خێزان قژم درێژ کردبوو و

هەر بەو قژە درێژەوە دەچوومەوە بۆ مەکتەب. ئەم خۆشییەم زۆری ناخەیاند و لە قوتابخانەوە کردیانەسەرم کە قژم کورت بکەمەوە. چەند رۆژێک خۆم کرد بە کەرەی شەربەت و هیچم لە ماڵەوە باس نەکرد، هەوڵمدا پەنا ببەمە بەر خاڵۆژنم بۆ ئەوەی قژم کورت نەکەمەوە، سوودی نەبوو، پێیان وتم کورتی نەکەیتەوە خۆمان لە مەکتەب بۆت کورت دەکەینەوە!

دواتر کە هاتینە قوتابخانەی باوەشاسوار - بێکەس، یادگاریی خۆشمان تۆمارکرد [بەداخەوە زۆر گەڕام و ویستم بۆ هەر قوتابخانەیەکی ئاماژەپێکراو هەندێک زانیاری لەسەر ساڵی دامەزراندنیان بخەمەڕوو بەڵام لەسەر ئەنتەرنێت هیچ شتێکی ئەوتۆم دەست نەکەوت و ئەمەش خەمێکە دەبێت لایی لێبکەینەوە، ناکرێت مێژووی ٣٠ ساڵی رابردوومان بە تۆمارکراوی دەست نەکەوێت] و یەکێک لە یادگارییە لەبیرنەکراوەکان چاندنی یەکەم وەجبەی دار بوو لەناو قوتابخانەکە. باوەشاسوار، پڕ بوو لە وانە بۆ من! لەوێ بوو بۆ یەکەمجار فێربووم، کە بەرپرسیارییەتی ئەخلاقە و گرنگە، لەو ساڵانە لە قوتابخانەکان خۆراک و شیر دابەش دەکران و ماوەناماوەیەکیش جل و بەرگی کۆنەی وڵاتانمان بەسەردا ساغ دەکرایەوە، سەردەمێکی قورس بوو و تەنها باوکان و ئەوانەی لە دەرەوە بوون درکیان بە سەختیی ئەو قۆناغە دەکرد. هەر ئەوکات لەناو قوتابییەکان دەنگوباس وا بڵاو بوو کە جل و بەرگی دەستی دووی رێکخراوەکان دەبرین و جلوبەرگی دەستی دووی ماڵەوەمان بۆ دەهێنن!

رۆژگاری نەوەدەکانی سەدەی رابردوو، رۆژگارێکی سەخت بوون و هەموو ئەوانەی روویانداوە و پێیاندا تێپەڕیوم لە سەرەتای تەمەنم لە کەلار وەکو نەخش هەڵکۆڵراون، بیرمە لە گەراجی ئەوکاتی بەغداد مێزێکی بچکۆلەم هەبوو پاکەت و جگەرەم دەفرۆشت، هەرگیز بیرم ناچێتەوە کە چەند مەترێک دوور لە من کەسێک کە خاوەنی گەراجەکە بوو بەهۆی دوژمندارییەوە کوژرا و تا رۆژی ئەمڕۆش رووداوێکی ناخۆشی لەبیر نەکراوە. ساڵانی دواتر کە هاتمە دەرەوەی کەلار، بۆم دەرکەوت کە تیرۆانینێک دروستکراوە

لەسەر کەلار کە شارێکە عاشقە شەڕە و ڕۆژ نییە خەڵکی تیا نەکوژرێت، خۆشبەختانە زۆرینەی ئەوانەی هاتنە دەرەوەی کەلار بە ڕەفتار و ئاکاریان پێچەوانەکەیان بۆ خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان سەلماند. دەبێت ئەوە بڵێم کە گەورەبوون لە کەلار وەکو ئەوە وابوو لە خانوویەک بە قەبارەی شارێک گەورە بیت، چونکە تەواوی ئەوانەی بەریان دەکەوتیت دەیانناسیت یان لانی کەم بەشێوەیەک لە شێوەکان دەیانویست هاوکاریت بکەن و بتکەن بە کەسێکی باشتر.

ساڵ هاتوو و چوو و بۆ خوێندنی ناوەندی چوومە خوێندنگەی [پێشکەوتن] کە لەلایەن مامۆستا نەوزاد نەجمەدینی خۆشەویستیەوە ئیدارە دەدرا و هێندەی بیرم بێت مامۆستا سەڵاح و مامۆستا عەبدولڕەزاق و مامۆستا لوقمان و مامۆستا کامەران دەرسیان پێدەوتینەوە، هەرگیز بیرم ناچێت بەیانییەکی ساردی کەلار هەر لەناو دەرگەی قوتابخانەوە ڕاپێچی ژوورەوە کرام و دارکارییەکی چاک کرام، بەبێ ئەوەی بزانم بۆ!، هەر مامۆستایەک دەهاتەژوورەوە بە زلەیەک بەیانی باشی لێدەکردم و دواتر لە ڕێگەی مامۆستا جوانی خوشکمەوە، کە ئەوکات لە خوێندنگەی شێروانە بوو کە لەلایەن مامۆستا سرودەوە ئیدارە دەدرا، شتێکم بۆ دەرکەوت و جوانی خوشکم وتی لەبەر ئەوە (فەلاقە) کراویت چونکە هاوڕێیەکت وتویەتی دوێنی وەلیەکە لە مەکتەب «هروب»مان کردوە و ناخۆشییەکە ئەوە بوو ڕۆژی پێشووتر من ناساغ بووم و هەر لە ماڵەوە نەهاتبوومە دەرەوە، بەهەرحاڵ، ئەو بەیانییە کارێکی وایان پێکردم هەرگیز بیرم نەچێتەوە [پێکەنین] و هەر بەڕاستی لە ڕۆژانی دواتر لە دیوارە بە بەرد دروستکراوەکان تۆکمە زیندانئاساکانی خوێندنگەکە سڵم دەکردەوە. ڕێزی بێپایانم بۆ تەواوی ئەو مامۆستایانەم و یادیان بەخێر.

لە یادمە، تەمەنم ١٥ ساڵێک دەبوو، لەگەڵ مامۆستا ڕزگاری برامە سەرقاڵی بەقاڵی بووین و لەو جێگەیەی لە نزیکی قوتابخانەی لەیلا قاسم و مەیدانی گەنمفرۆشەکان بوو کارمان دەکرد، هەرچەندە لە لوتکەی نەوجوانی بووم و کورد وتەنی دڵمان دەرکردبوو و حەزمان

لێبـوو هەمیشـە شـیکپۆش و بۆنخـۆش بیـن بـۆ ئـەوەی سـەرنجی کچانی هاوتەمەنمـان رابکێشـێن بـەڵام ئەمـە سـەخت بـوو بۆیـە زۆربـەی جـارەکان بـە عەقڵـی گەنجانـەی خۆمـان چـاوەڕێ بوویـن کچێکـی هاوتەمـەن بـە رێکپۆشـی و لـە لوتکـەی قۆزێتیـدا بمانبینێت ناوچاوانی ئێمـە وابـوو زۆربـەی جارەکان لەگـەڵ دایکیـان دەردەکەوتـن و لەکاتی هاوارکـردن بـۆ فرۆشـتنی کیلۆیـەک تەمانـە بـە دیدارمـان یـان باشتر بڵێـم بـە دیداریـان شـاد دەبوویـن. ئـەوەی لـەو سـەردەمە لـە کـەلار، سـەربەرزانە، ئەنجامـیان دا بـوو بـە توێشـووی رێگەمـان و بـوو بـەو نەخشـە و رێبـەرەی کـە دواتـر بەشـێکی گـەورەی ژیانمانـی وێنـا کـرد و نەیهێشـێت هیـچ دۆخ و نەهامەتییـەک بمانخـات.

یەکێکـی دیکـە لـە یادگارییەکانـم لـە خوێندنگـەی پێشـکەوتن چالاکیی سـاڵانەی خوێندنگەکـە بـوو، کـە خوێنـدکاران بـە گۆرانـی و شـانۆگەری دەیانڕازانـدەوە. بیرمـە دوو سـاڵ لەسـەر یـەک بـە هیممەتـی مامۆسـتا نـەوزادی ئەزیـز بەشـدار بـووم و دوو گۆرانیـم وت، یەکێکیـان گۆرانییە تایبەتەکـەی مامۆسـتا تایـەری خەلیلـی بـوو [هـەی سـەوزە سـەوزە، سـەوزە ماڵەکـەم.. بـێ تـۆ وێرانـە، مـاڵ و حاڵەکـەم] و گۆرانییەکـەی دیکـەش [بـەو بـەو بـەو بـەو بـەو بـەو خانمـە خاسـەکەم.. پـاو پیـڵاو وە بـان دیـدە راسـەگەم]، هەمیشـە ئـارەزووم دەکـرد رۆژێـک لـە رۆژان ئـەو یادگاریانـە بـە چـاو ببینمـەوە.

زۆر دوور نەکەومـەوە لـە قۆناغـی سـەرەتایی، ئـەوکات مامۆسـتا کەریم لـە قوتابخانـەی [بێکـەس] بڕیاریـدا شـانۆگەرییەک ئامـادە بکەیـن و خۆیـی سەرپەرشـتیانی دەکـرد. قوتابخانەکانـی کـەلار بەناوبانـگ بوون لـە بـواری چالاکیـی هونـەری و مامۆسـتای دڵسـۆزمان هەبـوو. بیرمـە و هەرگیزیـش بیـرم ناچێـت شـانۆگەرییەکەمان نـاوی [کلـک پەمـوو و قەشـەنگ] بـوو، دڵنیـا نیـم ئایـا مامۆسـتا کەریـم خـۆی نوسـیبووی یاخـود نـا. مـن رۆڵـی کلـک پەمـووم هەبـوو و کچێکـی هاوپۆلیشـم رۆڵـی قەشـەنگی دەبینـی، ماوەیەکـی تووڵانـی خۆمـان ئامـادە کـرد و پرۆڤەمـان کـرد، دکتـۆر زانیـاری بـرام ئـەوکات لێـی پرسـیم کـەی نمایشـی دەکـەن، منیـش بـە بیرکردنـەوەی منداڵیـی خۆمـەوە وتـم چـواری بیسـت نمایشـی دەکەیـن، خـۆی ٢٠ـی ٤ بـوو. ئەوەبـوو، هەڵـە نەبم یەک

ڕۆژ پێش نمایشەکە ئەو کچەی هاوپۆلم بە هەر هۆکارێک بوو نەیتوانی ڕۆڵەکە ببینێت و ریسی چەن مانگەی مامۆستا کەریمی خۆشەویست بووەوە بە خووری، زۆرجار بیری لێدەکەمەوە ئەبێ چەند نیگەران و خەمباری کردبێت کە شانۆگەرییەکەی روناکیی نەبینی.

گەورە بوون لە کەلاری جاران، تام و چێژی خۆیی هەبوو. بۆ قۆناغی دواناوەندی و ئامادەیی لە پێشکەوتنەوە خوێندمان گوازرایەوە بۆ خوێندنگەی شەهیدئارام، کە خوێندمان تیایدا بە زمانی عەرەبی بوو. بەشێوەیەکی ڕۆژانە بۆ گەیشتن بە خوێندگە دەبوو لە بنگردەوە بە پێ بگەینە شەهید ئارام، بە سەرما و گەرما. ڕێگەی چوون بەرەوە خوێندنگە خۆی بۆ خۆی قوتابخانەیەکی پڕ وانە بوو.

من لە یەکێک لە وانەکانی پۆلی شەشەم کۆڵەوار بووم، ڕاستی بێژم تاقە دەرسێک نەبوو لە چەند دەرسێک کۆڵەوار بووم. بیرمە، حاجی فایەقی باوکم – خوا لێی خۆش بێت لەگەڵ مردووی هەمووان - لە یەکێک لە مامۆستاکانمی پرسیبوو، «یادگار لە دەرسەکەت چۆنە؟» دیارە وەڵامەکەی ئەوە بوو، «بە عومری لەو دەرسە دەرناچێت!» ئیتر ئەمە زۆر بریندار کردم، بە هیممەتی دوو مامۆستای بەڕێز و کەموێنە [مامۆستا جەلال مەلیک و مامۆستا سەلام شوکر] کە هەتا ماوم قەرزارییانم لەگەڵ هەموو مامۆستایەکی دڵسۆزی دیکە، توانیم بە نمرەیەکی بەرز پۆلی شەش ببڕم و لەو کۆلێژ و بەشە وەربگیرێم کە هەوڵم بۆ دەدا و ئێستەش لەهەمان بوار مامۆستای زانکۆم.

کەلار، بۆ من، کە چاوم ڕانەهاتووە بەو هەموو گەڕەک و ئاوەدانی و شەقام و باخچە زۆرە، هێشتا پڕە لە یادگاری و هیچ کام لەوانەش نەیانتوانیوە شوێنەواری یادگارییەکانمان کاڵ و کەم بکاتەوە؛ لە چوون بۆ سەر قەڵای شێروانە و ترس و لەرزی سەردانێکی سیروان و بینینی [تەقوییەکە] لە نزیکەوە تا دەگاتە پەی بردن بەوەی لە پشتی پەردە چڵکنەکانی فەرعی ڤیدیۆکانەوە چی دەگوزەرێت.

توانا ئەمینی هاوڕێم، نوسەرێکی جوان و خەیاڵفراوان، لەبەر ئەوەی لە ڕۆژانی گەنجیی خۆیدا نەهامەتی و سەختیی زۆری -هاوشێوەی ئێمە- بینیوە زۆر جوان درکی بە تەبیعەتی کەلارییەکان کردوە کە ئەوەی تەمەنێک لە کەلار ژیابێت ئەم خووەی گرتوە، ئەو لە دەبێژێت:

«شتێک کە لە کەلارییەکاندا زۆر خۆشم دەوێت ئەوەیە؛ ناوەڕاستیان نییە، یان دۆستتن یان دوژمن... خۆ بەوە نییە لە باکوری ئەوروپا دەژیم، منیش لە دۆستایەتی خەڵکدا کەلارییم!

جوانە تا کۆتایی یەک دیوت هەبێ.»

جا ئەم خووە لە کەلارییەکاندا خوویەکی جوانە، کە بە دڵ دۆستایەتیت دەکەن و پشتیوانتن تا دوا هەناسە و کە لێشت کشانەوە هەرگیز دووڕوو نابن و ڕوو بەڕوو پێت دەڵێن کە چیتر دۆستت نین و ناتوانن دووڕوو بن. مەردیی کەلارییەکانم هەر ئەوکات بۆ دەرکەوت، لەبەر موحتاجی دەمانویست خانووەکەمان بفرۆشین و باوکم داوای کرد لەسەر دیوارەکە بنوسین [الدار للبيع] کەچی ڕۆژی دواتر دراوسێی بەرانبەرمان کە ماڵی خوالێخۆشبوو کاک [مەحمود ڕۆغزایی] لێ نیشتەجێبوون نوسینەکەیان دەسڕییەوە، براکانم دەیاننوسییەوە و ڕۆژی دواتر دیسان بە بۆیاخ دەسڕایەوە، ئاخر کەلارییەکان چاک لەو وتەیە تێگەیشتبوون کە [الجار قبل الدار] بۆیە چی پێویست بووایە دەیانکرد بۆ ئەوەی دراوسێیەکی باش گوزەرەکە چۆڵ نەکات، ئێمەش هەر وامان کرد.

لەکۆتاییدا، دەبێت بڵێم گێڕانەوەی سەردەمێک کە دەمێکە لاپەڕەکانی لە زاکیرەماندا داخراوە و نە خۆمان و نە کەس لایان لێیان نەکردۆتەوە کارێکی ئاسان نییە، بۆیە من پڕ بە دڵ سوپاسی مامۆستا و برایانی خۆشەویستم [مامۆستا مستەفا سەعید] و [مامۆستا ئەحمەد محەمەد] دەکەم کە ئەم شەرەفەیان پێ ڕەوا بینیم، چیرۆکی مامۆستا ئەحمەدی ئیزاعە و ئاشنا بوون بە شتێک

بە ناوی [رادیۆی گەرمیان] و بیستنی ناوی خۆمان لە گۆرانییەکی داواکراو خۆی بۆ خۆی یادگاریگەلێکی لەیاد نەکراون.

پێدەچێت، زەمەن و قەدەر بە نیاز نەبن ئەوانەی هاوبەشی یادگارییەکانمان بوون چانسێکی دیکەی دیدارییانمان هەبێتەوە، لێرەوە یادی یەکێک لە هاوماڵ و هاوسێ عەزیزەکانیشم دەکەمەوە کە لە کاتی نووسینی ئەم یاداشتە-یادگارییە هەواڵی کۆچی دواییم بیست، ئەویش مامۆستا [گۆران]ی کوڕی کاک [عەلیی مەلا عەباس] یادی گۆران و جەنابی باوک و باپیری بە خێر و دوامەنزڵیان بەهەشتی نەبڕاوە بێت، بوونی ئەو دراوسێیانە بۆنێکی پڕ لە یادگار بە بنگرد دەبەخشێت و لەگەڵ هەموو سەردانێکیشمدا بە دزییەوە دەڕوانمە ماڵەکان و چاو دەگێڕم بۆ هاوڕێکان و بۆ ئەو پیاوانەی کە لەسەر کۆڵانەکان تام و هەیبەتێکی تایبەتیان بە گەڕەکەکان دەبەخشی. بەڵێ.. هەژدە ساڵ لە کەلار وەکو هەژدە رۆژ دەبینرێت، بەڵام دەبێت چەند هەژدە ساڵی دیکە، گەر تەمەن باقی بێت، درک بە وانە و جوانییەکانی ئەو شارە و مەردی و مرۆڤدۆستیی دانیشتووانەکەی بکەین!



# پرۆسەی خوێندن لە کەلاردا

رزگار حاجی حەمید

## بەراییەك

دوای ئەوەی (کەلار) لە کۆتایی شوباتی(١٩٧٠) کەلار بە مەرسومی کۆماری کرایە قەزا لەسەر پارێزگای کەرکوك، هەردوو ناحیەی (شێروانە و پێباز) کە سەر بەقەزای کفری بوون خرایە سەر ئەم قەزایە، ئیدی لەوکاتەوە جیا لە دامەزراندنی کۆمەڵێك دامودەزگای حکومی کۆمەڵێك گەڕەك وکۆمەڵگەی گەورەی تیادا درووستکرا، کە دانیشتوانەکەی لە ناوچەکانی دەوروبەرەوە بە زۆرە ملێ ڕاگوێزرابوون، پاش ماوەیەکی کەم و بەپێی فەرمانی کۆماری ژمارە (٦٠٨ لە ١٩٧٥/١١/٦) نەخشەی کارگێڕی قەزای کەلار لە پارێزگای کەرکوك هەڵوەشێنرایەوە و خرایە سەر پارێزگای سلێمانی، هاوکات تادێ ئەم شارە لە گەشەکردندایە و بەشێوەیەکی ناسروشتی ڕێژەی دانیشتوانی زیاد دەکات، بەپێی قۆناغەکانی سەردەم کاریگەریی بزاوتە سیاسی و ئابووری وکۆمەڵایەتی وجوگرافی و کارگێڕییەکانەوە گەشەکردنێکی بەرچاو و دیاری بەخۆیەوە بینیوە، لەگەڵ ئەوەش ڕەوشی سیاسی عیراق و کوردستان ڕۆڵی هەبووە

لە فراوان بوون و گەشەکردن و گەورەبوونیدا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێگە و هەڵکەوتە جوگرافیاکەی و فاکتەرە سیاسی و ئابووری و کارگێڕی و خزمەتگوزارییەکان، گەرچی لە ئاستی پێداویستییەکانی سەردەمیشدا نەبوویێت، دوای ڕاپەڕینیش وەك شار و شارۆچکەکانی تر تاڕادەیەك ئاسایش و ئارامی بەخۆییەوە بینی، هیچ نەبێ ئەو جۆرە چەوسانەوەی کە لە ناوچەکانی دەرەوەی هەرێم هەبوو، لێرە کەمتر بەدی دەکرا، بۆیە جارێکی دی بووە باوانی ئەو شار و شارۆچکانەی لەژێر دەسەڵاتی بەعسدا بوون، دیسانەوە کەلار ڕووبەڕووی ئاڵوگۆڕی ئیداری بووەوە، بە دامەزراندنی پارێزگای کەرکوك لەسەر بڕیاری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ڕووی کارگێڕییەوە لە پارێزگای سلێمانی جیاکرایەوە خرایە سەر پارێزگای کەرکوك، ئەمە و تادوای پرۆسەی ئازادی و ڕووخاندنی حکومەتی بەعس پارێزگای کەرکوك هەڵوەشێنرایەوە، ئیدارەی گەرمیان جێی گرتەوە بۆ ئەو قەزایانەی کە بەدرێژایی مێژوو تا ناوەڕاستی حەفتاکان لەسەر (لیوا-پارێزگا)ی کەرکوك بوون، دواتریش بە بڕیارێکی ئەنجومەنی وەزیران ئیدارەی گەرمیان گوێزرایەوە بۆ شاری کەلار ئیدی لەوکاتەوە تائێستا ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە، ئەوەی مەبەستە لێرەدا تیشك دەخەینە سەر پرۆسەی پەروەردە و خوێندن لە شاری کەلاردا، کە تائێستاش ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە بە خێرایی گەشە دەکات، هەروەك چۆن کاریگەری لەسەر کۆی سێکتەرەکان هەیە بەهەمان شێوە کارتێکردنی لەسەر پرۆسەی پەروەردەش هەیە، کەبەهۆی زیادکردنی ژمارەی دانیشتوان و قەیرانەکانەوە سالآنێکە نەتوانراوە کێشەی کەمی بینای قوتابخانەکان چارەسەربکرێت، هێشتا دوودەوامی سێ دەوامی بوونی ماوە و لە زۆرێك لە خوێندگاکاندا ئەم دیاردەیە ئامادەیی هەیە، لە هەندێ بیناش چواردەوامی هەیە، تادێ ژمارەی گەرەکەکان زیاد دەکەن، ئەمەش پێویستی بە دروستکردنی بینای نوێ و مامۆستا و هۆیەکانی فێرکردن و تاقیگە هەیە، ئەمە جیا لە کوالێتی بینا کە لەگەڵ پرۆسەی خوێندنی سەردەمدا ناگونجێت.

## پێکهاتەی خوێندن

خوێندەوار بەو کەسە دەوترێ کە توانای خوێندنەوە و نووسین و تێکستێکی بە ئاسانی هەبێ و تەمەنی لەشەش ساڵان تێپەڕ ببێ، ڕێژەی خوێندەواری لە ساڵی (١٩٨٧)دا لە نێو باشووری کوردستاندا، نزیکەی (٥٦٪) بوو، لەساڵی (١٩٦٥) (٥١٪) و ١٩٧٧ – ٥٤٪ ئەم ڕێژەیە بۆ ئەوڕۆ زۆر کەمە هۆیەکانی کەمی خوێندەواری ئەمانەن:

١- کەمی ژمارە و ڕێژەی خوێندنگە، کە یەکێکە لە سەرەکیترین کێشە و ئاستەنگەکانی بواری پەروەردە، ئەوانەش کە هەن زۆر کۆن و کوالێتی سەردەم بوونی نییە لە بینای ناوەندەکانی خوێندندا.

٢- کەمی مامۆستا و لاوازی ئامڕازەکانی هاندانی قوتابیان.

٣- باری ئاڵۆزی سیاسی باشووری کوردستان.

٤- هەڵویستی کۆمەڵگا و خواست لەسەر خوێندن، یا لاوازی ئاستی هۆشیاری و خوێندەواری خێزان و تاك زاڵبوونی دابونەریتی کۆن و گرفتەکانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە.

٥- قەڵاچۆنەکردنی نەخوێندەواری لەنێو دەستەی تەمەن گەورەکاندا و جێبەجێنەکردنی یاسای فێرکردنی تەوزیمی.

٦- لاوازی پەیوەندی نێوان خێزان و قوتابخانە.

٧-داگیرکەران هەمیشە هەوڵیان داوە کۆمەڵگای کوردی نەخوێندەوار بێت، بۆ ئەمەش چەندین لەمپەرییان درووست کردووە لەبەردەم پرۆسەی پەروەردەدا.

٨- کاولکردن و ڕووخاندنی قوتابخانەکان بۆ نموونە قوتابخانە ڕووخاوەکان تا ساڵی (١٩٨٨) گەیشتە نزیکەی دوو هەزار خوێندنگە (سلێمانی ٩٢٥، هەولێر ٤٩٠، کەرکوك ١٦٠، شوێنەکانی دیکە ٤٢٥) کە هەندێك شارۆچکە و شارەدێ (ناحیە) و کۆی گوندەکانی باشووری کوردستانی گرتووەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەی نەخوێندەواری جیاوازی هەیە لە نێوان شارەکاندا و هەروەها لەنێوان شار و گوندا و هاوکات لەنێوان ڕەگەزی نێر و مێدا، ڕێژەی خوێندەواری لەنێو

دانیشتوانی شارەکاندا (٥٨٪) زیاترە، لە چاو دانیشتوانی گوندەکاندا کە (٢٥٪)ە هەروەها لەناو پیاوان (٥٤٪) بەگشتی زیاترە لە ژنان (٢٩٪)ە، ئەویش بەهۆی ئازادی پیاو و ڕێگەی نەگرتن لەچوونی کوڕان بۆ قوتابخانە و پێویستی نێرینە بەخوێندن زیاترە لە مێینە لە کۆمەڵگای کوردستاندا، پێکهاتەی نەتەوەیی -خوێندن دانیشتوان لەباشووری کوردستاندا پەروەردەی قوتابخانەکان بەکاریگەرترین پەروەردە منداڵان دادەنرێت لە جیهاندا، زۆربەی بیریارانی پەروەردە ڕایان وایە کە دامودەزگاکانی پەروەردە دەتوانێ ڕووی وڵات بگۆڕێ لیبنتز دەڵێ: (ئەگەر پەروەردەم پێبدەن دەتوانم ڕووی وڵاتەکەم بگۆڕم) دووڕای جیاواز سەری هەڵداوە لە جیهانی پەروەردەدا بەرامبەر بە پەروەردە و خوێندن:

١-ڕایەك پێیان وایە کە بەبێ پەروەردەی خێزانەکان زۆر ئەستەمە بتوانرێ پەروەردەی قوتابخانەکان بەرەو پێش بچێت و گەشە بکات.

٢- ڕای دووەم پێیان وایە کە پەروەردەی قوتابخانە سەرەتا و کۆتایی گۆڕانکاری پەروەردەییەکانە.

بۆیە ئەم ڕایە پشت دەبەستێ بەچەندین ئەزموون و بەڵگەی قوتابخانەیی ئەمانە پێیان وایە پەروەردە لە خێزانەکاندا جیاوازییەکی هێجگار زۆر هەیە بەڵام پەروەردە لە باخچەکاندا لەسەر یەك پرۆگرام دەڕوات واتە جیاوازی کەمتر بەدی دەکرێ لە پەروەردە کردنەکەدا، لێرەوە سەرجەم منداڵان لەبەردەم پرۆسەیەکی گشتگیردا دەبن جیاواز دەبن لەتاك تاکی خێزانەکان لەبەردەم ئەم پرۆسە گشتگیرییەدا دامودەزگاکانی پەروەردە دەتوانن بە پرۆگرامی نوێ و زیندوو گۆڕانکاری و چاکسازی نوێیەوە ڕووبەڕووی گەشەسەندنی پرۆسەی خوێندن ببنەوە، لێرەدا دەتوانن ئەو گۆڕانکارییانە ئەنجام بدەن کە کۆمەڵگای کوردی پێویستییەتی، هاوکات سوود ببینن لە پرۆسەی خوێندنی سەردەم بەتایبەت ئەوانەی لەگەڵ کۆمەڵگای کوردیدا دەگونجێ بە ڕەچاوکردنی بەشێك لە دابونەریت و جێگیرکردنەوەی کەلتوور و مێژووی کورد، بەتایبەت چەندین نموونەی بەهێز هەن لە جیهاندا کە توانیوویەتی

گەشە بە پرۆسەی پەروەردەکردنی تەندروست بدەن، بە لەچاوگرتنی دۆخی باشووری کوردستان و ڕەچاوکردنی ئەو دۆخەی کەتاك و خێزان تیایدا دەژی، ئەمە مانای ئەوە نییە چاومان لە پێشکەوتنی جیهان نەبێت و لە دۆخێکی چەقبەستوودا بمێنینەوە، دەکرێ بە قەد ئاستی هۆشیاری کۆمەڵگا هەنگاوبنێین و لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم خۆبگونجێنین، هەروەها بایەخ بە پرۆگرام و پێداویستی و کەرەستەی خوێندن و باشکردنی بژێوی و موچەی مامۆستا لەڕووی مادی و مەعنەوییەوە، خەڵاتکردنی ئەو مامۆستایانەی کە چالاك و سەرکەوتوون لە پیشەکەیاندا جیابکرێنەوە لەو مامۆستایانەی ئاستی زانستی و وانەوتنەوەیان نزمە ناکرێ هەمان ماف و موچەیان هەبێت، ئەمەش هاندەر دەبێت کە مامۆستایان هەوڵی بۆ چالاکبوون و بەرزکرنەوەی ئاستی زاستی خۆیان بدەن، بە دوای سەرچاوەدا بگەڕێن و خۆیان ئامادە بکەن لە کاتی وانە وتنەوەدا، هاوکات خوڵقاندنی ژینگەیەکی گونجاو بۆ مامۆستایان و خولی بەردەوام بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی مامۆستا دروستکردنی بینای هاوچەرخ لە باخچە و یاریگا و هۆڵی کتێبخانە و ژووری جۆراوجۆر بۆ پێداویستی و هۆیەکانی فێرکردن، چونکە بینا کۆڵەکەیەکی سەرەکی پێشکەوتنی خوێندنە، کە لە وڵاتی خۆماندا بینا یەکێکە لە ئاستەنگییە گەورەکانی پەروەردە لەم قۆناغەدا کە کێشەی کەمی بینا و شێوازەکەیەتی، بۆیە لە کۆتایدا دەگەینە ئەو ئامانجەی کە هەردوو چەمکی پەروەردەی خێزان و پەروەردەی قوتابخانە دوو چەمکی گرنگن، هەرچەندە لەڕووی هەندی ئەرکەوە جیاوازن، بەڵام پێکەوە گرێدراون و تەواوکەری یەکترین، بۆیە پەیوەندی و هاوکاری ئەم دوو پەروەردەیە دەتوانرێ ڕێگا و ڕاستەڕێییەکانی پەروەردەی تاك و تاکی مرۆڤەکان گەشە پێبدرێ و پێش بکەوێ، ئەمەش پێویستی بە دروستکردنی ڕایەڵەی پەیوەندی بەهێز و تۆکمەی هەیە لەنێوان قوتابخانە و خێزاندا، ئەویش پێویستە باوکان و دایکان بە بەردەوامی سەردانی قوتابخانە بکەن بۆ بەئاگابوون لە ئاستی منداڵەکانیان، هەروەها پێویستە لەلایەن بەڕێوەبەر و کارگێڕی قوتابخانەکانەوە ساڵانە بەلای کەمەوە (٢-٣) کۆبونەوەی فراوان

ئەنجام بدرێت، ئاگادارکردنەوەی بەخێوکەر لە ئاستی منداڵەکانیان لە ڕووی خوێندن و پەروەردەوە.

## پەروەردە و فێرکردن
## لەسنووری پەروەردەی کەلاردا

بۆ یەکەمین جار و(٩٠)ساڵ پێش ئێستا قوتابخانەیەکی سەرەتایی لە کەلار کرایەوە، پرۆسەی پەروەردە و خوێندن وەك سەرەتایەك لە (تشرینی یەکەمی ١٩٣١)دا دەستپێدەکات، ئەویش بە هەوڵ و هیمەتی (حەمەبەگی جاف) کە خولی پێشتر و ئەو خولەش (نوێنەری گەرمیان و کەرکوك) بوو لە پەرلەمانی عیراقدا، وەك هاندەرێك ئەختەری کچی دەکاتە خوێندکار، وەك ئەمەکناسییەك لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی گەرمیان و بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەلارەوە قوتابخانەیەکی بنەڕەتی ناودەنێن (حەمەبەگی جاف)، کردنەوەی قوتابخانە لەوسەردەمەدا جیا لەوەی هەنگاوێکی گرنگ بوو دانیشتوانی ناوچەکەش گەلێ دڵشادبوون و بە زەوقەوە منداڵەکانیان خستە بەرخوێندن، پاشان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کەلاری کۆن قوتابخانەیەك لە گڵ درووست دەکەن، یەکەم بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە مامۆستا(تۆفیق علی عبدالرحمن) بوو، لەو کاتەوە تا ئێستا چەندین بەڕێوەبەری بەخۆییەوە بینیووە، وەك وەفایەك لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی گەرمیان و بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەلارەوە قوتابخانەیەکیان ناونا (تۆفیق ئەفەندی)، ژمارەی خوێندکاران لەو ساڵەدا (٣٣) قوتابی بوون، کە لەڕووی پێکهاتەی ڕەگەزییەوە (٢٩ کوڕ و ٤ کچ) بوون، ئەو دەمە زمانی فەرمی خوێندن زمانی عەرەبی بوو، بەڵام مامۆستایان بەکوردی ڕوونکردنەوەیان دەدا بۆ ئاسانکاری و تێگەیشتنی خوێندکاران، لەو ڕۆژگارەدا ژمارەی قوتابخانەکان زۆر کەمبوون لە سەراپای لیوای کەرکوکدا نزیکەی (٢٩) قوتابخانە هەبوو، ئەویش زۆربەی هەرە زۆری قوتابخانەی سەرەتایی بوو، قۆناغی ناوەندی تەنیا لە سەنتەری لیوادا دەکرایەوە، هەربۆیە زوو وازیان

لە خوێندن دەهێنا و نەیان دەتوانی لەو دۆخە سەختەدا ئەو ڕێگە دوورە ببڕن و بەردەوامی بە خوێندن بدەن، بەتایبەت چینە هەژارەکە، هۆکارەکەشی بۆئەوە دەگەڕێتەوە دەسەڵاتداران نەیان دەویست منداڵانی کورد بخوێنێت و ببنە خاوەن بڕوانامە و ئاستی هوشیاریان بەرزببێتەوە، دواتریش لە ساڵی (١٩٥٦)دا قوتابخانەی سەرەتایی لە باوەنوور و گۆبان کرایەوە، لە دوای ساڵی (١٩٧٣) کەلاری نوێ (كلار الجديدە) لە گەڕەکی فەرمانبەران کرایەوە، لەدوای ڕاپەڕین زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، گەورەترین کێشەی پەروەردە هەبوو، لە لایەك نەبوونی مووچە و خراپی کەرەستە و تەنانەت میتۆدیشی، هەرچەندە ئەو کاتە وێڕای سەختی ژیان مامۆستایان لەژێر درووشمی (سەری بەرزمان بۆ موچە نەوەی ناکەین) درێژەیان بە خوێندندا و جوانترین هەڵوێستیان نواند، هەر بۆیە کەموکووڕی لە بیناکاندا هەبووە وە تائیستاش هەیە، زۆربەی بینای قوتابخانەکان (٢-٣) دەوامی تیادایە، بیناکان هەمان بینای کۆن و بۆ ئەو ژمارە کەمەی خوێندکاران پێش ڕاپەڕین درووست کرابوون، کە ژمارەی بینا تەنها (٢١) بینا بوون و (٤٤) قوتابخانە (٣،٢) دەوامی تیادا هەبوو، دواتر بڕیاری (٩٨٦) هەندێ لە بیناکانی نۆژەنکردەوە، هەندێ بینایتر درووستکران، پەیمانگای تەکنیکی کرایەوە، هەروەها پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایان لە ساڵی (١٩٩٥) کە ئەو پەیمانگایە کۆمەڵێك بەشی لە خۆدەگرت، بۆئەو دەمە زۆرگرنگ کە بووە هۆی پێگەیاندنی چەندین مامۆستا بە پسپۆڕی جیاجیاوە، کە لە زۆربەی ناوەندەکانی خوێندندا گرفتی کەمی مامۆستا ئامادەیی هەبوو، لە ئێستاشدا هەمان گرفت بەدی دەکرێت، تادێ ژمارەی دانیشتوان و گەڕەکەکان لە زیادکردندان لەگەڵ ئەمانەشدا ساڵانە ژمارەی خوێندکارانیش زیاد دەکات، هەروەها لەو ساڵانەی دوایدا بەهۆی قەیرانەوە زۆر بەکەمی بینا درووست دەکرێت، ئەوانەش کە هەن جیالەوەی لەگەڵ خوێندنی سەردەمدا ناگونجێت بەشێکی کۆنن لە ساڵانی هەشتاکان و نەوەدەکاندا درووستکراون ئەمانەش پێویستیان بە نۆژەنکردنەوە هەیە و هەندێ بیناش پێوستە سەرلەنوێ درووست بکرێتەوە، هەروەها بینای قوتابخانەکان بە ڕێکوپێکی بەسەر

گەڕەکەکاندا دابەشنەکراون، هاوکات بچووکی ڕووبەری پۆلەکان و کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆری قوتابی لە پۆلدا ئەمیش کێشەیە بەتایبەت بڵاوبوونەوەی پەتای کرۆنا کە ئەمەش مەترسییەکە زیاتر دەکات لە ڕووی تەندرووستی و تەنانەت دەروونییشەوە چ لای خوێندکار و مامۆستا و خێزانیش کە وەك دەبینرێ ڕۆژانە حاڵەتی تووشبوون تۆمار دەکرێت، کە ساڵی خوێندنی ( ٢٠١٩-٢٠٢٠ ) ماوەیەك دەرگای قوتابخانەکان داخران کە کاریگەری لەسەر ئاستی خوێندکاران هەبوو تەنانەت بە بڕیاری وەزارەت بازنەی یەك پۆلەکانی (٣،٢،١) کۆی خوێندکاران دەرچوون بەبێ ڕەچاوکردنی ئاستیان، لێرەدا ئاماری قوتابیان و مامۆستایان و فەرمانبەران بەپێی ناونیشان و ژمارەی قوتابخانەکان بۆ ساڵانی خوێندنی (٢٠١١-٢٠١٢-٢٠٢١-٢٠٢٢) دەخەینە ڕوو لەگەڵ بەراوردکاری و شیکاریدا:

## ١- باخچەی ساوایان:

لەم قۆناغەدا دووساڵی خوێندن بەڕێ دەکرێ بۆ تەمەنەکانی (٤-٥) ساڵی، کە دەرگا ئاوەڵایە بۆ هەردوو ڕەگەزی (نێر و مێ) بۆ چوونە بەرخوێندن و فێربوون و ئامادەکردنیان بۆ قۆناغی بنەڕەتی، ئەمیش لەبەر کەمی قوتابخانەکانی باخچەی ساوایان تێکڕای ڕێژەی منداڵان بۆچوونە بەر خوێندن زۆر کەمە، هەرچەندە خواستی خێزان و منداڵان بۆ ئەم قۆناغە زۆر بەرزە، بەپێی ساڵی خوێندنی (٢٠١١_٢٠١٢) باخچەی ساوایان ژمارەیان (٧) باخچەیە، کە خاوەن بینای سەربەخۆی خۆیانن و تێکەڵن لە تەنیا لە شارۆچکە و شارەدێدا هەن لە گوندەکاندا بوونیان نییە، کۆی ژمارەی منداڵان (٢٤٣٥) منداڵە و ژمارەی کوڕان (١١٩٣) منداڵە، کە کچان زیاترە و ژمارەیان (١٢٤٢)یە، مامۆستایانیش دەکاتە (١٤٢) کە حەوت بەڕێوەبەر و یەك یاریدەر و یەك ڕابەری پۆل و (١٣٣) مامۆستا کە هەموویان لە ڕەگەزی مێینەن، هەروەها کۆی ژمارەی فەرمانبەران و فەرمانبەرانی خزمەتگوزار بەپێی ناونیشان (٨١) فەرمانبەرە، کە زیاترینیان چاودێرە، هەرچەندە ژمارەی باخچەکان وەك پێویست نییە،

یـان زۆر کەمـە تەنانـەت کەموکـوورِی لـە جـۆری دابەشـکردندا هەیـە بەپێـی گەرەکـەکان، جیـا لـەوە چەندیـن گەرِەکیـش هەیـە باخچەیـان تیـادا نییـە، هەروەهـا بـۆ سـاڵی خوێندنـی (٢٠٢١-٢٠٢٢) پێکهاتـووە لـە (١٨) باخچـە بـە حکومـی و ناحکومییـەوە، کـۆی منداڵان دەکاتـە (٤٠٧١) منـداڵ و کچـان زیاتـرە و ژمارەیـان زیاتـرە و دەکاتـە (٢٠٥٥) ە هەروەهـا ژمـارەی کـورِان (٢٠١٦) منداڵـە، کـۆی مامۆسـتایانیش (٢١١) مامۆسـتایە، بەهەمـان شـێوە کـۆی مامۆسـتایان هەموویـان لـە رِەگـەزی مێینـەن، ژمـارەی بەرِێوەبەرەکانیـش دەکاتـە(١٨) بەرِێوەبـەرە و یـاردەدەری بەرِێوەبەریـش تەنیـا چـوار یـاردەدەرە، لەهەمـان کاتـدا کـۆی ژمـارەی فەرمانبـەران و فەرمانبەرانـی خزمەتگـوزار بەپێـی ناونیشـان (١٠١) فەرمانبـەرە، کـە زۆرینەیـان لـە رِەگـەزی مێیـە (٧٩) فەرمانبـەرە، بـەڵام گـەر بـەراورد بکەیـن لەنێـوان ئـەو دە سـاڵەدا جیاوازییەکـە (٢٤٣٥) منـداڵ زیـادی کـردووە لـە باخچەکانـدا، جیـاوازی مامۆسـتایانیش (٨١) مامۆسـتا زیـادی کـردووە.



## ٢-قوتابخانەی بنەرِەتی:

بەرنامـەی ئـەم قۆناغـە نـۆ سـاڵی خوێندنـە بـۆ تەمەنەکانـی (٦-١٥) سـاڵان، خواسـت لەسـەرخوێندن و بەردەوامبـوون رِێژەکەی بـەرزە، بەپێی سـاڵی خوێندنـی (٢٠١١_٢٠١٢) قوتابخانـەی بنەرِەتـی ژمارەیـان (١٩٠) قوتابخانەیـە، لـەو ژمـارە (١٨٠) قوتابخانـەی خـاوەن بینـای سـەربەخۆن و لـە (١٠) میوانـن و (٥٤) قوتابخانـەی لـە شـارە و (١٣٦)ی لـە گونـدە، کـە پێکهاتـووە لـە سێ قوتابخانـەی کـورِان و چـوار قوتابخانـەی کچـان و (١٨٣) قوتابخانـەی تێکـەڵاوە، کـۆی گشـتی مامۆسـتا و رِابـەری پەروەردەیـی و توێـژەری کۆمەڵایەتـی دەکاتـە ( ٣٧٣٣) و کـە (١٩٠٨) مامۆسـتای نێـر و (١٨٢٥) مامۆسـتای مێیـە، لـەو ژمارەیـە (١٨٧) بەرِێوەبـەرە کـە (٢١)یـان مێیە هەروەهـا ژمـارەی یاریدەدەرانیش دەکاتە (٢٤٧) یاریـدەدەر کـە (١٨)یـان لـە رِەگـەزی مێیـە، هـاوکات کـۆی گشـتی قوتابیانیـش (٤٣٢٥٧) قوتابییـە کـە (٢٢٨٣٠ کـورِان و ٢٠٤٢٧) ی کچانـە، هەروەهـا بـۆ سـاڵی خوێندنـی (٢٠٢١-٢٠٢٢) پێکهاتـووە

لـە (٢١٢) قوتابخانـە و کـە ( ١٧١) خاوەنداریەتـی باڵەخانەیـان هەیـە و خـاوەن بینـای خۆیانـن و لـە (٤١) بینـادا میوانـن، سـەرجەم ژمـارەی قوتابیـان (٤٧١٩٨) قوتابییـە، کـە (٢٤٦٢٦ کـورە و٢٢٥٧٢)ی کچـە، هەروەهـا کـۆی گشـتی مامۆسـتایان (٥٢٤١) مامۆسـتایە، لـەو ژمارەیـە (٤٢٨٠ مامۆسـتای هەمیشـەیی و ٨٣٦ وانەبێـژ و ١٢٥ گرێبەسـتی ناحکومییـە)

## ٣-خوێندنگەی ئامادەیی:-

ئـەم قۆناغـە سـێ سـاڵی خوێندنـە بـۆ تەمەنەکانـی (١٦-١٨) سـاڵان، بەپێـی سـاڵی خوێندنـی (٢٠١١_٢٠١٢) خوێندنگـەی ئامادەیـی (٢٤) خوێندنگایـە، کـە (٢٠) خـاوەن خوێندنـگای بینـای سـەربەخۆن و لـە(٤) میوانـن، تێکـڕا لـە شـارۆچکە و شـارەدێدایە، هەروەهـا سـێ ئامادەیـی کـوڕان و چـوار ئامادەیـی کچانـە و (١٧) خوێندنگـەی تێکـەڵاوە، کـۆی گشـتی مامۆسـتایان دەکاتـە (٦٧٣) مامۆسـتایە لـەو ژمارەیـە (٤١٧ نێـر و ٢٥٦ی مێیـە)، هەروەهـا کـۆی ژمـارەی خوێندکارانـی ئامادەیـی دەکاتـە (١١٠٠٠) خوێنـدکارە، گـەر سـەرنجی سـاڵی خوێندنـی (٢٠٢١-٢٠٢٢) بدەیـن بـۆ هەمـان قۆنـاغ (٣٠) خوێندنگـەی لـە خۆگرتـووە، کـە (٢١) خـاوەن خوێندنـگای بینـای سـەربەخۆن و لـە (٩) میوانـن، کـۆی گشـتی مامۆسـتایان دەکاتـە (١٠١١٦) مامۆسـتا، لـەو ژمارەیـە (٤٦) مامۆسـتای وانەبێژە، هەروەهـا کـۆی ژمـارەی خوێندکارانیـش دەکاتـە (١٢٢٦١) خوێنـدکارە لـەو ژمارەیـە (٥٤٢٩) نێـر و مـێ زیاتـرە کـە دەکاتـە (٦٨٣٢) هەرچەنـدە ژمـارەی خوێنـدکاران لـە نێـوان ئـەو دە سـاڵەدا جیاوازییەکـە دەکاتـە (١٢٦١) خوێنـدکار دەبـوو زیاتـر بوایـە، ئەمـەش بۆئـەوە دەگەڕێتـەوە:

١-تـرس و بـاوەڕ بەخۆنەبوونـی هەندێـك لـە خوێنـدکاران لـەم قۆناغـەدا، کـە ئەسـتەمە سـەرکەوتن بەدەسـت بێنـن، بۆیـە ناچـار وازدێنـن و ڕوو دەکەنـە ناوەندەکانیـتری خوێنـدن.

٢-بـێ هیوایـی خوێنـدکاران بەرامبـەر حکومـەت، پێیـان وایـە دوای بەدەسـت هێنانـی بڕوانامـەش چانسـی دامەزراندنیـان نییـە یـا زۆر

کەمە.

٣-کۆچکردن بۆ هاندەران یان شارەکانیتر، هەندێ جاریش گەڕانەوە بۆ لادێکان.

٤-وازهێنان بەهۆی ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە ڕێژەکەش زیاتر ڕەگەزی کچان دەگرێتەوە.

٥-کاریگەری باری ئابووری و ئاڵۆزی بژێوی ژیان، کە ناچار پەنادەبەنە بەرکارکردن.

٦-کردنەوەی ژمارەیەك پەیمانگای حکومی و ئەهلی لەناو شاردا، ئەوانەی ئاستیان لاوازە لەدوای تەواوکردنی (٩)ی بنەڕەتی ڕوودەکەنە ئەو پەیمانگانە.

قوتابخانەی نێودەوڵەتی سابیس :-

خوێندن بە زمانی ئینگلیزییە، جۆری قوتابخانە کۆمەڵگەیە، خاوەنداریەتی باڵەخانەیان هەیە و خاوەن بینای خۆیانن، کە پێکهاتووە لە (١٣) پۆل لە قۆناغی یەکەمی باخچەی ساوایان و دووەمی باخچە و پۆلی یەکەمی بنەڕەتییەوە تاوەکو یازدەهەمی زانستییەوە لە خۆدەگرێت، کۆی گشتی ژمارەی خوێندکارانی دەکاتە (٨٩٨) قوتابی جگە لە بەڕێوەبەر، مامۆستایان ژمارەیان (٢٤) مامۆستایە کە (١٦) مامۆستای نێر و (٨) مامۆستای مێیە، لەگەل تەنیا یەك فەرمانبەری هەیە ئەویش لە ڕەگەزی مێیە.

### ٤-ئامادەیی پیشەیی کەلار :-

ئەم ئامادەییە لە ساڵی (١٩٨٨) دامەزراوە تاوەکو ئێستا بەردەوامە لە پێگەیاندنی پیشەوەران، لە هەمان ساڵدا ژمارەی مامۆستایانی تەنیا (١٣) مامۆستا و خوێندکارانیش (٨٩) خوێندکار بووە، ئامادەیی پیشەیی پێکهاتووە لە دووبەش (بازرگانی و پیشەسازی)کە بەشی پیشەسازی تەنها بەشی کارەبایە، لە کاتێکدا لەبەرنەبوونی شوێن بەشیتر ناکەنەوە کە ئارەزووی کردنەوەیان هەیە لە لایەن خوێندکارانەوە داواکاری بۆ بەشەکانیتر هەیە و بۆ وانە وتنەوە

مامۆستای پسپۆڕیان هەیە، کۆی خوێندکاران دەکاتە (٢٣٨) بەشی بازرگانی (٨٠) خوێندکاریان هەیە، کە ژمارەی نێر تەنها (١٥) خوێندکارە و ئەوانیتر کە دەکاتە (٦٥) خوێندکار مێینەن، بەشی پیشەسازی (کارەبا) زیاترە کە ژمارەی خوێندکارانی دەکاتە (١٥٨) خوێندکار، ژمارەی فەرمانبەران تەنها (٩) فەرمانبەرە، بەپێی ساڵی خوێندنی (٢٠٢١-٢٠٢٢، ئامادەیی پیشەیی پێکهاتووە لە دووبەش (بازرگانی و پیشەسازی) کە بەشی پیشەسازی تەنیا بەشی کارەبایە، لە کاتێکدا لەبەرنەبوونی شوێن بەشیتر ناکەنەوە کە ئارەزووی کردنەوەیان هەیە لە لایەن خوێندکارانەوە داواکاری بۆ بەشەکانیتر هەیە و بۆ وانە وتنەوە مامۆستای پسپۆڕیان هەیە، بەپێی ساڵی خوێندنی( ٢٠٢١-٢٠٢٢) کۆی خوێندکاران دەکاتە (٢٠٣) خوێندکار کە (٦٩) کە بەشی پیشەسازی زیاترە دەکاتە (١٣٤) خوێندکار، بەشی بازرگانی (٦٩) خوێندکاریان هەیە، کە ژمارەی نێر (٣٣) خوێندکارە و ژمارەی مێ زیاترە کە دەکاتە (٣٦) خوێندکار، بەشی پیشەسازی (کارەبا) زیاترە لە بەشی بازرگانی کە ژمارەی خوێندکارانی دەکاتە (١٣٤) خوێندکار کە ژمارەی نێر (١٠٧) خوێندکارە و زیاترە لە مێ کە ژمارەی دەکاتە (٢٧) خوێندکار.

### ٥-قۆناغی دواناوەندی:-

تێکەڵاوە پێکهاتووە لە هەردوو ڕەگەزی کچان و کوران، پۆلەکانی (حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم و دەیەم و یازدەیەم و دوازدەیەم) و هەردوو بەشی وێژەیی و زانستی لەخۆدەگرێت، بۆ ساڵی خوێندنی( ٢٠١١-٢١٢) پێکهاتووە لە خاوەن (٥) بینای سەربەخۆ و لە ( ٢) بینا میوانن، واتە(٧) خوێندنگەی لە خۆگرتووە، ژمارەی گشتی خوێندکاران دەکاتە (١٦٢٦) خوێندکار، ژمارەی کوران (٩١٢) خوێندکارە زیاترە لە کچان، لە کاتێکدا ژمارەی کچان (٧١٤) خوێندکارە، کۆی ژمارەی مامۆستایانیش دەکاتە (١٢٠) مامۆستا،کە بەپێی ڕەگەز (٨٢ نێر و (٣٨) مامۆستای مێیە، ژمارەی فەرمانبەران و فەرمانبەری خزمەتگوزار تەنها (٦) فەرمانبەر بووە، لەو ژمارەش

تەنیا یەك فەرمانبەری مێیە بە ناونیشانی جیاواز، گەر سەیری ساڵی خوێندنی( ٢٠٢١-٢٠٢٢) ژمارەكان گۆڕانكاری بەسەردا دێت بەم شێوەیە پێكهاتووە لە (٦) قوتابخانەیە، یەك قوتابخانە كەمی كردووە، كە خاوەندارێتی (٣) باڵەخانەی خۆیانن و لە (٣) بینا میوانن، ژمارەی گشتی خوێندكاران دەكاتە (٥٣١) خوێندكار، ژمارەی كوڕان (٢٦٩) خوێندكارە زیاترە لە كچان كە (٢٦٢) خوێندكارە، گەر بەراورد بكەین لە نێوان ئەو دەساڵەدا جیاوازكە زۆرە (١١٠٣) خوێندكارە، كۆی ژمارەی مامۆستایانیش دەكاتە (٨٧) مامۆستا كە (٦٦) یان هەمیشەییە و (٢١) وانەبێژە، لەگەڵ ئەمەشدا دواناوەندی ئیسلامی كەلار كە بەهەمان شێوە لە پۆلی (حەوتەمەوە تا دوازدەیەم )یان هەیە، كۆی ژمارەی خوێندكارانی (٩٠) قوتابییە، كەژمارەی كچان زیاترە (٥١) خوێندكارە و كوڕانیش دەكاتە(٣٩) خوێندكار.

## ٦- فێركردنی خێرا:-

وەزارەتی پەروەردە بەمەبەستی جێبەجێكردنی فەلسەفە و ستراتیژییەتی پرۆسەی (فێربوون بۆ هەموان) بە هەماهەنگی و هاوكاری ڕێكخراوی یونیسێف لە ساڵی (٢٠٠٤)دا پرۆژەی خوێندنی (فێركردنی خێرا)ی دەستپێكرد، دوای ئەوەی وەك ئەزمونێك سەرەتا لە هەردوو پارێزگای (هەولێر و سلێمانی) دەستپێكرد سەركەوتنی بەدەست هێنا، ئەمەش بە مەبەستی گەڕانەوەی ئەوانەی كە وازیان لە خوێندن هێناوە و بەهەر هۆكارێك بێت دابڕاون و مافی خوێندنیان لە خوێندنگە فەرمییەكاندا نەماوە و تەمەنیان لە یاساكانی ڕەسمی وەزارەت بەدەرە، ئەم پرۆسەیە بۆ ئەو فێرخوازانەی نێوان تەمەنی (١٢-٢٢) ساڵی بۆ كوڕان و(١٢-٢٤) بۆ كچان جێبەجێكرا، كە دەتوانن لە قوتابخانەكانی (فێركردنی خێرا) بخوێنن و درێژە بە فێربوونیان بدەن، لە بری (نۆ) ساڵی خوێندنی قۆناغی بنەڕەتی بە (٥) ساڵ خوێندن تەواو دەكەن، لە(١-٨) چوار ئاست و ساڵێك بە دوو ساڵ، تەنیا ئاستی پێنجەم بە یەك ساڵ، واتە (٩)ی بنەڕەتی بەیەك ساڵ، كە پرۆگرام و بەرنامەی خوێندنی تایبەتیان بۆ ئامادەكرا

و وێـڕای کردنـەوەی چەندیـن خولـی مەشـق و ڕاهێنـان و ڕابـەران و بـۆ بەڕێوەبـەر و مامۆسـتایان و سەرپەرشـتیارانی پەروەردەیـی فێرکردنـی خێـرا و بۆپاڵپشـت و سەرخسـتنی ئـەم پرۆسـەیە، هەربۆیـە ئامانجـی خۆی پێکا و تەنیا لەنێوان( ٢٠٠٠-٢٠١٠) زیاتـر لـە (٣٢٢٠٠٠)کـەس سـوودمەندبوون لـە پرۆسـەی نەهێشـتنی نەخوێنـدەواری لـە هەرێمـی کوردسـتاندا، کـە دواجـار ڕێـژەی خوێنـدەواری بەرزبـووەوە گەیشـتە (٨٢٪) و ڕێـژەی نەخوێنـدەواری نـزم بـووەوە بـۆ( ١٨٪).

ئـەم خوێندکارانـە تەمەنیـان گـەورەیـە و زیاتـر ئەوانـە دەگرێتـەوە کـە لـە تەمەنـی منالّیـدا هەلـی خوێندنیـان بـۆ نەڕەخسـاوە یـان وازیـان هێنـاوە یـا نەچوونەتـە بـەر خوێنـدن بـۆ ئـەوەی لـە ئێسـتادا درێـژە بـە خوێنـدن بـدەن ئەمـەش زیاتـر چیـن و توێـژی فەرمانبـەران ئـەم خواسـتەیان هەیـە، بـە تایبـەت پێشـکەوتنی تەکنەلۆژیـاش کەشـێکی وای ڕەخسـاندووە، زەروورەت و خواسـت لەسـەر خوێنـدن جەسـتەی تـەواوی تاکەکانـی داگیرکـردووە، ئەوانـەی توانـای خوێنـدن و نووسـینی نییـە، لـە کۆمەڵـگادا هەسـت بـە نامۆیـی دەکـەن، بۆیـە تـادێ ئـەم خواسـتە زۆرتـر دەبـێ و ڕێـژەی نەخوێندەوارانیـش کەمتـر دەبێتـەوە یـان هـەر نامێنێـت، فێرکردنـی نائاسـایی بەرنامـەی کاروبـاری پرۆسـەکانی (نەهێشـتنی نەخوێنـدەواری، فێرکردنـی گـەورە، فێرکردنـی خێرا،خوێندنـی تەوزیمـی) لەخۆدەگرێـت، بۆیـە وەزارەتـی پـەروەردە لـەم ڕوانگەیـەوە پرۆسـەکانی پێکـەوە گرێـداوە و بەرنامەڕێـژی لـەم پێنـاوەدا، کردووەتـە ئامانجـی بنەڕەتـی و بـە پێـی توانـا کار بـۆ جێبەجێکردنـی ئـەو ئامانجـەی دەکات، ئـەم هەڵمـەت و هەنگاوانـەی وەزارەتـی پـەروەردە، پێویسـتی بـە هـاوکاری هەمـوو لایەکـە، کـە بتوانیـن ئـەم دیاردانـەی نەخوێنـدەواری و نەزانیـن و دابـڕان لەخوێنـدن و دوورکەوتنـەوە و ساردبوونـەوە، لـە خوێنـدن بەرەوکەمبوونـەوە و نەمـان ببرێـت، لـە سـنووری پـەروەردەی کـەلار نەهێشـتنی نەخوێنـدەواری (١٦) قوتابخانەیـە، کـە (٩) قوتابخانەیـان تایبەتـە بـە ڕەگـەزی نێـر و (٧) قوتابخانـەی تریـش تایبەتـە بـە ڕەگـەزی مـێ، کـە (٣٤٩) فێرخـواز ئاڵـودەی خوێنـدن و درێـژەی پـێ دەدەن، کـە (١٧٦) یـان لـە ڕەگـەزی مێیـە و ڕەگـەزی نێریـش ژمارەیـان (١٧٣) خوێنـدکارە، کـۆی گشـتی

ژمارەی مامۆستایانیش (٦٤) مامۆستایە، (٣٤) یان لە ڕەگەزی نێرە و (٣٠) مامۆستاش لەڕەگەزی مێیە،کە کۆی گشتی فەرمانبەران دەکاتە (٧) فەرمانبەر کە پێکهاتووە لە (٤) نێر و (٣)مێ، گەر شیکاری بکەین، تادێ خواستی خوێندن زیاتر دەبێت، بەپێچەوانەی ساڵانەوە کە لەبەر چەندین هۆکار ڕێژەی وازهێنان لە خوێندن زۆر بوون، ئێستا زۆرن ئەوانەی وێڕای تێپەڕبوونی تەمەنیان درێژە بە خوێندن دەدەن، لە قۆناغەکانی بنەڕەتییەوە تاوەکو زانکۆ و گەر مەرجی تەمەن ڕێگا بدات بۆ ماستەر و دکتۆراش هەمان خواستی خوێندن هەیە، بۆ ساڵی خوێندنی ( ٢٠٢١ - ٢٠٢٢) ژمارەی بنکە و قوتابخانەکان (١١) دانەیە کە هیچیان خاوەن بینای خۆیان نین و هەموویان میوانن، کە (٣) دانەیان تایبەتە بە کچان و ژنان و (٨) یان بە پیاوان کە لە ناو کەلار و گردەگۆزینە و ناحیەکانی (ڕزگاری و باوەنوور) دان هەروەها ژمارەی بنکەکانی پیاوان و ژنان پێکهاتووە لە (٧) بنکە کە سێ ئاست لە خۆدەگرێت (ئاستی یەکەم دووەم و سێیەم) بنکەکان پێکهاتووە لە(٢) بنکەی ژنان و(٥) بنکەی پیاوان، قوتابخانەکانی خوێندنی خێرا تەنیا(٤) دانەیە کە پێنج ئاست لە خۆدەگرێت (لە ئاستی یەکەمەوە تا ئاستی پێنجەم)، کۆی فێرخوازان (٤٢٨) فێرخوازە، کە ژمارەی نێر زیاترە دەکاتە (٣١٠) فێرخواز بەڵام ژمارەی مێ (١١٨) فێرخوازە، گەر سەرنج بدەین تادێ ژمارەیان کەم دەبنەوە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ژمارەی خوێندەواران بەرزدەبێتەوە و کەواتە ژمارەی نەخوێندەوار کەم دەبێتەوە، ئەم پرۆسەیەی نەهێشتنی نەخوێندەواری و فێرکردنی گەورە ساڵانێکە درێژەی هەیە.

سەرئەنجام وەك لە خشتەی خوارەوەدا هاتووە، قوتابخانەکانی (باخچەی ساوایان، بنەڕەتی، ئامادەیی، دواناوەندی، ئامادەیی پیشەیی، فێرکردنی خێرا) بە پێی ساڵی خوێندنی( ٢٠١١-٢١٢) سەرجەمیان دەکاتە (٢٤٥) قوتابخانە و خوێندنگە، مامۆستایانیش سەرجەمیان ( ٤٧٥٧) مامۆستایە، ژمارەی خوێندکارانیش کە گەورەترین ژمارەی تۆمارکردووە، دەکاتە (٥٨٩٠٥) خوێندکار، فەرمانبەرانیش ژمارەیان (٧١١) فەرمانبەرە، واتە کۆی خوێندکاران وقوتابیان و مامۆستایان

فەرمانبــەران ناگرێتــەوە، تەنیــا ئەوانــەن کــە لــە خشــتەی خــوارەوەدا هاتــوون:

خشتەی ژمارەی ( ١ )

ژمارەی قوتابخانە و خوێندکاران ومامۆستایان و فەرمانبەران

٢٠١١-٢٠١٢

| ناوی فەرمانگە | ژ٠ قوتابخانە | ژ٠مامۆستا | ژ٠خوێندکاران | ژ٠ فەرمانبەران |
|---|---|---|---|---|
| باخچەی ساوایان | 7 | 142 | 2435 | 81 |
| بنەڕەتی | 190 | 3733 | 43257 | 492 |
| ئامادەیی | 24 | 673 | 11000 | 109 |
| دواناوەندی | 7 | 120 | 1626 | 16 |
| ئامادەیی پیشەیی | 1 | 25 | 238 | 6 |
| خوێندنی خێرا | 16 | 64 | 349 | 7 |
| کۆی گشتی | 245 | 4757 | 58905 | 711 |

سەرچاوە: بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەلار،داتای بڵاونەکراوە، ٢٠٢٢



بەپێــی ئــەو خشــتەیەی لــە خــوارەوەدا هاتــووە، بــۆ ســاڵی خوێندنــی (٢٠٢١-٢٠٢٢) ئــەم قوتابخانــە و خوێندنگایانــە (باخچــەی ســاوایان، بنەڕەتــی، ئامادەیــی، دواناوەنــدی، ئامادەیــی پیشــەیی، فێرکردنــی خێــرا) (٢٧٨) قوتابخانــە و خوێندنگــە، مامۆســتایانیش ســەرجەمیان

(٦٨٢٧) مامۆستایە، ژمارەی خوێندکارانیش کە گەورەترین ژمارەی تۆمارکردووە، دەکاتە (٦٤٦٩٢) خوێندکار، واتە کۆی خوێندکاران و قوتابیان و مامۆستایان فەرمانبەران ناگرێتەوە، تەنیا ئەوانەن کە لە خشتەکەدا هاتوون، کۆی قوتابیان وخوێندکاران دەکاتە (٦٥٦٧٦) خوێندکار و قوتابی، کۆی فەرمانبەرانیش (٦٦٤٠ ) لە کۆی ئەو ژمارەیە (١٦)ی فەرمانبەری گرییەست بووە بە پێی ساڵی خوێندنی( ٢٠١١-٢٠١٢) سەرجەمیان دەکاتە (٧١١)کەواتە جیاوازی(٧١) فەرمانبەرە سەیری خشتەی خوارەوە بکە:

خشتەی ژمارەی (٢)

ژمارەی قوتابخانە و خوێندکاران ومامۆستایان بۆ ساڵی خوێندنی (٢٠٢١-٢٠٢٢)

| ناوی فەرمانگە | ژ٠قوتابخانە | ژ٠مامۆستا | ژ٠خوێندکاران |
|---|---|---|---|
| باخچەی ساوایان | 18 | 272 | 4071 |
| بنەڕەتی | 212 | 5241 | 47198 |
| ئامادەیی | 30 | 1116 | 12261 |
| دواناوەندی | 6 | 87 | 531 |
| ئامادەیی پیشەیی | 1 | 29 | 203 |
| خوێندنی خێرا | 11 | 82 | 428 |
| کۆی گشتی | 278 | 6827 | 64692 |

گەر بەراورد بکەین لەنێوان ساڵانی خوێندنی ٢٠١١-٢٠١٢ و ٢٠٢١-٢٠٢٢ کە (دە) ساڵە دەردەکەوێت بۆساڵی خوێندنی (٢٠٢١-٢٠٢٢) باخچەی ساوایان (١١) باخچە زیادی کردووە کە (٦) باخچەیان ئەهلییە، هەروەها قوتابخانەی بنەڕەتی (٢٢) قوتابخانە زیادی کردووە و بەهەمان شێوە ئامادەیی (٦) خوێندنگە زیادی کردووە، ئەوەی کەیی کردووە بەپێی ئەو بەراوردکارییە فێرکردنی خێرا (٥) دانە کەمی کردووە ئەمیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەپێی ئەو ماوەیە ڕێژەی خوێندەواری بەرز دەبێتەوە و فێرخوازان ئاستەکان دەبڕن و دەچنە پەیمانگا و ناوەندەکانیتری خوێندن، هەروەها قوتابخانەی دواناوەندی یەك دانە کەمی کردووە بە بەراورد بە ساڵی خوێندنی (٢٠١١-٢٠١٢)، تەنیا ئامادەیی پیشەیی وەکو خۆیەتی، هەروەها ژمارەی قوتابی و خوێندکاران (٥٧٨٧) زیادیکردووە، بە هەمان شێوە مامۆستایانیش (٢٠٧٠) مامۆستا زیادیکردووە کە زۆربەی هەرە زۆریان مامۆستای وانەبێژن وەك لە خشتەی خوارەوەدا هاتووە:

خشتەی ژمارەی (٣)

بەراوردی نێوان ساڵانی خوێندنی ٢٠١١-٢٠١٢ و ٢٠٢١-٢٠٢٢

| ساڵی خوێندن | باخچە | بنەڕەتی | داوناوەندی | ئامادەیی | فێرکردنی خێرا | پیشەیی | کۆی قوتابخانە | قوتابی و خوێندکار | مامۆستا |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 2011-2012 | 7 | 190 | 7 | 24 | 16 | 1 | | 58905 | 4757 |
| 2021-2022 | 18 | 212 | 6 | 30 | 11 | 1 | | 64692 | 6827 |
| بەراورد | 11 | 22 | 1 | 6 | 5 | 1 | 33 | 5787 | 2070 |

سەرچاوە : کاری توێژەر

## سەرچاوەکان:

١- د. عەبدوڵڵا غەفور، پێکهاتەی نەتەوەیی دانیشتوان لە باشوری کوردستان، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر٢٠٠٧

٢-عومەر محەمەد ئەمین، سیستەمی نەێی خوێندن و گۆڕانکاری، چ ١، ٢٠٠٩سلێمانی

٣-گۆڤاری پەروەردە و فێرکردن، ژمارە (٢)، ساڵی ٢٠٠٨، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

٤- گۆڤاری پەروەردە و فێرکردن، ژمارە (٥)، ساڵی (٢٠١٠)،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

٥- عەدالەت لەتیف بەڕێوەبەری پەروەردەی کەلار چاوپێکەوتن

٦-بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی گەرمیان، داتای بڵاونەکراوە ٢٠٢٢

٧- بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی کەلار،داتای بڵاونەکراوە، ٢٠٢٢



# کەلار لە سێبەری شاردا


سامان بەهمەن

ماستەر لە پەروەردە و دەروونزانی


گەر بگەڕێین و بپشکنین، دەکرێت بڵێین هیچ شارێك نییە لەم سەری گەردوون بۆ ئەو سەری گەردوون هەموو ئەو ڕەگەز وپێدراو بنەماو شەنگستانەی تێدا بێت، کە شارێکی نموونەیی بێکەمو کورمان پێبدات. تەنها ئەو شارە ئایدیا و نموونەیانە نەبێت، یان شارێکی یۆتۆپی لە چەشنی کۆمارەکەی ئەفلاتۆن تەنها لە خەیاڵدان و سەر پەڕەی پەرتووکەکان بوونیان هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بوترێت شارێك نییە لانی کەم چوویێتە ژێر پێناس و شوناسی شارو بە پێی تیۆرەکانی شارناسی، هەندێك لە پێکهاتوو ڕەگەزانەی تێدا نەبێت بۆ بوونی هەر شارێك مەرجن.

گەر سەیرێکی شاری کەلار بکەیت، وەکو دەرکەوتە و سیماکانی شار مێژوویی شارنشینی دەکرێت بوترێت لەچاو زۆر لەشارەکانی کوردستان و دەروبەرمان مێژوویەکی زۆرتازە و ساوایی هەیە، لەچاو شارەکانی تر دەرفەتی کەمترو هەلی کەمتری بۆ ڕەخساوە، تاوەکو لە شێوەی شار شێوەبگرێت و لانی کەم بەشێك لە پێکهاتەکانی شاری تێدا بەرجەستە بێت، بەڵام ئەم بیانووە بۆ زەمەنێك و قوتاغێك دەست ئەدات، دەکرێت لێیگەڕێن، ئەگینا زۆر لە شارەکانی وڵاتانی دونیا مێژووەکەیان زۆر لەشاری کەلار

کەمترو تازەترە، بەڵام دەکرێت کەلار لە هیچ ڕوویەکەوە بەراورد ناکرێت بەو شارانە.لانی کەم لەدوای راپەڕینەوە، نزیکەیی سی و یەك ساڵە، دەرفەتی زێڕین و باش بەردەست بووە بۆ ئەوەی ئەم شارە ببێتە شارێك و بچێتە پاڵ شارەکانی تر.هەڵکەوتەیی جوگرافی و ئەو خێروبێرەی لەسنوری ئەم شارەدا هەیە، دەکرێت بوترێت دەبوو ئێستا ئەم شارە ناوەندێکی گەورەیی ژیانکردن و خۆشگوزرانی بووایە بۆ هەموو شارنیشن و هاوشاریانی. گەر لەو پێکهات و ڕەگەزانەی لەخوارەوە بۆ شار و بوونی شارخراونەتەڕوو،شاری کەلار بەراورد بکەین و داوەری بکەین، لە زۆر ڕووەوە هێندە هەژارو داماوین، دەبێت بگرین و غەمبخۆین و هاواربکەین.ئێمە لە کوێ شارو شارنشینین.

ئەوەی گرنگە لەوەی کێ بەڕێوەبەرو حاکمی شارە، کێ ئەقڵ و چاوی بەڕێوبەردنی ئەم شارەیە؟ تا ئەم نزیکانەش گەر تەماشا بکەیت، خەڵکی ترو کارەبەدەستی حیزبی و حکومیان دەهێنا حوکمی ئەم شارە بکات، وەکو ئەوەی ئەم شارە خۆی کەسی ژیرو خاوەن ئەقڵ و ئاوەزی نەبێت خۆی بەڕێوبەرێت و نەتوانێت کاروباری شار ڕێکبخات. ئەمە ئەوپەڕی بێڕێزی و بە کەم زانینی هەموو ئەو هاوشارییانەیە لەم دەڤەرە دەژین. دەپرسین کوا فەزایی گشتی لەم شارە؟ کوا هاوزمانی و هاوغەمی و هاودەردی هاوشارییان. فەزایی گشتی خەڵکی خەمخۆرو دڵسۆز و خاوەن ئەندێشەو خەیاڵی گەورە دروستی دەکات، لە پشت هەر شارێکی جوان و پێشکەوت و ڕەونەقدارو دڵنشینەوە، خاوەن ئاوەزی گەورەوە ئەندێشەی باڵا هەیە، لەم شارە شتێك نییە ناوی فەزایی گشتی بێت.

نەبوونی بڵاوکراوەو دەرچوو بۆ شارێك ناوی خۆی ناوە ئیدارەی گەرمیان، لانی کەم سەدەها هەزار کەس لەم شارە دەژین، ئەی شارێك ئەو هەموو مەخلوقەیی هەبێت، دەنگ و ڕەنگ و سەدایان چۆن بگاتە دەستەڵات و حکومەت، ئەی چیدەبێتە پردی پەیوەندی نێوان هاوشارییانی کەلارو حکومەتی ناوچەیی

شارەکە؟ ئەی شارێکی گەورە، ڕۆژانە سەرگوزەشتەی نییە،؟ حیکایەت و ڕووداو مێژووی نییە؟ ئەی کوا بڵاوکراوە لەم شارە گەورەدا؟ شار بیناو مۆڵ و باڵەخانە نایکەنە شارێکی زیندوو و شارێك بیەوێت گەورە بێت و بچێتە ناو مێژووی شارەوە. لەم شارە جگە لە خراپی بیناو نەبوونی چاوێکی هونەری بۆ دیزاین و ڕەونەقی شار و ماتریاڵی شارنشینی. دیوە ڕۆحی و مەعنەوییەکی تری شار مەزن لەم شارەدا ئامادەگی نییە، کوا پەیکەری هونەری لەم شارەدا؟ کوا ڕەنگ و هونەری وێنەیی سەر دیوارەکانی ئەم شارە؟ کوا کۆڕو ڤیستیڤاڵی هونەری ئەدەبی لەم شارە؟

هەموو شارێك لانی کەم دەستەبژێرێك لە ڕۆشنبیری هەیە، خەمی دەخوات، لایەنە مەعنەوی و ڕۆحیەکەی شار ڕادەگرێت و ناهێڵێت بکەوێت. کوا ناسنامەو شوناسی ڕۆشنبیری ئەم شارە؟ کێن ئەوانەی نوێنەری ئەم کایەیە گرنگەی شارن؟ ئەم شارە پڕە لە کەسی خوێندەوارو و خاوەن ئەندێشەو خەیاڵی جوان، بەڵام ناتوانن لەناو ئەو بێسەرو بەری و پەرشووبڵاوییەدا قسە بکەن و بێنەگۆ، ئەمانە بوون بەژێر ئەو فۆرمە لە ڕۆشنبیری موزەیەف و ساختەیی شارەوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بە کایەیی ڕۆشنبیر و فکر و مەعنەوییەوە نییە، بەزۆر و بێ هیچ شتێك خۆیان وەکو دەمسپی و دەمڕاستی ئەم کایە لەم شارە ناساندوە، کوا وتارو کۆڕو کۆبوونەوەی ئەمانە، کوا دیبەیت و گفتوگۆی جیدی ئەمانە؟ کوا جوڵەی ڕۆشنبیری ئەدەبی ئەمانە؟ ناکرێت تۆ لەهەموو شتێك خۆت هەڵبقورتێنیت، کایەی ڕۆشنبیر هی کەسانێکن، ئەخوێننەوە، ئەهلی فکرو تێهزرینن، بەدیار نوسین و کتێبەوە شەونخونی دەکەن، بیردەکەنەوە، ڕێز لەکات و دونیایی خۆیان دەگرن، ناکرێت تۆیەك سالێك پەرەی پەرتووکێك هەڵنادەیتەوە، بە ڕێکەوتیش ڕووناکەیتە پەرتووخانەیەك، نوسین و مەعریفە بەشێکی گرنگ نین لە ژیانت، بێیت و لەم شارەدا خۆت بە ڕۆشنبیر و فەیلەسوف و زانا بزانیت.دەکرێت ئەمە غەمێکی گەورەی خەڵکە ڕۆشنبیرو جدییەکەی ئەم شارە بێت، کۆتایی بەم ڕۆشنبیرییە ساختە و بیدەم و بێزمانە بهێنن.

ئەمانەن شار دروست ئەکەن، ئەمانە ناهێڵن شار بێ حیکایەت و بێ رووداو بێ مێژوو بێت.مۆزەخانەو، شانۆ، سینەما، پەرتووخانە، فەزایی گشتی، کەسانی غەمخۆرو خاوەن بەهرەو ژیر، شار دروست دەکەن. نەك بوونی باڵەخانەو بارەگایی حیزبی زۆرو، بەنزیخانەی زۆر.

شاری کەلار دەبوو ئێستا زۆر شتی هەبووایە، کەمترین قسە لەسەر کەموکوڕی ودرزەکانی بکردایە،هیوا خوازبووم لێرە بمتوانیبا باسی بەهرەو داهێنان و دیوە درەوشاوەکەی شارەکەم بکردایە،نەك لیستێك لە کەموکوڕی لێرە، کە نەبوونیان کەلێن و دزری گەورە بۆ ناسنامەیی شارە و پێناسی شار.هەموو ئەو پێکهاتوو رەگەزانەی خوارەوە بخوێنیتەوە، دەتوانیت قەزاوەت و بەواردکاری بکەیت، ئێمە وەکو کەلار لە کوێی مێژووی شارو شانشینین؟ ئێمە چەند شارەوە نزیك و دوورین.

## شار لە دونیایی ئێمەدا:-

((شار)) هێندە ناوێکی زاڵ و گەورە و ئاڵۆزی ناو سەری مرۆڤەکانە، هیچ قۆناغ و زەمەنێك نادۆزینەوە شار نەبوویێتە جێی باس و مشتومڕ و ئاوڕدانەوەی هەموو ئەو ڕۆشنبیرو زاناو فەیلەسوفانەی ڕۆژێك لە ڕۆژان لەشاردا ژیاون و مردوون.

وە هەمیشە قەدر و بەهایی شار لایی ئەو هاوشارییانە بووە، کە شار بووەتە جێگەیەك بۆ ژیانکردن و خۆدروستکردن و جێگەیەك بۆ بەرجەستەکردنی خەون و خولیاو ئەندێشەکانیان.

یەکێك لەو کایانەیی لەگەڵ هاتنی مۆدرێرنەو شورشە فکری و هزری و کۆمەڵایەتی و سەرجەم ئەو دەڤەرانەی پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە یەکەوە هەیە، زۆرترین قسەو باس و مشتومڕو نوسین و جەدەلی لەدەوری خۆی کۆکردوەتەوە، بابەتی ((شار)) ە.هەرچەندە بوونی شار مێژوویەکی زۆردێرین و کۆنی هەیە،مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش زانین و ئەسینا و ڕۆما زۆر شاری تر دەکەونە ناو ئەو مێژووانەوە.

دەکرێت بوترێت شار بە مانا کلاسیکیەکەیی مێژوویەکی دیرین و کۆنی هەیە، ئەسینا و رۆما و قوربتەو بابل و نیشاپور و زۆر شاری تر لەم سەری گەردوون بۆ ئەو سەری گەردوون بونیان هەیە. لەگەڵ گەورەبوونی فکرو خەیاڵ و ئەندێشەی مرۆڤەکان بۆ ژیان و دونیابینیان پێناس و شوناس و فۆرمو شرۆڤە و گەنگەشەکانیش بۆ خودی((شار)) گەورەدەبن، ئیدی شار دەبێتە پێدراوێکی گرنگ و پڕ بەهایی ناو کۆڵینەوە و بابەتی ڕۆژانەو گفتوگۆی ناوەندە ڕۆشنبیری و ئەکادیمییەکان.

بۆیە خۆ لە قەرەدانی پێناسەو شوناس و لێکدانەوەیەکی سنوردار بۆ شار کارێکی نازاستی و کورت هێنە. شار ئێستا پارچە زەوییەکی سنوردار و تەنها ونامۆ نییە، دەوری خۆی تەنیبێت بە کلتورو فەرهەنگێکی یەك ڕەنگ و یەك بۆن یەك شێوە، شار هێندە ئاڵۆز و پڕگریی و پڕ پێناس و لێکدانەوەی جیاوازە، کۆمەڵێك زانست و کایەیی جیاوازی لەدەوری خۆی کۆکردوەتەوە، تاوەکو لێی تێبگەن و شرۆڤەیی کاریگەری و دەرکەوتەکانی خودی ئەم کایە بکەن کە ناوی شارە. لەدوای هاتنی قۆناغی مۆدرێرنەو بە ئێستاشەوە کە ئێمە لە دوای مۆدێرنەوەی، کەم مێژوناس و کۆمەڵناس و ئەدیب و شاعیر هەن، خۆیان لە بابەتی شار نەدابێت هەر یەك لە گۆشەیی پسپۆری دونیایی نوسینی خۆیان، هەریەك لەمانە لەناو خەیاڵ و فەنتازیایی نوسینەکانی خۆیدا بە گرنگیەوە لە شارو حیکایەت و هەموو ئەو شتانەی دەکەونە ناوی جێکردوە، بە چاوێکی گرنگ و سەنگینەوە لە شاریان ڕوانیوە.

بۆیە لە ئێستادا حیکایەتی شار حیکایەتی هەموو ئەو مرۆڤانەیە لەناویدا دەژین و پێکەوە بەرخود دەکەن و دەچنە پەیوەندیەوە، شار ئەو جەستە گەورە و زەبەلاحەیە، هەموو وردە خەون و وردە خەیاڵ و فەنتازیا و هیواکانی تاکەکانی دەگرێتە کۆش، شار لە ئێستا وێنایی خەیاڵ و بیرکردنەوە و فەرهەنگ و کلتور و زیهنیەتی تاکەکانی خۆیەتی، چونکە شار پێدراوێك نییە ئێمە لەدەرەوەی خەیاڵ و بیرکردنەوەی خۆمانەوە بۆمان بێت،



شار کاڵایەکی مادی ڕووت نییە بە ئاسانی دەستی بخەین، شار چاو دەست و قاچی ئەو مرۆڤانەیە لەناویدا بوونیان هەیە، شار هەرچۆنێك بوو، تۆش ئەوەیت، بیرکردنەوە و خەونی ئێمە بۆ شار بۆ هەموو ئەو شتانەی شارێکی باش دەیخوازێت گرنگن، لە پشت هەموو شارێکی گەورەو مەزن و خاوەن شوناس، لە پشت هەموو شارێکی دڵگیرو دڵنشین و خاوەن مێژوو خاوەن هونەرو خاوەن کلتور و فەرهەنگی دەوڵەمەند، خەڵکانی گەورە و هوشیار بە شارو پێدراوەکانی، ئاشنا بە گرنگی و مێژووی پێداویستییەکانی شار هەیە، تۆ چەند خەونەکان، چەند چاوەکانت، چەند فەنتازیاکانت دوور بڕۆن و گەورەبن، ڕۆحی شارو سەری شارو جوانیەکانی ئەوەندە گەورە دەبن.

ئێمە چەند دەستمان هەیە لەجوانکردن و ڕۆحیەت و مەعنەویەتی شار، شاریش هێندەی خۆی کاریگەری لەسەر دونیابینی و خەون و خولیاکانی ئێمە دادەنێت.

بۆیە دەکرێت شار وەکو مرۆڤێك چاولێبکەین، کە هەم جەستەیی و هەم ڕۆحی پێویستیان بەخۆراکی خۆیانە، بۆ ئەوەی بە تەندروستی بمێنێتەوە، تەمەنی ڕۆحی خۆی تا ئەوسەر درێژبکاتەوە. مرۆڤ دەکرێت لە ڕووی فیزیکی و بایلۆژیەوە ژیان و مانی سنوردار بێت، نەتوانێت چرکەیەك لە ژیانی خۆی درێژبکاتەوە، بەڵام دەتوانێت دونیایی ڕۆحی و مەعنەوی بۆ زەمەنێك لەناو حیکایەت و زیهن و مێژووی ئەوانی دیدا بهێڵێتەوە. شاریش دەکرێت دیوە مادی و ڕەقەکەی بکەوێت، کۆن بێت، تووشی کارەسات و داڕوخان بێت، بەڵام دیوەکەی تری کە ئێمە بۆ دونیایی خۆمان بە گرنگی ئەزانین، دیوە

مەعنــەوی و ڕۆحــە پڕجوڵــە و ڕامنەبووکــەی درێژبکاتــەوە.

تەمەنــی شــار بــەو حیکایــەت و ڕووداو و ســەربوردانەوە درێــژ دەبێتــەوە کــە لەنــاو مێــژووی خۆیــدا تۆماریــان دەکات، بۆیــە دەبێــت ئێمــە هوشــاریمان بەرانبــەر شــار هەبێــت لــەم ســەردەمەدا، لــەم دونیــا تازەیــە، تاوەکــو دێــت شــتەکان گەورەتــرو پــڕ ئاریشــەتر دەبــن، بەشــێکی ئــەم دونیــا تازەیــە، ئاڵۆزکــردن و گــرێ دروســتکردنە بــۆ هەمــوو ئــەو شــتانەی ئێمــە دەمانەوێــت ئاشــنایان بیــن، پێناســیان بکەیــن، لەگەڵیانــدا بەرخودبکەیــن، لێیــان تێبگەیــن، بچینــە نــاو ڕۆح و لایەنــە شــاراوەو پەنهانەکانیانــەوە.

ناکرێــت تــۆ لەشــاردا بژیــت و بمریــت، نەتوانیــت لــەم جوگرافیایــە تێبگەیــت، هوشــیاریت ئەوەنــدە نەبێــت بەرانبــەر ئــەم پێــدراوە گەورەیــە، تــۆ ڕۆژانــە لەناویــدا پەیوەنــدی دەگریــت، خــەون دەبینــی، دەجوڵێیــت. گــور بتەوێــت باشــتر لــە ڕازو نهێنــی و ســیحری شــارەکەی خــۆت تێبگەیــت، دەبێــت لانــی کــەم بزانیــت شــار واتایــی چــی؟ شــار و جوگرافیاکانــی تــر چــی لەیەکدیــان جیادەکاتــەوە؟ چــی بۆشــار گرنــگ و پێویســتە؟ شــار چــۆن گەشــە دەکات؟ چــۆن دەچێتــە نــاو حیکایــەت و مێژوویــی هاوشــاریەکانی ترییــەوە؟. دەبێــت بزانیــت شــاریش دڵــی دەشــکێت و ئــازاری پێــدەگات، ڕۆحــی بیماردەبێت.لانــی کــەم دەبێــت شــارەکەی خۆتــت خۆشــبوێت، عیشــقی لەگەڵــدا بکەیت.ئــەم عیشــق و خۆشەویســتە بکەیتــە هەوێنــی داهێنــان و گەشــەپێکردن و غەمێکــی گــەورە بــۆ هێشــتنەوەی هەمــوو ئــەو بەهــا جــوان و ســەنگینانەیی شــارەکەت، کــە دواجــار دەبنــە ناســنامەو دەروازییەکــی بــاش بــۆ چوونــە نــاو ژیــارو شارســتانیەت و دونیــا و مێژوویــی ئــەو شــارانەی هەمــوو گەلانــی دونیــا بەهــی خۆیانــی دەزانــن و شــانازی پێــوە دەکــەن.



## شار لەنێو ئەدەبیاتی ڕۆشنبیری ئێمەدا:-

سەرباری ئەوەی شار یەکێکە لە پێدراوە سەرەکی و گرنگەکانی ناو ژیانی کۆمەڵایەتی ئێمە، وە بووەتە ئاوێنەو خەزێنەی بەشێك لە حیکایەت و سەرگوزەشتەو ڕابوردوویی ئێمە بە هەموو ئەوانەی کە هەن، بەڵام ئەوەی جێگەی هەڵوەستەو پرسیاری جدییە، مافی خۆمانە بپرسین بۆ تاوەکو ئێستا شار نەبووەتە پرسێکی جدی و غەم لێخوراوی ناو کایەیی ڕۆشبیری و فەرهەنگی و فکری و زانستی ئێمە؟ بۆ ئێمە نوسەرو ڕۆشنفکرو ئەکادیمست و مێژووناس و شارناسەکانمان ئاوڕێکی ورد و باشیان لە شار و پێدراو و بەهاکانیان نەداتەوە؟

چۆن دەکرێت ئەم کایە گرنگەیی ژیان کە پەیوەندی ڕاستەخۆی بە تاکەکانی ناوییەوە هەیە، تاوەکو ئێستا نەبووەتە پرۆژەیەکی گەورەیی ئەکادیمی و زانستی ناو دەزگاکانی ئێمە. دەکرێت وەڵامی ئەم پرسیارە یەك بیانوویی ئەوەی هەبێت، شار و دەرکەوتەکانی لە دونیا ئێمەدا درەنگ وەخت هاتوون، شار لە کۆمەڵگەی کوردانی باشوور درەنگ سەری هەڵداوەو هێشتا نەبووەتە جێگەی پرسیار و ڕامانی تاك بە تاکی ئەم کۆمەڵگەیە بە ڕۆشنبیر و خوێندەوار و ئەکادیمیستیەکانیەوە.بەڵام لانی کەم ئێمە دوای ڕاپەرین بە حکومی کۆچ و چوونە دەرەوەی هەزارەها تاکی ئەم پارچەیە بۆ شارە گەورەکانی دونیا لەم سەری گەردون بۆ ئەوسەری گەردوون، لە نیۆرك بۆ لەندەن و لەوێشەوە بۆ ئەمستردام و بەرلین و پاریس هەموو پایتەختە گەورە و ناودارەکانی دونیا.ئێستا نەمان وێراوە باز بەسەر ئەو بیانووە سادەو ساکارو نالۆژیکیەدا بدەین و غەمی یەکەم و گرنگمان نەبێت غەمی ناسینی شارو شارنشینی و شارستانیەت و ناسینی جەوهەرو گرنگی و بەهای فکر و فەرهەنگی شارەکانی خۆمان. دەبوو لانی کەم گەر شتێکی گەورە و زۆریش نەکرایە، ئێستا لە ناوەندەکانی زانکۆ و پەیمانگاکانی ئێمەدا زانستێکی

تایبەت هەیە، زانستێکە لقێکی گرنگی ناو فەرهەنگی شارناسی کۆمەڵناسیە و پێی دەوترێت((شارناسی)). ئەم زانستە کۆڵینەوە لە مێژوویی سەرهەڵدان و گەشەو هۆکاری دروستوون و قۆناغەکانی پێگەیشتنی شارو جۆراو جۆری شارەکان دەکەنە چەقی باسکردن و کارەکانیان. بەداخەوە ئێمە نەك هەر زانستێکی گرنگ و پڕبایەخی ئاوەها شك نابەین، بەڵکو کەمترین قسەی جدی و گفتوگۆی زانستیی لە بارەی شارەوە کراوە، زۆر کەم کتێبێك یان گۆڤارێك ناوەندێك شك ئەبەیت، بە تێرو پڕی بە شێوەیەکی زانستی هاتبێت شاری کردبێتە بابەتی تێڕامان و لێوردبونەوە.

تەنانەت لەناو ئەدەبیات و ژانرە جیاوازەکانی ئەدەب و شیعر و چیرۆك و ڕۆمان و پەندەکانی ئێمەدا کەمترین جێگە هەیە بۆ ئاوڕدانەوەو غەمی گەورە بۆ شار و مانا و دیوە شاراوەکانی. شاعیرانمان کەمترین خەیاڵ و ئەندێشەو سۆزی خۆیان بۆ بابەتی شار تەرخان کردووە.بۆیە دەکرێت بوترێت هێشتا هوشیاری تاکی ئێمە بە ڕۆشنبیران و ئەوانەشی گرنگی بە بابەتی شار ئەدەن، نەگەشتوونەتە شوێنێك بتوانێت بە باشی لە چیەتی شارو پێگەو گرنگی شار بگات وە بۆ ژیانی تاکەکان بیخەنە بەرباس، پەیوەندی شارو کایەکانی ترو پەیوەندی شارو تاکەکانی پەیوەندی شار هەموو ئەو شتانەیە لەناویدا دەجولێن هێشتا نەبووەتە دیدگا و پرۆژەی کۆڵینەوە. بۆیە دەکرێت، وشیارانەترو چاوکراوەتر هەموو ئەوانەی لەم بوارەدا کاردەکەن و بە لایەنەوە شار بابەتی جدی ناو نوسین و قسە و کۆڵینەوەکانیان بێت وبایەخ بە وجودە گەورەی ناو دونیای مرۆڤەکان بدەن.

## شارو هونەری بەڕێوەبردن:-

هەموو ئەو کایانەی لە ژیانی مرۆڤەکاندا بوونیان هەیە، بە هەموو جۆرو جیاوازیانەوە، هەرکامیان بگریت و بنکۆڵی بکەیت، پێکەوە لینك و خاڵێکی هاوبەش کۆیاندەکاتەوە، ئەوەش بوونی هونەرێکە لەناو هەموو ئەو کایانەدا کە هەیە، هیچ کارو چالاکیەکی

مـرۆڤ نییـە، پێویسـتی بـە خەیاڵێکـی هونـەری و چاوێکـی هونـەری ڕۆحێکـی هونـەری نەبێـت، ئەمـە ئێمـە گـەر بمانەوێـت بەهـاو مانـا ببەخشـینە ئـەو کارو کردانـەی ئەنجامیـان دەدەیـن، لـە پـاڵ ئەرکـە پیشـەیی و ئەخلاقیەکـەی، هونەریشـی بخەینـە پـاڵ، هـەر کارێـك بـۆ ئـەوەی ئیسـتاتیکا و چێژببەخشـێتە خۆمـان و ئەوانـی دی دەبێـت خاڵـی وبـۆش نەبێـت لـە دیدێکـی هونـەری.

بەڕێوەبـردن لـە هـەر شـوێن و جێگایـەك بێـت، لەهـەر پلـەو پۆسـتێکدا بێـت، بچـووك یـان گـەورە پێویسـتی بـە کارەکتەرێکـی وشـیار و ژیـر هەیـە، لـەوە بـگات، فەلسـەفەو ئـەدەب و هونـەری بەڕێوەبـردن چییـە؟ ئـەرك و وەزیفەیـی یەکەمـی ئـەم کایـە چیـە؟ بەڕێوەبردنـی بـاش چـۆن لـە بەڕێوەبردنـی خـراپ جیابکاتـەوە؟ ئـەو دەزگاییـە کار تێدا دەکرێـت کام جـۆر لـە بەڕێوەبـردن و ئیشـکردن دەخوازێـت، سـەرباری ئـەوەی دەبێـت کەسـێکی شـیاو و گوجـاو بێـت بـۆ بەڕێوەبـردن، غەمخـۆرو دڵسـۆزبێت بـۆ کارەکـەی وهاوشـارییانی، دەبێـت کەسـێکی بوێـرو خـاوەن بڕیـاری خـۆی بێـت و لـە هیـچ دۆخ و بارێکـدا نەچێتـە ژێربـاری هیـچ داواکارییەکـی تایبەتـی و کەسـیەوە. وە دەبێـت گـوێ بـۆ غـەم و ئـازارو کێشـەکانی هاوشـاریانی بگرێـت، بـەدەم داواکاری هەمـوو ئـەو شـتانەوە بێـت غەمـی شـارو گرفـت و ئاریشـەن بـۆ هاوشـارییان.( ڤیبـەر) یەکێـك لـە تایبەتمەنیەکانـی شـاری بـاش و مەحکـەم و تۆکمـە لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە دەبەسـتێتەوە بـەوەی دەبێـت ئەوانـەی شـار بەڕێوەدەبـەن، خەڵکانێـك بـن ڕاوێـژ بـە هاوشـارییان بکـەن و بچـن بـەدەم داواکارییەکانیانـەوە.

کار بەدەسـت و بەڕێوەبەرانـی شـاردەبێت خەیـاڵ و ئەندێشـە خەونـی گەورەیـان بـۆ بونیـادی شـار هەبێـت، لەپـاڵ غەمـی بینـاو گەشـەی ئابـوری و ژینگـەو گەشـتوگوزارو هەمـوو ئـەو شـتانەی لـە دونیایـی مادیـدا هەیـە، دەبێـت غەمـە کلتـوری و فەرهەنگـی و مەعنەویەکانـی شـاریش لەبەرچـاو بگرن،دەبێـت هەمیشـە غەمـی هەمـوو ئـەو شـتانە بخـۆن کـە ڕۆحیەتـی شـار لـە کپـوون و متبـوون وبـێ جوڵەیـی ئەپارێـزن. ئـەوەی تەمەنـی شـار درێـژددەکات و دەیهێڵێتـەوە، ماتریـاڵ و شـتە ڕەق وبـێ گیانەکانـی نـاوی نییـە، بەڵکـو

ئـەو کلتـوری پێکـەوە ژیـان و ئـەو سـەدا مەعنەویـی ئـەو ڕۆحـە فەرهەنگەیەیـە کـە پارێـزگاری لـە مانـەوەی ڕۆح و ڕوومەتـی گەشـی شـاردەکات. تـۆی کاربەدەسـت دەبێـت لـەوە تێبگەیـت، شـار چەشـنی مـرۆڤ دوو ڕۆحـی هەیـە، ڕۆحێکـی فیزکـی و بایلـۆژی و مـادی دەبێـت تێربکرێـت، لەگـەڵ ڕۆحێکـی تـر کـە بەبەهاتـرو گرنگترە لـەم ڕۆحـە مادییـە، ئەویـش ئـەو خەیـاڵ و ڕۆحـە ڕامنەبـوو و پـڕ لـە جووڵـەو نەشـئەیە، بـۆ ماوەیەکـی درێـژ حیکایـەت و سەرگوزەشـتەکانی مـرۆڤ دەهێڵێتـەوە.

دەبێـت ڕۆژانـە تـۆ وەکـو بەرپـرس و بەڕێوەبـەرو حاکمـی شـار، بێیتـە نـاو خەڵکـی و کۆچـە کۆڵانەکانـی شـارو بـازارو شـوێنە پەراوێزخراوەکانـی، شـوێنە پەنهـان و گۆشـەگیرو نەبینراوەکانـی شـار بپشـکنی، لەنـاو خەڵکـی و هەمـوو چینـە جیـاوازەکان بیـت، واتـە دەبێـت تـۆ بـەڕۆح بـە خەیـاڵ و بـە هەسـت لەگـەڵ خەڵکـی و هاوشـارییان بیـت، لـە کۆڕبوونـەوە و خۆشـی ناخۆشـیان لەگەڵیـان بیت.نـە وەکـو تـۆ لـە دۆڵێـك و هاوشـارییان لـە دۆڵێـك تـۆ لەدونیـای خـۆت و ماڵـی جیـاوازو کۆشـکی جیـاواز و شـەقامی جیـاواز و گوزەرانـی جیـاواز. وە خـۆت لەخەڵـك دابڕیـت و بچیتـە سـەر بورجـی عـاج و هەزارەهـا فەرسـەخ لـە هاوشـارییانەوە دووربیـت، ئـاگات لـە هـەواڵ و ڕووداو و حیکایـەت و سەرگورزەشـتەکانی شـارنەبێت. تـۆ دەبێـت بپرسـیت بـۆ شـارەکەی مـن بـێ ڕەنـگ و بـێ ڕۆحـە، بـۆ شـارەکەی مـن حیکایـەت و سەرگوزەشـتەی خـۆی نییـە، بـۆ شـارەکەی مـن ئەوانـەی دەبنـە بونیـاد و دورسـتکەری تێیـدا نیـن؟

شـارەکەت( نـە پەیکەرێـك لەناویـدا بوونـی هەیـە، نەدیوارێکـی تابلۆیەکـی هونـەری، نـە سـینەما و نـە شـانۆ و مۆزەخانـەی خـۆی، نەشـوێنێك بـۆ پشـوودان و وەرزشـکردن). ئـەی تـۆ خـۆت وەکـو بەڕێوەبـەر و کاربەدەسـت و دەمسـپی ئەوەنـدە خەیـاڵ و خـەون خولیاکانـت هەژاربـن و هوشـاریت نەبێـت بەرانبـەر ئـەم کایانـە، کـە ڕۆح و چـاو دڵـی شـارن، ئەمانـە هەگبـەو شـاهیدی شـارێکی بـە خزمـەت و بـە بەهـان، ئەمانـە گـەر لەشـارێکدا هەبـن، خودئەڤینـی و غوروڕێکـی نـەرم و جـوان ئەداتـە هاوشـاریانی لـە هـەر کـوێ دونیـا

بـن، شـانازی بەشـارەکەیانەوە دەکـەن، بیـری دەکەن،عاشـقی دەبـن.
بـەڵام کام لەشـارەکانی ئێمە،بەشـارەکەی خۆمانـەوە هەمـوو ئـەو شـتانەی تێدایـە بەرباسـدراون؟ کام لەشـارەکانی ئێمـە لـەم جـۆرە کاربەدەسـت و خـاوەن وشـیاریی خەونبینـی گـەورەی تیدایـە بـۆ خزمەتـی شـارەکەی؟
ئێمـە هەمیشـە یـەك شـت دەڵێـین بـە شـارەکانمان و بەدەنگـی بـەرز بەوپـەڕی نائومێدییـەوە
(( کـەی ڕۆژێـك بێـت شـارەکەم بەجێبهێڵـم، نـەك کـەی ڕۆژێـك بێـت بـۆ شـارەکەم بگەڕێمـەوە)).

## شار و پەرتووکخانە:-

یەکێـك لـە سـیما دیـارو ڕەونەقدارەکانـی شـاری دڵنشـین و شـاری تێفکریـن و هـزرو بیرکردنـەوەو شـاری زینـدوو پڕجووڵـە، بوونـی پەرتووخانەیـە، پەرتووخانـە بـەو واتایەیـی ببێتـە شـوێنی گربوونـەوەو پێکـەوە دانیشـتنی ئـەو خەڵکـە خوێنـدەوارو ڕۆشـنبیرەیی کـە لـەو شـارەدا غەمـی مەعریفـەو نوسـین و دونیایـی کتێبیـان هەڵگرتـووە، شـێوازی پەرتووخانەکانـی بـە شـێوەیەك بێـت و تـۆی مـرۆڤ هەمیشـە حەزبکەیـت و بچیتـە نـاوی و نەیەیتـە دەرەوە، شـوێنی دانیشـتن و کـۆڕو کۆبوونـەوە پشـوودان بەشـێکی دانەبـڕاوی نـاو دونیـای پەرتووکخانەیەکـی مۆدرێـن و هاوچەرخـە، واتـە پەرتووکخانـە یەکێکـە لـە سـیمبوڵ و ڕەمـزە مەعنەوییەکانـی شـارێك بـە مانـای شـار پڕبێـت لـە جووڵـەی ڕۆشـبیری و فیکـری و ئاڵۆگۆڕکردنـی ئایدیـاو خەیاڵەکانـی یەکـتری. لـە هـەر دەقـەرو جوگرافیایـەك پەرتـووك و پەرتووکخانـە بوونەتـە غەمێکـی گـەورەی تاکەکانـی لـەوێ خەڵکـی خوێنـدەوار و عاشـیق بـە دونیایـی پەرتـووك و نوسـین مەعریفـە هەیـە، چونکـە ئێمـە لەنـاو دونیایـی نوسـین و پەرتووکەکانـەوە فکـرو ئەندێشـەو خەیاڵـمان دێنـە دەرەوەو لەوێشـەوە ئیـدی پەیوەنـدی ئێمـە بـە ئەوانیدیـەوە دروسـت دەبێـت، شـارێك بـۆ ئـەوەی سـەرهەڵبڕێت و جۆرێـك لـە خودئەڤینـی بیگرێـت، شـارێك بـۆ ئـەوەی هەمیشـە

تاکەکانی ناوی شانازی پێوە بکەن و لەناویدا بمێننەوە، بوونی دونیایی کتێب و نووسین و پەرتووخانەکانە لەناویدا، شاری بێ کتێب شارێکە، نە گەورە دەبێت نە گەشە دەکات، نە ئومێدی ئەوەی هەیە لەناویدا مرۆڤ هەست بە جۆرێك لە بەختەوەری و ئاسودەیی مەعنەوی بکات. دەکرێت بوونی کتێبخانەی زۆر نەبێت هۆکاری ئەوەی ئێمە شارێکی خوێندەوارو شارێکی عاشیق بە دونیایی مەعریفەو خەیاڵمان هەبێت، بەڵام نەبوونی ئەم کایە گرنگ و سەنگینەیی ژیان لەناو دڵی شارێکدا، یەکشتمان پێ دەڵێت: لەوێ کەس بیرناکاتەوە، کەس غەمی یەکەم و کۆتایی دونیایی مەعریفە و فکری نییە، لەو شارەدا خەڵکانێك دەژین نە خەونیان هەیە و نەحیکایەت، گەورەترین تراژیدیای شار ئەوەیە خاڵی بێت لە پەرتووك و پەرتووخانە. ئەوەی شارێك جوان دەکات، ئەوەی شارێك وا لێدەکات، خەڵکی خوێندەوارو ئەهلی کتێب رووی تێبکەن و بەرەو پیرییەوە بچن، بوونی ئەو کایە مەعنەویی و رۆحیانەیە کە دەبێت شار هەیبێت. ئەوەی شار دەگۆڕێت و گەشەیی پێدەکات و لە بیاری و چەقبەستوویی خۆجوینەوە و خۆدووبارە کردنەوە دەپارێزێت، ئەو ئایدیا و بیرکردنەوانەن ئێمە لەناو سەرو چاوی کتێبەکانەوە هەڵیان دەکۆڵین، ئەی ئەهلی پەرتووك و نوسین و خوێندەوار شوێنێکی وەکو پەرتووخانەکان کۆیان نەکاتەوە، ئاخو دەبێت لەکوێ دەردە دڵ و غەمی شار و خەمی خەڵك و غەمی مەعریفە کۆیان بکاتەوە، شارێك ئەم دونیا جوانەیی نەبێت خوێندەوارو خاوەن قەڵەمە جوان و بوێرەکانیان بێ لانە پەرتەوازە دەبن.هەر شارێك بێ بەش بوو لە دونیایی کتێب و کتێبخانەکان، بێ بەشە لە بەشێکی گەورەیی ئەو دونیا رۆحی و مەعنەویەیی لەناو پەرەیی پەرتووکاندا هەن، کەلێنێکی گەورە دەکەوێتە شوناس و ناسنامەیی شارێکەوە گەر غەمی گەورەو جدی لە کایەیی مەعریفەو نوسین و کتێبخانە نەخوات.

## شار و بڵاوکراوە:-

سادەترین وساناترین پێناسە بیدەینە پاڵ هەموو جۆرو شێوازەکانی بڵاوکراوە، دەکرێت بڵێین بڵاوکراوەکان بۆ خۆیان یەك وڵات و یەك نیشتمانن بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە چاوی بڵاوکراوەکانەوە دەیانەوێت بە ئاگابن لە هەموو ئەو شتانەی لەدەروبەری ئێمە دەگوزرێن و ڕوودەدەن. شار بۆ ئەوەی بوونی هەبێت، سەدایی هەبێت و هەمیشە دەنگێك هەبێت بەرگیری لێبکات، دەنگێك ڕەخنەبگرێت و هەڵوەستە بکات، چاوی لەسەر هەموو ئەوشتانەبێت بەناو ڕۆحی شاردا تێدەپەڕن، بڵاوکراوەی باش و جدی وسەربەخۆ و ئازادە، لێرە جۆرێك لە بڵاوکراوەو ڕۆژنامەو گۆڤارو دەرچوو هەیە، کە دەست نادەن بۆ شار، هیچ سودو خێرێکی گشتیان نییە بۆ هاوشارییان، ئەوانە لەناو سەرو چاوی ئایدیاو حیزبێکی دیاریکراوەوە دێنە دەرەوە، جگە لە خزمەتکردن بە مەرامی حیزبی و شەخشی هیچ هیواو و خەونێکیان لە سەر هەڵناچنرێت. ئێمە لەم جۆرە بڵاوکراوانە نادوێین.هەمیشە یەکێك لە ڕووە گەش و جوانەکانی هەر شارێك، کە پڕبێت لە هەواڵ و ڕووداو جوڵەو دەنگوباس، بوونی دەرچووو ڕۆژنامە و گۆڤارو میدیایی باشە. ئەمانە لە ناو مێژوودا خۆیان بەرهەمی شارو شارنشینین، ئەو خەیاڵ و ئەندێشانە لەناو ڕۆح و دڵی شارەکانەوە هاتوونەتە دەرەوە، شارێ بۆ ئەوەی بە بەردەوامی وەکو مرۆڤێکی سرك بە بزێو و جست و چالاك بمێنێتەوە، ترسی لە کپبوون و گۆشگیربوون نەبێت، دەبێت زمانێکی هەبێت قسەی بۆ بکات، دەبێت دەنگێگی هەبێت هاواربکات ناڵەو بیماریيەکانی بخاتە بەرچاوان، درزو کەلێن و ئاریشەکانی لە شاردنەوەو پەنهان بپارێزێت، هەموو ئەمانە ئەرك و بەرپرسیارێتی بڵاوکراوەکانی ناو شارەکەن.شار ڕۆژانە ڕووداوی خۆش و ناخۆش هەواڵی تراژیدی و کۆمیدی، چالاکی ڕۆژانەی سەرجەم کایەکان، وردە پرۆژەو پێشکەوتنەکانی، هەموو ئەمانە دەبێت بچنە سەر پەرەی بڵاوکراوەکان و هەموو هاوشارییەك مافی ئەوەی هەیە هەواڵ و

سەرگوزەشتەی شارەکەی کە خۆی بەشێکە لە وجودی بچێتە ماڵەکەی لانی کەم بە ئاسانی دەستی بگاتە هەموو ئەمانە.

چونکە ڕۆژنامەگەری (( بریتیە لەو داهێنانە یان ئەو شێوازەیی گوزارشتکردن کە بەکاردەهێنرێت بۆ تەعبیرکردن و سەرەنجدان لە ڕووداو ئایدیاکان)).یان دەکرێت بڵێن (( شێوازی دەربڕینە بە جۆرێك لە جۆرەکان دەتوانین بڵێن خولّقاندنە)).

کەواتە ڕۆژنامەگەری زمانحاڵ و گوزارشتکەری هەموو ئەو شتانەیە لەناو ڕۆحی شارێکەوە دێنە دەرەوە. شاری بێ ڕۆژنامەو ڕۆژنامەگەری شاری بێ گوزراشتە لەخۆ. ڕوودەدەن. بڵاوکراوەکان زیاترن لەوەی تەنها هەواڵ و حیکایەتەکانی ڕۆژانەی هاوشارییان بگوازنەوە، بڵاوکراوەی باش دەتوانێن بۆ خۆی ببێتە دەسەڵاتێکی ناوچەیی لەناو فەزایی شارداو ڕایی گشیی و فەزایی گشتی دروست بکات، وە ڕوویەکی سیاسی گرنگی هەیە، خوێندەوار و چین و توێژە جیاوازەکان لەدەروی یەکدی کۆبکاتەوە بۆ غەمی هاوزمانی و هاودەردی شارەکە، بە چاوێکی ڕەقیب ئاساوە سەیری هەموو ئەو کارو چالاکی و کردانەی بەناوی شارەوە ئەنجامدەدرێن بکات.

گەر هەموو ئەمانە لەشار هەبوون، ئیدی کاربەدەست و بەرپرسەکانی شار بێمنەتانەو بێدەربەستانە غەم و ئازارو بیارییەکانی شار فەرامۆش ناکەن، هەمیشە ترسێك و دڵە ڕاوکێیەك دایاندەگرێت، لانی کەم دەست لەهەندێك لەو شتانە هەڵدەگرن کە تەنها خێری بۆ خۆیان هەیە.هەموو شارە هاوچەرخ و پێشکەتووەکانی دونیا بڵاوکروەکانیان کردووەتە مینبەرێك و ئەکتێکی بەرگیری دژ بە گەندەڵی و خراپەکاری بەرپرس و کاربەدەست و سیاسیەکانی وڵاتەکەی خۆیان، ڕۆژانە لە ڕێگەی بڵاوکراوە بوێرو ئازاکانەوە، زۆرشتی پەنهان و پشتی پەردە و ژوورە تاریکەکان دەخرێتە سەر پەرەییان وبۆ ڕایی گشتی پیشانی دەدەن، مشت ومڕ و دیالۆگ دەخولّقێنن. ئێستا لەدونیای ڕۆژئاوادا بڵاوکراوەکان بۆ خۆیان یەك دەستەڵاتن لەپەنایی

دەستەڵاتەکانی تر کاردەکەن، ڕۆڵیان دەبێت لە بڕیارو پێشهات و ئەکتانەی لەناوحکومەت و دەستەڵات دێنە دەرەوە.بەشێوەیەك پرس و ڕاییان پێدەکرێت و گوێ لەڕاو بۆچوون و پێشنیازو داواکارییەکانیان دەگیرێت.

## شارو فەزای گشتی:-

ڕوویەکی تری شاری پڕجووڵەو زیندوو شارێك هەموو زەمەنێك دەست لەملانێ بێت لەگەڵ گفتوگۆوجەدەل و ڕایی جیاواز و پلورالی فکری و کۆمەڵایەتی، شارێك هاوشاریانی هاوغەمی هاودەردی و هاوزمانی کۆیان بکاتەوە، دەبێت شتێکی هەبێت کایەیەکی گرنگی هەموو شارێك بیەوێت تاکەکانی ئازاد و سەربەخۆیان هەموو ئەو باوەڕو ئایدیا و دیدانەی هەیانە بێ ترس دەریببڕن و بیڵێن، ئەویش بوونی((فەزای گشتی)یە.بە شێوەیەکی ئاسایی فەزای گشتی بەوە پێناسە دەکرێت((کە هەموو شارمەندان و هاوڵاتیان بە ئازادیی و لە ڕووی یاساییەوە دەتوانن دەستیان پێ بگات)). شار تەنها لە شەقامەکان پێکنەهاتوون، بەڵکو گۆڕەپانی گشتی ومەیدانیش لە خۆدەگرێت، هەروەها فەزای ژوورەوەی بیناکان وەك کتێبخانە و هۆڵە گشتیەکانی شاریش دەگرێتەوە.

یۆرگن هابرماش ئەم فەزایی گشتیە ناو دەنێت(( فەزای هاوبەش)) هەروەها ئەم فەزایە ئەو هاوڵاتیانە دەگرێتەوە کە لەسەر مەسەلەیەك بیروڕا ئاڵوگۆڕدەکەن، بۆ ئەوەی بگەنە بڕیارێکی هاوبەش، یان خۆیان بە باشترین شێوازی حکومکردن بەڕێوە بەن، واتە هەستێکی دەستەجەمعی هاوڵاتیانی شارێك یان شوێنێکە بۆ مەسەلەیەکی دیاریکراو کە پێویستە ئاراکانیان تێیدا بەشداربن، بۆ بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگە.وە دەپرسێت ئەو فەزایە لە کوێی دەوڵەتدایە؟ هابرماس جەخت لەوە دەکاتەوە (فەزای گشتی) دابراوێکە لە سیاسەتی دەوڵەت، واتە دەتوانین بڵێن ئەو مەساحەیە لە نێوان دەوڵەت و هاوڵاتیاندایە، ئەگەر

زیاتر وردبینەوە دەکرێت بڵێین ئەو فەزا زیندوو ڕۆشنگەرەیە کە زیندوێتی بە کۆمەڵگا دەبەخشێت و ناهێڵێت کۆمەڵگا لە هیچ دۆخێکی سیاسەتی لابەلادا بمرێت. هەورەها هابرماس ئاماژەی بەم دۆخی زیندوێتی کۆمەڵگە دەکات و ناوی لێدەنێت ((دامەزراندنی خەیاڵی کۆمەڵگە).وە خەیاڵی کۆمەڵگە کردەیەکی ئاراستەکراوە و ئاینده دەخولێنێت، واتە گۆڕینی داینامیکی کۆمەڵگە بۆ خۆئاراستەکردن و خۆگۆڕین.

گەر کەمێك هەڵوەستە بکەین لە سەر دیدو ڕوانینەکانی هابرماس لەمەڕ گرنگی و فەزای گشتی، دەبینین شاربۆ ئەوەی چاوێکی هەبێت جیاواز لە چاوی سیاسی و کاربەدەستانی و دەوڵەت کە بەجۆرێکی ترو بە شێوازێکی تر سەیری شارو پێکەوە ژیان دەکات، ئەوانەی دەچنە ناو فەزای گشتیەوە لانی کەم دەبێت ئەو هاوشاریانە بن، کە هوشیاریان بەرانبەر چەمك و مەغزاکانی ئەم فەزایە هەبێت، لەوە بگەن ئەم فەزایە دەبێت چیبکات و چینەکات، ئەرك وەزیفەیی چییە؟ چۆن کاردەکات. بۆ ئەوەی بتوانێت بەشێوەیەکی ڕێکو پێك و دوور لەدەستی حیزب و ئایدیایەکی دیارییکراو ئیش بکات. لە هەر کوێ هاوشارییان درکیان کرد بەوەی دەبێت شار فەزای گشتی هەبێت، بۆ ئەوەی جۆرێك لە ئازادیی ژیانکردن و ڕا دەربڕین و پێکەوە ژیانی ئاشتیانە و پێکەوە هەڵکردن هەبێت، دەکرێت بوترێت ئەو شارە هەمیشە بە کەم ڕازی نابێت، دەستەڵاتی مەرکەز و ناوچەیی ناتوانێت دواکاری و مافەکانیان نادیدە بگرێت، هەمیشە دێت بەدەم هاوشارییانەوە، لەناو ئەم دەوڵەت گەورەدا شار بۆ خۆی جۆرێك لە دەستەڵاتێکی نیمچە فەرمی لە ڕێگەی فەزایی گشتیەوە دادەمەزرێنێت، بۆ ئەوەی ببێتە پردێکی پەیوەندی لە نێوان شارییان و دەستەڵات، بۆ ئەوەی سەداو هاواری تاکەکانی ئەو شار بگاتە لای کاربەدەستان، ئەوەی هەیە دەبێت ئەو هاوڵاتیانە لەناو شاردا فەزای گشتی دروست دەکەن، هەمە ڕەنگ و هەم دید و هەمە ئایدیا و هەمە کلتور بن، واتە نوێنەری سەرجەم چین و توێژەکان لەوێ جێگەی کرابێتەوە، دەکرێت لەشاردا چینی جیاواز

و کلتوری جیاواز هەبێت لە ئاستی کۆمەڵایەتی وئاستی سیاسی وفەرهەنگی و ئاستی دینیدا، دەکرێت تاکی ڕا جیاو دیدگا جیاواز هەبێت، دەبێت هەموو ئەوشتانەی لەچوارچێوەی ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتیەیی هاوشارییان لەسەری کۆکن، هەموو داواکاری و خەون و غەمەکانی هاوشارییان بگاتە شوێنی خۆی. فەزایی گشتی چەندە خزمەت بە هاوشارییان دەکات، دەبێتە جۆرێك لە فشاری مەدەنی و سیاسی بۆ سەردەستەڵات و ناچاری دەکات بەدەم داواکاریەکانی هاوڵاتیانەوە بێت، هێندە خزمەت و کۆمەکی دەستەڵات دەکات، لەوەی بە شێوەیەکی ڕوون و باش ڕێکوپێك دوور لە ئاژاوەو دۆخی پۆپۆلیستی داواکاری هاونیشتمانیان دەچێتە لای و تێدەگات داوای چیدەکەن، وە ناسنامەو شوناسی ئەوانەی داوا دەکەن دیارن و لەبەرچاوی دەستەڵاتن و نوێنەرو غەمخۆر و زمانحاڵی هاوشارییان دیارن و سەرجەم چین و توێژەکان لەوێ داواکارییەکانیان جێدەکرێتەوە. کەوابوو شاری زیندو و شاری خاوەن جوڵەو خاوەن زمان و خەیاڵی جوان شارێکە دەبێت لانی کەم فەزای گشتی تێدا ئامادەگییەکی باشی هەبێت، غەم و هەمی یەکەمی ئەم فەزایە غەمی هەموو ئەو هاوشارییانەیە لەناو شاردا دەژین و بەرخورد دەکەن بە هەموو چین و توێژە جیاوازەکانەوە.

### شار و ڕۆحی هونەر:-

گەر لەو دیدە ئیستاتیکی و گرنگەیی(بلیخانۆف) بڕوانین، کە پێی وایە هونەرو ئەدەب دەروازییەکن بۆ ئاراستەکردنی گەلان، هەروەها باس لەوە دەکات کە هونەر ئەدەب تەنها وێناکردنی ژیانمان نین، بەڵکو دەبێت بزانین ئەم دووکایە پێکەوە گوزرارشت لە ژیان دەکەن. بۆیە هونەر دەکرێت بوترێت، هونەر پایەکی گرنگی شارو شارنشینی و ژیاریی هەر کۆمەڵگەیەکە بە بیخوازێت.

یەکێکی ترە لە ڕووە گەش و دیارەکانی هەر شارێکی شیرین و لە دڵدا نشین، شارێك هاتیەتە ناوییەوە دڵت نەخوازێت بە ئاسانی

لێی بچیتە دەرەوە، شارێك بە ماوەیەكی كەم ئولفەتی پێوە بگریت و عاشقی بیت، شارێكە هونەر ڕوویەكی دیارو دراوشاوەیەتی، شارێكە هونەر بەشێكی گەورەیی ئەو حیكایەتەو سەبوردانەیە كە لەناویدا دێنەبوون، هونەر ئەو دونیا جوان و پڕ ئیستاتیكاو ڕەونقدارەیە بە درێژایی هەزارەها ساڵ و بە هەموو فۆرمەكانیەوە، بووەتە جێگەی مشت و مڕی دونیای فەلسەفەو تێڕامان و بیركردنەوەی هەزارەها فەیلەسوف و زاناو حەكیم و ئەهلی هونەر خۆی، وە بووەتە یەكێك لە لقە گرنگ و پڕبەهاكانی ناو دونیایی فەلسەفە. هەر لە یۆنان و ڕۆمان و ئیتالیاو هەموو ئەو شارو نیشتمانانەیی هونەر بووەتە مێژوو و ناسنامەو شوناسی گەورەیان. شاری گەش و شاری پڕ لە ڕەنگ و پڕ لە نیگایی ڕەنگاو ڕەنگ و شارێك هەر چركەو ڕەنگێك بنوێنێت و هەر زەمەنێك خۆی بگۆڕێت بۆ شارێكی هونەریتر و ڕەنگاڵەتر، دەبێت هونەر ببێتە بەشێكی گرنگی ژیانی ڕۆژانەیی هاونیشتمانیەكانی.لە هەر كوێدا هونەر هەبێت هەر كامیان بێت هەر كایەیی و جۆرێكیان بێت، لەوێ خەیاڵ و ئەندێشەو بیركردنەوەی جیاواز هەیە، لەوێ ژیان و جوڵەو ململانێكان ئارام و ڕەنگاوڕەنگترن، هونەر ڕۆحی شارێكە نایەوێت بی حیكایەت بمێنێتەوە، چاوی شارێكە، نایەوێت تابلۆی دووبارو چركەی دوبارە نیگا بكات، هونەر نەچێتە كوچەو كۆڵانی هەر شارێكەوە، ئەو شار ڕۆح و دەرونی چەشنی مرۆڤێك بیمارە و پێویستی بە خوراكی ڕۆحە.هونەر هەموو ئەو درز و كەلەبەرانەی سروشت بۆ ئێمە پڕدەكاتەوە كە خودی سروشت ئەو قودرەت و تواناو هێزەیی نییە پڕی بكاتەوە.

ئەرستۆ گووتەنی((ئەوەی سروشت ناتوانێت تەواوی بكات، هونەر تەواوی ئەكات)).كەواتە هەر چاڵێكی بێ هونەر لەناو ڕۆح و سەری سروشتا هەبێت، هونەر پڕی دەكاتەوە، ڕۆژێك دێت سروشت دەوەستێت و ئەمرێت، ئیدی هونەر لەوێوە دەست پیپێدەكات، تەمەنی هونەر درێژترە لە تەمەنی سروشت. هونەر بە هەموو ڕەنگەكانیەوە، هەمیشە لە هەموو زەمەنێك دەبێتە شاهیدو گەواهیدەرێكی ڕاستەقینە بۆ شارێك، هونەر پێمان

دەڵێت، چی لەناو سەری تاكەكانی ئەو شارەدا بوونی هەیە، هونەر پێمان دەڵێت ئێمەیی شاری چۆن سەیری خۆمان و دونیا دەكەین، چۆن لەجوانی و ئیستاتیكا دەڕوانین.شاری پڕهونەر هەمیشە ڕێگەنادات هیچ بەیانی و ئێوارەیەكی شار دووبارە بێتەوە، ئەو شارەیی هونەر هونەرمەندەكانی سەرمەشق و چاوساغ و بیركەرەوەو نەخشە داڕێژەری دونیایی تاكەكانین، شارێكە هەمیشە ڕەنگینە و هەمیشە تەمەنی خۆی درێژ دەكاتەوە، بە ئارامی بە هێواشی دەچێتە ناو مێژووی هەموو ئەو شارانەیی ترەوە كە لە دەروازەی هونەرەوە خۆیان گەیاندوەتە ناو پەڕەكانی مێژووی جیهان. هەر نیشتمانێك دیوارەكانی بە ڕەنگی هونەر نەخشێنرابن، هەر جوگرافیایەك هونەر ڕەنگڕژێنی كردبێت، ئەوە لەو شوێنەدا داهێنەرو مرۆڤی بلیمەت و خاوەن بەهرە هەیە، ئیدی ئەو جوگرافیایە درەنگ یان زوو خۆی دەگەیەنێتە ئەوسەری لاپەڕە پرشنگدارو بە بەهاكانی مێژوو، زۆرن ئەو نیشتمان و جوگرافیایانەی هونەر بە شتی جوان و ڕەنگینەوە بەرەو هەوارو قوڵایی مێژوو بەڕێی كردوون، ((مۆنالیزا))یی داڤنشی و پەیكەری ((داودی)) ئەنجیلۆ تابلۆكانی ڤانكوخ و پیكاسۆ ئەو نیشتمان و خاكانەیان تا بنی مێژوو برد، بە هونەرەكانیان هەموو مرۆڤایەتیان قەرزاری خەیاڵ ئەندێشەیی كار هونەریەكانی خۆیان كرد.

بۆیە دەكرێت هەزارەها جەنگ و گۆمی خوێن و تراژیدیا و



حیکایەتـی مـردن، نەتوانێـت نەتەوەیـەك بباتـە نـاو مێـژووەوە بـە ئەندازەیـی ئـەوەی کارێکـی هونـەری داهێنەرانـەو بەهرەمەندانـە ئـەوە دەکات، ئـەوەی ئێسـتا نەتـەوەو شـارە زیندەوەکانـی دونیـا پێـوە خەریکـن و غەمـی گـەورەو حیکایەتـی یەکەمـی نـاو ئەندێشـەو خەیاڵدانیانـە، چـۆن بتوانـن بـە خێرایـی و بـە زووی لـە ڕێگـەی هەمـوو هونەرەکانـەوە، بەبـێ جەنـگ و تراژیدیایـی گـەورە گـەورە و کەمتریـن قوربانـی بچنـە نـاو لۆچەکانـی مێـژووە، ئێسـتا بەشـێکی گەورەیـی کلیلـی چوونـە نـاو پانتایـی و جوگرافیاکانـی مێـژووە، لـە دەسـتی ئـەو کەسـانە یـان داهێنـەرو بەهرەمەندانەیـە، لەنـاو سـەریاندا هونـەری بـاش هەیـە، لـە نوکـی پەنجەکانیـان ڕەنـگ و بۆیـە هەیـە، لەنـاو هەناسـەکانیان بـۆن و چێـژی دونیـا پەنهـان و پـڕ ڕازەکانـی هونـەر هەیـە.

بێگومـان مەبەسـتی ئێمـە هەمـوو ئـەو هونەرانـە دەگرێتـەوە کـە خزمەتـی مـرۆڤ دەکـەن، هەموویـان بـە جیـا و یـەك یـەك و دواجـار پێکـەوە ڕۆڵێکـی سـەرەکیان دەبێـت لەبـەرەو پێشـبردنی ڕەوتـی مێژوویـی و ژیـاری هـەر شـارێك. دەکرێـت ئـەم هونـەرە (هونـەری وێنەکێشـان و سـینەماو شـانۆو پەیکەرتاشـی) هەمـوو هونەرەکانـی تـر لەخـۆ بگرێـت و ڕەنگدانەوەیـان هەبێـت لەسـەر هەمـوو ئـەو هاوشـاریانەی لەناویـدا دەژیـن، لەهـەر کوێـدا ئـەم هونەرانـە هەمـوو شـاری جـوان و دڵنشـین و پـڕ ڕازو نیـاز و حیکایـەت هەیـە.







# 25/3/1991
# ڕۆژێکی خوێناوی له مێژووی شاری کەلاردا

مستەفا سەعید عەلی

ئەم بابەتە بەرهەمی چاوپێکەوتنە لەگەڵ
١- دکتۆر محمد امین میرزا غفور ٢٠١٦/٣/٢٥
٢- حمزه محمد درویش ٢٠١٦/٢/٢٠-١٩
٣- احمد کریم قادر ( ئەحمەدی کەریم خەیات ) ٢٠١٦/٣/٢٩
کە هەرسێ چاوپێکەوتنەکە بە دەنگ و ڕەنگ تۆمارکراون، بەڵام لێرەدا ویستم نەك بەشێوەی چاوپێکەوتن بەڵکو وەك دەقێکی ئەدەبی دایڕێژمەوە.

ڕۆژی ٢٥ /٣/ ١٩٩١ تەنها ( ١٦ ) ڕۆژ بوو ڕاپەڕینی شاری کەلار کرابوو، ڕۆژەکانی شار نائاسایی دەگوزەران، خەڵکی لە نێوان ترس و دڵەراوکێ و هیوادا کاتەکانی خۆیان دەگوزەراند، مەردوم دەیانزانی ئەو ڕاپەڕینە لە دژی ڕژێمی بەعس هەروا بە ئاسانی تێناپەڕێت و باجی قورسی لەدوایە، هەریەك لە هێزی پێشمەرگەو پاشماوەکانی سوپای عێراق هەوڵیانداوە سەرکەوتن بەسەر ئەویتردا تۆماربکەن، ئەو کات لە عێراقدا هێزێکی نەیار لە دژی ڕژێمی ئێران لە عێراقدا هەبوون پێیان دەوترا ( مجاهدینی خلق ) ئەم هێزە لەکاتی ڕاپەڕینی گەلی کورد زۆر بەهێزەوە بەرگرییان لە ڕژێمی صدام کرد و دەتوانین بڵێین ڕۆڵی گەورەیان بینی لە هێشتنەوەی لە دەسەڵات بۆیە لە ڕۆژی ١٩٩١/٣/٢٥ چوار تانك کە وێنەی

سەرکردەکانی کورد هەڵدەگرن خۆیان دەکەن بە شاری کەلاردا بۆ ئەوەی خەڵکی وابزانن ئەمانە پێشمەرگەن و ئەو تانکانەیان لە سوپای عێراق بە غەنیمەت وەرگرتووە.خەڵکیش وا دەزانن ئەمانە پێشمەرگەن و لەدەوریان دەئاڵێن، بەڵام دواجار زانرا ئەمانە هێزی مجاهدینن و دەیانەوێت هەرچۆنێك بێت خۆیان بگەیەننە بەرزاییەکانی بەردەسوور و لەوێوە بۆمبارانی ناوشار بکەن، شڵەژان و نائارامی لە شاردا دروست بکەن و هێزی پشتیوانی بە دوایاندا بێن و شاری کەلار داگیربکەن.

بەڵام ئاشکرادەبن و ناتوانن بگەنە شوێنی مەبەست، بۆیە هەر لە دەروازەی شار دەستدەکەنەوە و لە گردەگۆزینە (کریم عبدالرحمن) شەهید دەکە و برایەکی شەهید شوان گەرمیانی کە مێردمنداڵ بوو گوللەیەم بە سووکی بەر بشت ئەژنۆی دەکەوێت، ئەم منداڵە دەستی بە دەستی ئەحمەد محەمەدەوە بووە. کۆمەڵێك خەڵکی سڤیل شەهیددەکەن کە "علی عبدالرحمان" یەکێك لەوانەبوو، هەرلەوێدا پێشمەرگە لێیان دێنە دەست و دوان لە تانکەکان دەسوتێنن و سەرنشینەکانیان دەکوژن بەڵام دوانەکەی تر دەرباز دەبن و دێنە ناو شارەوە، لە بەرامبەر نەخۆشخانەی کەلار دەستدەکەنەوە و کۆمەڵێك خەڵك دەکوژن، دکتۆر محمد امین میرزا شۆفێری ئەو ئۆتۆمبێلە دەبێت کە مجاهدین لێی دەدەن بەو جۆرە ڕووداوەکەی بۆ گێرامەوە:

پێش ڕووداوەکەی ١٩٩١/٣/٢٥ بارودۆخی کەلار نائارام بوو، بەردەوام بۆردومان هەبوو فڕۆکە دەهاتنە سەرکەلار و لە دوورەوە تۆپی تێدەگیرا لەو کاتەدا من بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی گشتی کەلار بووم، دوو پزیشکی کچ بەناوەکانی جوان ڕۆوف - خەڵکی موصل - و ضحی فاضل - و لەیلای خوشکی کە ئەندازیاری کشتوکاڵ و لەگەل ضحی ی خوشکی هاتبوونە کەلار بۆ ئەوەی بەتەنیا نەبێت

لـە نەخۆشـخانەی گشـتی کـەلار دەمانـەوە، لای بەیانییەکـەی ڕۆژی ٣/٢٥ لـە نەخۆشـخانەوە تەلەفۆنیـان بـۆ کـردم کـە بـارودۆخ نائارامـە و بێـم بیانبەمـەوە ماڵـەوە، منیـش بەدەمیانـەوە چـوم و لەگـەڵ منداڵەکاندا چویـن بـە شـوێنیاندا و هێنامـن بـۆ ماڵـی خۆمـان دەنگـی تـۆپ دەهـات، بیسـت مەترێـك لـە نەخۆشـخانەکە دوورکەوتینـەوە چاومـان بـە شـاعیر کاك محمـد پـەژار کـەوت نازانـم بۆچـی هاتبـووە نەخۆشـخانە وتـی: دکتـۆر بامنیـش لەگەڵتـان بێـم ئەویشـمان سـوارکرد. گەشـتینە نزیـك شـەقامی گشـتی هێنـدەم زانـی ئۆتۆمبێلەکـەم کـە سـۆپەرێکی مۆدێلـی ١٩٨٥ بـوو بەرزبـووەو داکـەوت! ئیـتر لێـمان بـوو بـە قیامـەت هەرکـە دابەزیـم و سـەیری دواوەم کـرد هەرچـی لـە دواوە بـوون هەموویـان پێکرابـوون کاك پـەژار هەرلەوێـدا گیانـی سـپارد! سـەلاری کچـم کەلەباوەشـی دکتـۆرە جـوان دابـوو ئەوانیـش دەسـتبەجێ مـردن، دکتـۆرە ضحـی و لەیـلای خوشـکی هەریەکـەو قاچێکیـان پەڕیـوو، بـەڵام سـەحەری کچـم کەلەباوەشـی کاك محمـد بـوو هیچـی لێنەهـات، بـەڵام وتـی: باوکـە هەسـتمکرد گەرمییـەك بـە پشـتمدا ڕۆیشـت مەعلـوم گەرمایـی ئـەو فیشـەکانە بـوو کـە لەسـنگی شـەهید محمـدی دابـوو. خێزانـم نزیـك ٤٠ – ٥٠ پارچـەی بەرکەوتبـوو بـەڵام برینەکـەی سـوك بـوو ئـالان و ئاراسـی کوڕیشـم بەهەمـان شـێوە پارچەیـان بەرکەوتبـوو، برادەرانـی نەخۆشـخانە هەرکـە بـە وەزعەکـە یـان زانـی دەسـتوبرد هاتنـە سـەرمان و تـەرم و بریندارەکانیـان بـردە نەخۆشـخانە، کـەس و کاری شـەهید محمـد هاتـن و تەرمـی شـەهید محمـد پەژاریـان بـردەوە، تەرمـی سـەلاری کچیشـم هـەر لـە نەخۆشـخانە مایـەوە، یەکسـەر دکتـۆر حیدر عەلـوەش کـە دکتۆرێکـی عەرەبـی خەڵکـی نەجـەف بـوو هـات پێکـەوە کەوتینـە تیمارکردنـی بریـندارەکان کـە دکتـۆرە ضحـی و لەیلای خوشـکی و چەنـد بریندارێکـی تـر بـوون، بـەڵام وەزعـی هەردووکیـان زۆر خـراپ بـوو یەکـی قاچێکیـان پەڕیـوو و خوێنیـان لەبـەر دەڕۆشـت، لـەو کاتەدا پیاوێـك کـە برایەکـی بریـندار بـوو هـات و وتـی: براکـەم دەبـەم بـۆ

سلێمانی، ئێمەش وتمان ئەم دوو كچە لێرە چارەسەریان بۆ ناكرێت لەگەڵ خۆت بیانبە بۆ نەخۆشخانەی سلێمانی، كە دەیانبات لە نزیك شارەدێی باوەنور تەندروستی هەردووكیان بەیەكجاری تێكدەچێت و لایاندەداتە نەخۆشخانەكەی باوەنور لەوێ هەردووكیان كۆچی دوایی دەكەن و خەڵكی باوەنور زۆر مەردانە دەچن بە دەمیانەوە و تەرمەكانیان لە نەخۆشخانە دێننە دەرەوە پورێ " زەینەب ئەمین فازڵ " تەرمەكانیان دەشۆرێت لە گۆڕستانی باوەنور بەخاك دەسپێردرێن.
ئەو كاتە كەلار زۆربەی خەڵكەكەی چۆڵیان كردبوو گەڕابوونەوە بۆ زێدی ئەسڵی خۆیان واتە گوندەكان، بەڵام ماڵی كاك محمەدی حاجی وەلی و كاك ئەحمەد و عەباسی برای هەركە هەواڵەكەیان بیستبوو لەگەڵ كۆمەڵێك گەنجی خانەقین بەدەمیانەوە هاتن و تەرمی سەلارمان برد لە گۆڕستانی بەرلووت بەخاكمان سپارد.
حمزە محمود درویش كە خۆی و براو خوشك و ئامۆزاكانی یەكێكن لە قوربانیانی ئەو ڕوداوە بەوجۆرە باسی ڕوداوەكەی خۆیانی بۆ گێڕامەوە.




سێ دكتۆرە شەهیدەكە

ڕۆژی ٣/٢٥ نزیکی کاتژمێری ٨,٣٠ – ٩ ی بەیانی دەبوو ئێمە ئەو کات ماڵمان لەسەر جادەی کەلار – سلێمانی لە گەڕەکی حەمەی کەریم بووین، منداڵبووین یاریمان دەکرد لە کۆڵان، تانکێکمان بینی بەسەر جادەکەدا تێدەپەڕی وێنەی سەرکردەکانی کورد ( مام جەلال – کاك مسعود )ی هەڵواسیبوو گوێمان لێبوو خەڵکەکە وتیان ئەمانە پێشمەرگەن و پاشەکشەیان کردووە، مام حسێن لۆرییەکی هەبوو پێش وەختە ئامادەکرابوو چادر درابوو بانگی کردین و تەواوی خێزانەکەمانی سوارکرد و ئێمەش بەڕێکەوتین تا بچین بۆ باوەنور کە شوێنێکی ئارامتربوو، هەرکە هاتینە سەر جادەکە چەند پێشمەرگەیەك بە چەکەوە لەگەڵمان سواربوون، کە گەشتینە ملەی بەردەسوور پێشی یەکێك لە تانکەکان کەوتین، یەکێك لە سەر نشینەکانی تانکەکە هەر کە پێشمەرگەکانی بینی پێشبینی ئەوەی کرد پێشمەرگەکان تەقە لە تانکەکە بکەن و بیسوتێنن بۆیە سەری لە تانکەکەوە دەرهێناو RPG یەکی نابە سەیارەکەی ئێمەوە و بەر ئاسنی چادری ئۆتۆمبێلەکە کەوت و تەقییەوە و هەرچی ئەوانەمان لەبەشی دواوەی لۆرییەکەوە بوین بریندربووین کە بریتی بووین لە ( حمزە واتە خۆم، هیوای برام و شیلانی خوشکم و خەندەو مژدەی ئامۆزام ) و مام حسێن کە شۆفیربوو بوو، هێشتا بەو ڕوداوەی نەزانیبوو ڕۆیشت تا لەنزیکی گوندی بەرلوت ئۆتۆمبێلەکە بەهۆی بەرکەوتنی پارچەیەك بە ڕادێتەرەکەی ئیتر وەستا! لە بەرلوت دایانگرتین، کەس بەکەس نەبوو نزیکەی نیوسەعاتێك لەسەر جادەکە دایاننایین تا کاك ( خلیل ی حاجی احمد ) کە پورزای دایکمە هات هەرکە ئێمەی بینی منداڵەکانی خۆی لە ئۆتۆمبێلەکەی داگرت و ئێمەی سەرخست و بردینیە نەخۆشخانەی باوەنور، لە باوەنور وتیان برینەکاناتان سەختە و ناتوانین چارەسەریان بکەین بۆیە ڕەوانەی سلێمانییان کردین، بەڵام تا ئەو کاتە هەر هۆشمان بەخۆمانەوە بوو. لە ڕێگە لایاندایینە نەخۆشخانەی دەربەندیخان

لەوێ هەندێك چارەسەریان بۆ كردین ماڵی مامێكم لە دەربەندیخان بوو پاسێكی هەبوو ناردیان بە شوێنیدا هات و بە پاسەكەی ئێمەی گەیاندە سلێمانی و براینەی نەخۆشخانەی فریاكەوتن تا ڕۆژی ٤/١ كە كۆڕەوەكە دەستیپێكرد ئێمە لە نەخۆشخانەی فریاكەوتنی سلێمانی ماینەوە، لەوێ هەندێك نەشتەرگەرییان بۆ كردین، من هەندێك پارچەیان لە جەستەم دەرهێنا و هیوای براشم كە لەخۆم منداڵترە قۆڵێكیان بڕییەوە. خزمانی تاسلوجەمان بە زۆری لامان دەمانەوە لە نەخۆشخانەی شەوێكیان كاك وەهابی حاجی محمد – وەهاب خەیات – كە خزمان بوو لە كەلارەوە هاتبوو بۆ لامان، یەكدوخزمی تاسلوجەشمان لەو كاتەدا هاتنە سەردانمان كە هاتن وتیان سلێمانی چۆڵی دەكات و تاسلوجەش لەلایەن سوپای عێراقەوە گیراوەتەوە. ئەو كاتە ئێمە تەنها چواركەسمان لە نەخۆشخانە مابووینەوە ( من و هیوای برام و خەندە و مژدە ) شیلانی خوشكم لەبەرئەوەی برینەكەی سوك بوو لە نەخۆشخانە دەركرا، بینیمان هەر خەڵكەو دێن و نەخۆشی خۆی دەباتەوە ئێمەش بەهەموومان ١١ كەس بووین، سواری ئۆتۆمبێلەكەی كاك وەهاب بوین كە جۆری بەرازیلی بوو لە باشترین حاڵەتدا شوێنی ٥ كەس بوو. كە هاتینە دەرەوە دەبینین شار چۆڵی دەكات، تا عەربەت جادە هێندە قەرەباڵخ بوو بەخێرایی عەرەبانەیەكی دەستی دەڕۆیشتین. لەگەڕانەوەدا چوینە گوندی دێ سوتك لەسەر سنوری ئێران، خەڵكێكی زۆر لەوێ كۆبونەوە هەرچۆن بێت ئەو شەوە ئێمەیان لە چادرێكدا دانا، بۆ بەیانییەكەی ئێمە هەر چوارمان براینە ئێران، باوكم و مامۆژنێكیشم لەگەڵمان هاتن، هەركە لە سنوور پەڕینەوە ئامبۆلانسێكیان هێنا و ئێمەیان بردە نەخۆشخانەی قەسری شیرین و هەندێك عیلاجیان بۆ كردین. دوای ئەوە ڕەوانەی نەخۆشخانەی ئیمام حسینی شاری كرمانشان كراین. لەوێ نەشتەرگەرییان بۆ كردین و نزیكەی مانگێك لەوێ ماین، دوای مانگێك هاتن وتیان: دەبێت هیوا و حمزە ببرێن بۆ تاران

چونکە چارەسەری کۆتایی لەوێ بۆیان دەکرێت. خەندەو مژدەش دەبێت لێرە بمێننەوە، هەرچۆنێك بێت هیواو خەندەو مژدە لە کرمانشان مانەوە وە من برام بۆ تاران باوکم لەگەڵ بوو، بە فرۆکە بردیانین، کە لە فرۆکەخانە دابەزین وتیان نابێت هاوڕێکانیان لەگەڵیان بێن باوکم دەستی کرد بە هاوارکردن و وتی من حمزە جێناهێڵم هەرچۆنێك بێت ڕێگەیاندا لە ئامبولانسەکە لەگەڵم سواربێت ئەوانەی دی لەگەڵ نەخۆشەکانیان نەهاتن هی وایان هەبوو چوار مانگ بوو نەخۆشەکەی نەدۆزیبووەوە. لە تاران براینە نەخۆشخانەی ( فیروزگر )، لە فیروزگر بە باوکمیان ووت: دەبێت حمزە قاچی ببڕیتەوە، چونکە لە سێ شوێنەوە قاچم شکابوو، باوکم قبوڵی نەکرد و ووتی دەیبەمەوە با هەرچی لێدێت هیوام قۆڵێکە براوەتەوە قاچی حمزەش ببڕنەوە ئیتر چیم بۆ دەمێنێتەوە. دەمەوێت لێرە بوەستم، کاتێك ئێمە لە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی سلێمانی بووین سێ خوشکم بران بۆ تاسلوجە بۆ ماڵی خوشکێکی مامۆژنم گەورەکەیان تەمەنی ١٥ ساڵ بوو، کاتێك سوپای عێراق بەرەو تاسلوجە دێن ماڵی ئەو خزمەمان هەڵدێن بۆ ڕانیە، ساڵێك و یەك ڕۆژ ١٩٩٠/٣/٢٦ دایکم کۆچی دوایی کردو سێ کوڕ و چوار کچی منداڵی لە شوێن جێما، کۆستی دایکم هێشتا قەتماغەی نەبەستبوو ئێمە ئەو کارەساتە سەختە لێمان ڕویدا، ئەوە وەزعی من و هیوا بوو، ئەو سێ خوشکم ئاگامان لێیان نەبوو و نەماندەزانی چییان بەسەرهاتوە، خوشکێکم لەگەڵ مامم کەوتبووە ئۆردووگای گردەنوو، کاتێك دایکم کۆچی دوای کرد عەلی برام تەمەنی ( ٤ ) مانگان بوو پورێکم بردیە لای خۆی و لەگەڵ ئەواندا کەوتبووە ئۆردوگای گەیلان غەرب، سەیرکە! من لە تاران، هیوا لە کرمانشان، سێ خوشکم لە ڕانیە، دوو خوشکم لە گردەنوو، علی برام لە گێلانی غەرب، کەسیشمان ئاگامان لە کەسمان نییە و نازانین ئەوانی ترمان لە کوێن وەزعێکی زۆر ناخۆشبوو تا دواتر کە دۆخەکە ئاسایی

بـووەوە لـە ڕێگـەی ئێسـتگەی دەنگـی گـەلـی کوردسـتانەوە یەکتریـان دیتـەوە!

لـە تـاران هەروامایـنـەوە و دەیانـوت نابێت بچنـە دەرەوە ڕۆژانـە تیماریان دەکـردم ڕۆژێکیـان باوکـم بـۆ کڕینـی هەندێـك شـتوومەك دابەزیبوو لە بـەردەم نەخۆشـخانەکە کاك محەمـەدی خزمـی کرمانشـانیهانی بینیبـوو لەگـەڵ پیاوێکـدا هاتبوونـە سـەردانمان، باوکـم هەواڵـی منداڵەکانـی لێپرسـیبوو ( واتـە بـراو خوشـکەکانم )لـە کاك محەمـەدی پرسـیبوو ئەمجـار پێـی وتبـوو دەنگوباسـی حسـێن بـرام، محمـد وتبـووی ئـەوە حسـێنە لەگەڵـما ( مامـم حسـین ) هێنـدە سەروڕیشـی هاتبـوو لـەڕولازو پڵمـژاو بووبـوو باوکـم نەیناسـیبووەوە هـەر لـەوێ دەسـت لـە ملـی یەکتر دەکـەن و هێنـدە بەسـەریەکتردا دەگریـن هەرچی لـەو گـۆزەرەوە دەڕوات لێیـان کۆدەبنـەوە، باوکـم هاتـە سـەرەوە وتـی : حمـزە مـژدە بزانـە کـێ هاتـووە بـۆ سـەردانت کـە بینیـم مامـم حسـێن بـوو ئیـتر خـودا دەزانێـت بـەو منداڵـی خۆمـەوە چەنـد دڵشـاد و خۆشـحاڵ بـووم چوارمانـگ بـوو کـە کەسـێکی خۆمـم نەبینیبـوو.



مامـم: وتـی نیازتـان چییـە؟ باوکـم زۆر هەوڵیـدا ڕێگەیـان نـەدا بێنـە دەرەوە، تـا دواجـار بـە نافەرمـی و بەڕێگەیەکـدا هاتینـە دەرەوە و هاتینـە کرمانشـان مـن هێشـتا نـەم دەتوانـی بـڕۆم شـەوێك لـە کرمانشـان بوویـن بـۆ سـبەینی هاتینـەوە گردەنـوو دوای دوو ڕۆژ گەڕاینـەوە عێـراق.

پەیوەسـت بـۆ کارەسـاتەوە کەسـی سـێیەم کـە قسـەمان بـۆ

دەکات مامۆستا ئەحمەد کەریم قادر ( ئەحمەد کەریم خەیات )
ئەویش لەگەڵ ئەم ڕووداوەدا یادەوەرییەکی هەیە لەو بارەیەوە بۆی
گێڕامەوە ووتی : ساڵی ١٩٩٢ قۆناغی چوارەم بووم لە زانکۆی
المستنصریه بۆ تطبیق چوومە یەکێك لە قوتابخانەکانی بەغداد، بۆ
تۆمارکردنی پەیوەندیکردنمان بەڕێوەبەر ناردینییە لای یاریدەدەرەکەی
کە ناوی " فاضل فرهود عوده " بوو

کە هاتە سەرەی من وتی خەڵکی کوێیت ؟ ووتم : سلێمانی
ووتی مەرکەزی شار ؟ ووتم : نەخێر قەزای کەلار
کەوام ووت یەکسەر دەستی بە گریان کرد کە هێوەربووە وە
وتم : مامۆستا بۆ چی دەگریت، ووتی : دووکچم لەکەلار شەهید
بوونە. منیش یەکسەر زانیم د.ضحی و لەیلای خوشکیەتی. وتی
بۆچی نەتانتوانی بەرگرییان لێبکەن و نەکوژرێن، منیش باس و
ڕوداوەکەم بۆ گێڕایەوە کە چۆن بووە. ووتی : دەتوانی سۆراخیان
بکەیت لە کوێ بەخاك سپێردراون و گۆڕیان لە کوێیە ؟ منیش
بەسەرچاوم ووت. سەبارەت بەوەی چۆن زانیبویان کچەکانی
کوژراون دوای هاتنەوەی سوپای ڕژێم هاتبوونە کەلار، دیارە لە
ڕێگەی هاوڕێیانی نەخۆشخانەوە زانیبێتیان، کە گەڕامەوە بۆ کەلار
سەردانی نەخۆشخانەی کەلارم کرد لە ڕێگەی یاریدەدەری پزیشك
کاك اشرف امید جاسم پرسیارم کرد وتی خاتوو نەسرین محی الدین
زانیاری زیاتری لایە، کە پرسیارم لە نەسرین خان کرد وتی :
بەڵێ هەردووکیان مردن و دایکم شۆردنی و لە گۆڕستانی باوەنور
بە خاك سپێردراوون، لەگەڵ برادەران حامدخلیل محمد، فتح الله
شمس الله، جلال ملك علی، اشرف امید جاسم چوینە باوەنوور و
لە ڕێگەی پیاوێکەوە ناوەکەیم بیر نەماوە گۆڕەکانمان دۆزییەوە و
دوای ئەوە چوینە لای پارتی و یەکێتی پارتی گەلی هەندێك پارەمان
کۆکردەوە و قەبرەکانیانمان هەڵواسی و وێنەم گرتن و بردم بۆماڵیان

لە بەغداد، پرسیارم کرد بۆچی نایەن ڕووفاتی کچەکانتان ببەنەوە، وتیان ئەگەر دەزانیت لە گۆڕستانێکی دیار و لەگەڵ خەڵکانێکی باشدا نێژراوون با هەر لەوێ بمێننەوە نایانهێنمەوە، دوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام باوك و دایکی هاتنە سەردانیان و هەرکە بینییان گۆڕەکانیان هەڵواسراوە و زانیاری تەواوی لە سەرنوسراوە جارێکی تر تەئکیدیان کردەوە با میوانی ئێوەبن و نایانبەینەوە!



دکتۆر محمد امین میرزا غفور



حمزە محمد درویش



احمد کریم خەیات

# چەپکێك وشەی گەرمیانی



کۆکردنەوە: ساڵەح هەلاج

ئـەم کۆمەڵـە وشـە لـە بەردەسـتاندایە مشـتێکن لـە خەرمانێکـی دەوڵەمەنـدی ئاخێـوەری ناوچەکـە، بـە هـۆی تێکـەڵاوی نەتـەوە و کـۆچ و کۆچـڕەوی هاوشـاری و هـاو گونـدی و هاودینـی و ژن و ژن خوازییـە بوونەتـە زار و بنـزاری دەڤەرەکـە.

دەبینیـن زۆر وشـە هـەن لـە دووزمـان پێکهاتـووە ئـەوە سـەلمێنری ژیانکـردن و بـێ جیـاوازی یەکـتر بوونەتـە وشـەیەکی داڕێـژراوی ڕۆژانـە.

تایبەتمدیەکانـی دەڤـەری گەرمیـان زۆر و فـرەن، نەکـراوە ناکـرێ ڕچاوی سـەدان سـاڵەی ئـەو برایەتـی و پێکـەوە ژیانـە وشـەی نەکەوێتـە نـاو زمانـەوە.

ژیانـی ئێـرە تەنها لـە زمانـدا نەبـووە بگـرە لـە خزمایەتـی و هانیشـتهانیدا بەیەکـەوە گرێـدراوون، لـە کار و پیشـەیدا هاوبەشـبوونە.

ئـەم بابەتـە مەڵـۆی وشـەدانێکی تایبەتـی ناوچـەی گەرمیانـە بـە پەنـای خـوا.

## وشەدانی گەرمیانی

### ئا.

- ئابە: بیهێنە، بمدەرێ، کەسێك شتێك لە کەسێکی تر وەربگرێ بە دەنگ داوای بکات.
- ئاتەگ: داوێنی کەواو کراسی ژن.
- ئاچوخ: ڕەنگی کراوە.
- ئاخر شەڕ: پیری خێر لە خۆ نەدیو.
- ئاشەوان: وەستای ئاش و ئاسیاو.
- ئاخرخێر: پیری خۆشگوزەران.
- ئاخێز: هەستان، دەرەنگ ئاخێز، تەمەڵ.
- ئاردەوا: چَشتێکە لە ئارد و ئاو و ڕۆن و شەکەر دروستدەکرێ زیاتر بۆ ژنی زەیستان.
- ئارەق چن: دەستماڵ.
- ئاژاژك: باوێشك، ئاژاژکە. دەمەکاوکێ.
- ئاژن: زۆر کونکردنی شتێك، دەرزی ئاژن.
- ئاژنگ: دۆشدامان، کەسێك داماو خەمباربێت دەڵێن ئاژنگی داوە.
- ئاسیاو: ئاشی ئارد هاڕین، مەکینەی ئارد هاڕین.
- ئاغا: سەرۆکی هۆز.
- ئاغا ژن: هاوسەری ئاغا.
- ئاڵفتە: خوو پێوە گرتن.
- ئاگرە: هەڵزنانی دەم و لێودا برینێکە لە دەمو چاودا پەیدا دەبێت.
- ئامۆژن: ژنی مام.
- ئاوایی: ئاوەدانی، گوند، دێهات.
- ئاوزەنگی: دوو پارچە ئاسنە کەوتۆتە ئەملاو ئەولای زینی ئەسپ و مایین سوار پێی لە سەر دادەنێن لە کاتی ئاژۆکردندا بە پێ

دەیسرێوێننـە قەبرغـەی ئاژەڵەکـەدا.

• ئـاو ڕۆشـنکەرەوە: جـۆرە مێرویەکـە ڕەش و سـوورە لـە ئـاوی لێڵـدا بـە پەلـە دێـت و دەچێـت.

• ئاوس: سك پڕ. مرۆڤ یان ئاژەڵی دووگیان.

• ئاو سیاگ: ئاوساو، ئەستوور بوون، تلۆقەکردنی پێست،

• ئەوقات زل: خۆبەزلزان، لە خۆبایی، بنەچەی وشەکە پارێزەرە.

• ئاوەڵە: جۆرە نەخۆشییەکی پێستی مرۆڤ تووشی خوران دەکات.

• ئاوەلەم: ئاولەمە، بێچوی ناوسك کە هێشتا خۆی نەگرتبێ.

• ئاوماڵکە: چیلکە و چوڵی بەردەم لافاو.

• ئاوەخۆرە: ئەو دەفرەی ئاوی پێدەخورێتەوە.

• ئاوەدان: شوێنێك خەڵکی تێدابێت، گوند شار.

• ئاوەچۆڕ: هەر شتێك تەڕبێت و ئاوەکەی بچۆڕێ.

• ئاودز: تەشەنەکردنی برینێك بە هۆی تەڕبوونی بە ئاو.

• ئاوەکوڵ: ئاوی گەرم.

• ئۆغر: کەسێك سەفەربکات.

• ئۆین: ئاژاوە، وەکو دەڵێن ئۆین باز.

• ئەتك: سوکایەتی پێکردن، ئەتکی کرد

• ئەتوار: ڕەوشت، ئاکار..

• ئەزنەك: هەوڵدان لە دانیشتنەوە بۆ هەستان.

• ئەژدیها: ماری زۆر گەورە.

• ئەسپایی: هێواش و لە سەرخۆ.

• ئەسـپوون: بنەگیایەکـە کـەف هەڵدەخـات، جـاران لـە جیاتـی تایـت و سـابوون بەکاریـان دەهێنـا. سـابوون لـە ئەسـپوون وەرگیـراوە.

• ئەسمەر: گەنم ڕەنگ.

• ئەسمەر پێچ : بەنی ڕەنگاوڕەنگ چیخ و ڕەشماڵیان پێ دەپێچا.

• ئاش: چێشت.

• ئامێتە: تێکەڵ. ئامێتکردن.

• ئاوایی: گوند، دێ.

• ئەمەسە: ئەمەیە.

• ئەنجن: وردکرد.

• ئەنجەت: بەهانە.

• ئەیقەرە: هێندە، ئینقەرە.

## ب

• بابا: باپیرە، بەڵێ بەڵێ.

• بابۆڵە: پارووی درێژ، لەفە، سەندویچ.

• بابڕ: پڕ، چڕ.

• باوەخولـێ: یارییەکـی منـاڵان بـوو بـەدەوری خۆیانـدا سـووڕیان دەخـوارد.

• باپەڕ: سەرما بردوو، هەڵامەت.

• باپێچ: ژانە سك.

• باخەڵ: گیرفانی سەرسنگ، کۆش.

• برك: ژانە سك.

• باوش: کۆش، ئامێز.

• باوڵ: جانتا، کیف.

• باوەلـێ: باپیرە.

• باوەخون: چوونەوەی یەکەمجاری بووك بۆ ماڵی باوان.

• باوەگێژە: خولانەوە، گەردەلول.

• بایەم: بادەم.

• بایـەف: دەوەنێکـە، لـە ناوچـە گـەرم و سـاردەکان دەڕوێ و پێشـی دەڵێـن چەقاڵـە گەڵاکانـی ئـاژەڵ دەیخـوات و بەرێکـی تۆیـکڵ ڕەقـی هەیـە خۆشـە دەکـرێ و دەخـورێ.

- بایەقوش: کوندەپەپوو.
- بەچکە: بێچوو،بەبێچێووی ئاژەڵ و پەلەوەر دەوترێ.
- بخەفە: بخەوە، بنوو.
- بچەمە: بنوشتێرەوە. بچەمێیەوە
- بڕبڕە: کاریتەی پشت، عەمود فەقەری.
- بڕەمە: تاودە، بێرەڕێوە.
- بریق و باق: ڕەنگاو ڕەنگ، تروسکە دانەوە.
- برینە: کردنەوەی خوری و مو و بەرەگن لە ئاژەڵ.
- بزرکا: تێك چوونی شیر و ماست.
- بزنەمژە: جۆرە گیاندارێکە وەکو قومقۆکە.
- بژنە: قژن، کەسێك قژەسەری زۆربێت، بژنە سەرە.
- بژی: جۆرەکولیچەیەکی کوردواریە
- بڵامـك: بزمـك، دارێکـی بچووکـە ئـەم سـەر و ئەوسـەری بـە بـەن دەسـترێ و دەکرێتـە دەمـی بێـووی هـەراش تـا نەتوانـێ گوانـی دایکـی بمژێ.وەکـو لەغـاوی ئەسـپە.
- بوغاز: گۆماوی بن شاخ
- بوغز: کینە لە سك.
- بۆیەمە : جۆرەقوماشێك بوو ژنان دەیانبەستە سەریانەوە.
- بۆز: ڕەش و سپی بۆر و بەڵەك.
- بەرەگن: تووکی بەرخی یەك ساڵە.
- بـەڕەزا: گیایەکـە لـە شـوێنەئاوەدارەکان دەڕوێ بـۆ نەخۆشـی گورچیلە باشە.
- بەرەزوانـە: بەرەزمانـە، ئاسـنێکی باریکـە لـە نـاو گەوێـی قایشـی پشـتوێن دەکرێتـە
- بەچـەوازی: تورەبونێکـە لـە منـاڵ، بـەڵام هـەردوو وشـەکە دەبێتـە یانـی یـاری مناڵانـە.

• بەران پێڵ: بەروانکەی ژنان لە کاتی ئیش و فەرماندا.

• بەدەن: جەستە.

شێخ مارفی نۆدێ لە فەرهەنگی ئەحمەدیدا دەڵێت:

رأس سەرە عەین چاوە..... بەدەن قالب ایسم ناوە.

• بەراو: بێستان.

• بەربووك: پێخەسوو: ژنێك لە گەڵ بووكدا بچێت بۆ ماڵی زاوا.

• بەراویتە: لە بارچوونی بەچکەی ئاژەڵ بەناکامی.

• بەگەن: پەسەن.

• بنە: حەشارگە، بنکە.

• بنەوانە: بەربەستکردنی ئاو بەلایەکی پێویستدا بڕوات

• بەلەفیرە: سکچوونی ئاژەڵ.

• بەلەسە: شێت، یاخی، هاربوون.

• بیلەم : بمهێڵە، بم تێڵە.

• بیلەمان: بمان هێڵن.

• بیلەی: بیهێڵە.

پ

• پاپاچینە: پێ لیکانە، نەردەوان.

• پاپۆش: کەوشی مناڵانە.

• پاتاڵ: شڕ و وڕ بێ کارە.

• پاتە: کەوش و پێڵاو.

• پاتیلە: مەنجەڵی بچووك.

• پاچ: تەوەر.

• پارسەنگ: کێشی بەرانبەر بۆ یەکسانکردنی ترازو یان باری ئاژەڵ.

• پاسار: گوێسەوانە، سوانەی خانوو، نیومەترێك لە دیوارەکە دێتە

دەرەوە.

• پاروین: گوێرەکەی یەك ساڵە.

• پاشقول: پێخستنە بەر پێی کەسێکی تر تا بکەوێ. پاشقول لێدان.

• پاشمەلە: زەمکردنی کەسێك کە خۆی ئامادەنەبێ.

• پریاسکە: پارچە پەڕۆیەکە شتی تێدا گرێدرابێ.

• پرپۆڵ: کەل و پەل.

• پۆرك: پێخەف، نوێن.

• پەخشە: مێشوولە.

• پەرێز: ناوچەی قەدەغەکراوی پاوەن بۆ ئاژەڵ، جاڕی خەلە. شوێنی خۆحەشاردانی ڕاوچی.

• پەز: مەڕ.

• پەشتەماڵ : خاولی.

• پشکوژ: دووگمە، قۆپچە، خونچەی گوڵ.

• پەموو: لۆکە.

• پەلۆشە: گیایەکی ساقەت ئەستوورە بە وشکی چاك دەسووتێ.

ت

• تاتە: خوشکی گەورە.

• تاتەشۆر: تەختەبەردێکی پان مردوویان لە سە دەششت.

• تابڕ: نوشتە و دۆعا بۆ نەمانی تای نەخۆشی

• تارم: خەرمانی کوتراو،

• تارمە: بەرهەیوانی ماڵ.

• تاس کڵاو: کڵای بە زێڕ و زیو چنراوی ژنانە.

• تاسوق: ئارەزووکردن، تاسە.

• تامەزرۆ: ئارەزوکردن، ئاواتخواز.

• تامێسـك: زیتكـەی ڕوومـەت و دەم وچـاو. نەخۆشـیەكە لـە تـای گەرمـەوە هاتـووە.

• تاف: هەڕەتی گەنجی / تاف جوانییەکەم بەی وە دماوە
گلەیی پیری بکەم وەلاوە. فۆلکۆلۆر.

• تافتە: پەڵكی زۆر سفت بۆ بێژنی ئارد.

• تاق: پەنجەرەی بچووك، دەلاقە، ڕۆژچنە.

• تانوپۆ: پیاهەڵكوتن، وەسفکردن. ڕاهێڵ و تیوەدانی فەرش.

• تانووت: سەرکونەکردن، ڕەخنە، سەرزنشت.

• تانـە: پەڵەیەكـی سـپییە دەكەوتـە سـەر بیلبیلـەی چـاو، ڕەخنـە، سەرزنشـت.

• تـاودە: بـە پەلـە ڕۆیشـتن، هێـرش كـردن، پەلامـاردان. غـاردان بـە ئەسـپ.

• تایە: جێژی خەرمان

• تەپـان: گێرژنـە، دارێـك یـان بەرێكـی پـان دەخرێتـە ژێـر سـتوونی دەرگا لـە سـەری دەوسـتێ.

• تەپاندن: تێئاخنین، دەر یان هەرشتێ بە زۆر شتی تێئاخنی.

• تەپاوتڵ: سەرمە و قۆلاج، بەلاو بەولادا كەوتن.

• ترازوو: ئامرازی كێشان، قەپان.

• ترپە: دەنگە دەنگی پێ.

• ترپ: توور سەوزەیەكە خواردنی بە سوودە.

• ترۆزی: خەیاری ناو چەم.

• تروشكە: گیایەكی گەڵا پانی بەهاریە تامی ترش و مزرۆكەیە، .

• تفت: توون.

• تفانەوە: هەڵهێنەوەی خواردنی ناودەم.

• تكـە: دڵۆپـەی ئـاو لـە خانـو، دڵۆپـەی ئـاوی كـەم لـە ئەكـەوت و كەڵـۆز.

• تلۆقە: ئاوسان لە ئەنجامی سووتاندن.
• تلیلی: هەڵهەڵەی ژنان لە خۆشی و شاییدا.
• توانج: تانە، تانووت، سەکۆنەکردن/ تیرو توانج.
• توخم: نەژاد، ڕەسەن. توخمە سەگ. ئید.
• تۆڕ: وڵاخی بزێو، تۆڕی ماسی و ئاژەڵ و باڵندەگرتن.
• تورت: شتێك زوو بشكێ، تامێكە لە دەمدا
• تورخە: ئینتەلاکردن لە ئەنجامی زۆرخواردن.
• توورەکـە: دەفرێکـە شـتومکی تێـدا هەڵدەگیـرێ، بەوەیـش دەوتـرێ ئالكـی ئاژەڵـی تێدەکـرێ و بـە سـەریەوە هەڵدەواسـێ.
• تووشکە: گیایەکی گەلاپانی بەهارییە و تامی ترش و مزرۆکەیە.
• تولێنە: ئەوکەرەستانەی بە تولی دار دروست دەکرێ وەکو سەوەتە.
• تومەز: وتەیەکە، وتم دڵم خۆشە تومەز تۆ لێرەی.
• توژاڵ: توێژ، قەتماغە، قەیماغ.
• توێڵ: هەنێ ناوچاوان.
• تەپکـە: داوێکـە لـە زەویـدا چاڵێـك نزیکـەی بسـتێ بـە بازنەیـی، بەردێـك پانـی بـە دارێـك بەرزدەکرێتـەوە و دارێکیـش لـە خـوارەوە بـۆ دادەنـرێ، دانەوێڵـەی بـۆ دادەکرێ،کاتـێ باڵندەکـە دەچێتـە نـاو چاڵەکـە، بەردەکـە دەکەوێتـە سـەر نەچیرەکـەدا
• تەپاڵە: ڕیخی مانگا، پاشەڕۆی مانگا.
• تەتك: ماقڵەی منالی ورد.
• تەرەواڵە: شوێنی ئاوداری کەم، هەرزاڵە.
• تەرا: تاك، تەنیا، تاك و تەرا.
• تەڕاتێن: ڕمبازێ بە ئەسپ.
• تەشبی: کاسەی دارین.
• تەشقەڵە: شەڕ پێ فرۆشتن.
• تەرکە: جۆرێ قامیشی ناوپڕ.

• تەکان: ڕۆیشتن بە پەلە، تەکاندان. هەنگانان بە خێرایی.

• تەماکۆ: توتن:

• تەمیز: خاوێن پاك.

• تەون: چنینی فەرش و ڕایەخ.

• تەویلە: گەوڕ، شوێنی زستانەی ئاژەڵ

• تەوس: پێ ڕابواردن، گاڵتە پێ کردن.

• تێرنج : پارچە قوماشێکە لە خوار کەمەرەوە بە شێوەی سێ گۆشەی درێژ دەدوورنە کراسی ژنانەوە بۆ ئەوەی لە خوارەوە ئاوەدان و فراوانتر بێت / هێندەنەماوە کار دروسی... تێرنج و باڵاو قۆڵ و ئاوەسی. ئیدیوم.

• تیلماسك: پارچەك باریك و درێژکۆڵە.

• تێلا: دارێکی دەستی ئەستووری درێژە.

• تیتك: پەرچەم.

• تیف تیفە: ئارایشت، جوانکاری

## ج

• جاترە: هەزوێلە، ئەزبۆلە. گیایەکی بۆنخۆشە دەکرێتە ناو چێشتەوە.

• جاجك: بنێشت.

• جاجم: تەنراوێوێکە لەبەن، وەستای جۆلا درووستی دەکات لە جیاتی بەتانی.

• جاڕس: وەڕەس، قەڵەس. لە خۆبێزاربوون

• جانباز: ئاژەڵ فرۆش، جەڵەبچی.

• جانەوەر: گیاندار، جروجانەوەر. ئید

• جاو: قوماشێکە زیاتر بۆ کفنی مردوو بەکاردێت.

• جدەو: جۆرە برینێکە لە ناوشانی وڵاخ پەیدا دەبێت.

• جریدبازی: ڕوبازین بە ئەسپ. شێخ ڕەزای تاڵەبانی وتوویەتی

دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە، ئەو عەسرە، ئەو ڕۆژە
کە مەیدانی جریدبازی لە دەوری کانی ئاسکان بوو.

- جزدان: کیفی بەرباخەڵ.
- جزەوپیاڵە: دووپشك، کوڵاژدەم.
- جزو بەن: بەرگی کتێب، تەجلید.
- جزیلك: دووکی سوورەوەکراوی ئاژەڵ.
- جفت: جووت، دووهێڵ، جووتکردن.
- جیقن: لەڕوولاواز.
- جڵەو : هەوسار، ڕەشمەی ئەسپ و گوێدێژ.
- جڵەو کێش: کەسێك هەوساری ئەسپ و ماین ڕابکێشێ.
- جڵفر: هار و هاج، چەتوون.
- جنجك: قنج، دانیشت لە سەرقاچ واتە قنگی نەناوتە سەر زەوی.
- جنجك: ناوکە کولەکە و شوتی و گوڵەبەڕۆژە
- جـۆداس: قـەڵاس، (شـوفان)دانەوێڵەیەکی کێـوی زبـرە وەك جۆوایـە بـەڵام شـیرەی نییـە،
- جەردە: ڕێگر.
- جەربەزە: گورجو گۆڵ، هار و هاج، بزۆز،
- جەنجـەڕ: ئامێرێکـی دەسـتکردە لـە دار و دڕکی وشـترلوو درووسـتدەرا بـۆ گێرەکردنـی خەرمان.
- جەمام: ڕەق ئەستوور بوونی ماسۆڵکە، تەشەنوج.
- جهان: جنێو، جوێن، دژمان، وتەی ناشرین بەرانبەر بە یەك گوتن.
- جمین: جوڵان، جوڵاو، بزووتن.
- جەڵەب: کۆمەڵە پەز.
- جەم: گرد، کۆ، کۆڕی یارسانەکان،
- جەونە: دەفرێکە لە پێست بۆ هاوهەڵگرتن.
- جـەواڵ: چنراوێکـی دوو تایـە لـە بـەن درووسـتدەکرێ لە سـەر پشـتی

وڵاخ دادەنرێ بۆ گواستنەوەی شت و مك.

- جەوەنە: دەفرێکە لە موشەما درووستدەکرێ ئاوی پێدە گوازنەوە.
- جیقن: لەڕو لاواز.

## چ

- چارۆکە: کۆڵوانە- قوماشێکی تایبەتە ژنان دەیدەنە سەرشانیاندا.
- چاوش: هونەرمەند دهوڵ و زوڕناکوت، پلەیەکی پۆلیسیە.
- چرێش: کەتیرە، سەمغ.
- چرپن: دانەساکناو، زۆ جوڵە، جرت و فرت کەر.
- چۆ: دار: چڵ و چۆ، لق و پەلکی دار.
- چمك: سوچ، گۆشە،
- چەپاڵ: کەسێك بەدەستی چەپ بنووسێ و شت بخوات.
- چەتاڵ: چنگاڵ، دار یان ئاسنی دووقلك بۆ تەنگ و دار لاستیك و بەستنەوەی خێوەت و ڕیسانی خوری بەکاردێت.
- چەخماخە: بروسکەی هەور.
- چەرچی: دەستفرۆش، بەقاڵ.
- چەرداخ: کولیتە لە دار و قامیش درووستکراو بۆ ناو باخ و بێستان.
- چەرمگ: سپی.
- چەرم : پێستەی ئاژەڵ خۆشەکراو.
- چەفت: لار، خوار، چەوت.
- چەفتە: سەرپۆشی ژنانە بە مورگی وردە چنراو.
- چەکمە: جۆرێ جزمەی درێژ بوو هەتا خوار ئەژنۆ.
- چەك و چۆڵ: پێویستی ئێك و تفەنگ.
- چەمووش: لاسار، هاروهاج. گیاندارێکی سرك و چەتوونە.
- چەنەباز. کەسێك زۆر قسەبكات.

- چیچك: گوڵی تازە خونچەی دەشت و دەر.
- چیخ: تەنراوێکە لە قامیش و حەسیر بۆ چواردەوری دەوار و کۆزەی بەرخ و کار.
- چەڵمە: ئامرازێکی هێلکەییە بۆ بەستنەوەی ئاژەڵ لە گێرکردندا.
- چەناگە : لاچەنگە، نێوان ڕوومەت و ملّ.
- چیلکە: پووش و داری باریك بۆ سوتاندن، باریکایی سەری گوان.

## ح

- حەپەسان: واق وڕمان، سەرسام بوون، شۆك.
- حەپەلوش: بە پەلە قوتدان.
- حەپۆڵ: گێژ و وێژ.
- حەتۆتە: چەند تورکەیەکی بچووکە گیای وشکەوەکراوی بۆنخۆشی تێدەکرێ و بە شێوەی سێگۆشە و زنجیرەی ژنان بۆ بۆنخۆشبوون دەیکەنە ملیان.
- حوقە: یەکەیەکی عوسمانی بوو لە کیلۆ زیاتر بوو.
- حەکاك: زۆرزان، زانا، حەسن کەنۆش دەڵێت:

حەکاکان دەور گشت بیانەوە
هەرهان وەحەزرەت گشت بەیانەوە. / حەسن کەنۆش

- حویل: هویل، سوور.
- حەمکە: زۆر، فرە.
- حەیتە: زەلامی زرتەبۆزی ناقۆڵا.

## خ

- خاترجەم: ڕێزگرتن، ئا
- خاس: باش، چاك.
- خاكەسار: كڵۆڵ، داماو، خۆڵكردن بە سەردا.
- خانەخوێ: خاوەنماڵ.
- خام: خاو، كاڵ – نەگەیشتوو.
- خاوكەر: جۆرە مەقامێكی ناوچەی گەرمیانە.
- خاییی: هێلكە.
- خرت: ساوڕێن.
- خز: لوس.
- خەپكە: گونكە هەویری گەورە- بۆ سەگ و تووتكە.
- خورج: تورەكەیەكە لە بەن چنراوی بچووك، شوان و گاوان و كەژەوان خواردنی تێدا هەڵدەگرن.
- خوێش: خزم، كەس وكار، هێمنی شاعیر دەڵێت:

ئەی لاو خۆت ! لە خزم و خوێش دوور بگرە
ئاخر ئەنجامی نییە! ئاخر ئەنجامی نییە.!!

- خووم: ڕەنگی شینی تۆش.
- خومخانە: شوێنی ڕەنگكردنی بەن.
- خۆڵەكەوە: خۆڵەمێش.
- خومچی: كەسێك كاری خومگەری دەكات.
- خونكی: ماستاوكردن.
- خەڕك: بەرد، سەنگ.
- خەركانە: برینێكە لە دەم و چاوی مناڵ دەدات.
- خەفتن: خەوتن.
- خەنینە: پێكەنین.

## د

• داوەستە: دابەستە ئاژەڵێك لە ماڵەوە بە باشی بەخیوبكرێ بۆ سەربڕین.

• داپڵۆسین: لێدانی یەكێك بەدا.

• دادا: نەنك، دایكی دایك و دایكی باوك.

• داركای: كەسێك یان ئاژەڵ بەدار لێیدرابێ.

• داخ: دەفری زۆر گەرم.

• داغان: پەرش و بڵاو،تەفرو تونا.

• دامە: داو، تەڵە، بۆ گرتنی پەلەوەر و ئاژەڵ، جۆرێكی یارییە بە سی و دووبەرد لە نێوان دووكەسدا دەكرێ.

• درەو: دروێنە، دروێنەی دەغڵ و دان .

• درم: پەتا و نەخۆشی.

• دنە: هاندان.

• دەبان: جۆرە خەنجەرێكی بەناو بانگە.

• دۆڵاب: سنووقێكە بۆ هەڵگرتنی جل و كەلو پەل.

• دەڵەك: گیانلەبەرێكەسووری تاریكە پێستەكەی بەنرخە، مریشكێ هەرجارێ لە شوێنێك هێلكەبكات.

• دەمەقاڵە: شەڕە جوێن، قسەوتن بەرانبەر بە یەك.

• دەمەكاوكێ: باوێشكدان، ئاژاژكدان.

• دەمەدەم: دووكەس دژی یەك قسەبكەن بەرانبەر یەك، دەمەقاڵە.

• دەمەلاسكێ: لاسایی كردنەوە.

• دۆخەوا: خواردنێكی كوردەواری بەتامە، دۆ دەكولێنرێ پونكە یان كنیواڵ ( كوڕادە)ی تێدەكەن.

• دوومەڵ: برینێكی پێستە ئاوساو بە كێم.

• دووزەلە: جۆرێكە لە نەی بە دوو قامیشی بەیەكە و پێچراو دوو فیقەی لە قامیش بۆ درووستكراو هونەرمەندان ئاوازی پێدەژەنن.

• دێز: ڕەش و بۆر، دەفرێکی گڵینە، چێشتی تێدا لێدەنرێ.

• دەیم: زەوی وشکانی.

• دێوانە: دەروێش.

ر.

• ڕایەخ: هەر فەرشی لە سەر زەوی ڕابخرێ.

• ڕەپ: توند وەستان، ڕپ و ڕاست.

• ڕەتاو: ڕفێنراو، هەڵهاتوو.

• ڕەت ڕەتێن: کێ بەرکێ بە ڕاکردن یان بە ئەسپ سواری.

• ڕەشمە: هەوسار، سەرکەلەی وڵاخ.

• ڕشکە: دەفرێکە وەکو تۆڕ لە مووی بزن دەکرێت، بۆ گواستنەوەی قرچە وکلۆشی دروێنە.

• ڕەف: لە ناوماڵاندا بە قوڕ و قامیش خشتێکی تەنکی درێژ دروستدەکرا دەفر و قاپ و قاچاغی لە سەر دادەنرا.

• ڕەمی: ڕایکرد. هەڵهات.

• ڕەهەنە: ڕەهندە، ڕفێنراو، ڕاونراو، دەربەدربەدەر بوون.

• ڕم: تیرێکی درێژە بۆ هاوێشتن.

• ڕۆخانە: چەم و زێی ئاو.

• ڕیتاڵ: شیاکە، تەپاڵەی مانگا و گوێرەکە.

• ڕیپۆق: چڵك و کیمی چاو.

• ڕیقنە: پاشەڕۆی باڵندە.

## ز

- زاخە: لاپاڵی زیخەڵان.
- زاخدا: هەرشتی بە زێڕ ئاودرابێ.
- زرانی: ئەژنۆ، هەژنۆ.
- زالـو: زەروو، کرمێکـی ئاوییـە لـە چـەم و کانیاوەکانـدا پەیـدا دەبێـت، دەچێتـە نـاو قەڕگـی مـرۆڤ و ئاژەڵـەوە.
- زایهان: هەر مێینەیەك بەچکەی بێ.
- زەردە سـیری: گیایەکـی گـەڵا وردی دڕکاوەییـە، بۆدەرمانـی کەچەڵـی بـەکاری دەهێنـن.
- زکوزا: زاوزێ، مناڵ بوون.
- زگوردی: ڕەبەن، پیاوی سەڵت.
- زەمبیلـە: دەفرێـك شـت و مکـی تێـدا بـە دەسـت هەڵدەگیـرێ، جـاران بـە شـولی دار
- زوان: زمان.
- زوقـم : شــەختە، ســەهۆڵ، لــە ئەنجامــی زۆرســاردبووندا ئــاوەکان دەبەســتن.
- زیپکـە: قنجکـە سـووری هەڵتۆقیـوی دەم و چاو،هەوکردنـی پێسـتی دەم وچـاو پەیـدا دەبێـت.
- زیت: قیت، زرنگ، زیتەڵە، کابرا لە خۆیەوە زیتۆ بوو. ئید
- زەیستان: ئەوژنانەی تازەمناڵیان دەبێت.

## ژ

- ژاژ: قەڕەم،
- ژاکە ژاك: چەنبازی، بە کەسێك دەوترێ قسەی نابەجێ زۆربکات.
- ژەمەنبەردە: لە برسا مردوو.
- ژنەفت: بیستن
- ژەك : یەکەم شیری پاش بەچکە بوون.

## س

• ساچمە: وردە پارچەی قوڕقۆشم دەكرێتە ناو تفەنگی ڕاوی

• ساتمە: پێ هەڵكەوتن.

• ساغڵەم: تەندرووست. باش، بە كەسێك دەوترێ یان باش بێت دەڵێن پیاوێكی ساغڵەمە.

• ساورێن: تەگەی بزن، نێری بزن.

• سپوون: بنەگیایەكە لە گەرمیان زۆرە كەف دەكات جاران جلیان پێ دەشوشت..

• سركەوان: سەرانوێلك، زبڵدا - شوێنی پاشەڕوی ئاژەڵ و ماڵات لە دەرەوەی ماڵ.

• سنان: سنگان، جۆرەنەخۆشییەكی كوشندەیە لە ئاژەڵ و خەیار و شووتی و كاڵەك دەدات.

• سەرمەوقۆلانج: تەقلە لێدان، تەپاوتلدان.

• سۆتكە: سمڵ، گیایەكی بۆنخۆشە و بۆ دەرمان دەشێ.

• سورمە: كلی چاو ڕشتن.

• سواڵكەر: دەروەزەكەر.

• سوچەڕ: گیانلەبەرێكی دڕكاویە. گۆشتەكەی خۆشە، جگەرەكەی بۆ نەخۆشی شەكرەباشە.

• سەرەن: بێژنگی شاش بۆ بێژانی دانەوێڵە، كەوی.

• سیرەمۆزە: شەنگە سوورە، زەردەواڵە.

• سیسارك: مێروویەكی باڵدارە لە ناو پیسایدا دەژی.

• سێ شەش: هەژدەڕۆژ مانگی خاكە لێو.

• سێف: سێو.

## ش

- شاباش: چاکترین باز، بەخشیشێکە لە شای و زەماوندا دەدرێت بە چاوش.
- شارا: شوێنی جێژی خەمان.
- شارەمێرووچە: کوونی مێروولە.
- شاکام: بە ئاوات گەیشتن.
- شاتە شات: زۆر وتن.
- شەقاوە: شەڕانی. ئاژاوەگێڕ.
- شاڵینە: پارچەبەڕەیەکی چنراوە بە خوری. بەڕە.
- شوقلەت: سەکویەکی باریك لە بنی ماڵەوە درووستدەکرا، ژێرەکەی بۆش و خانەخانە بوو لە ناو خانەکان شتی تێدا دادەنراوە، لە سەریشی پۆڕك و نوێنی تێدا دادەنرا.
- شەقیلە: چەرمێکی زۆر تەنك دەکرێتە چارۆکە و گوڵەنگی بۆ دەکرا، ژنان بۆ ئەوەی کراسەکانیان نەدڕی تەشییان لە سەر دەڕێست، شیعرێکی فۆلکلۆری هەیە و دەڵێت:

  شوان وەهۆ هۆ مەڕ وەکۆڕەوە

  ژن وەشەقیلەی گوڵنگ شۆوەوە.
- شەوەکەژ: لە پایزاندا بەً تایبەتی مانگی نۆ بۆ مانگی یانزە، بە هۆی کەمبوونەوەی ئالیك ئاژەڵدارەکان مەڕوماڵاتەکانیان بە شەو دەلەوەڕێنن و نایان هێننەوە بۆ ناو ئاوایی.
- شەومەنی: چێشتی ئێوارە بمێنێتەوە بۆ سبەی پێی دەڵێن شەومەنی.
- شەوە: مورگێکی ڕەشە بۆ پارێزگاری لە منالی تازەلە دایکبوو لە ژێر سەریدا دایدەنین تا جنۆکە و ساواخنکین و ئاڵ نەیبات.

## ع

- عاسا: داردەستی سەرخڕ، گاڵۆك.
- عازەو: عازەب، هەرزەکار.
- عاسەلا: کەل و پەل و پێویستی.
- عەبـدالٚ: ئەبـدالٚ، ئەقـدالٚ. ڕەبـەن، گەڕیـدەی بێکـەس، کەسـێك بـە دووی شـتێکدا بگـەڕی.
- عەمارەپۆ: دانەوێڵەی بۆگەن
- عەمەربۆ: برنجێکی بۆنخۆشە.
- عەنتیکەخانە: مۆزەخانە.

## غ

- غار: ژێر شاخ و کەند و گۆمئاوی ژێر کەندەڵان.
- غـار: غارغارێـن، کەسـێك بـە ئەسـپ و مایـن و وڵاخـی سـواری، ڕمبازێـن.
- غلۆر: کەوتنەخوارەوە لە بەرزایی.
- غومار: تەم و مژ، تۆز و غوبار.
- غەرغەڕە: سەرەمەرگ.
- غەز وبەز: چەوری.
- غەش: فێلکردن.
- غەشیم: نەزان.
- غەلەبەغەڵب: گەلەزەنگ، دەنگەدەنگ، هەراوهوریا.
- غەل و غەش: فێڵکردن.

## ف

• فاق: تەڵە، جۆرە داوێکە لە تەل درووستدەکرێ بۆ گرتنی باڵندە.

• فـاك و فیـك: فیکـە لێـدان، کەسـێك بـە شـوێنێکدا زۆر بـێ بچـێ پێـی دەڵێـن فـاك و فیکێتـی.

• فـاڵ: مایـن و گوێدێژی مێینـە کاتـێ جووتبونـی، بەخـت خوێندنەوەلای سیحربازەکان.

• فانۆس: چرا – لەمپە – دیوارکۆ.

• فجق: دەرپەڕیو، لە دەستدەرچوون.

• فەرتەنە: ئاژاوە، پشێوی، کێشەنانەوە.

• فـت: کەسـێك لـە یـاری یـان هـەر کارێـك دەربکـرێ دەڵێـن: فتکـرا، لـە کلاوێنـدا ئـەو کلاوانـە لادەبێـرت پێـی دەڵێـن: فتکـرا

• فرە: زۆر، یەکجار زۆ هەرشتی زۆربێ، فرەژنی، فرە ئاینی، فرەزان.

• فرچـك: فریشـك، ژەك، مژینـی سـاوای تـازەزاوی ئـاژەڵ لـە گوانـی دایکـی.

• فڕکان فڕکان: پەلاماردان و شت بردن بەتاڵان.

• فەریکـە: دانەوێڵـە و بـەری هەنـدێ درختە بەتـەواوی پێ نەگەیشـتبێ. فەریکـە نـۆك. نمونە.

• فـرۆ: ئـەوە شـیرێکی خەسـتە لـە گوانـی تـاوە زاو لـە بـری ماسـت دەبێتـە فـرۆ.

• فلْت: فراوان گەورە.

• فلْتەفلْـت: بـە کەسـێك دەگوتـرێ قسـەی نابەجـێ بـکات پێـی دەڵێـن: فلْتەفلْت.

• فەڕ: شتی نرخدار، بە کەسێکدەوترا بەخێربێی فەڕ و قەدەم هێنا.

• فەرتەنە: ئاژاوە، بشێوی، کێشەنانەوە.

• فیشکاندن: دەنگی مار، مارەکە فیشکاندی.

• فیسقە: پیازی زۆر بچووك دەچێنرێ، شتی بچووك فیسقەگولە.

• فـێ: پەرکـەم، نەخۆشـییەکی دەمـاری دێژخایەنـە زیاتـر بـە هـۆی برینـداری دەمـاری مێشـکەوە مـرۆڤ تـووش دەبێـێ.

## ق

• قاتـر: هێسـتر، ئاژەڵێکـە سـك و زانـاکات نێرە کـەر یـان ئەسـپ لـە مێینـەی یەکـتر دەپەڕنـن هێسـتریان دەبێـت.

• قاچان: یارییەکی دەستی کچانە بە پێنج بەرد.

• قاپقـاپ: سـەرپێیەکی دارینـە چەرمێکـی باریکـی بەسـەرەوەیە لـە پـێ دەکرا.

• قاپ و قاچاخ: دەفری ناوماڵ.

• قاپە ڕەقە: قولەپێ.

• قات و قڕی : نەهاتی و برسێتی.

• قشڵاخ: هەواری کۆن.

• قاڵدرمە: پێ پلکە، نەردەوان.

• قـاو: جـاڕدان، بڵاوبوونـەوەی قسـە لـە نـاو خەڵکیـدا، هـەراو زنـا، قاوقیـژ. کـەڕووی دار، زوو دەسـووتێ.

• قـان: دووکـەڵ کردنـە نـاو کونـی ئاژەڵـی کێـوی قانـدەدرێ تابێتـە دەرەوە.

• قرێنـە: قرخێنـە، لـە دوای تێرخـوارد قـورب هاتنـەوە، دەنـگ هاتنـەوەی گەروو.

• قرچـە: تەوژمـی گەرما، دەنگـی دار و ئێسـکی شـکاو، لاسـکی خەلـە و گیـا.

• قورنجك: نوقرچك، بە دووپەنجە گرتنی پێستی مرۆڤ.

• قفە: کۆکە، کوخە.

• قوڕات: خۆهەڵنان، خۆهەڵکێشان، بنچەکە گیا.

• قوشخانە: مەنجەڵ.

- قۆناغ: یەك ڕۆژە ڕێگا، ماڵ و شوێنێكی تایبەت بۆ پشوودان.
- قۆلانج: بست، ئەنگوست.
- قوماتك: پێچانەوەی منالْی مەلۆتكە لە بێشكەدا.
- قولەتین: شتی بێزراو، لە بەرچاوكەوتن.
- قورناسك: ئانشك. جومگەی نێوان باسك و بازوو.
- قەپۆز: چەناگە.
- قەف: بازنە، قە قەف، چین چین
- قەفار: داری پشتیوانەی دەرگا.
- قەنداخ: ئاوی گەرم لە جیاتی چا خواردنەوە.
- قەواڵە: قەباڵە، سەنەد، تاپۆ، زۆر هات قەواڵە بەتاڵە. ئید
- قەوشەر: زمبیلە، عەلاگە.
- قەیرە: كچی بەتەمەن شووی نەكردبێ. قەیرەكچ.
- قەیاخ: سەرتوێژی ماست و برین. قەتماغە
- قوتیلە: قەندیلە، جرا فتیلەی نەوتی.
- قولەفیسكە: قولەقاپ، جومگەی قاچ.

### ك

- كاچ: بنی شاخ.
- كاكۆڵ: مووی درێژی پێشەوەی سە.
- كاڵەمشتی: كڵاوێن یارییەكی پیاوانە بە حەوت كڵاو دەكرێت.
- كالیار: جۆرێ ترۆزیە زۆر گەورە دەبێت
- كاو: گەرم، شتی زۆر گەرم،
- كاوێژ: هەڵهێناوە و جاواندنەوەی خواردنی لە دەمی ئاژەڵدا.
- كڕك: دەشتێكی وشایی، كڕكای كڕك.
- كڕە: ئاسیاوی برنج هاڕین.

• کفتەکار: ماندو لە کاردا. پەك کەوتوو.

• کوپ: دەفرێکی گڵینی لە ئاگردا سوورەوەکراوە، گەورە و بچووکی هەیە و ئاوی تێدەکرێ بۆ ئاوخواردنەوە.

• کۆتە: دارێکە گۆشتفرۆشەکان گۆشتی لە سەر وەرد دەکەن.

دڵ وەکو کۆتەی قەساو چاو وەکو جۆگەی دلیا

وام لە مەیدانی مەراق ئەسپی خەم وازینەکەم..

مەلا حەسنی نەوحی.

• کڵاو خوری: کڵاوێکی خڕە هەلاج لە بەرەگن درووستی دەکات بۆ شوان و وەرزێر لە بەر خۆرەتاو دەیکەنە سەریان.

• کڵاو بۆرە: هەلاج لە بەرگن درووستی دەکات. کڵاێکە لە پێشتەوە کورتە تا سەر ئەبرۆ لە پشتەوە تا ناو کەمەرە لە کاتی باراندا دەکرێتە سەر.

• کفت: شەکەت، ماندوو.

• کۆریان، چەمی بێ ئاو. شیوەکۆر، بن کاژی جەم و دۆڵ.

• کڵۆم: کلیل و قوڵی دارین.

-١٦-

• کونەباجە: دەلاقە، ڕۆژچنە، تاق.

• کۆردەرە: دۆڵ و دەری بن بەست.

• کۆزە: شوێنێکی تایبەت و گەرمە بۆ بەرخی ساوای تازە زاو.

• کولەنجە: سەڵتەیەکی ژنانەیە ناوەخنەکەی لۆکەیە..

• کونەڵان: کوندەڵان، شوێنێکی تایبەتە بە خشت قوڕ لە شێوەی چەرداخ دروستکرێت بە دووچین چینی ناوەڕاستی بە داری باریك و قایش درووستدەکرێ، کونەی ئاو و مەشکەی دۆی لە سەر دادەنرێ. چینی سەرەوە بە دار و پەردوو قوڕ سواخ دەدێ.

• کوڵەنانی: کەسی جادوبازو ژن خەڵتین.

• کوڵگرتن: گوێگرتن لە خەڵکی بە دزییەوە.

• کەپۆڵك: ناوشان، کۆڵنج. چەناگە و قەبۆز.

• کەپنەك: فەرەنجی، هەلاج لە بەرەگن درووستی دەکات بۆ زستان و سەرما و باران.
• کەفت: کەوت، ڕمان، داخورا، هەرەسی کرد.
• کەفگیر: کەوگیر: گرتنی کەفی سەر چێشت.
• کەف و کوڵ: گوڕ و تین، کەفی سەرچێت، هەڵچوون و توڕبوون.
• کەڵمە: دوو داری چەمنێنراوە دەکرێتە نیلەی ملی گاجووتەوە.
• کۆڵەکە: ستوونی داری خانوو.
• کۆڵەوەژ: دارێکە لە ئاگردا سەرەکەی سوتابێ و وژەوژی ئاگری هەبێ. شوکری فەزڵی دەڵێت:

حەیفەچاوێ کە جەفا کۆڵەوژی تێکدەشکان

ئێستا بکلچێوکی وەفا عەنەن گەلاوێژی نەکەی.

• کەنوو: کەندوو دەفرێکە لە قوڕ درووست دروستدەکرێ، بەرزی مەترونیو، پانییەکەی نیومەتر، درێژیەکەی هەشتا سانتیمەترە ئارد و دەغڵ و دانی تێدەکرێ
• کەیوانو: کابان، ژنی گەوەی ماڵ.
• کەنیشك: کچ، کیژ.

## گ

• گاڕان: داردەستی جوتیار و گاوان.
• گازەرا: ناوەڕاستی پشت، / لە سەر گازەرای پشت کەوتم.
• گاڵ: هاندان، گاڵە گاڵ، دەنگو هەرا، هەرزنەتاڵە، گیایەکی هێشوویی ڕەنگ سوورە، تۆوەکەی هاوشێوەی لۆکەیە.
• گاڵۆك: گۆچان، داریکی ڕێکە نەباریکە و نەئەستوور، لای سەرەوەی نیو بازنەیی دەچەمێتەوە، داردەست.
• گاوەسن: گاسن، ئاسنێکی نووك تیژ و دواوەی بڵاوە تێهەڵکێشراوە بە هەوجاڕوە زەوی دەکێڵێ.

• گاوەڵکێ: ڕۆیشتنی مناڵ و گەورە لە سەر ئەژنۆ.

• گزەنەك: نەخۆشییەکی پێستە تۆقەدەکات.

• گژنیژ: جۆرێکە لە سەوزە، ڕێژەیەکی زۆری زەیتی تێدایە زۆر بە سوودە بۆمرۆڤ.

• گل: نەخۆشی چاو، چاویەشە – چاوێشە.

• گوپ: گوبن، کەسێك دەم و چاوی خڕ و قڵەو بێت.قڵە

• گۆبەن: هەراو هوریا و ئاژاوە. شێخ ڕزای تاڵەبانی دەڵێت:

بۆ کەرێ ئیعلانی حەربی کرد لە گەڵمان شێخ حەسەن
سەیری کەن یاران چ گۆبەندێکی گێڕا ئەم کەرە.

• گۆچەوەن: سووژن، سووزن، جەواڵ دوور.

• گۆترە: گۆترمە، خەمڵاندنی کڕین ڕۆشتنی شتێك بەبێ ڕەچاوکردنی نرخ و بەهای.

• گوربز: گوج و گۆڵ توند و تۆڵ. و چالاك و بزێو بی.

• گورزە: باوشێ دار یان قامیشی بەسراو.

• گوردە: مناڵی ژنت لە تۆ نەبێ.

• گوژاڵك: زرکەتاڵ، ڕەوکێکی خشۆکە بەرێکی بچووکی هەیە وەکو شوتی، زۆرتاڵە بۆ گەلێك داودەرمان بەکاردەهێنرێ.

• گۆشەوارە: گوارە، گوارەی گوێی ژن.

• گورزوەن: گورزەهۆن، چنین و هۆنینەوەی بەنی چوار تەڵ.

• گومەز: جاران خانووی شارنشین بە گەچ و بەرد دەکرا، مێچکەی بە شێوەی خڕ درووست دەرا پێیان دەوت گومەز.

• گۆل: ئاوەخۆرەی ئاژەڵ، لە دار و بەرد و چیمەتۆ درووستدەکرێ ئاژەڵ ئاوی تێدا دەخواتەوە.

• گوێزەوانە: خەڵاتکردن، دیاری بۆ مناڵی تازە لە دایك بوو.

• گەڕ: فێڵ و تەڵەکەبازی، گەڕباز.

• گەجەر و گجوور: کەسی بێکەڵك خراپەکار.

• گەرمەژنـە: نەخۆشـییەکی پێسـتە لـە ئەنجامـی گەرمـا و ئارەقەکـردن درووسـت دەبێـت.

• گـەزاف: خـۆ هەڵکێشـان، درۆ و فشـەکردن، لاف و گەزاف.مەحـوی شـاعیر دەڵێـت:

ئێستا بۆ لاف و گەزاف هەرکەس دەبینێ عاشقە

نەك هەموو کەس جان فیدا وەك میم حی و واو و بێ.

• گەرمشتە: برێشکە، گەنم لە سەر ساج برژاو.

• گـەوزان: تلخـواردن لـە نـاو خۆڵـدا / کەرەکـە خـۆی لـە نـاو خۆڵـدا گەوزانـەوە.

• گێنگڵ: پێچ خوارد لە ئێش و ئازاردا، عەبدوڵا پەشێو دەڵێت:

کاتێ بانك دەکەی بەکاك

کاك وەکو مار

بەرەو گوێچکەم گێنگڵ دەدا.



## ل

• لالۆ: خاڵۆ، برای دایك.

-١٨-

• لاویتـە: ئامرازێکـە بـۆ زەوی هەڵکەنـدن بەتایبەتـی کنگـر و دۆمـەڵان و ئـەو بەرهەمانـەی لـە خـاك دەڕوێـن.

• لاف و گەزاف: خۆهەڵکێشان، درۆو فیشاڵکردن.

• لوتەوانـە: پارچەیـەك خشـڵ، زێـڕ یـان زیـو ژنـان لوتیـان کوندەکـرد و وەکـو گـوارە پێـدا هەڵیـان دەواسـێ.

• لچ: لێو بۆ ئاژەڵ.

• لووشـکە: جـۆرە دەنگێکـە کاتـێ وڵاخ ئالیـك دەخـوات، یـان ئـاوی بـۆ دەبـەن، یـان بەچکـەی خـۆی دەبینـێ، مێردمنـاڵ کاتـێ بگـری دەڵێـن: لوشـکە لوشـکی چیتـە.

• لۆغانە: بەخیشینی خاوەن خەرمان بە هۆی باشی دانەوێڵەکەیەوە.

• لۆقەکردن: نەرمەغار بە ئەسپ.

• لۆینە: ئاشەوان. وەستای ئاش، ئاسیاوچی.

• لەبـز: قسـەکردن بـە جوانـی دەڵێـن فـڵان لەبـزی شـیرینە/ بەلبـزی شـیرین مـار لـە کـون دێنێتـەدەر. ئید

• لەتـر: ڕەتـدان، کاتـێ کەسـێك یـان ئـاژەڵ بـەلادا دەڕوات / لەتـری داو کـەوت.

• لەچك: سەروێن سەرپۆشکرنی ژن.

• لەگام: بێکەڵك، بێ توانا.

• لەوە: کادان، کادین، ئەنباری کا تێدا هەڵگرتن.

• لیپاو لیپ: پڕاو پڕ، دارماڵ.

• لیتە: قوڕ و چڵپاو، قوڕی زۆر خەست.

م

• ماخوڵان: جوڵان، کەسێك زۆر بێت و بڕوات دەڵێن: ماخولانێتی.

• مامر: مریشك.

• مـات: خۆحەشـاردان، مـت بـوون، سۆسـکەکە خـۆی ماتکردبـوو لـە سـەر هێلکەکانـی.

• مارزا: پیسی بەرخی تازەزاو.

• مارانـگاز: مارانگەسـتە، کەسـێ مـار پێوەبـدات، کەسـێك تووشـی کارەسـاتێك ببـێ و لـە کارەسـاتی تـر بترسـێ. دەڵێـن مارانـگازە.

• مافەتـە: نەخۆشـییەکە بـە هـۆی کرمێکـی ژەهـردارەوە کاتـێ مـاڵات دەیخـوات تووشـی پەتایەکـی سـەختی دەکات و دەیکـوژێ.

• ماین بەز: گوێدرێژێ لە ماین دەپەڕێنن.

• متمانە: باوەرپێکردن، دڵنیایی.

• مجمـە: سـینی، دەفرێکـە چایـی و چێشـتی لـە سـەر دادەنێـن بـۆ

خــواردن و خواردنــەوە.

• مشت و ماڵ : کێوماڵ، بشکنین.

• ملّچەملّچ: کەسـانێ کاتـێ نـان دەخـۆن دەنگـی دەمیـان دێ، دەڵێـن ملّچەملّچــی دەمــی دێ.

• ملۆزم: بەرچەپ، مێمل، کەسێك مرۆڤ تووشی زیاندەکات.

• ملـە: جۆبرکـە، گیانلەبەرێکـی خشـۆکی چنگـدار و قاوەییـە لـە نـاو بـاخ و کشـتوکاڵدا دەژی هـەر گیایـەك بێتـە پێشـی لـە بنـەوە دیخـوات.

• مەچیر: دەزووی دوورمان.

• مەژلاژگ : مەلاشۆ، ئاسانەی دەم.

• مێروچە: مێرووله.

• مەلیچك: چۆلەکە، پاساری عەباسی کەمەندی دەڵێت:

تۆ بڵێ شاخی مار، شیری مەلیچك بۆت دەسێنم

تۆ گیان و بوی هەر بەخودا بۆت دەئەهێنم.

• مێزەر: کڵاو جامانە و مشکی سەرومێزەری پیاو.

• مزگفت: مزگەوت، پەرستگا خواپەرستی

ن

• ناچیـزە: ژنێـك لـە فەرمانـی پیاوەکـەی دەربچێـت، کەسـی نارەسـەن. ژنـی کەسـێکی تربێـت و لـە گـەڵ پیـاوی تـردا بـێ، نامەحـرەم

• ناخوون: نینۆك.

• نازەناخوون: گۆشتی ژێر نینۆك.

• ناسیار: ناسیاو، ئاشنا، دۆست.

• نافك: ناوك، چەقی سکی مرۆڤ و گیانداری تر

• نـاق: ناقـرە، پینـا قاقـە، ملـی پێشـەوەی مـرۆڤ، دەسـتی نـاوە ناقـم وەکـو بخنکێـم.

• نامك : ناوکی هەرمیوەیەکی ناوکدار.

• نەقار: وەستای بەرد چاککردن بە چەکوش.

• نقوم: ژێر ئاوکەوتن.

• نمەك: خوێ.

• نمەنمەك: گونکەهەویر کەمێك پاندەکرێتەوە بەڕۆن چەوردەکرێ و دەخرێتە سەر ئاگر نابرژێ بۆ چارەسەری ماسۆڵکەی پێکان ئاوسان هاتبێ، دەینەنەسەر ئاوسانەکەی و پاشان نەرم دەبێت و چاك دەبێتەوە.

• نوا: پێشەنگ، سەرکاروان، کەسێك بکەوتە پێش هاوڕێکانی بۆ شارەزا بوون.

• نۆبەرە. یەکەم بەچکە بوون.

• نوقڵانە: مژدانە، هەواڵی خۆش، مزگانی.

• نوێرد: تەقەڵدان و کۆککردنی پالیمی کراس.

• نەدی و بدی: کەسێکە شتێکی نەدیبێ و ئێستا شتی هەبێ و زۆری خۆش بوێ.

• نەژنەو : نابیست، گوێگران، لاسار،

• نەوو: لەباد فەرشێکە هەلاجەکان لە بەرگن درووستی دەکەن.

• نەیجول: جۆرەقامیشێکی باریکی ناو بۆشە.

• نەیجە: جۆرە قامیشێکی باریکە.

• نێرەموك: پیاو یان ژن لە ڕووی جەستەییەوە کەم ئەندامن نە ژنن نە پیاون.

• نیخن: کەسێك نەتوانێ کارێك تەواو بکات هەر نیخەنیخی بێ.

• نیمتەنە: سەڵتە و سوخمەی ژنانەی قۆڵدار.

• نیمداشت: نەکۆن و نەتازە.

## و

- واتە وات: قسەو باسی ناوخەڵك، وتی وتی،
- واق وڕمان: سەرسوڕمان.
- وەرەس: جاڕس، بێزار.
- واڕۆك: باڕۆکە مریشکی یەك ساڵە.
- وجاخ: ئاگردان، کوانوو،
- وچان: پشوودان، مۆڵەت،
- وازی: یاری مناڵانە.
- واشـە: باڵندەیەکـی گۆشـتخۆرە لـە بـاز بچووکـترە بزیکیشـی پـێ دەوتـرێ.
- وەردێنە: نەخۆشییەکی چاوە، تەراخوما.
- وەشـت: بایەکـی بەهارییـە لای باشـوورەوە لـە گـەڵ بـاران، یـان پێـش بـاران هەڵـدەکات.
- وەشاندن: تۆکردن، چاندن، کامەران خەلەکەی وەشان.
- وڕك: پیانوو، گڕوگرتن، پەڵپ گرتن.
- وڕێـنە: وڕاوە.
- وەوی: بووك.
- وەویلە: بوکەڵەی کچانە.
- وەهاسە: ئاوایە، وەهایە.

## هـ

- هاپۆ: مام، کەسێك لە خۆگەورەتر.
- هات و هوت: قسەی بڵاو، هات هات، خۆتەخوت.
- هاج: هارو هاج، لاسار، بزۆز، مناڵێکی هار و هاجە.
- هاڕە: کەوتنی بەردی گەورە لە شاخ، هاڕەی کرد.

• هـاز: ڕەوکێکـی بەهارییـە، لـە بنەماڵـەی کاردۆ بـەڵام بچووکـترە، دەکرێتـە چێشـت کرمـی نـاو سـك دەکـوژێ
• هـاژە: خـوڕەی ئـاو، کەسـێکی لـە دنیـا بـێ ئـاگا بـێ پێـی دەڵێـن: هـاژەی دێ.
• هاوکوف: دووکەس هاوتەمن و وەك یەك لە کار و کرداردا.
• هاولف: دوانە، دووکەس بە سکی لە دایك بن.
• هاموشۆ: هاتوچۆکردن، بەسەرکردنەوەی یەکتری.
• هەپـە: دووداری بچووکـە لـە دوو کونـی بەرانبـەر بەیـەك باسـکە مـژان دەبەسـتن بەیەکەوە.
• هەسان: بەردێکە بۆ تیژکدنی چەقۆ و داس.
• هەڵ تۆپیو: مردارەوە بوو.
• هەڵپاچیـن: بڕیـن بـە مەقەسـت، قـژی مناڵەکـەی هەڵپاچـی، دارەکـەی هەڵپاچـی واتـە کورتـی کـردەوە.
• هەڵپاچـان: گوڵێکـی بەهاریـە وەکـو سـێپەڕەوایە لـە گـەڵ ڕۆنـدا دەیکوتـن بـۆ کەچەڵـی باشـە. گوڵـە. شـەقایق.
• هەلۆرك: بێشکەی مناڵ.
• هەلـوکان: هەلوکێـن، یارییەکـی مناڵانەیـە لـە نێـوان دووکەسـدا، دووبـەردی بچـووك بەرانبـەر یـەك دادەنێـن، پانییەکـەی بسـتی دارێکـی بچووکـی دەخەنەسـەر، دارێکـی یـەك مەتـری دارەکـە دەکەنـە ژێـر داربچکۆلەکـەدا بـەرزی دەکەنـەوە لێـدەدەن، هەرکامیـان زیـار بـڕوات ئـەوە سـەرکەوتووە.
• هەوجاڕ: قورەمە، کەرەستەی جووتکردنە بە ئاژەڵ.
• هەورین: چارگ، قەیچی، قاچی بڕینەوەی مەڕو بزن.
• هـەوری: چیتێکـی ڕەش و سـپی یـان سـوور و ڕەشـە، بـە زۆری ژنـی کـورد سـەروێن دەبەسـتنە سـەریانەوە.
• هەوسار: جڵەوی وڵاخ،
• هەڵەگەڕ: کەسێك یان هەر گیاندارێك زۆر بگەڕێ.

• هێزم: کۆمەڵێ داری شکێنراو بۆ سوتاندن ئامادەکرابێ،

بارۆکە سوورەی بان بارەهێزم

بێرە خوارەوە نەختێ پتکێزم/ فەقێ سمایلی زەنگەنە

## ی

• یابوو: قاتر، هێستر. بڕوانە قاتر.

• یاتاغ: نوێن، پێخەفی خەوتن.

• یازوخ: بەداخەوە، دریغ، مەخابن.

• یاساخ: قەدەغە، نارەوا.

• یاڵ: مووی پشتە ملی ئەسپ و ماین.

• یاڵدار: ئەو باڵندانەی کڵاوقوچیان هەبێت، کەڵەشێر، کڵاوکورە، پەپولە سلێمانی.

• یای کردن: بیرکرد، یادکردن، تاسەکرد.

• یایە: ژنی بەیت بێژ لە پرسە و سەر شیوەندا، ژنی بە تەمەن،

• یەختە: خەسان، گوند دەرهاتن.

• یەق: شێ کردن، نم کێشان، گەڕانەوەی ئاوی ڕاوەستاو.

• یەك سم: ئەسپ و هێستر.

• یەکانە : بەرازی نێر.

• یەلەك: سوخمەی ژنانە...



# کەلار

## شاری ڕێز و پێکەوە ژیان

مەلا ئیدریس ژاڵەیی

یەکێک لە سیما دیارەکانی شار بەمانا قوڵەکەی هەمەجۆری پێکهاتەکەیەتی لە نەتەوە و ئاین و ئاینزا جیاوازەکان بەشێوەیەک هیچ کەس لە دراوسێ ماڵ و کارگە و بازاڕ و پیشەجیاوازەکان ئەو جیاوازیانە ناکەنە پێوەر لە هەڵسوکەوتەکانیاندا، لە شاردا دەمارگیری ئینتیما بۆ نەتەوە و ئاین و ئاینزاکان کاڵ دەبێتەوە بە پێچەوانەی ڕەشماڵ و گوند و کۆمەڵگە خێڵەکیەکان کەتەنها یەکجۆر لە نەتەوە و خێڵ و ئاین و ئاینزا تێیدا جێگەی دەبێتەوە، بە درێژایی مێژوو زۆرێک لە بیرمەند و فەیلەسوفەکان قسەیان لە سەر شار بەمانا جۆراوجۆرەکانی کردووە و پێوەرەکانی شاربونی ئاوەدانیەکانیان دیاریکردووە. (المدينة عبر التأريخ، تأليف:ماريا لويزا برنيري، ترجمة:د. عطيات ابوالسعود، سلسلةالكتب الثقافيةشهريةيصدرهاالمجلس الوطني للثقافةوالفنون و الاداب، الكويت٢٠١٢ ).

لەدوایی بڵاوبونەوەی ئاینی ئیسلام و بەدیاریکراوی لە کۆچی پێغەمبەر محمد « صلى الله عليه وسلم» وە لە ئەنجامی چەوساندنەوە و ئازاردانی قورەیشیەکانی مەککە کە سیستمی خێڵایەتی یەکجۆر لە هۆز و ئاین تێیدا قەبوڵ بوو بەرەو یەسریب کەدوای ئەم ڕوداوە بوو بە شار و بە(المدينةالمنورة) ناوبانگی دەرکرد و بە پێچەوانەی مەککە چەند هۆز و ئاینی جیاوازی تێدا بوو و کاری گرنگی

پێغەمبەری ئیسلامیش، درودی خوای لەسەر بێت، پتەوکردنی ئەو پرەنسیپانە بوو کە دەبووە هۆی چەسپاندنی بنەماکانی پێکەوەژیانی ئاشتیانەی نێوان پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی ئەو شارە، ئەمەش لەو پەیمانامە ئیمزاکراوەدا خۆیبینیەوە کە ناسراوە بە دەستوری مەدینە کە دانی ناوە بە بوونی پێکهاتەکانی شار لە موسڵمان و یەهودی و مەسیحی و بتپەرست و تەنانەت دوڕوە فێڵبازەکان و هۆز و تیرە جیاوازەکان ئەرک و مافیانی تێدا دیاریکراوە و مافی هاونیشتیمانی بوون کرایە سیمای دەوڵەتی ئیسلامی و ئەم هێڵانەی خوارەوە بوو بە بنەمای پێکەوەژیانی ئاشتیانەی نێوان هەموان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا :

★ داننان بەهەبونی ئەوی دیکە بە چاوپۆشی لەوەی لە سەر چی ئاین و بیروباوەڕێکە.

★ پەنا نەبردن بۆ هیچ زۆرلێکردنێکی ئاینی و دورکەوتنەوە لە سەپاندنی ئاین بە زۆر و زۆرکاری.

★ ڕێزگرتنی هەموو ئاینە جیاوازەکان و هەڵس و کەوت و مامەڵە کردن لەگەڵ یەکدی لەسەر بنەمای ڕێز و ڕەوشت و ئاکاری جوان.

★ پەیڕەوکردنی بنەمای لێکتێگەیشتن و گفتوگۆ لەنێوان هەموان بەجوانترین شێواز.

لە بنەڕەت دا پەیوەندی باش و دۆستانەی نێوان ئاین و نەتەوە جیاوازەکان بنەمای تۆکمە و پتەوی هەیە کە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە و کتێبەکانی بیرمەندە پێگەیشتو و تێگەیشتوەکان بەدرێژایی مێژووی موسڵمانان ئاماژەیان پێداوە و بە بەڵگەی قورئان و فەرمودە ڕونیان کردوەتەوە، لێرەدا ئاماژە بە کۆمەڵێک لەو دەرەنجامانە دەکەین کە پێویستی دەکات لەسەر مرۆڤایەتی بەهەموو ئاین و نەتەوە جۆرە جیاوازەکانیانەوە پەیوەندیان پێکەوە باش و پتەوبێت :

★ وحدة النسب : مرۆڤایەتی هەموویان یەک سەرچاوەیان هەیە و نەوەی ئادەم ن، بنەچە و نەسەبی هەڵگرانی هیچ نەتەوە و ئاینێک پیرۆز تر و باڵاتر نیە لە ئەوی دیکە، لە قورئانی پیرۆزدا

دەفەرموێـت { يَـا أَيُّهَـا النَّـاسُ إِنَّـا خَلَقْنَاكُـم مِّـن ذَكَـرٍ وَأُنثَـىٰ وَجَعَلْنَاكُـمْ شُـعُوبًا وَقَبَائِـلَ لِتَعَارَفُـوا ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُـمْ عِنـدَ اللَّـهِ أَتْقَاكُـمْ ۚ إِنَّ اللَّـهَ عَلِيـمٌ خَبِيرٌ }الحجـرات ١٣ ، باشـترینی مرۆڤەکانیـش ئەوانـەن کـە زیاتـر سـود دەگەیەنـن بـە مرۆڤایەتـی چونکـە پێغەمبـەر درودی خـوای لەسـەربێت دەفەرموێـت ( خیـر النـاس انفعهـم للنـاس )حدیث صحیـح، رواه جابـر بـن عبداللـه، اخرجـه السـیوطي.

★ وحـدة المعـدن: بیروبـاوەڕی ئاینـی لـە سـەر ئـەوە دامـەزراوە کـە هەمـوو مرۆڤـەکان سـەرچاوەیان یەکـە و هەمـوو لـە گڵ دروسـتکراون، هەمـوو سـەرچاوەی ژیانـی مرۆڤایەتـی لـە گڵەوەیـە، سـەرەنجام جەسـتە دەبێتـەوە گڵ، ئەمـەش دەمانگەیەنێـت بـەو ڕاسـتیەی کە کـەس لەکەس گرنـگ تـر نیـە، یەکێـک بڵێـت مـن لـە زێـڕ و ئـەو لـە خـۆڵ، یـان لـە کانزایەکـی گـران بەهـا تـر دروسـتکراوە، لـە قورئانـدا دەفەرموێـت :{ وَمِـنْ ءَايَٰتِـهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُـم مِّـن تُـرَابٍ ثُـمَّ إِذَآ أَنتُـم بَـشَرٌ تَنتَـشِرُونَ} الـروم/٢٠، هەروەهـا پێغەمبـەر درودیً خـوای لەسـەربێت دەفەرموێـت ( )یـا أیهـا النـاس ألا إن ربكـم واحـد، وإن أباكـم واحـد، ألا لا فضـل لعربي علـى أعجمـي، ولا لأعجمـي علـى عـربي، ولا لأحمـر علـى أسـود، ولا أسـود علـى أحمـر إلا بالتقـوى) ).

★ وحـدة الصانـع (الخالـق) :بەدیهێنـەری هەمـوو مرۆڤـەکان تەنهـا[ اللـه] یـە، واتـە مرۆڤـەکان وەک شـمەک نیـن جۆرێکیـان کۆمپانیـای فـلان و ئەویتریـان کۆمپانیایەکـی جۆرێکـی دیکـە و ئەویـان ئەسـڵی و ئەویـان عـادی بێـت، هەمویـان دروسـتکراوی خـودای گـەورەن و هەمویـان ڕێزلێگیـراون، لـە قورئانـدا دەفەرموێـت { يَـا أَيُّهَـا النَّـاسُ اعْبُـدُوا رَبَّكُـمُ الَّـذِي خَلَقَكُـمْ وَالَّذِيـنَ مِـن قَبْلِكُـمْ لَعَلَّكُـمْ تَتَّقُـونَ }البقـرة ٢١ .

★ وحـدة التكریـم : خـودای پـەروەردگار مرۆڤـی لەسـەر بەڕێزتریـن و جوانتریـن شـێوە دروسـتکردووە، پلـەی جێنشـینی خۆیـی لەسـەر زەوی پێبەخشـیوە بەبـێ ئـەوەی هیـچ جیاوازیـەک لەنێوانیانـدا بـکات، ئاخـۆ لەسـەر چـی بیروبـاوەڕ و ئاینێکـە، لـە چـی نەتـەوە و ڕەگەزێکـە هەمویانـی بـە جوانـی و بەڕێـزی و گـەورەتر لـە هەمـوو بونەوەرانی دیکە

دروستکردووە و ژیان و گوزەران و ڕۆزی و پلەی شەرەفمەندانەی پێبەخشیون، لە قورئاندا دەفەرموێت {وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا }الاسراء ٧٠ .

★ وحدةالدين :ئاین پەیام و ویستی خودای گەورەیە بۆ مرۆڤەکان، ئاینە ئاسمانییەکان هەموو سەرچاوەیان یەکە و لەلایەن خودای گەورەوە هاتون و داواکاری چاکە کردن و خێر و فەزیلەت و دور کەوتنەوە لە خراپە و ناشیرینی و ڕەزیلەت دەکەن و مەبەست لێ یان بەختەوەر کردن و بەرزکردنەوەی پلە و پایە و ڕوناککردنەوەی ڕێگەی مرۆڤەکانە بە بێ جیاوازی.

★التعاون الانسانی و شیمة التسامح : یەکبونی مرۆڤایەتی لە وەی لە کلتوری هەموان چاکەکردن و لێبوردن و هاوکاری و بەدەمەوە چون جوان و پەسەندن، لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت {وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ }المائدة ٢/ .

پێغەمبەر درودی خوای لەسەربێت هەرکە گەیشتە یەسریب و کۆڵەکەی دەسەڵات و حوکمداری دامەزراند پەیماننامەی لەگەڵ لایەنەکانی ئەو شارە واژۆکرد کە هەموان کار لەسەر خێر و چاکە و هاوکاری یەکتری بکەن، هەروەها ڕایگەیاند کە خوای گەورە هێز و گەورەیی و هاوکاری دەبەخشێت بەهەر کەسێک هاوکاری و یارمەتی برا مرۆڤەکانی بکات بەدەر لە ڕەچاوکردنی ئەوەی لەسەر چ دین و نەتەوەیەکە،

لەم بارەیەوە دەفەرموێت : عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ - رضي الله عنه - عَنْ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ: «...... وَاَللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ،......». رَوَاهُ مُسْلِمٌ [رقم: ٢٦٩٩] .

هەروەها لە فەرمودەیکی دیکەدا دەفەرموێت : عن انس قال: قال رسول الله ﷺ: (انصر أخاك ظالمًا أو مظلومًا)، فقال رجل: يا رسول الله، أنصره إذا كان مظلومًا، أفرأيت إذا كان ظالمًا كيف أنصره؟

قال: (تحجزه أو تمنعه من الظلم فإن ذلك نصره)، رواه البخاري في صحيحه ٢٤٤٣،٦٩٥٢،٢٤٤٤ .

ئەگەر ورد بینەوە پێغەمبەری ئیسلامﷺ برایەتی تایبەت نەکردووە بەوەی کە هاودین یان هاو نەتەوەن، بەڵکو برایەتی لە مرۆڤ بوندایە، هەر ئەم بیروباوەڕە جوان و ڕەسەنانەشە کەلەگەڵ سروشتی مرۆڤدا دەگونجێت و سەرچاوە و بنەوای خێر و خۆشی و بەختەوەریە بۆ مرۆڤایەتی و هیچ جێگە و ڕێگەیەک ناهێڵێتەوە بۆ ڕق و کینە و خۆپەرستی و جوداکاری و ستەمکاری، ( أسس العلاقات الودية بين الشعوب و الامم في القرآن الكريم/الدكتور مصطفى الزلمي، الطبعة الاولى ٢٠١٦ ).

ئەوەی لەم وتارەدا و لەم بۆنەیەدا مەبەستمە باسی بکەم ئەو پێکەوە ژیان و پێکەوە هەڵکردنەیە لەنێوان موسڵمانان و غەیری خۆیاندا لە ئاین و ئاینزا جیاوازەکان لە شاری کەلار بەتایبەتی وەک ناوچەیەکی نزیک لە شاری سلێمانی و کەرکوک کە مێژویەکی پرشنگداریان هەیە لە پێکەوە ژیانی موسڵمان و مەسیحی و یەهودی و هەروەک کوردستان کە چەندین پێکهاتە و ئاینی جیاوازی تێدایە و زۆر بەدەگمەن کێشە و ناکۆکی لەسەر جیاوازی دین و مەزهەب ڕویداوە.

نوسین لە بواری بابەتێکی ئاوادا پێویستی بە کتێب و سەرچاوەی زیاتر هەیە کە بەداخەوە زۆر کەمە و بەزمانە جیاوازەکان هیچم بەدەست نەکەوت و ئەوەشی بەزمانی دایک نوسراوە چەند کتێبێکە لە پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکات، بۆیە سەرەڕای زانیاریەکانی ناو ئەو کتێبانە زیاتر پشتم بە بیرەوەری زیاتر لە سی و پێنج ساڵەی ژیانکردنی خۆم لەناو شاری کەلار و یادەوەری و زانیاری کەسانی دیکەی هاوشاریە کەلاریە بەڕێزەکانە لە کەسایەتیە جیاوازەکان.

سەبارەت بە ڕێژەی دانیشتوانی کەلار لە ڕووی ئاین و مەزهەبەوە (زۆرینەی هەرەزۆری دانیشتوانی شاری کەلار موسڵمانن، کەبەزیاتر لە ٩٧٪ دەخەمڵێنرێت، لەگەڵ بەشێکی کەمی پەیڕەوانی ئاینی کاکەیی کە بە نزیکەی ٦٠٠ خێزان مەزەندە دەکرێن، چونکە

لـە عێراقـدا هیـچ ئامـار و سـەرژمێرییەک نییـە بـۆ پەیڕەوانـی ئاینـی کاکەیـی، لـە سـەرژمێریە فەرمییەکانـدا بـە موسـڵمان لـە قەڵەمـدراون )» دەربـاز محمـد، کـەلار لـە لادێـوە بـۆ شـار، چاپـی دووەم، چاپخانـەی چوارچـرا، لاپـەڕە ٩٢ «.

بـە بۆچونـی کەسـایەتی دیـاری کاکەیـی لـە شـاری کـەلار بەڕێـز مامۆسـتا حمیـد بـاوە کاکەیـی: « کاکەیـی لـە ناوەڕاسـتی حەفتاکانـەوە لـە شـاری کـەلار نیشـتەجێبون و ژمارەیـان نزیکـەی دوو هـەزار و پێنجسـەد کـەس دەبـن کـە نزیکـەی پێنجسـەد و پەنجا خێزانێـک دەبـن و تاکـو ئێسـتا هیـچ کێشـەیەک لـە نێـوان موسـڵمان و کاکەیـی لەسـەر جیـاوازی ئایـن و ئاینـزا ڕوینـەداوە و پەیوەنـدی کۆمەڵایەتـی نێوانیـان زۆر باشـە و ژن و ژنخـوازی لـە نێوانیـان هەیـە و تاکـو ئێسـتا هیـچ مافێکـی کاکەیـی پێشـێل نەکـراوە و هـەردولا هاوبەشـن لـە خۆشـی و ناخۆشـیەکان و بەشـداری پرسـە و شـین و شـایی و جێژنەکانـی یەکـترن و بەشـێوەیەکی گشـتی هەمـوو وەک بـرا لـە شـاری کـەلار پێکـەوە دەژیـن» ( بەشـێک لـە گفتوگـۆی نوسـەری ئـەم وتـارە لەگـەڵ بەڕێـز مامۆسـتا حمیـد بـاوە کاکەیـی ٢١ / ١/ ٢٠٢٢)٠

شـاری کـەلار جولەکـە و مەسـیحی تێدانیـە ئەگـەر هەشـبێت زۆر کەمـە :( خەڵکـی کـەلار زۆربـەی پەیوەسـتن بـە ئاینـی پیـرۆزی ئیسـلامەوە کـە ئاینـی سـەرەکی وفەرمـی هەرێمـی کوردسـتانە هـەر لەکۆنـەوە خەڵکـی لـەم ناوچەیـەدا بونەتـە موسـڵمان ئیـتر هیـچ ئاینێکـی تـری تێـدا نەبـووە وەکـو (گاور، جولەکـە ) گەرچـی دانـە دانـە جولەکـەی تـێ هاتـووە بـەڵام وەکـو ئایـن ژمارەیـان ئەوەنـدە نەبـووە.... )، « سـوارە حەسـەن باجەلان، مێـژووی کـەلار، چاپخانـەی چوارچـرا، چاپـی یەکـەم ٢٠١١، لاپـەڕە ٦٠ « ( هەروەهـا لـە سـنوری کـەلاردا نزیکـەی ٤٨٠ ماڵـی کاکەیـش هەیـە و پەیوەسـتن بـە داب و نەریـت و ئاینـی تایبەتـی خۆیانـەوە )هەمـان سـەرچاوەی پێشـوو لاپـەڕە ٦١ ( ئاینـی ئیسـلام دوو ڕێبـازی هەیە:(سونە،شـیعە)زۆربـەی دانیشـتوانی سـنوری کـەلار لەسـەر ڕێبـازی سـونەن، بەشـێکی کەمـی لەسـەر ڕێبـازی شـیعەن کـە زیاتـر

ئەو خەڵکانەن کە لە سنوری قەزای خانەقینەوە هاتون لە ڕێگەی ڕاگواستن و دەربەدەر بون لەلایەن ڕژێمەوە، لەو ساڵانەی دوایشدا حوسەینیەیەکیان بۆ دروستکراوە... )هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەرە ٦١.

شاری کەلار زۆربەی هەرە زۆری لەسەر مەزهەبی «سونەی شافعین» بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندین خانەوادە و بنەماڵەی سەر بە مەزهەبی شیعەی جەعفەری هەن کە تائێستا بەتەواوی ژمارەی خێزانەکان نەزانراوە، چونکە هیچ ئامارێکی تەواو بەردەست نییە، بەڵام ڕێژەکە پێدەچێت نزیکەی (٣٪) بێت، هاتنی خەڵکی شیعە مەزهەب بۆ شاری کەلار بەتەواوەتی ساڵەکەی دیار نییە،بەڵام لەوکاتانەوە دەستی پێکرد کە حکومەتی بەعس دێیەکانی ڕاگواست و زۆربەیان هاتنە ناو شاری کەلار، بۆ نموونە دێی ( ئەلی میر )، هەروەها هاتنی فەرمانبەران و مامۆستایانی شاری خانەقین بۆ شاری کەلار و نەگەڕانەوەیان و هەروەها لە کاتی شەڕی عێراق ئێران چەندین بنەماڵە لە ترسی بۆمبارانکردنی شاری خانەقین گواستیانەوە بۆ شاری کەلار و چەندین کەسیش بە هۆی هەڵاتن لە سەربازی نیشتەجێی شاری کەلار بوون و نەگەڕانەوە و چەندین خانەوادەی پێشمەرگە لە ترسی ڕاوەدونانی بەعس گوستیانەوە بۆ شاری کەلار بۆ ئەوەی دوربن لە چاوی پیاوانی بەعس،

پەیوەندی نێوان خیزانە شیعەو سونەکان لە شاری کەلاردا هیچ کێشەیەکی تێدا نیە و بگرە چەندین ژن و ژنخوازی لە نێوانیاندا هەیە و هیچ کێشە و ڕووبەڕوبونەوەیەکی مەزهەبی کە شایانی باس بێت ڕووینەداوە، شاری کەلار یەکێکە لەو شارانەی کە ڕادەیەکی زۆر باش پێکەوە ژیانێکی ئاشتییانە لە نێوان سونەو شیعەو کاکەییدا هەیە ئەگەر چی کەس تەنازولی لە بیر و باوەڕی خۆی نەکردووە بەڵام ڕێزێکی زۆر لە یەکتر دەگرن و زۆربەی دانیشتوانی شاری کەلار باوەڕیان بە پێکەوەژیان هەیەو ڕێز لە بیروباوەڕی یەکتری دەگرن..

( بەشێک لە گفتوگۆی نوسەری ئەم وتارە لەگەڵ بەڕێز مامۆستا شەهاب احمد شمس الله کە هاوڵاتیەکی خەڵکی شاری کەلارە و لەسەر مەزهەبی شیعەیە ).

هەروەها بیروباوەڕی دیکە جگە لەوانەی باسکران بۆ نمونە پەیڕەوانی ئاینی ئێزیدی لە شاری کەلاردا بونی نیە : ( زۆربەی دانیشتوانی شاری کەلار پەیوەستن بە ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە کە ئاینی سەرەکی و فەرمی هەرێمی کوردستانە، زۆربەی دانیشتوانی شاری کەلار لەسەر ڕێبازی سوننەن بەشێکی کەمیان لەسەر ڕێبازی شیعەن کە زیاتر ئەو خەڵکانەن کە لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق و ناوچەکانی تری کوردستانەوە هاتوون لە ڕێگەی ڕاگواستن و دەربەدەربون لەلایەن ڕژێمەوە و لەو دواییەشدا بەهۆی کێشەی مەزهەبیەوە لە پارێزگای دیالە و سەلاحەدین و هتد... هاتونەتە ئەم شارە، لەساڵی نەوەدەکاندا حوسەینیەیەکیان لە گەرەکی بنگرد بۆ دروستکرا، کە ساڵانە مەراسیم و بۆنەی ئاینی خۆیان دەگێڕن، ڕۆژانە بانگی خۆیان لەو حوسەینیە دەدەن و نوێژی خۆیان دەکەن، کاتەکانی بانگیان جیاوازە ئەگەرچی چەند چرکەیەکی کەمیش بێت، دانیشتوانی شاری کەلار سەرەڕای ئەوەی مەسەلەی سوننەو شیعە هیچ ململانێیەکی مەزهەبی بونی نیە، ڕێبازی سوننەش لە ئیسلامدا دەکرێت بە چوار مەزهەبەوە، شافیعی، حەنەفی، مالیکی، حەنبەلی، بەگشتی خەڵکی کورد پەیڕەوی مەزهەبی شافیعی دەکەن بەتایبەتی خەڵکی ئەم ناوچەیە، پێکهاتەی ئاینی دانیشتوانی شاری کەلار بە ڕێژەی٩٩ ٪ موسڵمان پێکی دەهێنن و لە ٠,٥٥ ٪ پەیڕەوانی کاکەیی و مەسیحیش لە ٠,٤٥ ٪ ، هەرچی ئاینی ئێزیدیشە لە ناوچەکەدا بونی نیە ). « ڕزگارحاجی حەمید،کەلار مێژویەکی دێرین و جوگرافیای شارێکی زیندوو١٩٧٠ -٢٠١٢،لێکۆڵینەوەیەکە لە جوگرافیای مرۆییدا، چاپخانەی چوارچرا، چاپی دووەم٢٠١٩، لاپەڕە، ٣٠٦ » .

مێژوی هەبونی کاکەیی لە شاری کەلار لەدوای ساڵانی حەفتاکانەوەیە : (لێرەدا ئاماژەیەک بە چۆنێتی هاتنی کاکەیی بۆ شاری کەلاردەکەین، ئەویش لەدوای ئەوەی لە ساڵانی ١٩٧٤-١٩٧٥ دا، لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ڕاگواستن و تەعریبکردنی دێهاتەکانی

ناوچـەی خانەقیـن دەسـتی پێکـرد، پەیڕەوانـی ئاینـی کاکەیـی خاوەنـی ٢٨گونـد بـوون، لـەو سـنورە چ لـە خانەقیـن و چ لـە دێهاتەکانـی کاکەیـی لـەو چوارچێـوەدا، گونـدی «کەنـی زەردی و ناوخـاس کاکەیـی » بـووە کـە ڕاگوێـزراون، دانیشـتوانەکەی بـەرەو دێهاتەکانـی ناوچـەی شـارەزوور ڕەوانـە کـران، دانیشـتوانی گوندەکانـی دیکـەش بـەرەو ناوەڕاسـت و باشـوری عێـراق ڕاگوێزراون، پاشـان خەڵکەکـەی وردە وردە گەڕاونەتـەوە و لـە شـاری کـەلار نیشـتەجێبونە، یەکەمیـن خێزانیـش لە کاکەییـەکان سـاڵی ١٩٧٦ گەڕاونەتـەوە کـەلار، هەریەکـە لـە «عەبـدوڵا کاکەیـی و ئەکبـەر ناوخـاس کاکەیـی و ناوخـاس ئەحمـەد کاکەیـی » بـووە و لـە گونـدی ئەحمـەد وەلـی نیشـتەجێبون، ئەوەبـوو عەبـدوڵا حەسـەن لـە گەڕەکـی گازینـۆ مایـەوە، « ئەکبـەر ناوخـاس کاکەیـی و ناوخـاس کاکەیـی » وەکـو یەکەمیـن مـاڵ چونـە کۆمەڵـگای حەمـەی کەریـم «گەڕەکـی سـەرکەوتن » ی ئێسـتا، و لەوێـدا نیشـتەجێبون،دواتر ژمارەیەکـی زۆر لـە پەیڕەوانـی ئاینـی کاکەیـی گەڕاونەتـەوە،

،لە گەڕەکەکانی شـۆڕش و شـێروانە وبنگرد و بەردەسـور و فەرمانبەران، نیشـتەجێبوون، بەشـێوەیەکی گشـتی ژمارەیـی کاکەیـی ئێسـتا لـە کـەلاردا ٥٨٠ خێـزان و لـە گەڕەکەکانـی بنگـرد و شـێروانە و بەردەسـوور و شـۆڕش و گردەگۆزینـە و حەمریـن، دابـەش بـوون، کاکەییـەکان بـە شـێوەیەکی گشـتی پەیوەندییـان لـە ڕووی کۆمەڵایەتـی و دراوسـێیەتی پتـەوە لەگـەڵ هـۆز و تیـرە وتایەفـە وعەشـیرەتەکانی ناوچەکـەدا و تـا ئێسـتا هیـچ کێشـە و گرفتێـک یـان ناخۆشـیەک ڕوینـەداوە، بەڵکـو بـە گیانـی برایەتـی و ڕاسـتگۆیی و پێکـەوە ژیـان مامەڵەیـان کـردووە، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە هەمـوو بۆنەیەکـی خـۆش و ناخۆشـدا لەگـەڵ تـەواوی خەڵکـی ناوچەکـە بەشـداریان کـردووە و هیـچ جیاوازیـەک و ناکۆکییـەک لـە ئـارا دا نەبـووە و خاوەنـی متمانـە و پاراسـتنی هەمـوو کلتورێکـی کوردانـەن و مەسـەلەی پاکـی و ڕاسـتی و لێبوردەیـی، بنەمـای بنەڕەتـی هەمـوو کاکەییەکانـە، لـە دوای ڕاپەڕینـە مەزنەکـەی سـاڵی ١٩٩١ پەیڕەوانـی ئاینـی کاکەیـی لـە شـاری کـەلار بەمەبەسـتی زیاتـر بـرەودان بـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانیـان لەگـەڵ هۆزەکانـی تـەواوی ناوچەکـەدا و دام و دەزگا حکومـی و حزبیەکانـی ناوچەکـە

توانیان» ئەنجومەنی ئاینی و کۆمەڵایەتی کاکەیی « پێکبهێنن، کەلەم بەڕێزانە پێکهاتبوون:خوالێخۆشبوان»باوە ڕەشید،ئەکبەرناوخاس،حەمەخ ان،مەدحەت کاکەیی»و هەریەک لەم بەڕێزانە «سەید عادل، سەید هەیاس،ئەلیاس، ڕەحیم عەلی،مەنسور خەلیفە، شاوازکاکەیی»

هاوکات سروشتە ئاینیەکانی خۆیان بە شاراوەیی ئەنجام دەدەن، جیا لەخۆیان ناهێڵن کەسیتریان تێکەڵ بێ)، « هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ٣٠٩ - ٣١٠ « .

دەرەنجامی ئەم نوسینە ئاستی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و لێبوردەیی و یەکتر قەبوڵکردنی ئاینی لە شاری کەلار وەک شارێکی کوردستانی دەریدەخات لە کاتێکدا لە گەڕەکەکانی شاری کەلاردا سونە و شیعە و کاکەیی پێکەوە دەژین، زۆر جار ڕویداوە خانەوادەیەکی سونە و خانەوادەیەکی شیعە لە نەتەوەی عەرەب لە باشور و ناوەڕاستی عێراق هەردووکیان لە ترسی شەڕ و کوشتاری مەزهەبی لە کەلار نیشتەجێن و بەحوکمی واقیعی یەکتر قەبوڵکردن لە کەلار هیچ کێشەیەکیان نیە و پێکەوە دەژین، لێرە شیعە و سونە و کاکەیی پێکەوە بەشداری مەراسیمی پرسە و شین و شایی یەکتری دەکەن، شەراکەت و کەسابەتی هاوبەش و ماڵ لەیەکن و هەندێک جاریش گەیشتۆتە ژن و ژنخوازی و تێکەڵی خێزانی و زیاتر توند و تۆڵبونی پەیوەندیەکان.

# بڕیارم دا بەرگری لە حکومەت بکەم

## چیرۆکی یەکەم شۆفێری تەکسی ناوشاری کەلار



هیدایەت محەمەد

### -ڕۆژی یەکەم-

دوو کاتژمێری مابوو بۆ بانگی ڕۆژوو شکاندن لە ماڵ دەرچووم چەندین جار بەناو شاردا سوڕامەوە، هیچم دەست نەکەوت، تەکسیەکەم ڕاگرت تەماشای خەڵکەکەم دەکرد بێ کار دەهاتن و دەچوون و قسەیان دەکرد. کابرایەک سێ عەلاگەی پڕ لە دەبەی بەتاڵی بەدەستەوە بوو، لەو کاتەدا بایەکی بەهێز هەڵیکرد کابرا شپرزە بوو عەلاگەکانی بۆ ڕانەگیرا دانەیەکی بەدەستەوە بوو منیش دانەیەکم بۆ گرتەوە ئەوی دیکە با بردی عەلاگە دڕا و هەر دەبەیەک بەلایەکدا ڕۆشت پێم ووت پشتوێنەکەت بکەوە بابیان بەستین بەیەکەوە، کابرا زۆر توڕەبوو جنێوی بەحکومەت و حیزبەکان دەدا، ووتم تۆکاری خۆت نازانی خەتای حکومەت چیە؟ ئاگری گرت چۆن خەتای نییە ئەگەر ئەوان دادپەروەر بونایە ئیستا من دۆم نە دەفرۆشت ئەوسا هەموویان دۆ خۆری ئێمە بوون. بیرم کردەوە هەموو دەبەکانی بدەمە دەم باوە کابرایەک بانگی کردم ئەم تەکسیە هی تۆیە؟

## -ڕۆژی دووەم-

جەمانەکەی دابوو بە سەریا، ڕیشێکی پڕی ماشوو برنجی هەبوو، کراسەکەی بەسەر شەرواڵەکەی دا شۆڕ کردبووەوە. بە دەنگی بەرز وتی: دەتوانیت لێرە چاوەڕێم بکەیت تا بانگ دەدات ڕۆژووەکەم دەشکێنم و دەچین بۆچوار ماڵ، بە دڵی ئەو ڕێک کەوتین. لە یەکەم ماڵدا زووگەڕایەوە وتی: ئەمانە ناکەونە ماڵ، لە دووهەم ماڵدا بە ڕوویەکی گەشەوە گەڕایەوە نزای دەکرد و دەیگووت پیاو هەر پیاوە، کەوتینە ڕێ بۆ سێهەم ماڵ وادیاربوو لێرەش بەخت یاوەری نەبوو.

لەچوارەم ماڵدا زۆر دوور کەوتەوە نە گەڕایەوە وامزانی هەڵی خەڵەتاندووم شەو بوو چووە کۆڵانێکەوە نەم دەزانی بۆچی ماڵێک چووە، لەوە دابوو بڕۆم، پەیدا بوو، کەوتە جنێودان بە حکومەت وتم کابرا تۆسەعاتێکە منت ڕاگرتووە کەچی بە خۆڕای جنێو بە حکومەت دەدەی خۆڕای چی ئەگەر حکومەت باشبوایە من ئێستا داوای سەرفترە و زەکاتم لەم چاو چنۆکانە نە دەکرد، بە دەنگی بەرز جنێوی دەدا دەیگووت چۆن وادەبێت ماڵی جولەکەیەکیان هەیە ساڵی جارێک لە دەرگایان دەدەم بێ بەشم دەکەن. دەستی بەرز دەکردەوە و دەپاڕایەوە ئەم حکومەتە سەرە و ژێربێت وائەم شەریکە دزانەی کردوەتە خاوەن پارە وەڵامیم نەدایەوە تا گەیشتە جێگای خۆی وتی خواحافیز

دادوەری وون.

## -ڕۆژی سێیەم-

هەتا ماڵ نە وەستام، منداڵەکانم لە دەرگا دانیشتبوون وتیان مۆلیدەی گەڕەکەکەمان لە کار کەوتووە. هەواڵێکی بێتام بوو، منداڵەکانم خوێندکارن کاتی تاقی کردنەوەیە، لە وەش دەترسام ناوی حکومەت بێنن چونکە هێشتا تورەیی موشتەریەکەم بەری نەدابووم، بە دوو ڕۆژ شەڕەکە بگەیەنمە ماڵ زۆر نا خۆشە. بۆیە وتم من برسیم نیە با بتان بەم بۆماڵی خاڵتان، لەوێ بیرم لەوە کردەوە من چوار ساڵە بە تەواوی پارەی مولیدە دەنوسم چوار ئەمپێرمان ڕاکێشاوە یەک ملوێن وسەت وحەوت هەزار دنیارمان داوە، ئایا ئەم شارە چەند مۆلیدەی تیدایە ؟ ساڵانە چەندە پارە بە مۆلیدە دەدەین ؟ ئەی ئەم هەرێمە چەن مۆلیدەی تێدایە ؟ ئەی لە کەیەوە مۆلیدە بۆماڵان دانراوە ؟ لە یەکەم ساڵەوە تائیستا چەن ملیار دۆلارمان بە مۆلیدە داوە ؟ ئایا بەو پارەیە نەمان دەتوانی کێشەی کارەبا بۆ هەتا هەتایە چارەسەربکەین ؟ ئەی بۆ نەکرا ؟ ئایا حکومەت و حزبەکان تاوانبارنین ؟ ئایا کەسێک ڕاسپێردراوە فیشەکی لێخوڕییێت و لە پشتی سەری سەرۆکی توند کردبێت بلێت: گەر کارەبای هاوڵاتیان باش بکەیت تەقەی خۆشی دەکەم تا بەیانی ئەم دیوو ئەو دیووم کرد و نەمتوانی بخەوم...

## -ڕۆژی چوارەم-

وەک پیشەی هەمیشەیم بەسێ ڕێگا دەروونی خۆم ئارام دەکەمەوە.

خەو وەرزش خوێندنەوە

گرفتی کارەبای مۆلیدە خەوی لێتۆراندم، بۆ وەرزشی بەیانیان بەرە و گۆڕەپانەکە چووم جاران بە چەند خولەکێک خۆم دەگەیاندە ئەوێ ئێستا لە بەرچاوم گۆڕەپانە کە زۆر دوور کەوتوەتەوە. تەماشایەکم کرد و گەڕامەوە بۆ ماڵ، من شەیدای نان خواردنی بە یانیانم، کەچی هیچم پێ نە خورا، پەڕۆیەکم هێنایە جامی تەکسیەکەم دا

و لە ماڵ دەرچووم. گەنجێکی جوان پۆش دەستی لێ هەڵبڕیم بمبە بۆ زانکۆ کە بۆنی خۆشی عەترەکەی بیری خستمەوە کە ڕیشم نە تاشیووە بۆ یەکەم جارم بوو ڕیش تاشینی بەیانیانم لە بیر بچێت. پرسیم خوێندکاریت ؟ نا زانکۆم تەواو کردوە بەشی ژمێریاری ویستم هانی بدەم بۆ زانینی پارەی کارەبای مۆلیدەی هەرێم بە تورەییەوە ووتی هیچ شتێک لەگەڵ ئەم دەسەڵاتە گەندەڵەدا سودی نیە گوو بەکلاوی گەل نا پێویت. ئەمڕۆ یان سبەی ڕێگای هات و نە هات دەگرمە بەر یان دەبمە خۆراکی ماسی دەریا یان ڕزگارم دەبێت، یەک بیین قسەی دەکرد تا دابەزی. سوپاسێکی باشی کردم کە گەشتمە بەردەسوور زانیم پارەی نەداوە.

## -ڕۆژی پێنجەم-

بەدەم ڕۆشتنەوە لە بەردەسوور خەوێکی قورس داگیری کردم تا گەشتمە حەمەی کەریم دووجار خەوە نوجکە ڕای چڵەکاندم، ئەم خەوە لەم کاتە دا دەرمان بوو بۆ من بێ سێ و دوو خۆم کرد بە ماڵی توبای خوشکمدا وەک منداڵی ساوا خەو بردمیەوە، کاتێک خەبەری کردمەوە وامزانی ماڵی خۆمانە بە گەرمی بە خێرهاتنی خوشکەکەم دەکرد تەماشای دەکردم و هیچی نە دەووت، پاش کەمێک واق وڕمان بە بزەیەکەوە ووتی: براخاس تۆ لە ماڵی ئێمەی زۆرم پێناخۆش بوو بە چوار ڕۆژ لە بەرگریکردنی حکومەتی خۆماڵی توشی دۆخێکی ئاوا بووم ماڵی خۆمان نە ناسمەوە. لە شەرماندا سەیرێکی موبایلەکەم کرد سەعات ١ـی پاش نیوەڕۆ بوو هەستم کرد لەو ڕۆژەوە ئەم بڕیارەم داوە کەوتومەتە داوێکەوە و گیرۆدەی خۆشەویستی ئەم بڕیارە بووم نا توانم کەلک لە ژیانی ئێستام ببینم. تەنها خۆماندوکردنم بۆ دەمێنێتەوە. لە کاتێکدا ئەم ڕۆژانەش بەشێکن لە ژیانم. کە بیر لە بەرگریکردن لەم حکومەتە دەکەمەوە لە ڕووی هەست و جەستەوە ئەو کەسەی پێشووتر نیم. داخەکەم کەسێک نەبوو پرس و ڕای پێبکەم بۆیە بە دەنگێکی

بەرز هاوارم کرد دانشتوانی ئەم وڵاتە خۆیان بێ ئیش و کارن چوار دەوریان پڕە لە خۆڵ و خاشاک بە کۆمەڵ ملیان شۆڕ کردوەتەوە بەسەر مۆبایلدا یان لە کافتریاکاندا قوڵتە قوڵت نێرگیلە دەکێشن شوێنی دانشتنی خۆشیان پاک ناکەنەوە لە کاتێکدا کاتی زۆریان هەیە بۆئەوەی ژینگەیەکی پاک و ڕازاوە بۆ ژیانی خۆیان دروست بکەن کەچی هەر بۆڵە بۆڵیانە و حکومەت خراپدەکەن ئیتر تەحەمولی ڕەفتاری وام نەماوە. خوشکەکەم بە بسمیلا بیسمیلا باوشی پیاکردم...

## ڕۆژی شەشەم

هێشتا لە ماڵی خۆشکەکەم بووم لە دەرگایاندا خوشکم دەرگای کردەوە ژنێک بوو نەمان دەناسی وتی من مامۆستا عەواتفم مامۆستای منداڵەکانتان بووم لە قوتابخانەی ئەڵوەند، ئێستا باوکی منداڵەکانم لە نەخۆشخانە خەواندویانە هاتووم بۆ بەتانیەک!. گوێی نەگرت بۆ وەڵام هێرشێکی توندی کردە سەر حکومەت نەخۆشخانەیەکی ئاوا گەورە بەتانی تیا نەبێت بۆ نەخۆش کێ حکومەتی ئاوا بێ پلانی دیوە؟! وەختێک هەناسەی هەڵمژی بوارم بۆ ڕەخسا وتم: تۆ بەتانیت بۆ نەخۆشی خۆت نە هێناوە کەچی ئەڵێی حکومەت پلانی نیە وتی: ئەگەر پلانی هەبێت نەخۆشەکەی ئێمە چەندین ساڵە بە دەستی نەخۆشی گورچیلەوە دەناڵێنێت ئێستا ئەوان دەڵێن گومانی نەخۆشی کۆرۆنای لێدەکەین، بە توڕەییەوە هاتە پێشەوە وتی: چی پلانێکی هەیە ئەو ناحکومەتەی تۆ ؟؟ لە ترسا وتم: پلانی بێ پلانی دادەم بەتانیەکەی بۆ هێناو وتی: مەیهێنەوە با کەسێکی دیکە سودی لێ ببینێت نازانم بۆ هات بە دەممدا و وتم سوپاس بۆ خودا وا من مێردی ئەم ژنە نەبووم بە پڕتاو گەڕایەوە خوشکەکەم بەرەو پیری چوو چپەیەکی بۆ کرد باش بوو گەڕایەوە.

## - ڕۆژی حەوتەم -

لـە مـاڵ خوشـکەکەم دەرچـووم بـە گورگـە فـڕە خـۆم کـرد بـە ماڵـی خۆمانـدا، خێزانەکـەم هـەواداری خۆمـن هاوسـەرەکەم نیگـەران دیاربـوو بـە هێمنـی ووتـی بۆ لـە کاتی خۆتـدا نـە هاتیتەوە دڵـمان لات بوو. پاشان تـکای لێکـردم لـە بڕیـاری بەرگـری کردنم لـە حکومەتـی هەرێم پاشـگەز ببەمـەوە. وتـی خەریکـە بـەم هەفتەیـە ڕووداوەکانـی ژیانمـان بـە بـاش و بـە خراپـەوە لـە دەست دەردەچـن ئـازار و دڵەڕاوکـێ بـە ناوچاوانیـەوە دیاربـوو. ئامادە بـوو تـا بەیانـی قسـەم بـۆ بـکات بیسـەلمێنێت کـە ئـەو لەسـەر هەقـە و حکومـەت مامەڵـەی خـراپ لەگـەڵ هاوڵاتیانـی خۆیـدا دەکات. ووتـی تـۆ لـە هەمـوو کـەس باشـتر ئێمـە دەناسـیت وا دەزانـم دوێنێیـە باسـی هەشـتاکانت بۆدەکـەم شـەهید سـڵاحی بـرام پەیوەنـدی نهێنـی بەشۆڕشـی ئەوسـاوە هەبـوو. بڵاوکـراوە و پۆسـتکارت و وێنـەی شـەهید وسـەرکردەکانی دەهێنایـەوە هەلاجـی بـرام پێشـمەرگەبوو. ئێمـە هەمیشـە لـە دڵەڕاوکـێ و ترسـدا دەژیایـن ئـەو شـەوەی سـڵاحی برامیـان دەسـتگیرکرد لوغمێکـی شەخسـی لـە ماڵمانـدا بـوو بـەس مـن بەشـتەکانیم دەزانـی هەرکـە جاشـەکان ڕۆشـتن لوغمەکـەم بـرد بۆماڵـی قـادری ئامـۆزام. دووسـاڵی تەواو ئێمـە بەرێـی بەندیخانـەی ئەبوغرێبەوە بوویـن. کـە ئازادیـان کـرد بەجلەکانـی بەرمانـەوە ڕامـان کـرد وشـارمان جێهێشـت. خێزانێکـی ١٣کەسـی بوویـن هەرچـەن دەس کـورت وبـێ پارەبوویـن وامـان دەزانـی لـە جنگـی مـەرگ ڕزگارمـان بـووە قوتابخانـەی گوندەکەمـان پـاک دەکـردەوە بـۆ جێـگای ژیانمـان. چونکـە لـە دەروونـدا دڵخـۆش وشـادمان بوویـن هەمیشـە پێکەنیـن لەسـەر لێومـان بـو وامـان دەزانـی لـە دژوارتریـن ڕەوش ڕزگارمـان بـووە. بـە هـەر کوێـرە وەریـەک بـوو حـەوش و خانویەکـی قوڕمـان پێکـەوە نـا بەیانیانێـک تـازە هەتـاو چـەن داردەسـتێک بـەرز بویـەوە، شـنەبایەکی فێنـک واسـەرقاڵی کـردم جێگایـەک نەمابـوو بۆبیرکردنـەوە لـە ڕابـردوو. لەچەنـد چرکەیـەک دا

حەوش وماڵمان بوو بەگۆمی خوێن. ژمارەیەک جەستەی بێگیانی تێدا درێژبوو دایکم و کامەرانی برام لەناو مردووەکاندا بوون ناڵە و زرمەی ساروخ و بای بە هێزی تەیارەکان دایان نیشاندم توند کراسەکەم لە بەری خۆمدا گرت نەوەک باکە بیبا کە بەرچاوم ڕوون بویەوە بەدوای دایکم وبراکانم دا دەگەڕام!

## -ڕۆژی هەشتەم-

بە قورگی پڕ گریانەوە باسی کەوتن و شەهید بوونی دایکی و کامەرانی برای بۆ دەکردم. دەی گووت بۆ یەکەم جار و دواجارم بوو بانگی ئەو دوو ئازیزەم بکەم وەڵامم نە دەنەوە. پاش چوار مانگ لەم کۆستە کەوتنە شاڵاوی بەدناوی ئەنفال دەسی پێکرد. بە پێی پەتی و بەگیرفانی چۆڵەوە کەوتینە ڕێ تا ڕۆژهەڵاتی کوردستان نە وەستاین. گوێم لە ناڵەی بریندای جێماوبوو. ژنم بینی کۆرپەکەی بە کۆڵیەوە مردبوو. لە ترسا نە دەگریا نە بەکەسە نزیکەکانیشی دەوت. تا لە تەنگانە دەرچووین ئەوسا وتی: منداڵەکەم مردووە بیبەن بینێژن. پاش شەش ساڵ دەردی سەری و ئاوارەبوون لە ١٣ کەسی خێزانەکەمان ٤ کەسمان گەڕاینەوە. هێشتا ئەو زامە سارێژ نەکراوانەی سەردەمی کچێنیم لەیاد نەکردبوو، یەک ڕۆژ پێش ڕوخان و لەناوچوونی بەعسیە فاشیەکان ڕاید سلاحی براشم شەهید بوو! لەو خۆشیەش بێ بەش بووین.

## -ڕۆژی نۆیەم-

پاداشتی ١٠ قوربانی و ١١ساڵ تێکۆشان و ترس و مەینەتیم بە بڕی ٦٠ هەزار دینار خانەنشین کرام. دڵم پێی خۆشبوو وتم: باشە لە بیر نەکراوین کە چووم موچەکەم وەربگرم ژنێکم بینی ئەو ژنی ئامرسریەی جاش بوو. لە کۆڵاندا باسی ژیانی خۆشی خۆیانی دەکرد شانازی بەو ڕۆژگارەوە دەکرد کە ئێمە لە ناو قوڕ وخوێندابووین ئەوان لە چی کەیف وسەفایەکدا بوون دەی گووت: سێ ماڵ لە

هاوسێکانمان سەیارەی ئێمە لەحەوشیاندا بوو. کەچی وەکو من پاداشت کراوە سێ مانگ جارێک لە یەک پەنجەرەوە بڕی ١٨٠ هەزار دینار وەردەگرین.

لەو ڕۆژەوە نا ئومێد بووم لە قوربانی و خەبات و ماندووبونمان.

لە ٢٠١٤ وە شەڕی داعش دەسی پێکرد هەموو چاکسازیەکیان ئەوەبوو ٦٠ هەزارەکەی ئێمەیان بڕی. لۆمەیان ناکەم چونکە داماوانە زۆر سەرقاڵن بە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیەوە.

کوڕ وکچی ئەو ژنە بەڕێزە ئێستا نوێنەر وئەندام پەرلەمانی ئێمە یە موچەی یەک مانگیان بەرامبەر بە موچەی دوو ساڵی شەهید و ئەنفال کراوەکانی ئێمەیە ئەمەیە داد پەروەری شۆڕش گێرانە یان ئێمە نەمان دەزانی هەر لە زکماکەوە سفر بووین.







## -ڕۆژی دەیەم-

بە بێدەنگی گوێم بۆ گرت تا ئەوەی ویستی بۆی باس کردم. هەستم بە بارقورسی سەر جەستەم دەکرد بۆیە داوای مۆڵەتم لێکرد و ڕووم کردە باوەشی سروشت. خۆر زۆری نەمابوو بۆ ئاوابوون لە ماڵ دەرچووم. هەر لەمنداڵیەوە ئاواتم ئەوەیە لە کاتی خۆرئاوابوون و خۆرهەڵهاتندا لە دەرەوەبم. چێژێکی تایبەتی لێدەبینم لە ژێر زەردەی خۆردا تاو توێی بڕیاردانەکەم دەکرد. لەناو بازنەی دوو دڵیدا دەسوڕامەوە دەم گووت: سواربوون عەیبێک و دابەزین دووعەیب. نازانم بۆ ئەوسا لە یەک ڕۆژدا دەیان جار سواری کەر دەبووم و دادەبەزیم چەنجارێک دەکەوتم و هەڵدەسامەوە خۆم دەتەکاند و سوار دەبومەوە عەیب نەبوو ئێستا بۆ عەیبە ؟ ئەی سەرۆک بۆ بڕیاری دا ووتی ئەگەر زەرەرمان کرد هەموو خەتاکە بخەنە سەر ئەستۆی من بڵێن هەمووی خەتای ئەم کابرایەبوو ئامادەم لەسەر ئەم مەسەلەیە سەرم دانێم سەریشی دانەنا و هیچیش نەبوو ! ئەی بۆ شێخ فەرمووی من هەلی کار بۆ تەواوی گەنجان دەڕەخسێنم

هیجـان نەبینی و عەیبیش نەبوو ؟ بـە سـەدان بڕیار وبەڵێنـان بیست و بینی لەبـەردەم دەیـان مایـک و کەناڵـی ڕاگەیانـدن دا نـە چونەسـەر و نـە ئەنجامیـان هەبـوو کەسـیش پێـی نـە گوتـن ئـەوەی گۆڕانـکاری دروسـت دەکات بڕیاردانـە و کارکردنـە بەوبڕیـارە. ئیـتر بـۆ مـن قیرسـیجانە نوسـاوم بـەم بڕیـارەوە ؟!

## -ڕۆژی یانزەهەم-

سـەرم هەڵبـڕی پیاوێکـی بـە تەمـەن لـە سـێبەری بـا دا دانیشـتبوو. ویسـتم خۆمـی لێبشـارمەوە کەچـی بـێ ئـەوەی نـرخ بـۆ دوودڵیەکـەی مـن دانێـت وەک دەرزی لەنـاو کاگـەن دا دۆزیبێتـەوە هـاواری کـرد. ئـەم وڵاتەتـان پڕکـردوە لـە نیـوە ڕۆشـنبیری نەخوێنـەوار. دڵ وجزدانەکەشـتان داخسـتووە گـەر بـۆ ڕاسـتی دەگەڕێـت لای زمانـە مردوەکانـە. ئـەم دەسـەڵات دارانـە تـا نەمـرن خانەنشـین نابـن ناچـاری کـردم بـڕۆم بـۆلای پرسـی بـەدوای چیـدا وێڵـی؟

وتم وەرزش دەکەم

وتی بۆ ناڵێی دوو دڵی لە ماڵ دەری کردوم؟

بێ پێچ و پەنا لە ڕۆژی یەکەمەوە بۆم گێڕایەوە

ووتی جا ئەمە کەی حکومەتە تا تۆ بەرگری لێ بکەیت.

وتم ئەی چیە؟

وتی قوناوی کەنەزەردە.

وتم کەنەزەرد چیە؟

ووتـی وابۆتـی دەگێڕمـەوە ٨٠ سـاڵ لەمەوپێـش باشـم لـە بیـرە تـۆش شـێوەی بیرکردنـەوەی خـۆت پالفتـە بکـە. ڕاسـتیە بیـنراوەکان لـە هـەزار وشـە بەنرخـترە. بەچـاوی خـۆم بینیـم کەنـەزەرد گرۆتینێکـی بـێ ڕەحمانەیـان هەبـوو بەردەبونـە گیانـی هاوڵاتیانـی خۆیـان نـەوە لـەدوای نـەوە خۆیـان پـەروەردە دەکـرد چـۆن هۆشـی بـاڵای خۆیـان بەسـەر دانشـتوانی کەنـەزەردا بسـەپێنن. توانیـان وا لـە دانشـتوانی کەنـەزەرد بکـەن ئـەوەی بەدڵـی ئـەوان نەجوڵێتـەوە و دەسـتیان مـاچ نـەکات

بەلادەر و خۆفرۆش و بێگانە پەرست ناوزڕی بکەن. ئەوەش بە

دڵی ئەوان بوو کوردی ڕەسەن پیاو چاک وشۆڕشگێڕبوو هەرکاتێک دەیان گووت ئەمانە بە باوباپیریانەوە هەرنۆکەری باشبوون لە خۆشیدا خەریک بوو دەیان دا لەشەقەی باڵ. بەرزدەبونەوە و دەیان گوت: گەورەم فەرمان بکەن هەموو ئەرکێکیشیان ئەوە بوو خەڵکی کەنەزەرد ناچار بکەن ملکەچی تیرەی فەرمان ڕەوابن.

## -ڕۆژی دوازدەهەم-

ئەحە بۆر باریک تازە پێدەگەشت و خۆڕسکانە جیاواز بیری دەکردەوە. نەک ملی بۆ نە دەخەواندن بێ ترسانە دەی ووت تێناگەم بۆچی بەرگری کردن و پاراستن و قوربانی دان لە کەنەزەرد کاری ئێمەیە؟ شیرینی خواردن وپشودان و خەو کاری ئەوانە ؟ لە شەڕ و لە ئاشتیشدا پرسمان پێناکەن ؟ ئەم قسانە سەرانی کەنەزەردیان بەلەسەکرد مقۆ مقۆیەکیان دروست کرد و نۆکەرەکانیان هاندا بڵێن ئەحە نێرەموکە بۆیە ژن ناهێنێت. کەلتوری کەنەزەرد وابوو هەرکچێک شوبکات دەبوو مۆڵەت وەرگرێت و بەفلتەری ئەواندا تێ پەڕێت پاشان دەگەڕایەوە بۆ زاوا بەبێ ئەوەی کاتی چاوەڕوانەکەی دیاری کرابێت. ئەحە بڕیای دابوو ئەم کلتورە گوناوگون بکات چاوەڕێی هەلێکی دەکرد دەستی دڵخوازەکەی بگرێت و هەڵبێت سەرانی کەنەزەردیش دەیان ویست لەو ڕێگایەوە دەسەمۆی بکەن. هەرکەسێک لەودەستورە لای بدایە دەستەی ناوگەڵ پاکی گەواهی پاکیزەبوونی بۆ نەدەدا. دەبوە نیشانەی تیری ژەهراوی بێچێ و نارەوا ئەحە لە تەمەنی هەشت ساڵیەوە شەهێنی مام زۆراب دڵ و دەروونی لێ سەندبوو.

سوجدەیان بۆخودا دەبرد بەیەک بگەن لە شنەبای مێرگ وزاریش تورەدەبوو کە یاری بە پرچەکەی بکردایە. ئەی چۆن بە خونجەی

بیخاتە بەردەستی ئەو گورگانە بڕیاریان دا پاشماوەی ژیانیان بەسەربەرزیەوە ببەنەسەر بۆ پاراستنی ماڵی باوکیان لە ئازار و ئەشکەنجەی سەرانی کەنەزەرد کەسیان ئاگادار نەکردەوە، شەوێکی ئەنگوستەچاو خۆیان هەڵدایە سەرپشتی ئێسترەکەیان و بۆی دەرچوون. شەهێن تورەکەیەک گڵەسەری لەگەڵ خۆی بردبوو پرچی پێ نەرم دەکردەوە و بۆنی کەنەزەردیشی لێ نەدەبڕا.

## -ڕۆژی سیانزەهەم-

بەدخوەکان بونە پۆستەچی دەستەی نۆکەر خۆیان گەیاندە یانەی پێشوازی سەرۆک دەمی کردەوە خاک فرۆش هەڵەیەکە لێخۆشبوونی بۆنیە.

- باوکی ئەحە: بۆخاتری خوا گەورەم خاک فرۆشی چی ئەوان لا گوێلێک گلەسەریان بردووە بۆخۆیان بەکاری بێنن من دوو هۆڕ گڵەسەرتان بۆدێنم بمان بەخشن.

-کورەکەی سەرۆک لێی چووە پێشەوە ئەوان خاکی پیرۆزی نیشتمانیان بردوە لە باوباپیرمانەوە خوێن بۆ پاراستنی دەبەخشین هەردەبێ لە شوێنی خاکەکەدا هەڵیان واسین تاکەسی دیکە هەڵەی ئەوان دووبارە نەکاتەوە.

ئەوان لە گوندی کونەمشکێی سەرسنور گیرسابونەوە نە سەرۆک هۆز و نەشێخیان. هەبوو ژیانێکی یەکسان و ئاسای دەژیان مام پیروەت مەلای بۆ هێنان حەڵالی کردن لەیەک. پیاوەکانی کەنەزەرد بەناوچەکەدا بڵاوبونەوە هەرەشەیان دەکرد، هەر کەسێک داڵدەیان بدات وەک و ئەوان تاوانبارە. سیخورەکانیان خۆیان دەکرد بەبزگیر و بەبەقاڵ و سواڵکەر دێ بەدێ سۆراغیان دەکردن. ئێوارانێک چەکدارەکانی کەنەزەرد گەمارۆی گوندی کونەمشکێیان دا ئەحە و شەهێن بێئاگا لەماڵەوەبوون مام پیروەت دڵنیای کردنەوە کەس ناوتان ناهێنێت لەماڵەوە خۆتان حەشار بدەن بزانین خودا چیمان

پیشـــان دەدا. چـەن خولەکێـک پێـش ئـەم هەواڵـە کات بریتـــی بـــوو لـە لوتکـەی حـەز و ئاواتەکانیـان ئـەوان لـە تەمـەن و کاتێکـدا بـوون دەبوایـە لەباوەشـی نـاز وخۆشـیدا بـن ئەحـە هیـچ قسـەی نەدەکـرد قتویەکـی بچوکـی هێنـا دووپـەرداخ ژەهـری خەسـتی گرتـەوە ووتـی خـودا گوێـی پێداویـن تامۆسـیقای ئـەم جیهانـە و دەنگـی دڵپەسـەند

ببیسـتین کەچـی سـەرانی کەنـەزەرد وامـان لێدەکـەن دەنگـی پرخەپرخـی مەرگـی خۆمـان ببیسـین، شـەهێن یەقـەی خـۆی دادڕی دوومانـگ لەنـاو هـەوری رەشـدا سـەمایان دەکـرد تروسـکەی هیوایـان دەدا بەژیـان بەهێواشـی دەسـتی بـرد بـۆ پەرداغـی ژەهرەکـە تێرلەچـاوی یەکیـان ڕوانـی لـەو دەمـەوە جگـە لـە پێکەنینێـک کـە لەژەهرتاڵـترە هیچـی دیکەیـان لـێ نابینـم..

# دەفتەری قیاسەکەی عوسمان خەیاتی بەرلووتی



کاروان عوسمان خەیات/ تاران

ئەم دەفتەرە، دەفتەری ئەندازەی مشتەرییەکانی باوکمە، وەکو هەر دەفتەرێکی بەرگدروویەک، ئەندازەی مشتەرییەکانی تێدا نووسراوە. لەوانەیە لای هەندێک هەر دەفتەرێکی ئاسایی بێت، بەڵام لە لای هەندێکی تریش بەو شێوەیە نەبێت. ئەم دەفتەرە تا کۆنتر بێت گرنگی و تایبەتمەندێتی زیاتری دەبێت و دەردەکەوێت. لە مێژووی شوێنەوار و گرنگی شوێنەوار، یان خاوەنداریێتی هەر شتێک ئەگەر خاوەنەکەی مابێت ئەوا گرنگی کەمترە و ئەگەر بابەتەکە یان شتەکە کۆنتر بێت و خاوەنەکەی مابێت یان مردبێت، ئەوا گرنگی زیاتر و زۆرتری تێدا بەدی دەکرێت.

ئەم دەفتەرە لەبەر ڕۆشنایی دەفتەرێکی تریدا نووسراوە، لە ساڵی ١٩٨٢ بەرەو سەرەوە نووسراوەتەوە، بۆ من و ئەوانەی لە بواری دەستنووس و بەڵگەنامە و شوێنەواردا کار دەکەن، دەزانن گرنگی دەستنووس و بەڵگەنامە و ئەم جۆرە شوێنەوارانە چی گرنگی و تایبەتمەندییەکی هەیە، زانایان کاتێک ئێسک و پروسکی مرۆیەک دەدۆزنەوە، لە ڕێگەی «دی ئێن ئەی»ەوە دەزانن ئەم ئێسکە هی چی دەورە و ساڵێکە، یان چەند تەمەنی کردووە، خاسیەتەکانی لەو ڕێگەیەوە دەدۆزنەوە، ئەم دەفتەرەیش بۆ

زەمانێـک بـەکار دێـت، دەزانیـن مـرۆی ئـەم ناوچەیـە، قەبـارە و ئەندازەیـان چەنـد بـووە، قەڵـەو بـوون یـان لاواز، باڵابـەرز بـوون یـان کورتەبـاڵا... ئەمـە لـە ڕوویەکـەوە، لـە ڕوویەکـی تریشـەوە ناوبانـگ و کارامەیـی وەسـتایەک دەستنیشـان دەکات کـە چەنـدە کەسـایەتی و ناودارەکانـی ئـەو شـارە ڕوویـان کردووەتـە لای بـۆ جلوبـەرگ و کاری هونەرەکـەی.

ئـەم دەفتـەرە تەنیـا ئەنـدازەی پیـاوە نـاودار و فەقیرەکانـی تێـدا نییـە، بەڵکـو ئەنـدازەی چەندیـن پێشـمەرگە و کەسـایەتی تێدایـە و ناویـان لەناوانـدا نەمـاوە، یـان سـەرنگوم بـوون، یـان تیـرۆر کـراون، یـان شـەهید بـوون، یـان ڕۆیشـتوون و ئیـتر نەگەڕاونەتـەوە، یـان لـە دەرەوەی وڵاتـن و لێـرەوە لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم ئەندازەیـە قاتیـان بـۆ دووراوە و نێردراوەتـە دەرەوە. ئـەم دەفتـەرە ئەنـدازەی هەندێکـی تێدایـە، ئێسـتایش لـە ژیانـدان، هەندێکیشـیان بـە مردنـی ئاسـاییی مـردوون و ناویـان لەنـاو مێـژووی سیاسـی، کۆمەڵایەتـی، ئابـووری، فەرهەنگـی و ئەدەبیـدا دەدرەوشـێتەوە. هەندێـک نـاو لـەم دەفتـەرەدا هەیـن نـاوی ئـەو پێشـمەرگانەن کـە لـە سـاڵانی هەشـتاکاندا لـە شـاخ بـوون و بـە دزییـەوە قاتیـان بـۆ دووراوە و نەتوانـراوە نـاوی ڕاسـتی خـۆی بنووسرێـت و بەنـاوی کەسـانی تریێـەوە نـووسراون، بەداخـەوە لەکاتـی خۆیـدا بـە باوکمـم وت ئەوانـە کامانـەن، وت: نازانـم و بیـرم نەمـاوە، بـەڵام دەزانـم نـاوی شـەهیدانی ئەشـکەوتی داری خلـە و سـاڵح هـەلاج و چەندیـن کەسـایەتی سیاسـی تریشـی تێدایـە، ئێسـتا لـە ژیانـدان، بـەڵام نازانیـن ناوەکانیـان بەچـی ناوێکـی خـوازراوەوە نـووسراوە.

زۆر لەسـەر ئـەم دەفتـەرە نانووسـم، بـەڵام ئـەم دەفتـەرە بـۆ مێـژووی ئـەم ناوچەیـە هەڵدەگیرێـت و دەپارێزرێـت، لـە ڕۆژگاری داهاتـوودا گرنگـی ئـەم دەستنووسـە و ئـەم دەفتـەرە دەزانرێـت و دەردەکەوێـت.

## ناوی باوکم

عوسمان عەلی ئەحمەد مەحموود، لە ساڵی ١٩٥٥ لە دێی بەرلووتی سەر بە شاری کەلار لە دایک بووە، نیوساڵی خوێندووە و تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵی ئەنجام نەداوە. هەر بە منداڵی و لە تەمەنی ٥-٦ ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە و بە هەتیوی گەورە دەبێت. سێ برا بوون: موحەممەد، عومەر، عوسمان، موحەممەد هەر بە گەنجی جوانەمەرگ دەبێت و خوشکیانیش نابێت، ئەرکی سەرشانیان بەم شێوەیە قورستر دەبێت، چونکە لە یەک کاتدا دەوبوو هەم کاری ماڵ و هەمیش کاری دەرەوە ئەنجام بدەن.

پێش چوونە خزمەتی سەربازی، لە لای عومەری برای و بەتایبەتی لە لای دادە «حەیات»ی بەرلووتی فێری خەیاتی دەبێت، لە ساڵی ١٩٧٦ و ١٩٧٧دا دێتە کەلار و لە لای خوالێخۆشبوو واحێد خەیات کار دەکات، دواتر دوکانێکی خەیاتی تایبەتی بۆ خۆی دەکاتەوە، مشتەرییەکی زۆر باش بۆ خۆی کۆ دەکاتەوە. هەر لەو ماوەیەدا کە دوکانی هەبووە، لە خزمەتی سەربازییشدا کاری خەیاتی دەکات و فێری دوورینی پانتۆڵ و جلی سەربازی دەبێت.

ئەو شێوە و بیری تایبەتی خۆی هەبوو لە بڕین و دوورینددا، دوورینی خۆیشی لەناو هەموو دوورینی خەیاتەکانی تریدا بە جوانی دەناسییەوە. تا کۆتایی ژیانی خۆشەویستییەکی تایبەتی هەبوو بۆ پیشەکەی و هەمیشە دەیگوت، من تیکەیە نانم لەم پیشە خواردووە و تا مردن ڕێزی لێ دەگرم، ئەو بڕوای وابوو نابێت زانست بشاردرێتەوە، بۆیە نزیکەی ١٤ کەسی لە نزیک و دوور، ئەوەی پرسیارێکیشی هەبووبێت، بە ڕاستگۆیانە و بێ پێچ و پەنا وەڵامی دەدایەوە و زانستەکەی فێری دەکرد. ئەو دەیگوت من بۆ فێربوونت سێ جار پێت دەڵێم، خۆتیش دەبێت دیققەت بکەی لە فێربوون و تەماشای دەستم بکەیت. ناوبراو لە ٢٠١٣/٦/١٤ بە نەخۆشی جەڵتەی دڵ کۆچی دوایی کردووە.

## پێناسەی دەفتەرەکە

ئـەم دەفتـەرەی باوکـم مێـژووی دانانەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی ١٩٨٦ و ماوەیـەک پێـش ئـەوە، ئەمەیـش بـە پێـی ئـەو مێـژووەی کـە لەسـەر دەفتەرەکەیـە. لـە لاپـەڕەی پشـتەوەی دەفتەرەکـەدا دوو مێـژووی سـاڵی لـە دایکبـوون مـن و خوشـکە بچووکەکەمـی پێوەیـە. نـووسراوە: «بـۆ یـادگاری: لـە دایکبوونـی کاروان عوسـمان عەلـی، لـە ڕۆژی شـەممە لـە بـەرواری ١٩٨٦/٩/٦». ئـەم دەفتـەرە پـێ دەچێـت دوو بـۆ سـێ سـاڵ پێـش ئـەم مێژووەیـش نووسرابێتـەوە. ئـەم دەفتـەرە بـە خەتـە جوانەکـەی کاک ڕێبـوار ڕەشـید قـادر جـاف، خـزم و دۆسـتمان بـە تایبەتـی بـۆ باوکـم نووسراوەتـەوە، ئەڵبەتـە ئـەم دەفتـەرە لەبـەر دەفتەرێکـی نارێکـی تـری نووسراوەتـەوە، بۆیـە بریـار دراوە ئـەم دەفتـەرە بـە ڕێکوپێکـی بنووسرێتـەوە، لـە سـەرەتای دەفتەرەکـەدا نـاوی مشـتەرییەکان تۆمـار کـراوە و بەپێـی ڕیزبەنـدی پیتـەکان نەنـووسراوە، بەڵکـو بەپێـی هاتنـی نـاوەکان ڕیـز کـراوە، واتـا ئەنـدازەی هـەر کەسـێک لـە ژمـارە یەکـدا هاتبێـت، ئـەوا نـاوی سـەرەتای دەفتەرەکەیـش بـەو نـاوە دەسـت پـێ دەکات و هاتـووە.

ئەنـدازەی ئـەم دەفتـەرە (٢١×٢٨سـم)، دەفتەرەکـە زیاتـر بـە خەتـی کاک ڕێبـوار و باوکـم نووسراوەتـەوە، ئـەم دەفتـەرە خەتـدارە و بـە قەڵەمـی شـین و ڕەش نووسراوەتـەو. زیـاد لـە ٦٥٠ ئەنـدازەی مشـتەرییەکانی تێدایـە و هەندێکیانیـش چەنـد جارێـک ناویـان لـە دەفتەرەکـەدا هاتـووە، واتـا ئەنـدازەی دووبـارە و تـازە و کۆنـەی تێدایـە. هەندێـک پارچـە کاغـەزی تریشـی تێدایـە و هێشـتا ئەمانەیـش تۆمـار نەکـراون.



بۆ یادگاری

لە دایک بوونی کاروان عثمان علی

لە رۆژی شەممە لە بەرواری ١٩٨٦/٩/٦

لە دایک بوو

لە رۆژی چوارشەممە رێکەوتی ١٩٩١/٦/٥

## جۆری ئەندازەکان:

**درێژی شەواڵ، بانشان، قۆڵ، ناوقەد، بنباڵ، پانی قۆڵ، ملیوان.**

ئـەم جـۆرە ئەندازانـە، لـە بەرگدروویەکـەوە بـۆ بەرگدوورێکـی تـری دەگۆڕێـت و گۆڕانـکاری تێـدا کـراوە و هەرکەسـێک بـە جۆرێـک ئەنـدازە دەگرێـت، بـەڵام ئـەم ئەندازانـە لـە لای باوکـم و ئەوانەیشـی لـە لای ئـەو فێربـوون، جۆرێـک نەگـۆڕ بـووە و کـەم دەسـتکاری کـراوە.

درێـژی شـەواڵ: ئـەم ئەندازەیـە ٧سـم لـە سـەرەتای مەترەکـەوە تـەرک دەکرێـت بـۆ پـزی نـاوەوە، لـە نزیـک ناوکـەوە تـا نزیـک بـە قنگپاژنـە دەکاتـە درێـژی شـەواڵ.

بانشـان: ئـەم ئەندازەیـە لـە جـۆری قاتەکانـدا دەگۆڕێـت، لـە قاتـی سـادە و مەلیکـی و نیومەلیکیـدا وەکـو یەکـە و لـە قاتـی کەتافـی و قەمیسـدا وەکـو یەکـە و هەندێـک گۆڕانـکاری تێـدا دەکرێـت، لـە قاتـی سـادە و مەلیکـی و نیومەلیکیـدا سەرئێسـقان بـۆ سەرئێسـقانی بانشـانەکان ئەنـدازە دەگیرێـت....

قـۆڵ: ئـەم ئەندازەیـش لـە قاتـی سـادە و مەلیکـی و نیومەلیکیـدا لەسـەر ئێسـقانی سەرشـانەوە کـە ئەنـدازەی سەرشـان گیـراوە، لـە هەمـان جێـگاوە تـا جێـگای دیاریکـراوی مـوچ «سەردەسـت» دیـاری دەکرێـت و دادەنرێـت.

ئـەم ئەندازەیـە لـە قاتـی کەتافـی و قەمیسـدا لەسـەر شـان و بەتایبـەت لەسـەر سـابوونەی دەسـت تـا سەردەسـت دادەنرێـت و ٥-٦ سـانتیش کـەم دەکرێتـەوە بـۆ سـەرقۆڵەکەی.

ناوقـەد: ئـەم ئەندازەیـە بـۆ مەلیکـی و نیومەلیکـی و سـادە تـەواوی سـینە، واتـە دەوروبـەری سـینە بـە تـەواوی دەگیرێـت.

ئـەم ئەندازەیـە لـە قاتـی کەتافـی و قەمیسـدا تەنیـا یـەک لای و کەمێـک لەسـەرووی ناوکـەوە تـا خەتـی ناوەڕاسـتی سـک کـە دوورینـی بەردەسـت و پشـت پێکـەوە دەدورێنـەوە، دیـاری دەکرێـت.

بنبـاڵ: ئـەم ئەندازەیـە، ئەنـدازەی پشـتە و لـە دەمـارە گەورەکـەی بنباڵـی پێشـەوە تـا ئـەم دەمارەکـەی تـری لـە بنباڵـدا ئەنـدازە دەگیرێـت.

پانـی قـۆڵ: ئـەم ئەندازەیەیـش لـە شـێوەی قاتەکانـدا دەگۆڕێـت و لـەو سـێ دانـەی پێشـەوەدا وەکـو یەکـە و بـە دەوری عەزەڵـەی قۆڵـدا بـە شـێوەیەکی فـراوان، ئەنـدازە دەگیرێـت.

ملیـوان «یەقـە، هێقـە»: ئـەم ئەندازەیـە دەوری مـل دەگرێتـەوە و تەنیـا لـە قەمیـس و قاتـی کەتافیـدا بـەکار دێـت.



## هەندێک لە قسە خۆشەکانی دوکانەکەی باوکم

مـام سـابیرێک هەبـوو، خەڵکـی دەککـە بـوو، زوو زوو ئەهاتـە لای باوکـم، مـام سـابیر بـۆ قسـە دا نـە ئەمـا، ڕۆژێـک وتـی: لـە کۆڕێکـی ئاواییـا دانیشـتبووم، تـازە خانوومـان دروسـت کـردوو، وتـی لـە ئاواییـا ئەگـەر تـازە ئـەو زەوییـەت کردوێتـە خانـوو، ئەگـەر پێشـتر دەرمانـوو نەکـردوێ، ئـەوا لـە کاتـی تەواوبوونـا و پێـش ئـەوەی بچیتـە نـاو خانووەکـەو، ئـەوێ دەرمانڕێـژی بکـەی بـۆ ئـەوەی لـە حەشـەرە پارێـزراو بـی. وتـی: ئێمەیـش دەرمانمـان کـردوو، نزیکـەی ٣٠-٣٤ قۆلانچـە و کۆڵاژدمـی کوشـتوو، حەشـەرەیەکی زۆری کوشـتوو، وتـی منیـش لەنـاو کۆڕەکـەدا باسـم کـرد، وتـی: دەمڕووتـێ لـەو لاوە وتـی: عـەک لـەو درۆ، وتـی: منیـش تەماشـایەکم کـرد بینـم دەمڕووتێکـی ناشـارەزایە و بەبـێ خـۆ تێکـدان، وتـم: پێشـینیان وتوویانـە: لـە شـوێنێک درۆ بکـە، درۆزن دانەنیشـتوێ، وتـی وەڵـڵا کورەکـە زۆر تەریـق بـووەوە و وتـی: بەخـوا هیـچ مەبەسـتێکم نـەو، وتـی: منیـش پێـم وت: منیـش مەبەسـتێکم نـەو.

هـەر مـام سـابیر وتـی: ڕۆژێکیـان لـە نـاو بـازاڕا پیـاوێ گەیشـتە پیاما و وتـی مـام سـابیر مـام سـابیر، وتـم: بەڵـێ، وتـی: ئەزانـی لـە میسـر وە کـەر ئێـژن سـابیر، وتـم: وەڵا ئێمەیـش مانگایەکـمان بـوو دایکـم وتـی: شـوکر کەڵـی گـرت. وتـی: زانـی تێکـەوت، وتـی: بەخـوا مەبەسـتم تـۆ نـەو، وتـی: منیـش مەبەسـتم تـۆ نـەو. تومـەز کاورایـش نـاوی شـوکور بـووە.

ڕۆژێکیـان یەکێـک لـە کورەکانـی هاوڕێیەکـی باوکـم هـات و وتـی: کا عوسـمان، پەنمـان داوە و چارەسـەری کـە، باوکـم وتـی یـا ئەڵـڵا خێـر! وتـی ویسـتمان وە دزییـەوە قاتـێ بـۆ باوکـم بکەیـن، چوویـن لـە دوکانێـتر قاتێکـمان بـۆ دووریـوە و بردمانـەوە بـۆی، وتـی پێـمان: بانملەی کەرتـان دیـوە؟ وتمـان بـۆ؟ وتـی: ئەزانـم ئـەم قاتـە عوسـمان خەیـات نەیدووریـوە، بـڕۆن وە عوسـمان خەیـات بێـژن باوکـم وتوویەتـی: ئـەم بانملـەی کـەرەم بـۆ بکاتـە قاتـێ، باوکیشـم تێرتێـر پێکەنـی و وتـی: بەچـاوان.

ڕۆژێتر بەیانییە زوو پیاوێ گونێیەکی پەرت کردە بەین پارچەکانی باوکمەوە و وتی: قیق، یەکێ لە دوکانداەکان وتی: کا عوسمان هاوردیان، کاورایش وتی: ئەگەر درۆ ناکەی، تۆیش قاتی باشمان بۆ بکە، تا ئێمەیش قیقێ فڕەیدەینە بەر دوکانەکەو.

دوکانەکەی باوکم هەم جێگەی قسەی خۆش و هەمیش جێی ئاشتەوایی و کۆڕ و کۆبوونەوە بوو، میوان دەهات، ئەو لە دوکانەکەی ترەوە هاواری ئەکرد، کاروان! لەو شوێنە بەرد هەیە؟ منیش تێ ئەگەیشتم مەبەستی چییە و خێرا ئەچووم چاییەکەم ئەهێنا.

ڕۆژێک پیاوێ هات و هەستم کرد زۆر جەوی خۆشوو، وتم خێرە؟! وتی وەڵڵا دوێنێ شتێکم بینی زۆر ناڕەحەتی کردم، بەڵام ئەمڕۆ زۆر جەوم خۆشە، وتم یائەڵڵا: خێرا! وتی: بۆ بازاڕ کەلار ئەهاتم، ڕەفیقێکم گەیشتە پیاما و حاڵی شێواو بوو، وتم خێرە؟ وتی: وەڵڵا تەلەفونیان بۆم کردە و چوونە زەوییەکانمیان وە بێپرس کێڵاوە و ئەچمە گیان ئامۆزاکانم و ئەیانکوژم، وتم: بابە بێسە، جارێ پێش ئەوەی تفەنگ هەڵگری، بڕۆ بۆ ماڵ ئامۆزاکانو بزان بۆچی هەر لە خۆیانەوە کێڵایانە، وتی: نەخێر، ئەوان حساویان بۆ نەکردووم، وتم باوە بزان بۆچی حساویان بۆت نەکرد، لەوانەیە ئەوان تۆیان بە خۆییی حساو کردوێ، وتی: باشە وە قسەو ئەکەم، وتی: بەیانی لە پرسەیەکا هاتە لامۆ و وتی: ئەزانی خێرێکم لەسەرە و شیرینییە تۆیش قەرزارم، خوێنێکت لەسەرم لابرد، وتم: خێر؟ وتی: وەڵڵا چوومە لای ئامۆزاکانم و وتوویانە وەڵڵا وتوومانە ئەمە زەوی ئامۆزامانە و خۆ ئەو نایکاتە گەنم و ئەیکەینە گەنم و نیوەی ئەویشی تێ ئەکەین، بۆچی هەروا بکەوێت، وتی: وەڵڵا تومەز خەڵکی تر بە جۆرێکی تر پڕیان کردەتۆ و خەریکوە خوێنێ بهێنێتە مل خۆی. ئەمە زۆر دڵخۆشی کردووم.

# کەلار : پایتەختی میهرەبانی

بێستون ژاڵەیی



کاتێك لە دەروازەی بەردەسوورەوە دێیتە ناو کەلار هەر لەڕێوە تابلۆیەك باوەش بە بینین و ئیحساستدا دەکات و کەلاریانە پێت یەژێ «بەخێربێن بۆ شارە پڕ پاکی و سادەیی و ماریفەتەکەی کەلار، ئێرە هەمووی ماڵی خۆتانە، ئەگەر لێرە شوێن و ئاشنایەکتان نییە، بۆ پشوودان وحەسانەوە و هەر پێویستیەك ئێمە لە خزمەتتانداین(ئەنجا ژمارە تەلەفۆن وناوی ماڵێکی حەساندنەوە)» بەدڵنیاییەوە ئەم تابلۆ لە هیچ شاروشوێنێکی تری کوردستاندا نابینی لە کەلار نەبێت، لەو تابلۆی دەروازەی کەلارەوە دەڕۆین بۆ ئەوەی کە خۆی کەلاری بوون کەدەشکاتە گەرمیانی بوون لەواتا کۆمەڵایەتیەکەیدا یەکسانە بە خاکەرایی و ماریفەت و راستگۆیی و ڕاشکاوی، کەلاریبوون



ئێرەیی و ڕقی بە شاروشوێنەکانی تر تێدا نیە وەك لە شوێنی تر هەیە، کەلاریبوون لە مامەڵە لە گەڵ میواندا پڕە لە خاکیبوون و لەخۆبوونەوە و تەوازوع تا ڕادەی توانەوە لەبەردەم میواندا، بۆیە ئەگەر شار پێویستی بەهەموو دامەزراوەیەکی لەخۆگرتن و حەساندنەوە و ئارامی وشادی بەخشین بێت، کەلار بەهۆی میهرەبانی خەڵکەکەیەوە بەو مانایە تا ئێستا نەبۆتە شار و کار وکاسبی ئوتێل تیایدا کەساس و بێ قازانجە، ڕاستە لە کەلاردا بەهۆی ئەوەی ئاوەدانیەکە لە قۆناغی ڕاگوزەردایە بۆ بوون بە شارێکی گەورە هێشتا دەخاڵەت لەژیان وگوزەرانی دیگەران و چاوچنۆکی و چاوبڕین لە ڕزق ورۆزی ئەوانی تر حزووری هەیە، بەڵام میهرەبانی توخمێکی گرنگی ژیان وگوزەرانی کۆمەڵایەتییە لە کەلار، شارێك کەس تیایدا هەست بەغەریبی ناکات و هەرکەس لە هەرکوێوە بێت خێراتر لە هەر کەلاریەك دەبێتە کەلاریی، بۆیە ئەو هەزاران یەکەی نیشتەجێبوونەی بەخێراییەکی پێوانەیی دروست دەکرێن دەرەقەتی ئەو هەموو داخوازییە نایەن کە لەسەر نیشتەجێبوون لە کەلار وهەڵبژاردنی ئەم دەشتە گەرمە بۆ شوێنی ژیان هەن.

ڕاستە فەزای گشتی لەکەلار ئێستا لەسی وچل وپەنجاکانی سەدەی ڕابردوو بەرتەسك ترە کە خەڵك دیوەخانی بەگەکانی جافی بۆ گردبوونەوە لە فەزای گشتیدا و ئاگاداربوون لە دنیا ودەوروبەر بەکار دەهێنا و کەلار تا ئەمڕۆش خاڵیە لەو دیوان و کافتریا وکافێ و ماڵەگەورانەی بە کەڵکی کۆبوونەوەی نوخبە و دەستەبژێری کۆمەڵایەتی و کەلتوری وسیاسی بێت، لەدەرەوەی دەوامی فەرمیەوە کەلاری ئەو باخانەیان هەیە کە هەریەك لەو باخانە تەنیا چەند کەسێکیان تیایدا سەر بەیەکدا دەکەن و سەرە واوێ لەحاڵی خۆیان و دەوروبەریشیان ناگۆڕێ، ئەمە لەپاڵ دیاردەی شەرمئاوەر و پێکەنیناوی کۆبوونەوە خێڵەکیەکاندا کە تیایدا سەرۆك تیرە وخێڵە هەڵتۆقیوەکان تیرە وتایەفەکانیان بۆ چەندین پارچە وبەرەبابی تر ورد کردۆتەوە و تەنیا سەرگەرمی دەعوەت و خۆتێرکردن و وێنەگرتن و هیچ کام لەم عێلجاریانە برسیەکیان تێر

نەکردووە و نەبوونەتە پرۆژەیەکی خزمەتگوزاری وچاکەی گشتی بۆ ئەم گروپە کۆمەڵایەتیانە، بەڵام کەلار چانسی گەورەی لە ئایندەدا هەیە، چونکە لەپاڵ میهرەبانی و مرۆڤدۆستی دانیشتوانەکەیدا دەیان خاڵی هێزی ئابووری وجێکەوتەی جوگرافی و ئازایی خەڵکەکەی و هیتری هەیە.

لەهەموو کەمپینەکانی ٢٥ ساڵی ڕابردووی کەلاردا بۆ بەبەهاناوەچوونی ئاوارە ولێقەوماو و کارەساتی سروشتی و دەستکرد لێدراوان کە لە زۆربەیان ئاگادارم، نمونەی وام لە میهرەبانی خەڵکی کەلار بینیوە کە هی ئەوەن بکرێنە داستانی کاری خۆبەخشی وخێرخوازیی، لەپەیوەندی بە لەخۆگرتنی ئاوارە ولێقەوماوانیشدا لەمێژووی نزیکی ئەم شارەشدا کەهەر خۆشی لە زۆربەیدا ئاوارە و ڕاگوێزراوان ئاوەدانیان کردۆتەوە، گرنگە ئەوە بزانین کە لەسنووری قەزای کەلاردا لەدوای توندوتیژیە تایەفیەکانی عەرەبی شیعە وسونەوە لە عیراقی دوایی ٢٠١٤ دا ٧٥٠٠٠ عەرەب پەنایان بۆ سنووری قەزای کەلار بە ناحیەی ڕزگاریەوە هێناوە لەگەڵ ٢٥٠٠٠ کوردی خورماتوودا لە دوایی ١٦ی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧ ئاوارەی ئەم سنوورە بوون و لێرە بەدەیان خێزانی پەنابەری ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش دەژین کە هەموویان بوونەتە کەلاری وخاوەن ناسنامەی ولاتیبوون، ئەڵبەتە هەر لەبەر نابێ بڵێین کەلاری چەند میواندۆست و میهرەبان بووە لەگەڵ ئاوارە وپەنابەراندا بۆ ئەمەش ڕاپرسیەکی ئاژانسێکی گەورە و موعتەبەری نێودەوڵەتی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بەنمونە وەردەگرین کە ڕێکخراوی کۆچی نێودەوڵەتییە و ڕاپرسیەکەی لەسەرەتای ساڵی ٢٠٢١ دا بڵاوی کردۆتەوە و لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکاندا شێری کردووە.

بە پێی ئەو ڕاپرسیە کە دووای توێژینەوەیەکی مەیدانی هاتووە کە ڕێکخراوی کۆچی نێودەوڵەتی iom لە ١٤ گەورەشاری عیراق و هەرێمی کوردستاندا بەناونیشانی «شارەکان وەك ماڵ وماوا» ئەنجامی داوە بە بەغدا و هەولێریشەوە کە زۆرترین ڕێژەی ئاوارەیان تێدایە و تیایدا ڕای ئاوارەکان وەرگیراوە، کەلار بە میهرەبان و

میواندۆستترین شار لە لەخۆگرتنی ئاوارەکاندا هاتووە، ئاوارەکان لە کەلار بەم جۆرە ڕای خۆیان دەربڕیوە :

٪٧٦ دەڵێن هەرگیز کەلار بەجێ ناهێڵین.

٪٧٥ ئینتیمایان بۆ شارەکە هەیە و خۆشیان دەوێت.

٪٧٥ واهەست ئەکەن لەکەلار قبوڵکراون و وەك خانەخوێ و خاوەن ماڵ سەیر دەکرێن.

٪٩٨ متمانەیان بە خەڵکی کەلار هەیە.

٪١٠٠ متمانەیان بە دەزگا پەیوەندیدارەکان لە کەلار هەیە.

٪٩٩ واهەست ئەکەن لەکەلار بەتەواوەتی پارێزراون.

ئەڵبەتە ئەم داتا و زانیاریانە تەواو زانستی و موعتەبەر و هی ئاژانسێکی گەورەی ئومەمین و دەبێ شی بکرێنەوە و لەسەریان بووەستین، دەبێ بزانین ئەو خەڵکە غەریبە کە لە ژینگەیەکی ترەوە هاتوون و کەلتور و زمانیشیان لە هی کەلاری جیایە، چۆن وایان لێهاتووە کە هەرگیز ئامادەنین ئێرە جێ بهێڵن و هەست بە ئارامی وپارێزراوی و متمانە دەکەن و خۆیان غەریب نابینن، ئەمەش دەبێتە نهێنی میهرەبانی کەلاری.





# ئامادەیی پیشەیی کەلار و گوزەرێك...

ئەحمەد محەمەد قادر

«بەڵێ دیارە لە ناو قەومی بەسیتا،قەدری سەنعەتکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە، لە ناو حەوزێکی لیخندا..»
((گۆران))





ساڵی( ١٩٨٨) لە قەزای کەلاری سەربە پارێزگای سلێمانی، ئەوکات دامەزراوە، وەك دەڵێن:پێویستی دایکی داهێنانە،خوێندکارانی کەلار بۆ خوێندنی پیشەیی ڕوویان کردوەتە،شارەکانی(دەربەندیخان ،کفری.خانەقی.)، بەکردنەوەی (ئامادەیی پیشەیی کەلار) خوێندکاران گەڕاونەتەوە کەلار، لە کردنەوەیدا ساڵێ(١٩٨٨) بەپێی تۆماری گشتی خوێندکاران،(٤٧٣) خوێندکار لە بەشەکانی:( بازرگانی، کارەبا) وەرگیراون..

پێویستە بوترێ لە ساڵی( ١٩٨٧) بەشی بازرگانی لەئامادەیی سەورە (ثانویە الثورە) کە ئەوکات (عەبدوڵڵا مەنگوش) بەڕێوەبەری بووە،کراوەتەوە، (١٣٣)خوێندکاری وەرگرتوە، لە ژێر سەرپەرشتی ئامادەیی ناوبراودا، بۆ ساڵی (١٩٨٨) ئەم خوێندکارانە گواستراونەتەوە (ئامادەیی پیشەیی کەلار)، بۆیە لە تۆماری گشتی خوێندکارانی پیشەیی، یەکەم خوێندکار کە تۆمارکراوە بە ناوەی:(ڕەحمان عەلی

ئەحمەد)،لە ڕێکەوتی (١٩-١٠-١٩٨٧) لە پۆلی یەکەمی بازرگانی دەستی بە خوێندن کردووە، لەدایك بووی ناحیەیی مەیدان ساڵی( ١٩٧٣) یە..

## بۆچی ناوی لێنرا: (پیشەیی کەلار)؟

ئەوەندەی تێبینی کراوە، زۆربەی ئەو :زانکۆ،پەیمانگا،قوتابخانە، فەرمانگە،باخچە،مزگەوت و شوێنە گشتیانەی،کە دەبنە یەکەم لە هەر شارو شارۆچکەیەکدا، ناوی شارەکەیان وەرگرتووە (لێنراوە).

بۆیە دەکرێ (ئامادەیی پیشەیی کەلار)یش،کەوتبێتە چوارچێوەی ئەم تێڕوانینەوە...

## ناوی بەڕێوەبەرەکانی (ئامادەیی پیشەیی کەلار) و ماوەی کارکردنیان،لە دامەزراندنەوە تا ئێستا:

١- داود شێرزاد محمد (لەدایك بووی ١٩٥٠)،(١-١٠-١٩٨٨ بۆ ٨-١٠-١٩٨٩)(کۆچی دوایی کردووە).

٢-انوەر محمد مراد (لەدایك بووی ١٩٥٣) ،( ٨-١٠-١٩٨٩ بۆ ١-٤-١٩٩٠)،خانەنشین.

٣-حسین زۆراب محمد (لەدایك بووی ١٩٤٩)،(١-٤-١٩٩٠ بۆ ٢٤-١٢-٢٠٠٤)،خانەنشین.

٤-ابراهیم حسین احمد (لەدایك بووی ١٩٧٠)،(٢٤-١٢-٢٠٠٤ بۆ---- -٢٠٢٢) بەردەوامە.

## ناوی سەرجەم ئەو مامۆستایانەی،کە ساڵی یەکەمی دامەزراندنی (ئامادەیی پیشەیی کەلار)، ٩٨٩١-٨٨٩ )،دەستبەکاربوون:

١-داود شیرزاد محمد (بەڕێوەبەر)
٢-انور محمد مراد (یاریدەدەر)
٣-وداد علی الفت (یاریدەدەر)
٤-محمد جبار ابراهیم
٥-علی حسین حسن
٦-عباس حسین عبد علی
٧-احسان ولی
٨-سالار احمد عبدالله
٩-احمد مصطفی سمین
١٠-شیرین هیدایەت فارس
١١-سەرگوڵ رؤوف محمود
١٢-لیلی جمال علی
١٣- کوردە احمد فقیە
١٤-نسرین رزا علی
١٥-جلال محمد علی
١٦-دیار تاهر عبدالله
١٧-عدنان قادر محمد
١٨-سالح محمود الماس
١٩-عمر علی عارف
٢٠-ادهم انور شفیق
٢١-وسال علاألدین عبدالله
٢٢-احمد محمود تەهماس
٢٣-سالار کاکە گمر
٢٤-جلال حمید ابراهیم
٢٥-برهان احمد غنی
٢٦-تاهر عبدالله محمد
٢٧-حسین زۆراب محمد
٢٨-شکریە محمد علی
٢٩-بیان عبدالله سالح
٣٠-ئاشنا علی حسن
٣١-نزیرە حمە امین خورشید
٣٢-شنۆ فایق جلال
٣٣-انور احمد محمد
٣٤-طیبە عبدالکریم رەزا
٣٥-رۆشنا کریم مستەفا.

### کارگوزارەکان:

١-وەلی کاکەیی.
٢-جەبار..(پیرەمێردیک بووە،دانیشتوی خانەقین).
٣- خەلیل ئەحمەد (پاسەوان).

ناوی سەرجەم ئەو خوێندکارانەی، ساڵی یەکەم،(١٩٨٨)، لە (ئامادەیی پیشەیی کەلار) وەرگیراون،بە هەردوو ڕەگەزی (نێرو مێ)، بۆ هەردووبەشی (کارەبا +بازرگانی)،بە پێی تۆماری گشتی خوێندنگە، ژمارەیان: (٤٧٣) خوێندکارن: بە (رحمان علی احمد دەستپێدەکات بە (زینب علی دینە) کۆتایی دێت :

١- رحمان علی احمد
٢-محمد محی الدین نوری
٣-زیاد کریم محمود
٤-جلیل خلیل ابراهیم
٥-حسن عبدلله محمد
٦-مصطفی محمد سعید
٧-سلام کمال معروف
٨-فازڵ محمد قادر
٩-برزان فرج احمد
١٠-بختیار عمر محمد
١١-حسن محمد عزیز
١٢-تحسین محمد علی
١٣-احمد محمد رووف
١٤-عبدلله عبدالمحمد فتح الله
١٥-رێزان اکرم علی
١٦-فایق نامق عبدلله
١٧-ابراهیم محمد کریم
١٨-محمد مجید عبدالقادر
١٩-عباس ابراهیم اسماعیل
٢٠-علی محمد فتاح
٢١-جبار احمد محمد
٢٢-لقمان کریم سفر
٢٣-علی احمد حمەرەش
٢٤-شیرزاد محمد سالح
٢٥-لیلی مجید عزیز
٢٦-شهلە فیضالله غریب
٢٧-بیان حسن وەلی
٢٨-سروە محمد محمد امین
٢٩-وداد محمد سعید
٣٠-لميعه ولی عبدالقادر
٣١-روناك عبدرحمان محی الدین
٣٢-هیفا مصطفی فتاح
٣٣-نازنین مجید فتح الله
٣٤-نسرین مستەفا فتاح
٣٥-یسری محمد سعید
٣٦-بدریه قادر سالح
٣٧-زینب خلیل ابراهیم
٣٨-کویستان محمد محی الدین
٣٩-امیر علی سالح
٤٠-خوله جمعه شکر
٤١-سهامه کریم امین
٤٢-سراب فوزی عبدرحمان
٤٣-سویله عبدالله گمر
٤٤-رساله شفیق رحیم
٤٥-هیفا حسین علی
٤٦-زکری نوری محمد
٤٧-زیرینەمحمد امین
٤٨-مليحه کریم محمد
٤٩-ادیبه شریف مجید
٥٠-جوان احمد محمد
٥١-نسرین محمد محمود
٥٢-هاجەر محمد فرج

٥٣-سعاد نادر نجف
٥٤-نوزاد جهاد امين
٥٥-وريا علي ولي مراد
٥٦-سامان فريق تالب
٥٧-لقمان سمير ميرزا
٥٨-اكبر سابر گمر
٥٩-محمد علي حبيب
٦٠-رزگار محمد علي
٦١-سهيله حسين رۆستم
٦٢-مريوان عزيز مستەفا
٦٣-رحيم كريم حسن
٦٤-رحيم حسين محمد
٦٥-زاخۆ حسين حسن
٦٦-فادى عزيزسعيد
٦٧-برزان مصطفى محمد
٦٨-فريق حمەامين فرج
٦٩-عثمان محمد امين
٧٠-كامران احمد نوروز
٧١-شكر محمود سالح
٧٢-جاسم محمد نياز
٧٣-هورامان بهروز حميد
٧٤-برهان عبدرحمان محمد
٧٥-سهيله عبدالقادر محمود
٧٦-محمود كريم محمد
٧٧-كريم محمد عبدرحمان
٧٨-فريق رشيد سمين
٧٩-حمه امين مجيد محمد
٨٠-رؤوف عبدالمحمد ميرزا
٨١-ئاران محمد محمود
٨٢-ئازاد محمد علي
٨٣-عباس محمد حمه علي

٨٤-غازى محمد حسن
٨٥-ياسين حسن محمد
٨٦-تابان فايق مدحت
٨٧-روناك ستار احمد
٨٨-كامران محمد شريف
٨٩-شيرزاد محمد علي
٩٠-كامران مجيد عبدلكريم
٩١-طه محمد رشيد
٩٢-برهان محمد حسن
٩٣-شيرين علي عبدالله
٩٤-احسان علي سعيد
٩٥-نرمين حسن محمد
٩٦-فايق احمد محمود
٩٧-شادمان رشيد زۆراب
٩٨-رەزا سالح محمد
٩٩-سالار سيروان سالح
١٠٠-ناضم جاسم محمد
١٠١-لقمان محمود قادر
١٠٢-ادريس سالح محمد
١٠٣سركوت محمود جبار
١٠٤-علي عوسمان محمد
١٠٥-حمەصالح حسن قادر
١٠٦-حكمت هجران محمد
١٠٧-دريد فرج عزيز
١٠٨-علي ستار عزيز
١٠٩-اسۆ حمزه عبدالحميد
١١٠-كامران محمود محمد
١١١-فاروق محمد درويش امين
١١٢-محمود محمد عمر
١١٣جمعه محمد سالح
١١٤-بيخال حسن مارف

١١٥-لقمان عبدرحمان عبدالكريم
١١٦-كامران احمد عبدالرحمان
١١٧-حيدر نعمت يعقوب
١١٨-جيهاد عزيز خوامراد
١١٩-ياسين حسن احمد
١٢٠-حسام محمد حسن
١٢١-خرامان عول محمد
١٢٢-ستار احمد توفيق
١٢٣-بختيار افراسياب مجيد
١٢٤-مير علي نور محمد
١٢٥-عثمان محمد محمود
١٢٦-ريبوار قادر سالح
١٢٧-لطيف فاتح سعيد
١٢٨-محمد عبدالكريم رشيد
١٢٩-مستفا عيسا مير حسين
١٣٠-احمد حميد مجيد
١٣١-مريوان مجيد عبدالكريم
١٣٢-كامران جاسم حميد
١٣٣-شيرزاد نجم علي
١٣٤-محمد رشيد عبدالكريم
١٣٥-اسۆ محمد قادر
١٣٦زمناكۆ محمود كريم
١٣٧-اركان محمد غريب
١٣٨-عاصي محمد سالح
١٣٩-طارق سديق عبدالقادر
١٤٠-كاوه اغا مرادپيرك
١٤١-اهرام محمد عزيز
١٤٢-ادريس حمزه عبدالحميد
١٤٣-ابراهيم محمد عبدالرحمان
١٤٤-اسماعيل محمد حسن
١٤٥-برزان كريم معروف
١٤٦-جوهر كريم محمد
١٤٧-جوهر انور محمد
١٤٨-جوهر خليل اسماعيل
١٤٩-جوتيار عمر محمد
١٥٠-جميل كريم باوەخان
١٥١-جلال محمد قادر
١٥٢-حسن محمد عزيز
١٥٣-حمزه حسن عبدالقادر
١٥٤-حيدر عسكر علي
١٥٥-رێكەوت لتيف محمد
١٥٦-سالم فرج حمد
١٥٧-سامي محمود مراد
١٥٨-شيركۆ محمد سالح
١٥٩-عدنان عزيز حيدر
١٦٠-عدنان رحمن مهدى
١٦١-عسمان سديق سعيد
١٦٢-فاخر قادر رشيد
١٦٣-فاخر ميكائيل اسماعيل
١٦٤-فاضل عباس عبدالله
١٦٥-كمال جمعه امين
١٦٦-محمد حسن محمد
١٦٧-محمد نورى احمد
١٦٨-محمد فرج محمود
١٦٩-نامق احمد سليمان
١٧٠-نجم الدين قادر محمد
١٧١-امير امين نريمان
١٧٢-اوات سعيد علي
١٧٣-اوات غفور خزر
١٧٤-افراح يارووەلى بيجان

١٧٥-بيان قادر محمد
١٧٦-بيات احمد محمد
١٧٧-بهيه سرتيب محمد امين
١٧٨-پرشنگ على مجيد
١٧٩-پەروين عبدالكريم محمود
١٨٠-جوان وهاب كريم
١٨١-حمديه محمد سالح
١٨٢-روناك سعيد حسين
١٨٣-روناك عبدالله محمد
١٨٤-روناك جبار شفى
١٨٥-ريزان شمس الدين عبدالوهاب
١٨٦-رانيه احمد حسين
١٨٧-ژيان محى الدين حسن
١٨٨-سارا تاهر احمد
١٨٩-سروه فيض الله غريب
١٩٠-سوسن بهرام عباس
١٩١-شهله عثمان محمد
١٩٢-شيوه حميد محمد
١٩٣-شاديه هيدايەت قادر
١٩٤-صبريه رحيم نادر
١٩٥-فريال فرحان عبدالله
١٩٦- كەژاڵ حسن فرج
١٩٧- كويستان حميد مجيد
١٩٨- گولزار حميد عبدالرحمن
١٩٩- مهاباد شهابدين حسن
٢٠٠- مياسه وادى سعيد
٢٠١- ماجده سليمان سيد مراد
٢٠٢- نيكار محمد محمدامين
٢٠٣- نرمين حسن محمد
٢٠٤- وزيره ولى عبدالقادر

٢٠٥- وەنەوش على محمد
٢٠٦- سلحيه ياسين سليمان
٢٠٧- سوسەن محمد سالح
٢٠٨- ارسلان محمد رئوف
٢٠٩- ازاد محمود على
٢١٠- اشتى فايق ابراهيم
٢١١- جليل ميرزا محمد
٢١٢- جلال رئوف محمد مراد
٢١٣-جلال عبالرحمن كاكه احمد
٢١٤- جميل امين رشيد
٢١٥- چالاك حميد محمد
٢١٦- چيمەن محمد فرج
٢١٧- حسن على محمد
٢١٨- دلير حسن اسماعيل
٢١٩- سيروان عسكر مير كريم
٢٢٠- سردار احمد محمد
٢٢١- سيامند احمد كريم
٢٢٢- سركوت نامق خورشيد
٢٢٣- سعيد فتاح حسن
٢٢٤- شيركو كريم عزيز
٢٢٥- شرين اكبر كمر
٢٢٦- شمال سعيد ميران
٢٢٧- سلاح محمد محيدين
٢٢٨- سلاح عبدالله قادر
٢٢٩- صفاالدين محمد امين
٢٣٠-عبدالرحمن امين محمد
٢٣١- عبدالله صديق عزيز
٢٣٢- عبدالكريم حميد عزيز
٢٣٣- فاتمه كريم غفور
٢٣٤-كمال رشيد محمد

٢٣٥- كازم محمد امين حسين
٢٣٦- كمال محمد كريم
٢٣٧-شيركو حسن محمد
٢٣٨- كامران شمه رسول
٢٣٩- كامران ابراهيم محمود
٢٤٠-لوقمان احمد سالح
٢٤١- لوقمان رحمن رحيم
٢٤٢- محمد كمال محمد
٢٤٣- محمد عبدالله قادر
٢٤٤- محمد ابراهيم مايل خان
٢٤٥- محسن اسد علي
٢٤٦-نوزاد علي طهماس
٢٤٧-نازنين مصطفى اسماعيل
٢٤٨- نوجوان كمال اسماعيل
٢٤٩-وريا سعيد علي
٢٥٠-ياور احمد محمد
٢٥١- حسن علي قولي جان
٢٥٢- احمد فرج محمود
٢٥٣- ئوميد ولي محمد
٢٥٤- ادريس محمد سوفي
٢٥٥- بورهان محمد فرج
٢٥٦-بيستون شوكت علي
٢٥٧- جواد جمعه رحيم
٢٥٨- جهانبخش رشيد فيض الله
٢٥٩- حسن احمد روستم
٢٦٠- حسن محمد مجيد
٢٦١- حسين احمد محمد
٢٦٢- خوشناو طيب مجيد
٢٦٣- دلشاد محمد نجم
٢٦٤- ديار حسن بابا علي

٢٦٥- رحيم مجيد محمد
٢٦٦- رحيم عزيز محمد
٢٦٧- سيروان برزان عبدالرحمان
٢٦٨- سرهنگ احمد عبد علي
٢٦٩- ستار نامدار باوەخان
٢٧٠- شكر عيدان حسين
٢٧١-صالح عبدالرحمن رشيد
٢٧٢- صالح عبدالرمن كريم
٢٧٣- عادل محمد پير ولي
٢٧٤- عادل مجيد محمد
٢٧٥- عبدالرحمن رشيد احمد
٢٧٦- عمر علي محمد
٢٧٧- كاوه سلام حميد
٢٧٨- كامران عبدالواحد رشيد
٢٧٩-كمال حەمه امين عبدالقادر
٢٨٠- كامران احمد رشيد
٢٨١- كامران علي روستم
٢٨٢- محمود نوري روستم
٢٨٣- محمد حسن محمد
٢٨٤- محمود علي محمد
٢٨٥- حسن باوه رحيم باوه رشيد
٢٨٦- هيوا محمد خليل
٢٨٧- هيشام حميد رمزان
٢٨٨- ياسين سلاح كريم
٢٨٩- يادكار عزيز محمد
٢٩٠- احمد محمد مولود
٢٩١- احمد سالح عبدالرحمن
٢٩٢- انور كاكه محمود
٢٩٣- ابراهيم احمد غواس
٢٩٤- دلال حبيب سعيد

٢٩٥- حەمە امين حسن قادر
٢٩٦- دلشاد ابراهيم اسماعيل
٢٩٧- دلشاد رجب كمر
٢٩٨- رزگار احمد محمد
٢٩٩- رزوان جبار فهد
٣٠٠- زياد احمد سعيد
٣٠١-رەزا على كاكە امين
٣٠٢-سالار فايق فرج
٣٠٣-سالار فقى محمد غيدان
٣٠٤-سيروان محمود احمد
٣٠٥-سوران جلال مجيد
٣٠٦-سرخيل سلاح الدين
٣٠٧-سروەت عبدالرحمان حسين
٣٠٨-شهاب احمد على
٣٠٩-شهاب احمد روستم
٣١٠-صالح حسين مستفا
٣١١-عباس محمد عبدالقادر
٣١٢-عباس حسين مولود
٣١٣-عيدان محى الدين محمود
٣١٤-عثمان جوهر جميل
٣١٥-فاضل محمد محمدجان
٣١٦-فريق سالح عزيز
٣١٧-فخرالدين محمود احمد
٣١٨-قاسم محمد توفيق
٣١٩-كمال احمد روستم
٣٢٠-محمد مجيد سعيد
٣٢١-مريوان سالح محمد
٣٢٢-محمد لطيف محمد
٣٢٣-محمود سمين على
٣٢٤-نعمان قادر محمد
٣٢٥-نامق رحيم عباس
٣٢٦-هاشم عبدالله عبدالكريم
٣٢٧-هيوا على مرادخان
٣٢٨-فاخر فائق باواكرم
٣٢٩-غريب حسين بيات
٣٣٠-جبار على محمد
٣٣١-سعيد حميد حسن
٣٣٢-عسمان كريم احمد
٣٣٣=مريوان على شامراد
٣٣٤-نوزاد سابر محمد
٣٣٥-امير محمد على
٣٣٦-احمد اسماعيل محمد
٣٣٧-كاوە محمود قادر
٣٣٨-عبدالله رحيم كريم
٣٣٩-نيزام حسين باباعلى
٣٤٠-ازاد رشيد عبدلله
٣٤١-شيرين فليح فتاح
٣٤٢-نوزاد على عبدالله
٣٤٣-نوزاد محمد مراد
٣٤٤-ابراهيم عزالدين ابراهيم
٣٤٥-حسين محمد على
٣٤٦-جلال رشيد مصطفى
٣٤٧-ياسين رشيد نجم لدين
٣٤٨-عادل وەلى درويش
٣٤٩-فواد سابر محمد
٣٥٠-ياسين محمد امين
٣٥١-عادل على فلامرز
٣٥٢-سركوت محمود حمەخان
٣٥٣-تالب لتيف رۆستم
٣٥٤-اسماعيل محمود محمد

٣٥٥-حنياد حاتم شهاب
٣٥٦-جمعه سعيد محمد
٣٥٧-محمد حسين فتح الله
٣٥٨-عاسى فيسل كريم
٣٥٩-ازاد عبدالله قادر
٣٦٠-عماد نجم الين محمد
٣٦١-ارام وەلى على
٣٦٢-بكر محمد سالح
٣٦٣-فاضل ابراهيم توفيق
٣٦٤-فاضل رشيد سادق
٣٦٥-كامران نجاة على
٣٦٦-عباس احمد محمد
٣٦٧-ابراهيم سالح عبدالرحمن
٣٦٨-محمد بابان ابراهيم
٣٦٩-محمود توفيق جاور
٣٧٠-احمد رزا كريم
٣٧١-ازاد رشيد حسن
٣٧٢-عبد الرحمن حسن حسين
٣٧٣-حبيب محمود محمد
٣٧٤-سربست حميد محمد
٣٧٥-سامى سعيد حارس
٣٧٦-جلال حسن على
٣٧٧-يوسف ابراهيم حسين
٣٧٨-كريم حميد مجيد
٣٧٩-طه عزيز مجيد
٣٨٠-برهان محمد مسرف
٣٨١-امير احمد محمود
٣٨٢-سردار جلال عبدالله
٣٨٣-حقى اسماعيل حمد
٣٨٤-عبدالله نورى قادر

٣٨٥-محمد احمد محمد
٣٨٦-ازاد عزالدين ميرزا
٣٨٧-سامان امين حميد
٣٨٨-حسام الدين نورى
٣٨٩-دلشاد محمد خليفه
٣٩٠-خليل على مراد
٣٩١-شعبان كريم حميد
٣٩٢-جميل باهر صالح
٣٩٣-صباح حسين محمود
٣٩٤-نوزاد محمد رووف
٣٩٥-سردار كامل سمين
٣٩٦-محمد حسيب على
٣٩٧-سردار محمد سعيد
٣٩٨-هجران حسن محمد
٣٩٩-ابراهيم محمد رشيد
٤٠٠-حسين عمر كاكەحمە
٤٠١-ساهيره سامى فايق
٤٠٢-على محمد على
٤٠٣-سيروان مجيد عبدالكريم
٤٠٤-حسن عبدالكريم محمد
٤٠٥-برزان جوهر سليمان
٤٠٦-عباس احمد محمد
٤٠٧-محمد صابر مجيد
٤٠٨-اسۆ شمس حسين
٤٠٩-نسرين احمد محمد
٤١٠-عثمان سديق عبدرالرحمن
٤١١-خالد رشيد حسين
٤١٢-عثمان على حسين
٤١٣-حيدر حسين محمود
٤١٤-احسان اسد على

٤١٥-لقمان سابر شكر
٤١٦-خليل احمد فرج
٤١٧-جعفر حاج مراد على مراد
٤١٨-يوسف محمد فرج
٤١٩-احمد ابراهيم عبدالقادر
٤٢٠-سيروان رشيد حسن
٤٢١-حسين على قادر
٤٢٢-على محمد سالح
٤٢٣-فرهاد محمد حمەسالح
٤٢٤-جلال محمد سالح
٤٢٥-خليل عبيد محمد
٤٢٦-ابراهيم مجيد روستم
٤٢٧-دلير عزيز حسين
٤٢٨-محمود فتاح سليمان
٤٢٩-فيصل حسن قادر
٤٣٠-خليل محمد سالح
٤٣١-سباح انور حسين
٤٣٢-اسماعيل عزيز سادق
٤٣٣-كمال مراد خان على
٤٣٤-لتيف شريف كريم
٤٣٥-حيدر فرج محمد
٤٣٦-دلير مصطفى ابراهيم
٤٣٧-روستم قادر محمود
٤٣٨-اسۆ على جمشير
٤٣٩-يحيى احمد رشيد
٤٤٠-سالح على قادر
٤٤١-عباس امين درويش
٤٤٢-رحيم سليمان سوفى
٤٤٣-جلال عزيز امان الله
٤٤٤-جنە صديق على

٤٤٥-سامان حسين احمد
٤٤٦-جبار نريمان نقدالى
٤٤٧-كاوە حسين احمد
٤٤٨-اسماعيل عبدالقادر محمد
٤٤٩-كۆكش ابراهيم سعيد
٤٥٠-خليل محمد على
٤٥١-جميل عبدالله سمين
٤٥٢-جليل حسين نادر
٤٥٣-احمد كريم محمد
٤٥٤-حميد مستفا رحيم
٤٥٥-ابراهيم محمود امان
٤٥٦-عمر قادر سعيد
٤٥٧-اشتى احمد حسين
٤٥٨-كاوە احمد محمود
٤٥٩-برزان بارام قادر
٤٦٠-برزان عمر ولى
٤٦١-نجيبە معروف قادر
٤٦٢-تابان محمد على
٤٦٣-فريق عبدالرحمن محمد
٤٦٤-حسين حمە طالب
٤٦٥-رۆز كمال اسماعيل
٤٦٦-محمد احمد مجيد
٤٦٧-كريم ابراهيم امين
٤٦٨-جلال احمد محمد
٤٦٩-كامران احمد محمد
٤٧٠-فواد كاكە عبدالله
٤٧١-تيمور نامق محمد
٤٧٢-شلال محمد عبدالله
٤٧٣-زينب على دينە.

## گرنگیی خوێندنی پیشەیی.:

ئەگەر ژیرانە بڕوانین و کار بۆ بونیادی کۆمەڵگەیەکی ڕۆشنبیرو پێشکەوتوو بکەین،پێویستە هەر شارەو (ئامادەیی پیشەیی) تێدا دابمەزرێت، چونکە ئەم خوێندنە کادیری ناوەند (وصط) پێدەگەیەنێت،لەبوارەکانی بازرگانی و کارەبا و ئۆتۆمبیل(چاککەریی-فیتەری) دانانی کۆگای گەورەی فرۆشتنی کەرەستەیی کارەبایی،پێداویستییە سەرەتاییەکانی ڕۆژانەی شار جێبەجێدەکەن،لە ئێستادا وادەخوازێ هەر ماڵەو کەسێکی شارەزایی لەم بوارە دا تێدابێت...

ئەم خوێندنگەیە ئەگەر پێویستییەکانی لە):شوێن، تاقیگە،کەرەستە،مامۆستای پسپۆر..)ی بۆ دەستەبەر بکرێ، دەتوانێ پێداویستییەکانی شار لە (لەفی ماتۆڕ، بۆردی کارەبا..هتد)دابین بکات، چونکە نیوەی وانەکانی ئەم خوێندنگەیە کرداریی(عملی)یە.

بەکورتی دەکرێ بڵێین: لە چوارچێوەی سیستمێکی ژیرانەی پەروەردەییدا، گونجاوە ئەم خوێندنە بەرهەمهێنێت و بۆ بەردەوامی خۆی، پشت بە داهاتی خوێندکارەکانی ببەستێت..

لە ئێستادا بەشی زۆری ئەندازیارو فەرمانبەری فەرمانگەی کارەبای کەلار و بەڕێوەبەرو زۆرێك لە فەرمانبەرانی بەڕێوەبەرایەتی بانکی کەلار دەرچووی ئامادەیی پیشەیی کەلارن،

بەداخەوە تا ئێستا ئەمانە نەکراون..!

## شوێنی ئامادەیی پیشەیی کەلار،

چەند شوێنێك پێشنیار کراون، لەوانە:لیوا ڕەشەکە،شوێنی پەیمانگای مامۆستایانی جاران و سەرۆکایەتی زانکۆی گەرمیانی ئەمڕۆ.. دواجار لە بینای (پەیمانگای تەکنیکی کەلار)ی ئەمڕۆ دەگیرسێنەوە، بەهۆی زۆریی خوێندکارانەوە کردویانەتە دوو دەوام، دواتر (ناوەندی ڕەوشتی کچان)هێنراوەتە هەمان بینا و تاقی بەیانیان دەوامیان کردوە (تەنها ساڵێك لایان ماونەتەوە).

ئـەوكات دەكەوتـە پـەڕی شـارەوە، دولای باكـورو باكـوری ڕۆژئاوایی،چۆڵەوانـی بـوو، ڕۆژهەلاتـی گەرەكـی حەمـەی كەریـم و باشـوری گەرەكـی فەرمانبـەران بـووە..

ئـەو دوولایـی كـە چۆڵەوانـی بوو،لەبـەر دەرگاكەیـەوە تـا سـنوری گونـدی سـەید خەلیـل و ژووری كـەلاری كـۆن و ڕۆژئـاوای گەڕەكـی بەردەسـوور، سـاڵانە بـە گەنـم و جـۆ دادەچێـنران..

ڕێكەوتی:(١-٤-١٩٩٠)،مامۆسـتا (حسـێن زۆراب) دەبێتـە بەڕێوەبـەری ئامادەیـی پیشـەیی كـەلار، بەڕێـزان:

١-مامۆستا: ساڵەح محمود ئەڵماس.(یاریدەدەر).

٢-مامۆستا:ئەنوەر محەمەد موراد (یاریدەدەر).

## چۆن بووم بە مامۆستا لە ئامادەیی پیشەیی کەلار.؟

سـاڵی: ( ١٩٩٣) سـتافێك لـە ڕۆشـنبیران و دەرچوانـی زانكۆ(ڕادیـۆی دەنگـی گەرمیان)مـان دامەزرانـد، بـوو بە یەكـەم ڕادیـۆی دوای ڕاپەڕین لـە كـەلار، لـەم ڕادیۆیـەدا كارمدەكرد.(مامۆسـتا حسـێن زۆراب) بەڕێوەبـەری (ئامادەیـی پیشـەیی كـەلار) بـوو، داوای لێكـردم بچمـە ئامادەییەكەیـان، وانـەی زمـان و ئەدەبـی كـوردی بڵێمـەوە، ئـەوكات مامۆسـتا(ئامینە عثـمان حەسـەن-ئامینەی حاجی عوسـمان) وانـەی كوردی دەوتـەوە، كـە پسـۆریی خـۆی نەبوو.ماڵـمان لـە شـارەدێی گردەگۆزینـە بـوو، ئۆتۆمبێلـم نەبـوو، بەجیـب هاتۆچۆمـان دەكـرد، گەمـارۆی ئابـوری پـرزەو نـووزەی لـە خەڵـك بڕیبـوو، ژنـم نەهێنابوو،مانگـی (٢٠٠)دینـاری سـویسریمان لـە ڕادیـۆ وەردەگرت(ئەویـش بەنیـوە و ناتـەواو)، بۆیـە بەمامۆسـتا (حسـێن)م وت: ناتوانـم دەسـبەرداری ڕادیـۆ ببـم؟ وتـی: هاوكاریـت دەكـەم و خشـتەی وانەكانـت لـە گـەڵ كاری ڕادیـۆ بـۆ ڕێكدەخـەم..

ئـەوكات مامۆسـتا كـەم بـوو، دامەزرانـدن بـە قولـەی قافـەوە نەبـوو، چوومـە هەولێـر بـۆ چاوپێكەوتـن، لیژنەیـەك بـۆ پرسـوڕا دانرابوو،پـاش ئـەوان چومـە ژوورێـك مامۆسـتا (سـەلام عەزیـز _سـەلامی ئینگلیـزی)

لێبـــوو، بەڕێوەبـــەری پـــەروەردەکان لـــە نێـــوان (یەکێتـــی و پارتـــی) دابەشـــکرابوون،بەڕێوەبەر بـــۆ هەرکامیـــان با،جێگرەکـــەی بـــۆ ئـــەوی دیکەیـــان دەبوو،مامۆســـتا (ســـەلام عەزیـــز) جێگـــری بەڕێوەبـــەری گشـــتی پـــەروەردە بـــوو، ئـــەو لێیدەپرسـین: حەزدەکـــەی لـــە کام خوێندنگـــە داتنێـم (وانـــە بڵێیتـــەوە)؟ پێویســـت بـــوو دوو..ســـێ.. ناوێـــك بدەیـت، تاوەکـــو بـــە پێیی پێویســـت شـــوێنێکی گونجـــاوت بەرکـــەوێ، هەرکە چوومـــە ژوورەوە بـــە پێکەنیـــن و ڕوویەکـــی خۆشـــەوە وتـــی: کوێـــت دەوێ تـــا بـــۆت دانێـم؟ وتـــم) : ئامادەیـــی پیشـــەیی کەلار)،هـــەر ئـــەو گوفتـــار و کـــردارە بوو،تـــا ئێستا(٢٩)ســـاڵە لـــە ئامادەیـــی ناوبـــراو مامۆســـتام..

لـــە ڕێکەوتـــی( ١٣-١١-١٩٩٣ ) دامـــەزرام، ڕۆژی دواتـــر پەیوەندیـم کـــرد بـــە( ئامادەیـــی پیشـــەیی کەلار)ەوە،مامۆســـتایەکی کچ،بەنـــاوی: (طیبـــە عەبدولکەریـــم) خێزانـــی ئێســـتای مامۆســـتا (ســـاڵەح محمـــود ئەڵیاس)،وانـــەی کـــوردی بـــە خوێنـــدکارەکان دەوتەوە،پســـپۆریی خـــۆی نەبـــوو..

بەتەنهـــا وانـــەی زمـــان و ئەدەبـــی کـــوردی هەرســـێ بـــەش (بازرگانی،کارەبا،کانـــزا) و، ســـەرجەم پـــۆل و قۆناغەکانـــم دەوتـــەوە، تاســـاڵی(٢٠٠٩)، مامۆســـتا :(شـــیرین فلەیـــح) لـــە پیشـــەیی کـــەلار دامەزرا،بـــوو بـــە هـــاوکارم..

## گەمارۆی ئابووریی و چاوقایمی مامۆستایان،

چونکـــە تـــازە چەشـــەی ئازادیـــان کردبـــوو، هێشـــتا ســـێبەری زوڵـــم و زۆری (بەعـــس) نەڕەوییـــووەوە، برســـێتی و نەداریـــان بـــە قـــەدەری ڕەواو بژاردەی خۆمـــان دەزانـــی، کەموکـــوڕی و زیادەڕەویەکیـــش هەبایە،دڵیـــان نەدەهات، چاومـــان لێدەقوچان،جیاوازییـــەکان هێشـــتا بـــە ئەســـتەم ترونگەیـــان دەهـــات، وڵات کاول و زمـــان پەرێشـــان و کەنارگیـــر، بـــێ موچەیـــی و قاتووقڕیی..بـــەڵام دڵخـــۆش و پیشـــەکەمان پیـــرۆز و گرێدراوی ڕەوشـــتمان کردبـــوو، نکۆڵـــی لێیـــی عەیبـــەو خیانەتـــی نیشـــتیمانی بوو..(ســـەری بەرزمـــان بـــۆ مووچـــە نـــەوی ناکەین)،درووشـــمی مامۆســـتایان بـــوو..!

بـەلای کەمـەوە مانگـی چەنـد جارێـك مامۆسـتایان بۆ گەشـت و سـەیران بـە کەمتریـن خواردنـەوە، دەچوینـە دەوروبـەری شـارو دوورتـر، زۆر جار هـەر لـە قوتابخانـەوە ڕێکدەکەوتیـن، بـە بەرازیلیەکـەی مامۆسـتا(عەلی شـوکر) و جێبەکـەی مامۆسـتا(بەرزان غێـدان ) خۆشـترین سـات و کاتمـان بەسـەر دەبرد،جـل و بەرگـی زۆربەمان(لەنگە)بـوو..!

## من و مەولەوی..

بیـری ئیسـلام گەرایـی لەهەرێـم لـە نەشـوونمایەکی نـا ڕێکخراوەیـدا بـوو، زۆرێـك لـە گەنجـان هەوادارێکـی عاتیفیانەیـان بـۆی هەبـوو، لـە خـۆڕاش نەبـوو، دەسـتێك بـۆ پەرتەوازەیـی کۆمەڵگـەی کوردیـی لـە ئارادابـوو..

ئـەم بیـرە خزابـووە زۆربـەی کایـەو مەجلیـس و نێـو خێـزان و بەتایبـەت کایەیـی پـەروەردە..

مامۆسـتای زمانـی کـوردی بـواری هەبـوو لـە کاتـی وانەوتنەوەدا،پـەل بـۆ تـەواوی کایـە جیاوازەکانـی کۆمەڵگـە بهاوێـت، لـە باسـی( مەولـەوی) شـاعیردا گوتـم: کاتـێ شـیعرەکانی تایبـەت بـە مەینۆشـی (مەولـەوی ) دەخوێنیتـەوە، هەسـتدەکەی ئـەم شـاعیرە هەمیشـە لـە (بـاڕ و مەیخانە)کانـدا کەوتـووە، بەپێچەوانەشـەوە کـە دەق و هۆنـراوە ئایینییەکانـی بەسـەردەکەیتەوە، دەچیتـە ئـەو خەیاڵـەی کـە (مەولـەوی) حوجـرە بەجێناهێڵـێ و ژینـی گواسـتۆتەوە میحـراب و گۆشـەیی مزگەوت و خانەقـاکان..!

ئـەو خوێندکارانـەی کـە ئـەم شرۆڤەیـان بـە دڵنەبـوو بـە (کوفـرو ئیلحـاد) یـان دەزانـی، لـە ڕێـی سەرپەرشـتیارەکیانەوە سـکاڵایان لـە سـەرم تۆمارکردبـوو.! هەربەهـۆی ئـەو تێگەیشتنەوە،مامۆسـتامان دەم و چـاوی بـەر چەقـۆ درا و، ئـەوەی بەدڵیـان نەبوایـە هەڕەشـەیان لێدەکـرد.

ئـەم توندڕەوییـە زۆری نەخایانـد ڕووبەڕووبوونـەوەی چەکداریـی لێکەوتـەوە، لـە نێـو هەمـان قوتابخانـەو لـە کاتـی وانەوتنـەوەدا شـەڕی خوێنـاوی بـراکان دەسـتیپێکرد، زرمـەی تـۆپ و گیـزەی گوللـە نەیدەهێڵا

سەر لە قوتابخانە بێنینە دەر، خوێنی سەدان ڕۆڵەی ئەم گەلە بووە قوربانیی هیچ..!

## ساڵانی خوێندن و ژمارەی خوێندکاران:

(ساڵ بەساڵ خۆزگەم بە پار).لە شوێن و جێگاو ژمارەی خوێندکار.. بەداخەوە (ئامادەیی پیشەیی کەلار) ڕوولە لێژیی بوو، سەرای ئەم بارەش، بەهەوڵ و ماندوبونی مامۆستایان و ستافی بەڕێوەبردن، توانیومانە پلەی باش لە سەر ئاستی هەرێمی کوردستان بەدەست بهێنین..

## ساڵی خوێندن و ژمارەی خوێندکارانی وەرگیراو، چەند ساڵێك وەك نموونە:

١- ١٩٨٨ ---(٤٧٣ )خوێندکار وەرگیراون.

٢-٢٠٠٤------٣٧ خوێندکار.

٣-٢٠٠٥-----٤٤ خوێندکار.

٣-٢٠٠٦----٥٥ خوێندکار.

٤-٢٠٠٧----٩٠ خوێندکار.

٥-٢٠٠٨----١٢٥ خوێندکار.

٦-٢٠٠٩----١٧٥ خوێندکار.

٧-٢٠١٠----٢٤٥ خوێندکار.

٨-٢٠١١----٣٠٠ خوێندندکار.

٩-٢٠١٢----٣٢٠ خوێندکار.

١٠-٢٠١٣----٢٢٠ خوێندکار.

١١-٢٠١٤----٢١٠ خوێندکار.

١٢-٢٠١٥----١٨١ خوێندکار.

١٣-٢٠١٦----١٧٠ خوێندکار.

١٤-٢٠١٧----١٧٥ خوێندکار.

١٥-٢٠١٨----١٩٠ خوێندکار.

١٦-٢٠١٩----١٩٥ خوێندکار.

١٧-٢٠٢٠----١٩٨ خوێندکار.

١٨-٢٠٢١----٢٠٣ خوێندکار.

ئـەم خوێندکارانـە بـۆ هـەر سـێ بەشـی(کارەبا +بازرگانـی +کانـزا) وەرگیـراون، لـە کاتێکـدا ئامادەییـان تێدابـوو، بەشـی کۆمپیوتەریـش بکەینـەوە (ژمارەیـەك کۆمپوتـەر) لـە پـەروەردەی کەلار،بـۆ ئـەو مەبەسـتە وەرگیـران، بەداخـەوە بـە هـۆی بێجێگەییـەوە نەتوانـرا ئـەم بەشـە گرنگـە بکرێتـەوە.!

## مامۆستایان و نازناوەکانیان:

لـە کوردەواریدا نازنـاو بوونـی هەبـوە، هەرناوچـەو جوگرافیایەك،مۆرکی تایبـەت بەخـۆی وەردەگـرێ، هەمووکـەس ناتوانـێ نازنـاو بـۆ کەسانی دیکـە دانـێ، بەپێچەوانەشـەوە کەسـانێك هـەن،وەك (مـۆر) جێکەوتـەی دەکاو لێیـان نابێتـەوە، جـا هەرکەسـێ بـە خێـر نیشـانێکی جوانـی بەرکەوێـت، ئـەوە بەخـت یـاوەری بووە.!(دڵـم نایـە لێـرە نازنـاوی مامۆسـتایان بنوسـم).

مامۆسـتایانی هاورێـم بەتایبـەت (مامۆسـتا ئەنـوەر و مامۆسـتا بەرزان..)پێیـان دەوتم:(قایمقام)،جاخویشـم نەمدەزانـی بۆ،(هەمیشـە حـەزم لـە ڕێکپۆشـی دەکـرد..).

هەڵەنەبـم، سـاڵی (١٩٩٤) بـوو مامۆستا(حەسـەن سـەرتیپ ئەمیـن) لـە ئامادەیـی پیشـەیی کـەلار وەرگیـرا، وانـەی (عەرەبـی) دەوتـەوە، ئـەوکات خوالێخۆشبوو:کاك(سـەرتیپ)قایمقامی قـەزای کـەلار بـوو، مامۆسـتا (حەسـەن)یش تـازە هاتبـوو، مامۆسـتا بـەرزان بەدەنگی بـەرز بانگیکـردم :قایمقـام ؟ ماموسـتا حەسـەن وەڵامـی دایەوە،م.بـەرزان وتـی: بـرام لای ئێمـە م.ئەحمـەد قایمقامـە.!

(مام ساڵەح گۆری ئەسپ)لە پێشمەرگایەتیدا ناوی دەیان پێشمەرگەی ناوە، لەو بوارەدا شوهەرەتی وەرگرتبوو، ناوی هەر پێشمەرگەی نابێ، چاك یان خراپ لێینەبوەتەوە، نازناوی وای داناوە، خاوەنەکەی لە چوونە پێشمەرگایەتییەکەی پەشیمانە..!)



لە ڕاستەوە.وەستاو:م.ئەیاد،م.عامر،م.ئیبراهیم،م.عەباس،م.ئەحمەد،م. ئەحمەد محەمەد،م.کامیل،م.جەلال.

دانیشتوو:م.بەرزان،م.ئیبراهیم،م.باسام،م.کەژاڵ،م.حسێن،م.محەمەد،م. ئەنوەر،م.عەلی،م.ساڵەح،م.حسن.

## درەختەکانی پیشەیی کەلار...

چونکە پەڕی شارو، بیناکەش نوێ بوو، تاقە درەختێکی لێنەبوو، باوەش بۆ جریوەی ئێوارنی چۆلەکەو هەڵکورمانی کۆترێکی تەریك و سێبەرێ بۆ سەری دوو دڵدار چێبکا.!

ڕۆژێ ئاگادارییەك لە کشتوکاڵی کەلارەوە هات بۆ ڕادیۆ، گوایە نەمام بێبەرامبەر دابەش دەکەن، بەمەبەستی سەوزکردنی شار، منیش بە هەلم زانی (عەرەبانەیەکی حەماڵی)م گرت، نزیکەی (٥٠) نەمامی :(قەڵەمتۆز-کالیپتۆز و گەز و سنەوبەر..)م لێبارکرد،پێکەوە لە گەڵ مامۆستایان ڕواندمان، چەند درەختێکی ئێستاش ماون،

تەمەنیان بۆ(٢٠ساڵ) دەڕوا، سەدان چیرۆکی ئەوین و دەیان حیکایەتی دڵشکانیان بۆ گێڕراوەتەوە.! هەرکاتێ ڕێکەوتی بینینیان دەکەم، دێتەوە یادم، کە پەلەی گەورەبوون نەکەین، پێشەرمە خۆی دێ.!

## مامۆستا (کامیل قەرەداغی) و گاڵتەوگەپی ئێمە..

مامۆستا (کامل محەمەد قەرەداغی)،ڕێکەوتی (١٣-١١-١٩٩٣) لە (ئامادەیی پیشەیی کەلار )وەرگیرا،خەڵکی سلێمانی بوو، کورتەباڵا،جوتێ چاوی کاڵ و گەورە، قژێکی خاو دەیخست بەلادا، دەنگێکی ئیزاعی، نوسەرێکی بەتواناو وەرگێڕێکی ژیر،خۆشنووس و مامۆستایەکی سەرکەوتوو،خۆشەویست و دڵنشینی هەموومان..

مامۆستا کامل،لە ژوورێکی خوێندنگەدا دەمایەوە، سەڵت بوو،زۆر جار لە دەوەری کۆدەبوینەوە، هەستی بەتەنهایی نەدەکرد، هاموشۆی ماڵی زۆربەمانی دەکرد، لە وەختی خۆیدا قسەی دەکردو کەم دوو و خۆش بێژ بوو..

زۆر جار مامۆستایان دەچوینە دەشتوودەر، دەبوینە دوو گروپ و یاریمان دەکرد :کێل و بەرد،دەستشارکێ (محێبس)،بەرد فڕێدان،جارجارە لە ناو وەرد و بەهاردا، دەمانکردە شەڕە کەسەك و عەزیەتدانی یەکتر، مامۆستا (کامیل )لە نێوبەرداشی ئێمەدا دووری دەگرت، چوونکە دەرەقەتی کەسەکڵ و دەستوو تیری ئێمەی(گەرمیانی )نەدەهات، زۆر جار ئازارمان پێدەگەیشت،لە ساتی شەڕە بەردی ئێمەدا،ئەوانەی تاقەتی ئەم شەڕەیان نەبوو، لای کوانوو بوون و،دەستی خۆیان لە مەنجەڵ دەوەشاند، (نۆشی گیانیان بێت، دونیا هەروابووە.!

## بەشێ لە زیانەکانی یارییەکانمان:

- مامۆستا ساڵح جارێکیان کەوت،پەنجەکەڵەی سێ چوار تەقەڵی لێدرا.

- مامۆستا عەلی شکور دەستی بۆ کەسەکڵ برد،نیو(تابوقە) هاتە دەستیەوە،کۆی نەکرد، هاڵاندییە مامۆستا(برایم)ە،تا ئێستاش ئاسەواری ماوە.!

- مامۆستا (عەباس ڕەشید)م لە گروپەکەی دابڕی، مەترێ کێبڵی کارەبام پێبوو،کێبڵا بارانم کرد،خۆی دەیگووت: حەرام بێ گەر (بەعس)ئاوەها کەسی تەعزیب دابێ.! ئەو سەر بە پارتێکی دیاریکراو بوو، منیش پێچەوانەی ئەو، دەیگووت هەستمدەکرد، وەك حیزب لێمتدەدا،(وانەبوو).

هەڵەنەبم،ساڵی (٢٠١٧)،بەربژێری حیزبەکەی بوو، بۆ پەرلەمانی بەغدا،داوای دەنگی لێکردم،وتم بەسەر چاو، بەس توخوا پێمبڵێ: پێشمەرگایەتیت نەکردوە، تەعزیب نەدراوی لە (سیقی)ەکەتدا چیت نوسیوە؟ وتی : بۆ تۆ کەم کێبڵت لێدام.؟! بەداخەوە بەخت یاوەری نەبوو دەرنەچوو، دەرکەووت کە، کێبڵەکانی من سیاسی نەبوون، گاڵتەوگەپ بوون.!

## خاوەن ماڵ کرایە میوان..!

مانگی( ٧ی ١٩٩٥) مامۆستا (یونس سادق فارس)، بە مەبەستی کردنەوەی پەیمانگای کشتوکاڵیی هاتە کەلار و لە قایمقامیەت، ژوورێکی بۆ پشووی خۆی وەرگرت..

ڕۆژێ سەردانی (ئامادەیی پیشەیی کەلار)ی کرد،وتی: لەسەر داوای کاك: کۆسرەت کە ئەوکات( سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان) بوو، هاتووم پەیمانگای کشتوکاڵیی لێرە دامەزرێنم، داواتان لێدەکەم تەنها دوو ژوورم پێبدەن، یەکێکیان بۆ ئیدارە و ئەویتریان بۆ خوێندکارانی(قۆناغی یەکەم)، بە کورتی، ڕەزامەندی بەڕێوەبەر(مامۆستا حسێن زۆراب )و یاریدەدەرەکانی: مامۆستا (ساڵح محمود ومامۆستا ئەنوەر محەمەد)ی بە دەستهێنا.

مامۆستا (یونس سادق) ڕاگری پەیمانگا بوو، مامۆستا (ئیسماعیل محەمەد ڕەشید) بووبە جێگری، دواتر داوای لە مامۆستایان:( شوان فرج، سیروان ساڵح، جەلال مەلك و..)چەند مامۆستایەكی دیكە كردبوو، ڕاژەكانیان بگوازنەوە پەیمانگای كشتوكاڵیی، ئەمەش مەیسەر بوو، بۆ ساڵی یەكەم بە هەردوو بەشی(باخداری، بەروبومی كێڵگەیی)،تەنها (٧) خوێندكاریان هەبوو، دواتر پەیمانگای كشتوكاڵیی گۆڕی بۆ پەیمانگای تەكنیكی كەلار.

ڕۆژێ مامۆستا( یونس )هاتە ژوری بەڕێوەبەر، زۆربەمان دانیشتبووین، بە پێكەنین و شەرمەوە،هەر بە پێوە،پاژنەی پێڵاوەكانی بۆ خۆشی لە كاشیەكە دەداو،وتی: هاتووم ژوورێكی دیكەم بدەنێ؟!(چیرۆكی شاخی بزنەكە هاتەگۆڕێ..!)،(بۆ خودا بڵێین: شوێن دەستی مامۆستا یونس هێشتا دیارە لە كەلار..)

پەیمانگا و ئامادەیی پیشەیی، لە ڕووی یەكپۆشی، ئاستی خوێندن، ئەتەكیەت و هەڵسوكەوتی مامۆستا یونس و پشت قایمیی..نەدەكرا پێكەوە هەڵكەین، بە كورتی: دەركراین و لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئامادەیی پیشەیی كەلار لە شوێنەكان میوانین..!

## لەنێوان (ئامادەیی پیشەیی..و..پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی كەلار)دا.

بەماوەیەكی كورتی دوای دامەزراندنی(پەیمانگای تەكنیكی كەلار)، وەك یەكەم پەیمانگا، (پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی كەلار) كرایەوە،سێ بەشی لەخۆگرتبوو : (كوردی،ئینگلیزی،بیركاری) شوێنی دەوامكردنیان، نهۆمی دووەمی (ئامادەیی شەهید ئارام) بوو،فەرمانی كارگێڕیی بۆ ستافێ لە مامۆستایان دەرچوو، بۆ دەستەی كارگێڕیی و مامۆستای وانەبێژ، لەنێو ئەم فەرمانەدا ناوی منیشی تێدابوو، مامۆستا (عادل یاوەر) وەك ڕاگری پەیمانگاو،مامۆستا :( خالد خان موراد) وەك یاریدەدەر هاتبوون، بەهۆی كاری ڕادیۆ و مامۆستاییم لە پیشەیی كەلار،بەباشم نەدەزانی ئەو فەرمانە جێبەجێبكەم.!

لەوسـەروبەندەدا پشـتگیری حیزب(تزکیە)پێویسـت بـوو، هەرحزبـەو دڵـداری خۆیی دادەنا.لـە یەکەی سەرپەرشـتیاری و (مەڵبەنـدی یەکێتی) ەوە رەزامەنـدیـان لەسـەر مـن بـوو، بـۆ بەشـی کـوردی بـڕۆم، دڵـی کاری ڕادیـۆم نەدەهات،چونکـە یەکـێ لـە ئاواتەکانـم بـوو، هـاوکات تەبایـی و خۆشەویسـتی مامۆسـتایانی پیشـەیی و دەسـتەی کارگێـڕی وایانکـرد بوو،ئێـرەم لـە گشـت شـوێنێ پێخوشـتربێت.!بەم هۆیـەوە ماوەیەك بەشـی کـوردی مامۆسـتای نەبـوو..

ڕۆژێ کاك(سـەلاحی کوێخـا) (رۆحـی شـادبێ)،تێلی بـۆ کردم،(کارگێـڕی مەڵبەنـدی کەرکوکـی (ی.ن.ك)،بـوو لـە دەربەندیخـان وتی:پێویسـتمان پێتـەو حەزدەکەیـن بتنێرینـە پەیمانـگای مامۆسـتایان.؟ وتـم :پێـم ناکرێ،چونکـە بڕۆمـە ئـەوێ دەبـێ دەسـتبەرداری ڕادیـۆ و پیشـەیی کەلاریـش ببـم، هەسـتمکرد نیگەرانبـوو.!

یەکـێ لـەو مامۆسـتایانەی کـە ئامۆژگاریکـردم و زۆری پێخۆشـبوو بچمـە پەیمانـگا، بەرێزمامۆسـتا (خالـد خـان مراد)بـوو،ڕۆژێ هـات بـۆ ڕادیۆ،وتـی: هاتـووم بـۆ لات،چونکـە بـە نیـازن جارێکیدیکـە فەرمانـت بـۆ دەرکەن،منیـش بـە باشـم زانـی سـەردانت بکـەم، چونکـە پێـم وتن،کـە ئەوکارەکـەی خـۆی پێخۆشـترە، فەرمانیـش دەرکـەن نایەت،جائێسـتا بـۆ لای تـۆ هاتـووم چـی دەڵێـی: دوای گفتووگۆیەکـی دۆسـتانە،نەمتوانی ڕەزامەندبم.!((ڕەنگـە قبوڵـم بکردایـە، بـۆ ژیـان و گوزەرانـی خـۆم باشـتربوایە،چونکە دەرگای خوێندنـم لـە سـەر خـۆم کڵـۆم نەدەدا.!پەشـیمان نیم،چونکـە بڕیـاری خـۆم بـوو، بـە ئەزموونـی دەزانـم نـەك شکسـت.)).

مامۆسـتا (ئەنـوەر چاوشـین)یاریدەدەری پیشـەیی بـوو، گرەویکردبـوو کـە، فەرمانیشـم بـۆ دەرچـێ ئـەو (ئینفیـکاك)م بـۆ ناکا(دیـارە لـە خۆشەویسـتیدا بـوو).

ڕۆژێ زەنگـی چوونـە دەرەوە لێیـدا، لـە پۆلـەوە بـەرەو ئیدارە دەچـووم، توشـم بـوو بـە توشـی خوالێخۆشـبوو، مامۆسـتا: (داود علی عبـدی) یەوە، وەك هەمیشـە بـە ڕوویەکـی خـۆش و پڕلـە موحیبەتەمـە تەوقەیەکـی گەرمـی لـە گەڵکـردم و دەسـتی کـردە جانتاکەیـا، چکلێتێکـی خۆشـی

دامێ، بەرەو ئیدارە دەچووین و دەستی بەرنەدام،پێش ئەوەی دانیشێ سڵاویکردوو وتی: مامۆستایان باوەڕکەن کەم شەخسیەتی وام دیوە، زۆربەی مامۆستایانی زمانی کوردی داوایانکردوە راژەکەیان بگوازنەوە،پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایان،واستەشیانکردوە !کەچی حیزب و حکومەت ئەمی پێباشەو تکای لێدەکەن،کەچی ئەم رازی نیەو دەڵێ: دڵی ڕادیۆ و ئامادەیی پیشەیی کەلارم نایە.!

## ساڵی (١٩٩٦) بۆچی و بۆ کوێ گواستمانیانەوە (دەرکراین)؟!

لەم هەرێمەدا،پەیوەندییەکانی بەرپرسی یەکەمی، هەر فەرمانگەیەکی حکومی و ناحکومی، کاریگەریی و ڕۆڵی بەرچاو و ڕاستەوخۆی هەیە،لە دابینکردنی کەلوپەلی پێویست ومیلاکی بەڕێوەبردن،چونکە وەك پێویست حکومەتی هەرێم دەرەقەتی خۆبەڕووەبردن و بەدامەزراوەکردنی فەرمانگە ئیدارییەکانی خۆی نەهاتووە.!

پەیوەندییەکانی مامۆستا (یونس) فراوانترو کاریگەرتربوو،پەیمانگا لە گەشەدابوو، بە کوردی و کورتیی دەریانکردین!

لەچارەکی یەکەمی ساڵی(١٩٩٦) گواستمانەوە بۆ بینای (شەهید ئارام)،ئەم سێ خوێندنگەیە لە یەك بینادا دەوامان دەکرد: (شەهید ئارام،پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی کەلار، ئامادەیی پیشەیی کەلار).کە دەچیتە نێو بیناکە،ئێمە لە ڕێڕەو(ممر)ی دەستەڕاستیدا بووین،کە بەشی هۆڵی تاقیکردنەوە(مختبر-کرداری)بوو،بە هەوڵی مامۆستایان، ئامادەکران بۆ ژووری خوێندن، بیناکە دوونهۆم بوو(پەیمانگای مامۆستایان) لە سەرەوەبوو،

ژمارەی خوێندکارانمان زۆر کەم بوون، ئەو ساڵەش دەرچووی پۆلی(سێیەمی ناوەندی) زۆر بوون،پەرووەردە نەیدەتوانی شوێن و جێگایان بۆدابین بکات، بۆیە داوایان لە (پیشەیی کەلار )،کرد ژمارەیەك خوێندکار بۆ پۆلی(چوارمی ئامادەیی) وەرگرین و وانەکانیشیان بڵێینەوە،(چوار پۆل)مان، لە هەردوو بەشی (زانستی و وێژەیی) وەرگرت، لەم دوو خوێندنە جیاوازە، هەندێ وانەی هاوبەش هەن، بە تایبەت زمانەکان، ئەوەشی کە مامۆستای پسپۆرمان بۆی

نەبوو،پـەروەردە بۆیـان دابینکردیـن، سـەرەڕایی زۆری و قەرەباڵغـی، دەوام ئاسـایی دەڕۆیشـت، تاقیکردنـەوەی (بکالۆریا)مـان ئەنجامـدا...

مامۆستا(ساڵەح محمود ئەڵماس)،یاریدەدەربوو وتی:

لەکاتـی وەرگرتن(قبـول)ی خوێنکاراندا،ئیسـتیمارەی خوێندکارانـم بـرد بـۆ سـلێمانی،لە هەرسـێ بەشـی :(ئامادەیـی پیشـەیی کـەلار، بەشـی زانسـتی+وێژەیی)،هەرکە ئیسـتیمارەم خسـتە بەردەسـتی (جـوان ) ناوێك،(کـورد واتەنـی) هەردووچـاوی پەڕیـە تەوقـی سـەری، ژنێکـی ژیـرو وردکاربـوو، وتـی: ئاخـر چـۆن دەبـێ بەشـی پیشـەیی و وێژەیـی و زانسـتی پێکەوە.؟!،خۆجـارێ پێـم نالێـن: (وێژەیـی و زانسـتی) ئـەرزو ئاسـمانیان فەرقە؟!لایانبـە لەبـەر دەسـتم و ناکـرێ بـڕۆن بـزان چۆنـی چـارەی دەکەن،بیکـەن.!

ماۆسـتا سـاڵەح وتی:مامۆسـتا(بەرزان ئەحمـەد)م ئاگادارکرد،کـە بەرپرسـیارێتی هەبـوو لـە بەشـی وەرگرتن(قبـول)ی خوێندکاران،لـە وزارەت،ئەویـش چارەیەکـی پێنەبـوو! دواتـر مامۆستا(سـەرتیپ عزیـز عبدالرحمـن)م ئاگادارکرد،کـە سەرپەرشـتیاری بەشـی کارگێـڕی بـوو لـە بەڕێوەبەرایەتـی گشـتی پـەروەردەی کەرکوك،پێـی وتـم: ئازادبن،چۆنـی چارەسـەر دەکـەن بیکـەن، منیـش ئیسـتمارەکانم هێنانـەوە، بەشـەکانم جیاکردنـەوە( هەردووبەشـی وێژەیـی و زانسـتی)مان کـردە پاشـکۆی (ئامادەیـی شـەهید ئارام)،بـەم جـۆرە قوتارمـان بـوو، بـۆ سـاڵی دوایـی باقـی خوێندکارانی(ئامادەیـی شـەهید ئارام)مـان گەڕانـدەوە لای خۆیان،ئێمـە وامانزانـی خزمـەت دەکەیـن، باریشـمان لاربوو،دەرکرابووین، ژێـر ماڵەبوویـن.!

## (کیمیای)یەکەی هەڵەبجە.

هەمـوو فەرمانگـەو خوێندنگـەو تەنانـەت خێزانێکیـش چیرۆکـی سەیروسـەمەرەی لێـڕوودەدات، ئەوانـەی لـە خوێندنگەکانـد ڕوودەدەن (بەدیـوە نەرێنییەکەیدا)،جێپەنجـەی خوێنـدکاری (تەمـەڵ و ئاژاوەگێڕ..و)ن،کـە دەرەقەتـی خوێنـدن نایـەن و بەکورتـی بـۆ خوێنـدن نەهاتوون،(هەڵبەتـە قۆناغەکانـی تەمەنیـش بەشـێکی ئـەم ئۆباڵـە

هەڵدەگــرن.!).

ســەرەتایی ڕۆژێکــی نــوێ چووینــە دەوامــی ئاســایی، لــە ڕێــڕەوی پۆلەکانــد بۆنێکــی زۆر ناخــۆش و خنکێنــەر پەیدابــوو، بــەدوی ئاســەواریدا چووین،جگــە لــە بۆنێك،کــە دەرفەتــی بــۆ وانەوتنــەوە لــە تــەواوی ڕێــڕەوی پۆلەکانــدا نەهێشــبووەوە، نەبــوو.!

دیاربــوو خوێندکارەکانــی خۆمــان کردبوویــان، تەنهــا بــۆ ئاژاوەگێــڕی و پەکخســتنی دەوام.!

ســەرەداومان دەســتکەوت، بــەڵام یەکلانەکرایــەوە، ئــەو ڕۆژە وانــە نەخوێــنرا، هەریەکــەو لێکدانــەوەی جیاوازمــان دەکــرد، وەك کڵاویــن و شــاردنەوەی زار، تەنهــا ئەوکەســە لێکدانــەوەی ڕاســتیی دەزانــی کــە کاری خــۆی بــوو.!

مامۆستا(حسـێن زۆراب)بەڕێوەبـەری ئامادەیـی پیشـەیی) بوو،وتـی: لـە بۆنــی (کیمیای)یەکــەی هەڵبجــە دەچــێ.! (چونکــە خــۆی بەرکەوتــەی کیمیایــی هەڵبجــە بــوو).

## پیاوێك...نەبوو بە باوك.!

یەکێــك لــە نیعمەتەکانــی ژیــان ئەوەیــە کــە مناڵێــك پێــت بڵــێ: بــاوە یــان دایە.!ئەمــەش ئازایــی هیــچ کەســێك نییە،بەڵکــو یەکێکــە لــە قەدەرەکانی ژیــان و چارەنووس.!

مــام (حەمیــد محەمــەد عەلی)،کارگــوزاری (ئامادەیــی پیشــەیی کــەلار) بوو، لــە ســاڵی ١٩٩٤ بەدوا،بــە لەتــە کاغەزێکــی پتورکاوەوە،کــە گوایــە بەڵگــەی دامەزراندنیەتــی لــە فەرمانگەیەکــی خوارویــی عێــراق (ڕمــادی)، هاتــە پیشــەیی کــەلار، ســیمای گەواهــی چارەنوســی رادەگەیاند.!دەســتیان خۆشــبێ (ئیــدارەی ئامادەیــی پیشــەیی) کار ئاســانیان بۆکردو،مەلەفــی تەواویــان بــۆ کــردەوە..

مــام حەمید،پیاوێکــی بــاڵا مامناوەند،لەشــولارێکی لاواز،خــاوو خلیچك،کــەم دوو،دواتاڵــی توکــی ڕەش، سەروســیمای جێهێشــتبوو،پێکەنینی دەگمــەن و ســیمایەکی پــڕ لــە خەم،لافــاو هاتبــا

ئـەو مێشـێێ میوانــی نەبــوو.!

چـوون ڕۆژگار غـەدری لێکردبوو،هەمـوو جوانـی و چێژوو شـیرینییەکی لـێ شـاردبووەوە،لە ڕۆیشـتندا هەمیشـە سـەری لـە خـوارو وەك بلّێـی بـۆی بگەڕێ،وابـووا!

جگەرەکـەی لـە جێـی گشـت کـەس و،لـە دوولێـوی یـان لـە نێـوان پەنجەکانـی بوو،ئاوەزووی فرێدانـی سـوورتکی نەبوو.!هـەزارو یەکجار (چایـی) بـۆ مامۆسـتایان لێناوە،نەمـدی جـارێ جگەرەکـەی وەلانـێ.! مـرۆڤ سـیپای دەبینـی شـەرمی دەکـرد،داوای (چـای) یـەك بـکات، ئەوەشـی داوای کردبـا، بـە لەقەلـەق تـا دەیگەیانـدێ نیـوەی دەمـا، پێـم وابـێ ژیـان بووبـوو بـە بـار بەسـەر شـانیەوە.! بۆیـە چوارینـە شـیعرێکی (هـەژاری موکریانـی)، لێـرە جێـی خـۆی کـردەوە:

چەپ گەردی گەردوون، گەڕان کوشتمی.

نەزان پەرستی. بۆ نان کوشتمی!

هەر چەوسانەوەی بێحەسانەوە

مردن تۆ لەکوێی ژیان کوشتمی.؟!

پێـم وابـێ لـە کۆتایـی سـاڵی نەوەدەکانـدا شـانس یـاوەری بـوو، ژیانـی لـە گـەڵ هاوتەمەنێکـی خۆیدا(ژنێکـی وردو مرد،پـاك و پرچ،پڕ مایفەت..)پێکهێنا..داخیگرانـم لـە سـاڵی(٢٠١٧) دوامالّئاوایـی کـردو، کۆرپەیـەك پێـی نەگـووت :بابـا.!

## شەوانی ماڵ مامۆستا بەرزان..

پیشـەی مامۆسـتایی جیـاوازە لـە زۆربـەی پیشـەکانی دیکە،چونکـە بەربڵاوتـرە، کایگـەری زۆری لـە سـەر پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان هەبـوو، سـەرەڕای دەسـتکورتی و هـەژاری، بەهـۆی: گەمـارۆی ئابـوری، کەمـی موچە،شەڕوشـوڕی ناوخـۆ، مەترسـی بەعـس و..هتـد، هێشـتا دڵـەکان خۆشتر،خۆشەویسـتی نێـوان مرۆڤـەکان زیاتـر، هیـواکان گەشـتر و تەمـاح کاڵـتر بـوون.!

ڕۆژانە لە خوێندنگە پێکەوەبووین، قسەی خۆش و گاڵتەوگەپ و جارجارەش خوانی سادەی جەماعیمان هەبوو، کەچی شەوانیش بەزۆری لە ماڵ مامۆستا(بەرزان غێدان) کۆدەبوینەوە،خۆمان بە یاری (کڵاوین،محێبس،کونجی خۆرما..)بە مامۆستای ژن و پیاوەوە، بەسەردەبرد، تەنها هەر ئەوەندە نەبوو، ڕێك کەوتبووین کە هەر گروپێ بدۆڕێ، پێویستە تێچوی یاریەکە لە (ساردی،پسکت..هتد) بدات، ئێمە بەزۆری دۆڕاوبوین، لە کوردەواریشدا هەرگیز دۆڕاو پیرۆزبایی لە براوەنەکردوە، بۆیە لە کۆتاییدا گێچەڵێکمان دروست دەکرد، دەبوە پاڵ پاڵێن و جاری وابوو پیاوان، کراسمان لەبەری یەکتریا دەدڕی، وەك (ئایشە تەنوورە و جەلە خورما) بەسەریەکدا دەکەوتین، برادەری واهەبوو، دەکەوتە ژێرو دەرفەتی خۆقوتارکردنی نەبوو،وەخت بوو بخنکێ بە کوردی و کورتی (زڵە)یەك بوو مەپرسە.! ئەوانەی کە هۆکاری بردنەوە بوون، زیاتر عەزیەت دەدران و وەك پۆڕی خوراویان لێدەکرا.!

ئەوەی گرنگ بوو عاجزبوون نەبوو، چونکە بژاردەی خۆمانبوو، خۆشەویستی کۆیکردبووینەوە!

بە نزیکەی (٢٠) مامۆستا، دوو سەیارەمان هەبوو، کاك (عومەری موهەندیس) ئۆتۆمبیلی دائیرەی کارەبای پێبوو، بەزۆری ئەو کۆمانی دەکردەوە، شەوێ دوای دۆڕاندمان ڕێککەوتین کە، کڵاوێك بکەینە سەر گروپی براوە، درەنگانی شەو پاش یاری،هەموو لە ئۆتۆمبێلی کاك عومەر سەرکەوتین بەناوی پیاسەوە، چوینە کەناری شار،کاك عومەر سەیارەکەی کوژاندەوە،

گوایە خراپ بووە، دابەزین پاڵی بنێین، بەدەم ڕۆیشتنەوە سلفی لێداو ئێمە کە ئاگاداربووین خۆمان هەڵواسی، ئەوانی دیکەمان بەجێهێشت، مامۆستا(ئەیاد حامد) لەسەیارەکە دانەبەزیبوو(براوەشبوو)، وتم کاك عومەر لێخورە بۆ چەمی گردەگۆزینە، دەچین لەوێ دایدەگرین،منیش باسم دەکرد: گورگ و بەراز و ئەنواع جانەوەری لێیە، فەقیرە دەپاڕایەوە :بیکەن لە ڕێیی خوا مەمبەن، وەعد بێ ئیتر نەچمە سەر ئەوان و بێمە گروپی

ئێـوەوە.! بەتایبـەت مامۆسـتا (محمـد حاجـی عوسـمان)هیوایەتی بـوو، عەزیەتـی مامۆسـتا ئەیـاد بـدات، شـەوانی بـێ کارەبایی،لـە سـوچی کۆڵانەکانـدا دەوەستا (پـخ)ی لێدەکرد، بـە جۆرێ هـاواری دەکـردوو پیا هەڵدەزنـا، شـێریش بوایـە خـۆی ڕادەسـتی (کەروێشـك) دەکرد.!چونکـە زۆر هاوڕێـی بوو،خوشیدەویسـت.!

## بۆچـی خوێنـدکار (جوێـن)ی لـە مامۆسـتا(ئەنوەر چاوشـین) قبوڵدەکـرد.؟!

هونـەری مامۆسـتایی چ وانەبێـژ بێـت یـان ئیداریـی، تا ئەوسـاتەی کـە خانەنشـین دەبیـت، پێویسـتە بتوانێـت لـە پێنـاو خزمەتـی پـەروەردەدا خـۆت بگونجێنیـت و نوێکاریـی و زانیاریـت پـێ بیێـت، چونکـە قۆناغەکانـی خوێنـدن و سـەردەم هەمیشـە لـە گۆڕانـدان.

مامۆسـتا ئەنـوەر، جوێنەکانـی لـە دڵـەوە نەبوون،جوێنێـك نەبوو،کەسـایەتی خوێنـدکار بشـکێنێت و پەرچەکـرداری لـێ بکەوێتـەوە، زۆر جـار ڕووی لـە خوێندکارێـك بکردایـە جوێنەکـەی بـە (کـۆ) دەدا، لـە گەڵیـدا سـیمای پێدەکەنـی، خوێنـدکاران تێگەیشـتبوون کـە لـە دڵسـۆزیەوە، لـە جـێ سەرپەرشـتیاریان(باوکیان) ئـەم جوێنانـە دەدات، بەتایبـەت لـە کاتـی چونەپۆل،قاڵێکـی دەنایـەوە، خوێنـدکار لـە دەرەوە نەدەوەسـتا، ئـەوەش نەبـوو گرفتـی بـۆ دروسـتنەکردبێت، زوو هەڵدەچوو،هیچیشـی لـە دڵنەدەگـرت کـورد دەڵـێ: سـەری بشـکێنەو نانی لـە گەڵـدا بخۆ.!،هـاوکات جـدی بـوو لـە کارەکانی،هەمیشـە حـزوری هەبـوو،زوو دەهـات، شـارەزاییەکی باشـی لـە بـواری بەڕێوەبردنـدا هەبـوو، سەرناسبوو..(ئێسـتا خانەنشـینەو تەمـەن یـاری بێـت).

هەنـدێ کـەس هـەن لـە سەرئاسـتی (گەڕەك،شـار،وڵات.) ناوبانگ(شـهرەت) وەردەگرن:دکتـۆر بەیـان مانـی وتی:خاڵـۆ (س.ح.کەلار-خـودا لێیخـۆش بێـت)،لای پیکابەکـەی وەسـتابوو،ئەو منـی نەدەناسـی،لەبەرخۆمەوە ووتـم: سـەرم ژانکـەت ئـەڕا دوشـمان(جوێن)، بـۆ خێرەومەنـێ نییـە دوشـمانێ بەتەپیـمان.؟! سـەری بەرزکـردەوە و بەتێڕامانـەوە لێمـی ڕوانـی! منیـش خـۆم بێئاگاکـرد و دووبـارەم

کردەوە،ورریاتـر لێمـی ڕوانـی و تەماشـایەکی دەوروبـەری خـۆی کـرد، جگـە لـەو کەسـی دیکـە نییە.!بەتورەییـەوە هاتـە پێشـەوە و وتـی: ئـەوە وەل کیـە قسـەکەی؟ وتـم: تـۆ حەقـت چیـە؟ وتـی : وەخـوا مـن ناسـی ؟! بویشـە پیـم کـوڕ کێیـت؟ ناونیشـانی خۆمـم دا،پڕبەدڵـی خـۆی دوشـمان دارەپیـم.!.

## دواهەوارمان لە ئێستادا (باخچە خانە.!)

مانگـی(١٠ ی ٢٠٠٤) گواسـتمانەوە (باخچەخانە)،چونکـە هۆڵێکـی نزیکـەی (٥ بـە ١٠) و ژورێکـی بچوکـی (٤ بـە ٤)،کـە مەتبەخـی (باخچـەی سـاوایانی کـەلار) بـوو دران بـە ئێمـە، نێوانمـان دیوارکرد،لەبـەر بـێ جێیـی هۆڵـە گەورەکەمـان بـە پەردەیەکـی گـەورە لێـك جیاکردەوە،کردمانـە( دوو پۆلۆچکە)،زۆرجـار سـەرنج و بیـری خوێندکارەکانـم بـۆ گـرد نەدەکرایـەوە، مـن زمانـی کـوردی و جاریـواش بـوو ئەودیـو پەردەکـە، زمانـی ئینگلیزیـان بـوو، وەك کاساوسـێ وانـەی ئینگلیـزی لای پۆلەکـەی مـن خۆشـترو، کـوردی منیـش لای ئـەوان پەسـندو سـەرنج ڕاکێشـتربوو! مەتبەخەکەشـمان کـردە پۆلـی خوێندن،یەك مەتـر لـە (w.c) وە، دووربـوو.!

لـە (کتێبخانـەی گشـتی کـەلار)، دوو هۆڵیـان داینـێ هـی سـاڵی (حەفتاکان)،کاتـی خـۆی شـوێنی خوێندنـەوە بـوو، ئـەم دوو هۆڵـە دەرگایـان بـۆ نـاو باخچـەی ساوایانی کەلاریـش هەبوو،تـا ئێسـتاش هـەردوو لامان،کاریگـەی نەرێنیـمان لـە سـەر ئەویترمـان جێهێشـتووە، چونکـە بـە ئاسـانی دەنگـمان دەگاتـە یـەك، ئـەوەن منالێشـن بـە سـانایی کرناکرێـن.!

بۆیـە نـاوم لێنـا (باخچەخانـە): چونکـە خۆمـان خاوەنـی (هیـچ) بوویـن، نیوەمـان ماڵـی باخچـەی سـاوایان و نیوەکـەی دیکەمـان هـی یەکـەم کتێبخانـەی گشـتی کـەلار بـوو.!

بەراسـتی ئـەوەی سـیماو پێویسـتی خوێندنـی پیشـەیی بـوو، لـەم (باخچەخانە)یـە نەبوو،چونکـە خوێندنـی پیشـەیی پێویسـتی بـە هۆڵـی عەمەلـی هەیـە،(w.c )مـان نەبـوو، خوێنـدکاران دەچونـە مزگەوتی(شـێخ

ئیبراهیم) بۆ سەراو، بۆ مامۆستایانیش تەنها یەك (w.c) هەبوو، کچە خوێندکارەکانمان بەوپەڕی شەرموو لە ناچاریدا دەهاتنە ئەوەی مامۆستایان، ئەمەش یەك مەتر لە شوێنی (چا) لێنان و ژووری بەڕێوەبەرەوە دووربوو.! سەرتان نەێشێنم بەکورتی بەشێك لە کەم و کورییەکانی (ئامادەیی پیشەیی کەلار)تان بۆ ڕیز دەکەم:

١-لە ڕووی بینا و نەخشەسازییەوە، هیچ شێوەو شێوازێکی خوێندنگەی پێوە نییە، هەر ژوورەی ڕووی کردوەتە ولاتێ.!

٢-هۆڵی تایبەتی بە وانەی(عەمەلی- کرداری)نییە.

٣-هیچ جۆرە گۆڕەپانێکی وەرزشیی نییە، تەنانەت باخچەو شوێنێك بۆ پشوی خوێندکاران.

٤-(تەوالێت) و شوێنی دەستشۆرینی وەك پێویست نییە، بەتایبەت بۆ مامۆستایان.

٥-مەتبەخی نییە، بۆ چالێنان لەسەر تەپڵەیەك و لە سوچێکدا تەنها یەك مەتر لە ئاودەستەکەوە دوورە.!

٦-سەرجەم مامۆستایان بە (ژن و پیاو و ئیدارە) وە، لە ژوورێکی گەورەداین.

٧-دیواری حەوشەمان زۆر نەشیاوە تا ئەم ماوەیە (تەلیدڕکین)ی لێدرابوو، ڕێیواری بالابەرز بە جادەکەدا بڕوا، بۆ ئەوەی پۆلەکانمان ببینێ، تەنها بەسە نەختێ پاژنەی پێی هەڵبڕێت.!

٨-هێندە پاڵ و پێچی تێدایە بە کامیرەش (زۆر جار) کۆنترۆڵ ناکرێ،خوێندن لێرە (کورو کچ) تێکەڵن،(لە پۆلەکانیشدا کامیرامان داناوە).

٩-دوو پۆلمان لە سەردەمی خوالێخۆشبوو: مامۆستا (مستەفا ڕەشید/ بەڕێوەبەری پێشووی پەروەردەی کەلار)دا دروستکراون،کاتی گەمارۆی ئابوری، هەریەکەی دووپەنجەرەی(یەك مەتر بە نیو)ی لە بنمیچی ژوورەکاندا بۆ دانراوە،(ڕەنگە بۆ زیندانیش شیاو نەبێ.!

١٠- لە ساڵی (٢٠١٢)،بە مەبەستی کردنەوەی بەشی کۆمپیوتەر، (١٠)سێت کۆمپیوتەرمان لە پەروەردەی کەلار وەرگرت، بەداخەوە

وەكـو پێویسـت سـوودمان لێوەرنەگـرت، چونكـە پۆلـی خوێندنمـان نەبـوو بـۆ كردنـەوەی ئـەم بەشـە.
١١-تـا ئێسـتا بەشـێك لـە وانـەكان كتێبەكانیـان بـۆ چـاپ نەكـراون، دراونەتـە دەسـتی قـەدەری (مەلزەمـەو ماۆستا)...!(دەسـتم والـە هەویره،هـەر ئەوەنـدەم لـە بیـره.!).
بەهـەوڵ و تێكۆشـانی مامۆسـتایان و ئیـداره، ئـەم (كەلاوە)یە، هەندێ رەنـگ و ڕووی بـۆ گەڕاوەتـەوە، مامۆسـتایان بەدەسـتوپەنجەی خۆیـان و هەنـدێ كۆمـەك، ژمارەیەكـی بـاش تەختـی یـەك نەفـەری گونجاویـان بـۆ خوێنـدكاران درووسـت كرد،یەكێـك لـە پۆلـەكان ناونـراوە: پۆلەكـەی مامۆسـتا حیـدەر، چونكـە پشـكی شـێری هەبـوو، لـە جوانكـردن و دابینكردنـی پێداویسـتییەكانی،تا ئێسـتاش چاودێـری دەكاو قبوڵـی نییـە خوێنـدكار شـوختی لێبـدات.!
سـاڵێ ٢٠١٩ لەسـەر بودجـەی (پـەروەردەی كـەلار) دوو پۆلی شـیاومان بۆ درووسـتكرا.
لـە ڕێـی مامۆسـتا (ئەنـوەر محمـد موراد)ەوە،خێرخوازێـك،(دوو w c یـان بـە بلـۆك بـۆ دروسـت كردیـن، تەنهـا مابـوو سـەریبگرین،پارەكە بەشـینەكرد، بـووە شـوێن جگـەرە كێشـانی خوێندكاران،ناچاربویـن دەرگاكانمـان (كەڵەكچن)كـردن.!

## پیشـەیی كـەلار و بەرنامـەی ( كۆمەڵـەی ڕۆشـنبیریی بریتانـی - British Council):

(ناوەراسـتی مانـگ ١٠ی ٢٠٢١)،مامۆسـتا (عەلـی حەمیـد خەلیفـە) سەرپەرشـتیاری هاوڕێـی رەخنەگر_كـەلار، هاتـە سـەردانیهان، بـە حـزوری سـەرجەم مامۆسـتایان، نـاوەڕۆك و پەیامـی ( بەڕێوەبەرایەتـی پـەروەردەی كـەلار) ی لـە بـارەی ئـەم بەرنامـە نوێیـەوە پێراگەیاندیـن...
ئـەم بەرنامەیـە ئەزمـوون كـراوە، هـاوكات پێویسـتی بـە ژینگەیەكـی گونجـاو و لـە بـارە بـۆ ئـەوەی پیادەبكـرێ و ئامانجەكانـی خـۆی بپێكـێ، نكۆڵـی لـە دڵسـۆزیی و خەمخۆریـی مامۆسـتا (عەلـی حەمید خەلیفە)لـە بـواری پـەروەردەدا ناكرێـت، مامۆسـتایەكی ڕاسـتگۆ و بـە

هەڵوێستە...

پاش ئەوەی کە پەیامەکەی گەیاند وتی:پێمخۆشە هەر سەرنج و تێبینییەکتان هەیە،بە ڕاشکاوی پیم بڵێن.؟

کەسێك قسەی نەبوو، بۆیە منیش ڕوخسەتم لە بەڕێوەبەرو یاریدەدەرکان خواست و ئەوەی پێویست بوو بیڵێم وتم،کە بریتی بوون لەو خاڵ و سەرنجانەی سەرەوە...مامۆستا (عەلی) وتی:وللە ئەم سەرنج و سەراحەتەت حەقە بۆ وەزیر بوترێت، زۆر دەستت خۆش بێت،کەواتە دەتوانن بڵێن: ئێمە پێمان ناکرێ ئەم بەرنامەیە جێبەجێبکەین ؟وتم: نەخێر،بەڵام ئەمە حەقیقەتی حاڵ و ژینگەی قوتابخانەی ئێمەیە، وتی :حەقتانە و منیش تێبینیەکانتان دەکەمە یاداشتێك، لە گەڵ ئێوەدا واژووی دەکەم،چونکە من (هاوڕێی) ئێوەم...نزیکەی دووسەعات مایەوە، کۆنوسێکمان پێکەوە نووسی و وتی: بەزووترین کات وەڵامتان بۆ وەردەگرم،بە بوون و نەبوون...

لە ڕێکەوتی:پێنج شەممە_٢١-١٠-٢٠٢١، (مامۆستا عەلی حەمید- هاوڕێی ڕەخنەگر، مامۆستا خەلیل ئەحمەد-سەرپەرشتیاری یەکەمی ئامادەییەکان، مامۆستا عوسمان عەلی محەمەد-ب،سەرپەرشتیکردنی پەروەردەی گەرمیان)، هاتنە سەردانی ئامادەیی پیشەیی، مامۆستا خەلیل وتی: ئەورۆژە مامۆستا عەلی بە یاداشتەکەتانەوە گەڕایەوە لامان، کارێکی کردوە مەپرسن.! تەنانەت پێم وت: باشە مامۆستا عەلی ئێمە تۆمان ناردوە، کەچی داکۆکی لەوان دەکەیت ؟! (ئەمەی بە پێکەنین بۆ خۆشی گێڕایەوە...)،بەڵێ ئەمەیە سەرپەرشتیاری ڕاستەقینە و هاوڕێی ڕەخنەگر.!

پاش گفتوگۆیەکی پەروەردەییانە و گۆڕینەوەی دیدو بۆچوونەکان، پێکەوە چوار دیواری قوتابخانە بە پۆلەکانیشەوە گەڕاین، ئەوەی بینیان زیاتربوو لە گلەیی و یاداشتەکەی ئێمە،هاوڕامان بوون، بۆیە وتیان بەڵێ: بە هیچ جۆرێك لەم ژینگەیە ئەم بەرنامەی (بریژکنسڵ) جێبەجێناکرێت! پشتگیریی داواکاری و یاداشتەکەتان دەکەین، بەڵکو شوێنێکی گونجاو و شایستەتان بۆ دابین بکەین...ئەمەش دەقی نوسراوی (بەڕێوەبەرایەتی سەرپەرشتیکردنی پەروەردەی گەرمیان)ە :

**بەڕێوبەرایەتی سەرپەرشتیکردنی پەروەردەیی گەرمیان** مع **Ibrahim Hussen** و**Khalel Ahmad**.

٢٠٢١/١٠/٢١ ·

ئەمڕۆ پێنج شەممە ڕێکەوتی 21\10\2021 هاوڕێ لەگەڵ بەڕێزان م.خلیل احمد سەرپەرشیاری یەکەمی ئامادەیی و م.علی حمید سەرپەرشتیاری هاوڕێی ڕەخنەگر سەردانی ئامادەیی پیشەیی کەلارمان کرد بەمەبەستی بە دواداچوون لە گرفت و داواکاریەکانیان کەوێنەی ئەو داواکاریانە ئاراستەی پ.کەلار و پ.گشتی گەرمیان و ئیدارەی گەرمیان یش کراوە لای خۆمانەوە پاڵپشتی تەواوی داواکاریەکەیان بووین و هیوا خوازین

لایەنی پەیوەندیداریش بەتەنگ داواکەیانەوە بن ،هیچ لۆژیک نییە لە سەنتەری ئیدارەی گەرمیان یەک ئامادەیی پیشەیی هەبێت و ئەوەش بارو دۆخی بێت سەرەڕای ئەوەش ساڵانە بەئەنجامی باش سەری گەرمیان بەرز دەکەنەوە. دروشمی سەرۆکی حکومەتە نابێت خوێندن لە پێناو خوێندن بێت ، ئێرەش تاکە شوێنە کە قوتابی فێری کارو پیشەو بازاڕ دەکات .بەڵام ئاوا نابێت ،ئەوان شایستەی بینایەکی باشترن لەمەی ئێستا .بۆ هەموو ئەوانەی پەیوەندیدارن، دەبا پێکەوە شوێنێکی شیاویان بۆ دابین بکەین

ڕێزم بۆ ماندووبونتان هەیە ئامادی پیشەی کـــــەلار.

ســـــــــــــــــەرکەوتوو بن

عثمان علی محمد

ب.سەرپەرشتیکردنی پەروەردەی گەرمیان



وێنەکە:لە چەپەوە: م.بەرزان غێدان –م،عوسمان عەلی-م،عەلی حەمید -م،ئیبراهیم حسێن- م،خەلیل ئەحمەد- م،ئەحمەد محەمەد.

لە یاداشتەکەماندا پێشنیاری (بەشەناوخۆیی خوێندکارانمان کرد، لە تەنیشت (ماڵی حاجی ئاهو) کەتەنها (٨) خوێندکاری تێدایە، بۆ ئەم مەبەستە(مامۆستا ئەنوەر،مامۆستا ئیبراهیم، مامۆستا بەرزان، بەندە) سەردانی سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان (شێخ جلال شێخ نوری)مان کرد، ڕەنگە لەو ڕۆژەوە کە لە بینای خۆمان دەرکراین و ئاوارەبووین، بەم جارەوە دەیان جاریدیکە سەردان و داواکاریمان بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکان پێشکەش کردبێت، (مەحوی) دەڵێ : هەر کەسێ بۆ خەبەر چوو،بێ خەبەر کەوت.!

## له (کەلاوە) یەکەوە..!




دەکرێ لە بەر ڕووناکی مۆمی کەلاوەیەکەوە، مێژوو بنووسرێت.! خوالێخۆشبوو(پرۆفیسۆر : مستەفا زەڵمی )لە کەلاوەیەکی وڵاتی میسردا،لە یەك کاتتدا خەریکی خوێندنی، دوو دکتۆرا بوو، مێژووی مرۆڤایەتی پڕن لەم جۆرە نموونانە.!

هەرچەندە پەندی کوردی هەرگیز ئاوەژوو ناکرێتەوە، چونکە هەر ڕوداوێك ڕویداوە ئەنجا پەندێك لە دایك بووە،کورد دەڵێ : (شەڕ بە ئەسڵیحە دەکرێت)، تواناو هەوڵی جدی هەندێك جار، پەند دەخاتە ژێر پرسیارەوە.!

مامۆستایانی ئەم کەلاوەیە(پیشەیی کەلار)،چونکە پیشەکەمان لا گرنگ و پیرۆزبووە، هەوڵمان داوە لە گەڵ واقعێکی تاڵ و ناچاریدا هەڵکەین و بەردەوامبین، کەلار تاقە یەك ئامادەیی پیشەیی تیایە، دەبوو لە ئاستی خوێندنگەکاندا،لە رووی بیناو پۆشاکەوە نموونە بوایە، هەڵەنەبم لە ئاستی تەواوی بینای باخچەکانی شار، تا دەگاتە ئامادەییەکان، بینای نەگونجاوو، نەشیاوی چەشنی پیشەیی کەلار نییە..ئەمە بۆ ؟ نازانین..!

هەموو ئەمانە نەیانتوانیوە ئیرادەو تاقەتمان لە مەڕ کاری پەروەردەییمان لاوزبکەن،چونکە خوێندارەکانمان گوناهێکیان نییە.!مرۆڤیش پیشەیەکی کردە بژاردەی خۆی،پێویستە بوونی خۆی

تیادا بسەلمێنێ، نەخوازەڵا، پیشەی پەروەردەش بێت.! چەندین جار خوێندکاران، گلەییان لە شوێن و جێگا و ژینگەی خوێندنگە کردوە، لە وەڵامدا وتوومە: ڕۆڵە گیان، ئێوە (٣) ساڵ لێرە دەمێننەوە،ئێمە وا لێرەدا تەمەنمان تەواوکرد..! هەر لەم پۆلەی ئێوەدا، خوێندکارمان یەکەمی ئاستی هەرێمی کوردستانی بەدەستهێناوە، ئێوەش هەوڵدەن چاو لەوان بکەن.!

لەوەتەی لەم (کەلاوە)یەداین، سێ ساڵ زیاتر، یەکەمی ئاستی هەرێمی کوردستان و دەیانجار دەیەکەمەکانی هەرێم و زیاتریش،یەکەمی گەرمیانمان هێناوە...

## ناوی بەشێك لە خوێندکارە سەرکەوتووەکان:

١-ڕۆستەم قادر محمود، یەکەمی هەرێمی ئێستا(١٩٨٩-١٩٩٠)،کۆلێژی ئەندازیاریی

٢-کامران شمە رسول، یەکەمی هەرێم،(١٩٩١-١٩٩٢)،کۆلێژی ئەندازیاریی

٣-هێرۆ جواد ئەحمەد، یەکەمی هەرێم..(٢٠٠٩-٢٠١٠)، کۆلێژی ئەندازییاریی.

٤-ئەیوب هەژار عەلی، یەکەمی هەرێم..(٢٠١٨-٢٠١٩)، کۆلێژی ئەندازیایاریی.

٥-ئامینە محمود محەمەد، دووەمی هەرێم(٢٠٠٨-٢٠٠٩)، کۆلێژی ئەندازیاریی.

٦- کەریم خەسرەو عبد، دووەمی هەرێم (٢٠٠٧-٢٠٠٨)......................

٧-شکریە محمود شەریف، دووەمی هەرێم (٢٠٠٦-٢٠٠٧)..................

٨-سەمیرە ڕەزا، چوارەمی هەرێم،(٢٠٠٨-٢٠٠٩)............................

(ئـەم خوێندکارانـە لـە بەشـەکانی: (کارەبـا، بازرگانـی، کانـزا.) خوێندویانـەو، پـاش دەرچوونیـان بـە: یەکـەم و دووەم و سـێیەم،لە کۆلێـژی ئەندازیاریـی وەرگیـراون.).

(ئامینـە محمـود) بـۆی گێڕامـەوە وتـی: خوێنـدکارە سـەرکەوتوەکان لـە لایـەن وەزیـری پـەروەردەی هەرێمـەوە، خەڵاتکرایـن، لەوکاتـەی دەستخۆشـی لێکردم،پێـم ووت: پێـم خۆشـە سـەردانی مامۆسـتاکانم بکەیـت و دەستخۆشـی لـەوان بکەیـت، تاببینـی لـە چـی بینایەکـی کـۆن و داروخـاودان ؟! پەیمانیـدا سـەردان بـکات، نازانـم هـات یـان... نـا ؟! هێشـتا چاوەڕێ دەکەیـن، چونکـە لـە نـاو کـورد دا نەبـوو پەیـمان شـکاندن..!



ئامینە مەحمود

## خەڵاتکردنی مامۆستایانی(ئامادەیی پیشەیی کەلار).

لە پای ئەوەی کە لەسەر ئاستی ئامادەییە پیشەییەکانی هەرێمی کوردستان،پلەی (یەکەم)مان بە دەستهێنابوو،مامۆستایانی (ئامادەیی پیشەیی کەلار)،لە لایەن ئەم بەڕێزانەوە خەڵاتکراین :

١-جەلال شێخ نوری،(قائیمقامی قەزای کەلار)،ساڵی (٢٠٠٩ – ٢٠١٠).

٢-دارا ئەحمەد سەمین (بەڕێوەبەری گشتی پەروەردەی گەرمیان) (١٠-٧-٢٠١٩).



## مامۆستایەك (٢٠ )ساڵ زیاترە یەك خوێندكاری نەكەواندووە.!



مامۆستا (عامر نادر نەجەف) : لەدایك بووی (١٩٦٩)،خانەقی،ساڵی(١٩٨٨-١٩٨٩)،لە زانكۆی (مستەنسریە-بەغدا ) وەرگیراوە، لە راپەڕینی (١٩٩١) برایەكی لە شەڕی رزگاركردنی خانەقی، بە ناوی( فازڵ نادر نەجەف)، لە دایك بووی (١٩٦٤) شەهید دەبێت،مامۆستا عامر لە كۆڕەوەی خەڵكی كوردستان، دەچێتە دیوی ئێران،پاش گەڕانەوە ناتوانێ بگەڕێتەوە زانكۆی مستەنسریە، پاش دووساڵ دانیشتن، دەگەڕێتەوە زانكۆی سەلاحەددین(هەولێر)،قۆناغی (سێیەم و چوارەم ) لە (١٩٩٤-١٩٩٥)،تەواو دەكات...

مامۆستا عامر: باڵایەكی بەرز، لەش ولارێكی ڕێك و گورجوگۆڵ،كەم ئەسمەر، جوتێ سمێڵ لێوەكانی داپۆشیون،قژێكی پڕو دەیخا بەلادا، لە ئێستادا سەرو ریشێكی ماشوبرنجیی، هێشتا ژیانی هاوسەریی پێك نەهێناوە.!

مامۆستایەكی كەم دوو، ماڵی سەفەرو دەشتوودەر، باسی كەس ناكا،توخنی حیزبایەتی ناكەوێ، تائەوپەڕی : كورد و نیشتیمان و خاكی خۆشدەوێت، مامۆستا (كامیل )هاوڕێی ووتی: هۆرەی بۆم كردوە، هۆرە چڕێكی باشیشە.! زۆر جار وەك ماڵی خۆی،سەرقاڵی گوڵ و جوانكردنی درەختەكانی قوتابخانەیە، چاودێری كەش و هەوا زۆر دەكا، زەنگی بۆ بكە بەزۆری دەڵێ: كاكە، ماچۆزمانە،(كاكەیی)،

تەماحــی بەکــەس نییە،ڕاســتگۆو حەقبێــژە، لەبەرانبــەر چاکەیــەك دووچاکــە دەکات، نابێتــە ئــەرك بەســەر کەســەوە، لــە گەنــج ناچــێ، نیــگای وەك ڕۆحــی پاکــە، هەتــا بڵــێی مــەردو خاوەنــی عیزەتــی نەفســە، ئــەو کوردەیــە کــە : (لــە پــردی نامــەرد ناپەڕێتــەوە.!).

مامۆستا عامر : (٢٦) ساڵە مامۆستایە،لێم پرسی ووتی :

بوومەتــە مامۆســتا بــە دەگمــەن خوێنــدکارم کەوانــدووە، (٢٠) ســاڵە خوێنــدکار( بخوێنــێ یــان نەخوێنێ)،نەمکەوانــدووە، وتــم بــۆ.؟! وتــی: دڵــم نایــە، حەزدەکــەم بڕوا،مــن چانســی دەدەمــێ. لــە دوا چرکــەی زەنگــی چونــە دەرەوە، خوێنــدکار بێتــە چــوورەوە قبوڵــی دەکــەم، ئەســتەمە بــە هیــچ هۆیــەك خوێنــدکار لــە پــۆل بکەمــە دەرەوە، زۆر خۆمیــان لــە گــەڵ مانــدوو دەکــەم، ئیزافیــان پێدەکــەم، هەرگیــز جیــاوازی کــوڕو کــچ نییــە لای مــن، لەســەر پــەڕەی تاقیکردنــەوەی وەرزەکان دەنووســم: لــە ئێســتاوە پیرۆزبایتــان لێدەکەم...پرســیم : ئــەی خوێنــدکاران ڕێــز لــە موحیبەتــت دەگــرن ؟ ئەمــەی تــۆ نەبوەتــە مایەیــی ئیهمالــی و شــاندانەوەی خوێنــدکاران.؟! وتــی: خۆشــیان دەوێ،بــەڵام لــە تاقیکردنــەوەی (بکالۆریــا)، نزمتریــن ئاســتی دەرچوونــم هەیــە.! ئــەم نەتیجەیــە زۆر ئــازارم دەدا.! لــەم مامۆســتایە (ڕاســتی، نیســتی وپاکــی و ڕەدایــی)م بینــی.!.

ئــەم شــێوازەی مامۆســتا (عامــر) کێشــەیەکی کۆمیدی بــۆ مامۆســتای (ئاییــن) دروســتکردوە: کاتــێ خوێندکاران.لــە وانــەی ئاییــن دەکــەون، یەخــەی ئیــدارە و مامۆســتای وانەکەیــان دەگــرن و دەڵێــن : مەعقولــە لــە (فیزیــا) دەرچیــن و لــە (ئاییــن) بکەویــن ؟!

## خەمیان ناخۆن،خراپ لێیان مەڕوانن.!

لەســەر ئاســتی عێــراق و بەتایبــەت لــەم هەرێمــەدا، خوێندنــی پیشەیی(ســناعە)،لە کۆنــەوە تابــە ئێســتا، بــە چاوێکــی (نەرێنی)،لێیــی دەڕوانــن، ئەمــەش قــەدەرەو حوکمــی هەڕەمەکــی کۆمەڵگەیــە، چونکــە خــۆم گەواهــی دەری ئــەم (گونــاە کارییــەم)!

(٢٩) ساڵە لێرەم، وانە دەڵێمەوە، وایش قۆڵم لێ هەڵماڵیوە دەستبەکاربوونم، تا خانەنشینیم لێرەبم، چونکە گەیشتمە ئەو بڕوایەیی کە خوێندکار لە هەر قۆناغ و بەش و شێوازێکی خوێندندا بێت، کاریگەری (مامۆستا، بەڕێوەبەر، سیستمی پەروەردە و ژینگەی خوێندنگە)ی لەسەرە، ئەوەی خوێندکار والێدەکات دەهری بێت و ناوبانگی بە خراپی بڕوات، پێچەوانە کردنەوەی ئەو پێداویستیە مادی و مەعریفیانەیە، نەك خودی خوێندکار. دانانی ناو ناتورەی نەشیاوی پێشوەختە، کاریگەری خرپ لەسەر سایکۆلۆژیەتی هەر مرۆڤێکدا جێدێڵێ، منداڵ کە ناوی لێدەنرێ (وریا)،بۆ ئەوەیە خۆی لە گێلێتی نەدا، شەرم بکات کاتێ هاوتەریبی سیفەتی ناوەکەی ناڕوا.!

ئەوەی چەند ساڵە بوەتە پرسیار لام،لە ساڵی (٢٠٠٩-٢٠١٠)ەوە زانکۆی گەرمیان، بەشی کوردی، خوێندکاری (متەبق) بۆ ئامادەیی پیشەیی کەلار نانێرن! لە بە دوادا چوونمدا پێیان وتم: خوێندکاری قۆناغی چوارەم،ڕێگەپێدان لە هەر ئامادەییەکەو بهێنن، ئێمە نوسراوی بۆ دەکەین و دەینێرینە ئەو خوێندنگەیە، دیارە خوێندکاران مەیلی هاتنە لای ئێوەیان نییە.!

چەن ساڵێك پێش ئێستا لە سەرۆکی بەشی کوردی زانکۆی گەرمیانم پرسی: بۆچی خوێندکاری (متەبق)مان بۆ نانێرن؟! ئەویش وتی:پێم وتوون، دەڵێن: خوێنکارەکانیان گەورەن و شەڕانین وهتد.!(گەروابوایە من و زۆرێك لە مامۆستایان زیاتر لە (٢٥) ساڵە وانە دەڵێینەوە، چۆن ماوین؟!).

باش وایە زانکۆ وەك ناوەندێکی ئەکادیمی باڵا، ڕۆڵی گونجاوتر بگێڕێ لەمەی کە هەیەتی، بۆ نموونە: بەدوادا چوون بۆ ئاوەها پرسێك بکات، گەروانەبێت ئەو بۆچوونە کە لە کۆنەوە سەبارەت بە خوێندکارانی پیشەیی هەن، ئەویش پشتڕاستی دەکاتەوە..!

لە ساڵانی (٢٠٠٨-٢٠٠٩)،دوو خوێندکاری (متەبق) ی،زانکۆی گەرمیان،بەشی کوردی نێردرانە لامان، بەخۆشحاڵیەوە وانەکانم بۆ ئەو ماوەیەیی کە هەیانبوو، ڕادەستکردن.

لەو ماوەیەدا مامۆستایەکی زانکۆ بە ناونیشانی سەرپەرشتیارو

چاودێری ئەو دوو خوێندکارە، هاتبوە (ئامادەیی پیشەیی کەلار)، بە پێی جەدوەلی رۆژانە نەهاتبوو، وارێکەوتی کردبوو، وانەی کوردی نەبوو، ئەو دوو خوێندکارەش نەهاتبوون،خۆیشم لەوێ نەبووم.!
دوای گفتوو گۆو خۆناساندن، لە گەڵ بەڕێوەبەرو یاریدەدەرەکانی خوێندنگە،زۆری بەشان و باڵی مندا هەڵدابوو، ئەوەی بووە پرسیارو جێی سەرسوڕمان، لە دەفتەری (زیارات)دا نوسیبووی: سەردانی خوێندکارەکانم کرد لە پیشەیی کەلار،چوومە پۆلەوە، بە جوانی وانەکانیان پێشکەش دەکرد هتد..!.

## «ئاسۆ»ی کارگوزارو تەنها یەك ڕۆژی :

ئاسۆ ئەسکەندەر عەلی، لەدایك بووی (١٩٧٤)...زۆربەی هەرە زۆری ڕۆژەکان پێش ئێمە دێت و دوای ئێمە خوێندنگەی جێدەهێڵت، لە ڕۆحی مندا سیفەتی (دایك)ی وەرگرتووە، هەر رۆژەی نەیەت، بێ نازیان پێوە دیارە، جار جارە (مامۆستا بەرزان یان مامۆستا سامان )چاییەك لێدەنێن، دەنا وەك شەمەی (جەولەکان) لە خوێندنگە شخارتە لێنادرێت، جاری واهەیە، لە (سێ) لاوە بانگ دەکرێ: ئاسۆ چای..ئاسۆ دەرگاکە..ئاسۆ جەرەسە..هتد..؟!

ئاسۆ موچەکەی لە هەموومان کەمترە: خۆ ئەمیش ئینسانە،خێزاندارە، منداڵی هەیە، برایەی بە هۆی ڕووداوە وە، نەخۆشی درێژخایەنی هەیە، خۆی فەقەراتی هەیە، لە پشووەکاندا کرێکاریی دەکا، بە سەیارەی سەرجادە دێت و دەڕوا، هەمیشە قەلەق و خوی لێرەو مێشکی لە جێیەکی ترە، هەموومان (بۆڵە..بۆڵ)مان هەیە، لە: (حکومەت، خوێندکار. ناڕەواییەکان، من لە جگەرەکەی مامۆستا بەرزان..هتد)،ئاسۆ ئەو چانسەشی نییە.! بۆ نەگبەتی خۆی عەمەلی و پاك و پرچە، ئەم سیفەتەش بۆ کارگوزار هیلاکییە،چونکە پاکی دەبێتە(غەریزە).!

ئاسـۆ عەنتیکەیـە..! زۆر جـار ئامـۆژگاری خوێندکارەکانـم دەکـرد، کـە هـەر شـتێ فرێـدەدەن جگـە لـە ئاسـۆ کەسـیدیکە شـك دەبـەن کـە هەڵیگرێتـەوە ؟! ئاسـۆ لـە تەمەنـی بـرای گـەورە و باوکتانـە، تکایـە هـاوکاری بکەن...جارجـار دەمـووت: ئاسـۆ لـە وەزیرێکـی خـراپ زیاتـر مانـدوو دەبێـت، موچەکەشـی (جوتـێ پێـڵاوی خـوا پێداوێـك نـاکا.!)، ئاسـۆ ئـەم قسـانەی منـی بیسـتبووەوە،جارجار پێـی دەوتـم : توخـوا مامۆسـتا وەزیـرێ بـە قـەد مـن ماندودەبـێ؟ منیـش دەمـووت: نـە ئەشـهەدووبیللا.!

خـوە خراپەکانـی ئاسـۆ: بـە قـەد وەزیـری کشـتوکاڵ چاودێـری کـەش و هـەوا دەکات،(گوێلـێ گەنمـی تـۆ و نەکـردوە). بەفـرو بـاران بـا، دەبـوو هەمـوو ڕۆژێ لـە دەوامـەوە بچێتـە بـازار. موداخەلـەی لـە گفتوگـۆی نێـوان مامۆسـتایان دەکات.! هەرچـی ئامۆژگاریـم کـردووە، تەنهـا بەشـی یـەك ڕۆژێکـی بـووە.!



## نەخۆشی (کۆرۆنا) و قوربانییەکانی(پیشەیی کەلار):

کاتـێ کۆرۆنـا بـوە نەخۆشـیی سـەردەم، جگـە لـە ڕاچەڵەکاندنـی مرۆڤایەتـی : (هامووشـۆ و سـەردانیی، تەوقـە، مـاچ، موحیبەت..هتـد) کاڵکـردەوە..! کـەم خێـزان هەبـوون، ئازیزێکـی یـان زیاتـری ژیـان ئاوایـی لـێ نـەکا!

ئێمـەش وەك (ئامادەیـی پیشـەیی کـەلار) دوو مامۆسـتای ئازیزمـان، ئۆغـری یەکجارەکـی بـە خێریانکـرد و چوونـە دیوانـی خـودای دلۆڤـان:

مامۆسـتا : بورهـان ئەحمـەد غەنـی، ڕۆژی (٢١-١٠-٢٠٢١).کۆچـی دوایـیکـرد.

مامۆستا: بەکر سدیق محەمەد ڕۆژی (٢٠-٦-٢٠٢٠).کۆچی دواییکرد.

ڕۆحیان شاد و دوامەنزڵیان فیردەوسی بەرین بێت.

## لە پەراوێزی وتەی( سەرۆكی حكومەتی هەرێمی كوردستان)دا كە پار ساڵ وتی: پێویستی بایەخ بە خوێندنی پیشەیی بدرێت.
## نارەواییەكی دیكە،دژ بە خوێندكارانی پیشەیی:

وتوویانە: كورت بڕی، نەمبیستووە گشت بڕی.!.نامەوێ جارێكی دیكە كەم و كوڕییەكانی پیشەیی كەلار بكولێنمەوە، تەنها كورتە بەسەرهاتێ دەكەمە نموونە: كابرایەك جوتی بۆ جوتیارێ كردبوو،ڕۆژی یەكەم جووتیار،كاوڕێكی بۆ سایەق سەربڕیبوو، ڕۆژی دووەم كردبوویە (هێلكەوڕۆن)!،سایەق چاوەڕوانی زیاتربوو،بە جوتیاری وتبوو : بۆ لە كاوڕەوە بۆ هێلكەو ڕۆن؟! ئەویش دەڵێ: جووتەكەت هی هێلكەو ڕۆنە.!

ئەم شوێن و جێگا جوانەی ئێمەش،هەر ئەم تۆزەی لێ هەڵدەستێ، ئەوە چەند ساڵێكە دەرچوانی (پیشەیی كەلار)،پێویستە نمرەی (٧٠) بەسەرەوەیان هەبێ ئەنجا، لە پەیمانگای تەكنیكی كەلار وەردەگیرێن، بەم هۆیەوە بە سەدان خوێندكار ماونەتەوە یان چونەتە شوێنە جیاجیاكان بۆ ئیشوكارو بژێوی ڕۆژانەیان.

لە (٢٠٢٠-٢٠٢١)، پەیمانگای ئەهلی(پاراڵێل) لە كەلار كراوەتەوە،بۆ بەشی كارەبا،ساڵانە بڕی(٨٠٠) هەزاردینارلە خوێندكار وەردەگیرێت، ساڵی (٥٥٠) هەزار دینار لە خوێندكار وەردەگیرێت،بەشی بازرگانی، كە نمرەیان لە نێوان(٦٠ بۆ ٧٠) نمرە بێت، بۆ ئێوارانیش هەمان بڕی پارە وەردەگیرێت، بۆ ئەو خوێندكارانەی كە نمرەیان لە (٦٠) كەمترە، ساڵی ڕابردوو یەك خوێندكاری پیشەیی لە خوێندنی حكومی وەرنەگیراون، بە هۆی نەبوونی نمرەی پێویستەوە.!

پێویستە پەروەردە سەرەنج و وردكاری هەبێ بۆ ئاوەها داتایەك، هیچ نەبێ بە هۆی ئەم بارودۆخە نەخوازراوە (كۆرۆنا و دابەزینی ئاستی مەعریفی خوێندن و هتد)، نمرەی (٧٠) بۆ وەرگرتن دابەزێنێ، تاوەكوو لە سەدا سەدی خوێندكاران لە خوێندنی حكومی بێبەش نەبن و خوێندنی ئەهلی( پاراڵێلا)، زیاتر لەمەی كە هەیە، نەكەونە ژێر پرسیارەوە.!

### لیسـتی (نـاو، لـه دایـك بوون،مووچـه)ی تـەواوی ئـەو مامۆسـتاو فەرمانبەرانەی كـه لـه ئێسـتادا، میلاكـن لـه سـەر( ئامادەیی پیشـەیی كـەلار) :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 1 | ابراهيم بكر محمود احمد | 30-11-1977 | 492000 | ماستەر |
| 2 | ابراهيم حسين احمد محمود | 01-01-1970 | 948000 | بەکالۆریۆس |
| 3 | احمد محمد قادر مصطفى | 01-01-1966 | 928000 | بەکالۆریۆس |
| 4 | اسو اسكندر علي حسين | 01-01-1974 | 344000 | بێ بڕوانامە |
| 5 | ايوب معروف عبدالرحمن خورشيد | 01-01-1972 | 729000 | دبلۆم |
| 6 | ئـسو بابان رحيم كاكل | 23-03-1974 | 478000 | دبلۆم |
| 7 | برزان غيدان محمد خان سعيد | 16-11-1963 | 1088000 | ئامادەیی پیشەیی |
| 8 | بكر ناصر شكر الياس | 18-08-1981 | 492000 | دبلۆم |
| 9 | بهار سرتيب محمدامين كريم | 02-01-1976 | 478000 | ئامادەیی پیشەیی |
| 10 | توران ولي عبدالرحمن مامه خان | 12-03-1962 | 1028000 | دبلۆم |
| 11 | جنان محمود محمد علي | 20-02-1971 | 741000 | بەکالۆریۆس |
| 12 | حيدر حميد رشيد نادر | 01-06-1973 | 729000 | دبلۆم |
| 13 | خالد عادل عبدالقادر احمد | 15-02-1975 | 579000 | ماستەر |
| 14 | ديمن محمد فرج عباس | 01-07-1971 | 398000 | دەرچووی ناوەندی |
| 15 | ديار مدحت مبارك شاسوار | 13-11-1967 | 693000 | دبلۆم |
| 16 | رحيم عبدالرحمان رمضان امين | 27-02-1962 | 492000 | بێ بڕوانامە |
| 17 | زارا وهاب حسين عبدالله | 02-01-1981 | 416000 | بەکالۆریۆس |
| 18 | زياد فرياد عبدالله غيدان | 19-07-1981 | 492000 | بەکالۆریۆس |
| 19 | سامان انور باور عظم | 30-04-1978 | 509000 | بەکالۆریۆس |
| 20 | سعد احمد حميد صمد | 16-09-1969 | 471000 | دبلۆم |
| 21 | ستم مولود مجيد محمد | 01-01-1972 | 485000 | بەکالۆریۆس |
| 22 | شاخەوان سرتيب عزيز عبدالرحمن | 30-07-1975 | 717000 | دبلۆم |
| 23 | شيرين قليج فتاح كريم | 22-03-1969 | 860000 | بەکالۆریۆس |
| 24 | صباح علي رشيد علي | 31-10-1961 | 471000 | دبلۆم |
| 25 | عامر نادر نجف رضا | 01-07-1969 | 894000 | بەکالۆریۆس |

هـەر مامۆسـتاو كەسـێك لێـرەدا نـاوی نەهاتـووە، بـە پێویسـت و ڕەوای دەزانێ،كـە نـاوی هاتبـا، زۆر داوای لێبوردنـی لێدەكـەم، بـە گەورەییتـان بمانبەخشـن، خۆدەزانـم كەسـانێك هـەن بەرچـاو خزمـەت و لـە ئەركـی خۆیـان زیاتریـان كـردوە، مـن ناتوانم،خـوداو كۆمەڵگـە پاداشـتتان بدەنەوە.كاریـش بـێ كەموكـوڕی نابێـت...



# یادی کەلار و چەند سەرە قەڵەمێك

مەلا تەحسین گەرمیانی/ ئەڵمانیا

ئـەوەی مایـەی خۆشـحاڵییە سـاڵانە کۆمەڵێـک لـە برادەرانـی ئازیـز و ئیـدارەی شـار یـادی بـە قـەزا بوونـی کـەلار دەکەنـەوە، کـە ئەمـەش بـۆ ئێسـتا و داهاتـوو گرنگـی خـۆی هەیـە و دەبێـت، یـاد و یـادەوەری زیندویەتـی و راگرتنـی مێـژووە بـە سـوودی ئێسـتا و نەوەکانـی داهاتـووی گەرمیـان و کـەلار بـە تایبەتـی.

بـە هیـوام لـەم یـادەی ئـەم سـاڵدا منیـش لـە غوربەتـەوە بتوانـم بـە چەنـد سـەرە قەڵەمێـک ئاورێـک لـە مێـژووی نزیکـی شـاری کـەلار بدەمـەوە و هەندێـک فاکتـەری جیـا جیـای گەشـەکردنی شـاری کـەلار ئامـاژە پـێ بکـەم.

لێـرەدا هـەوڵ دەدەم بەچەنـد خاڵێکـی پۆلێنکـراو ئـەوەی لـە ئێسـتادا لـە توانامـدا بێـت بیانخەمـەڕوو.

## لایەنی جوگرافی

-هەندێ پرسیار بۆچی شاری کەلار بە زووی گەشەیەکی خێرا و گەورەی بەخۆوە بینی!

یان هۆکار چی بوو کەلار لە گوندێکەوە بوو بەم شارەی کە سەنترالی گەرمیان بێت!

ڕوون و ئاشکرایە بۆ گەشەی هەر شوێنێک جوگرافیا ڕۆڵی خۆی هەیە تا ئەو شوێنە گۆڕانی ئەرێنی بەخۆوە ببینێت، شاری کەلار لە ڕووی جوگرافییەوە شیاوی ئەوەی هەبوو تا گەشەی بەرچاو بکات، لەوانە هەڵکەوتەی شوێن کە دەکەوێتە سەر ڕووباری سیروان و دامێنی قەڵای شێروانەوە. ئاوی ڕووباری سیروان ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە بۆ ئەوەی خەڵکێکی زۆر بۆ کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری لە دەور و بەری خۆی کۆ بکاتەوە. قەڵای شێروانە وەک شوێنێکی گرنگ و مێژوویی کاریگەری ڕۆڵی خۆی هەبووە لەوەی خەڵک پەیوەستبن بەم شوێنەوە، لە ڕووی کەش و هەواشەوە بۆ کشتوکاڵ لەبار بووە. ئەمە وەک شوێن لە ڕووی هەڵکەوتەی جوگرافیشەوە دەتوانین بڵێین کەلار گرنگی گرێدانەوەی شارەکانی هەرێمی کوردستان و عێراقیشە.

کە دەکەوێتە نێوان شارەکانی سلێمانی و کەرکوک و دیالەوە بە زۆربەی قەزا و ناحیەکانی ئەم سێ پارێزگایەوە بە تایبەت.

## لە ڕووی سیاسییەوە

بڕیاری بە قەزا بوونی کەلار بۆ ئەوەی لە ئیدارەی پارێگای کەرکوک دابڕێت بڕیاری بە قەزا بوونی شاری کەلار دەدرێت ئەمە هۆکارێکی بنەڕەتی گەشەی شاری کەلارە کاتێک لە گوندەوە دەبێت بە ناحیە و لە ناحیەشەوە دەبێت بە قەزا ئیتر خاڵی وەرچەرخانی گەشەی شاری کەلار دەستپێدەکات وەک پێشتر ئاماژەم پێدا کەلار وەک شوێن و هەم وەک هەڵکەوتەی جوگرافیاکەی گرنگ بوون.

بەڵام بڕیاری بە قەزا بوونی دەتوانم بڵێم فاکتەری سەرەکی بوو، کە دواتر دێمە سەر هەندێک هۆکاری تری سیاسی. بۆیە فراوان بوونی ئاساتی دەسەڵاتی ئیداری بێگومان دەبێتە هۆکاری گەشەی شار بە گشتی. یەکێکی تر لە هۆکارەکانی گەشەی دانیشتوان و بەرفراوان بوون و زیادکردنی ڕێژەی نیشتەجێبوون لە شاری کەلار سیاسەتی سێ کوچکەی (بە عەرەب کردن و ڕاگواستن و بە بەعسی کردن) بوو کە لە لایەن ئەو کاتی دەسەڵاتی شۆڤێنی حزبی بەعسەوە بەرامبەر خەڵکی کوردستان ئەنجامی دەدا. نەمونەی بەرچاو ڕوخاندنی گوندەکانی سەر سنوری ئێران لە خانەقینەوە تا سنوری مەیدان و سەرتەکی بەمۆ کە هەندێکیان لە پاش ڕوخاندنی گوندەکانیان ڕەوانەی ناوچەکانی خوارووی عێراق کران و هەندێکیشیان لە نێو شاری کەلار نیشتەجێ بوون.

هەر لە درێژەی زوڵم و ستەمکاری بەعس لە شاری خانەقین و سەعدییە و گوڵاڵە سەدان ماڵ و خێزان دەربەدەر کران و لە شاری کەلار گیرسانەوە. قۆناغێکی تری سیاسەتی ڕوخاندن و دەرکردنی کوردی ناوچەکانی زەنگاباو و ناحییەی کۆکز و قەرەتەپە و جەبارە بوو کە لە خەڵکی دانیشتوانی ئەم شوێنانە ئۆردوگای سمود ناحییەی (ڕزگاری) ئێستای لێ دروست کرد، بەمەش شاری کەلار جوڵەی هەمەچەشنی تێ کەوت.

## پرۆسەی ئەنفال

شاڵاوی ئەنفالی سێ کە بۆ سەر تەواوی گەرمیان بوو تەواوی گوندەکان خاپوور کران و دەسەڵاتی حزبی بەعس گەورەترین تاوانی ئەنجامدا و دەیان هەزار کەس بێسەر و شوێن کران و لە گۆڕی بەکۆمەڵدا شەهید کران، لەم پرۆسە شوومەدا ئەوەی ڕزگاری بوو لە ئۆردوگای سمود و شاری کەلار نیشتەجێ بوون.

دەكرێ بڵێین سیاسەتی دڕندانەی دەسەڵاتی بەعس و بەرتەسك كردنەوەی ناوچە جیاجیاكانی گەرمیان و گەرمەسێر و نیشتەجێ بونیان لە كەلار و ڕزگاری بووەی هۆی بەرفراوان بوون و زیاد بوونی ڕێژەی دانیشتوانی شاری كەلار. لە ڕووی ئیداریشەوە ڕزگاری خرایە سەر ئیدارەی قەزای كەلار و مامەڵەی هاوڵاتیان و جوڵەی ئیش و كار و كاسبی و بازاڕ و بواری تەندروستی و پێویستییەكانی خەڵك بە گشتی...هتد.

ئەم ئاماژە كورتانەی سەرەوە بەلای منەوە فاكتەری بنەڕەتین كە بووە هۆی گەشە و گەورەیی وە بە سەنتراڵ بوونی كەلار ل ناوچەكەدا.

بێگومان دەكرێت فاكتەری تریش هەبن.

واتا دەكرێت بڵێین شاری كەلار و لە ئێستادا بووەتە ئەو شارەی كە هەموو خەڵكی ئەو ناوچانەی لە خۆ گرتووە كە كاتی خۆی بە زۆری زۆرداری ماڵ و حاڵیان لە لایەن بەعسەوە ڕوخێندراون. هەر شارێكیش چەندین خەڵكی جیا جیا و ژیانی كۆمەڵایەتی هەمەجۆری لە خۆ گرت بێگومان لە ڕووەكانی تریشەوە گەشەی تری جۆراو جۆر بە خۆوە دەبینێت كە دواتر هەوڵ دەدەم ئاماژەیان پێ بكەم.

## – كەلار چەقی سەنتراڵ :-

ناوەندێتیی شاری كەلار ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە ڕووی كاری بازرگانی و كارو كاسبییەوە گرنگی زیاتری پەیدا دەكرد تا دەهات قەبارەی بازرگانی و ئیشوكار زیاتر گەشەی بە خۆوە دەبینی وەك شارێكی گەورەی ناوچەكە، ئەم سەنتراڵ بوونەی گەشەیەكی خێرای دا بە شاری كەلار. بۆ نمونە كردنەوەی دەیان گارگەی چەوو لم و گارگەی بلۆك لە شاری كەلارو دەوروبەری كە وەك هەلی كار هەزاران كەسی لە دەوری خۆی كۆكردەوە بە تایبەت ڕێژەیەكی زۆر لە

سەیارەی گڵابەو شۆفڵ و ئالیاتی تر کە ماوەیەک شاری کەلارو دەوروبەری بە شاری گڵابە ناسراو بوو کە زۆرترین گڵابەی لێبوو. کە ئەمەش سود وەرگرتن بوو لە هەڵکەوتەی چەمی سیروان. لە لایەکی ترەوە گەشەی کشتوکاڵ و زەراعەت و سەوزەی کەلارو گردەگۆزینە کە بە هەزاران کەس چی وەک جوتیارو چی وەک دوکاندارو بە قاڵ کاریان بۆ دەستە بەر بوو بوو.

خاڵێکی تری گرنگ بازرگانی نێوان کەلارو شارەکان بە گشتی ئەم خاڵی بە گرێدانەوەیە بە یەکترەوە هێندەی تر گەیاندە لوتکە وەک شارێکی سەنترالی ناوچەکە بە گشتی.

## هێڵی گەرمی سەر سنور :

بە کردنەوەی هێڵی بازرگانی وەک دەروازەی پەروێزخان وسەرتەک و پشتە دەکرێ بە قۆناخێکی گەورەو زێرینە لە گەشەی شاری کەلارو بوژانەوەی ژیانی بازرگانی و گەشەی ژیانی خەڵک و شارو دەورو بەری. سروشتی ژیان وایە گەشەی ئابوری و بازرگانی و هەلی کار لە کوێ دەستە بەر بێ بە شەکانی تری گەشەی شار بە دوای خۆیدا پەلکێش دەکات.دەتوانم بڵێم لە کوردستاندا شاری کەلار یەکێکە لەو شارانەی گەشەی قەبارەی بازرگانی و ئابوری و هەلی کار بوونە هۆکار گەلێک لە هەموو روویەکەوە گەشە بکات وەک شارێکی گەشە کردووی ناوچەکە. تا ئێرە ئاماژەمان بە هۆکارگەلێکی شوێن و جوگرافیاو فاکتەری سیاسی ئیداری و ئابوری کرد. لێرە بە دوا دەکرێ باس و خواسی بوارەکانی ترو گەشەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کەلتوری و هونەری و.... هید بکەین.

## * کردنەوەی هەردوو پەیمانگای تەکنیکی و مامۆستایانی کەلار:

* من بۆ خۆم بەکردنەوەی ئەم دوو پەیمانگایە لە دوای راپەڕین لە شاری کەلار وای دەبینم سەرەتایەکی باش و گرنگ بوو بۆ ئەوکاتی شاری کەلار، کە توانی لە بواری زانست و پێگەیاندندا رۆڵێکی گەورەو گرنگ ببینێ کە هەزاران کەس لەو دوو پەیمانگایەدا بە پێی قۆناغەکان بڕوانامەیان بە دەست هێنا کە وەک دوو ناوەندی ناوچەکە تەکانێکی بە ئاستی زانستی و رۆشنبیریدا. کە بۆ شاری کەلار و ناوچەکە بە گشتی گرنگ بوو، وەدەستپێکی ژیانێکی نوێش بوو بۆ ئەو سەردەمە.

پەیمانگای مامۆستایان لە ساڵی ١٩٩٥ کرایەوە و لە مانگی حەوتی هەمان ساڵیشدا مانگی پەیمانگای کشتووکاڵی کەلاریش کرایەوە کە دواتر لە مانگی ١٢ هەمان ساڵدا فراوان بوویەوە بوو بە پەیمانگای تەکنیکی کەلار.

لە رووی پەروەردەو زانستەوە پێموایە زەنگی گەشەی پڕ بایەخی شاری کەلاری خێراتر کرد، ئەگەر چی ئەمڕۆ هەواڵم بیست لە ٢٠٢٢ بۆ یەکجارەکی پەیمانگای مامۆستایان داخرا. چونکە لە شوێنی ئەوە بەدیلی تر هاتۆتە گۆڕێ کە زانکۆی گەرمیانە. بەرهەمی ئەم دوو پەیمانگایە بهێنینەوە یاد دەکرێ بڵێین بە قۆناغێکی گەورەی بزانیین کە ئێستا سەدان مامۆستا خاوەن بڕوانامەی بەرزن و جێگە دەستیان دیارە لە بواری پەروەردەو زانست و مەعریفەو رۆشنبیریدا، بەدەر لەم دوو پەیمانگایە سەدان کەس لە پەیمانگاو زانکۆکانی عێراق و کوردستان ئازایانە سەرەڕای تەنگوچەڵەمەی بەردەمیان توانیان بڕوانامە بە دەست بێنن و داهاتووی شاریان پێ روناک کردەوە. چونکە سەردەمی دوای راپەڕین سەردەمێکی پڕ لە قات و قڕی و گرانی بوو ژیان لە سەختی نان پەیدا کردن ئاسان نەبوو، لەو بارودۆخەدا هەزاران کەس کۆڵیان نەداو بوونە خاوەنی بڕوا دواتر شانیان داوە بەر پەروەردەو فێرکردن و خوێندن کە هەر یەک لەوانە خاوەنی چەندین چیرۆکی جیاجیای ئەو ژیانە

سەختەن کە خوێندنیان بە ئاکام گەیاند هەرچەند دەسەڵاتی کوردی مامۆستاو خاوەن بڕوانامە برسی دەکات و ئەگەریش قسان بکەن ئەوە تێهەڵدان دەکرێن !

گەشەی شاری کەلار بە چەندین قۆناغ و دژواریدا گوزەری کردووە کۆمەڵێ جوڵەو هەوڵ و کۆششی کەسێتی و گروپ و ئیدارەو دامودەزگاو حزب و ڕێکخراوەکان بە گشتی پڕاو پڕ بوون لە هەوڵ و تێکۆشان.

## * بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانەی کەلار

کەلتوری کتێب خوێندنەوە لە هەموو دونیادا ڕۆڵ و کاریگەری باش دروست دەکات لە سەر تاک کۆمەڵگە بە گشتی. دەکرێ بڵێین کتێبخانەی گشتی کەلار ڕۆڵ و کاریگەری باشی هەبوو لە کتێب خستنە بەر دەست و هەم لە ڕووی دەیان چالاکی کۆڕو کۆبوونەوەی ڕۆشنبیران و خوێنەرانی کتێب، من سەردەمێک باسدەکەم کە خۆم کارەکتەری ئەو قۆناغە سەرەتایانەی نێو ڕاستی نەوەدەکان. سەربوردەی کردنەوەی کتێبخانەی کەلار ئەوا بە جێی دێڵم بۆ کاک شێخ سەعید شاکەلی. کارو چالاکی و ڕوو کردنە کتێب و یەکتر بینین و کۆمەڵێ باسوخواسی ڕۆشنبیری کە زیاتر خەڵک ڕووی تێبکات کتێب خانەی کەلار چەترێکی باش بوو بۆ کۆڕو کۆبوونەوە لە پاڵ بەشەکانی تر لە گەشەی ڕۆشنبیری شاری کەلاردا.

## * کردنەوەی بەڕێوە بەرایەتی پەروەدەی گەرمیان

بە کردنەوەی ئەم بەڕێوەبەرایەتیە دیسانەوە بۆ ئەو کاتە تەکان و گروتینێکی تریدا بە گەشەی پەروەردەو فێرکردن کە بۆ ئەو کاتی کەلار هەنگاوێکی گرنگ بوو کردنەوەی دەرگایەکی تر بوو بۆ گەشەی پەروەردەو فێر بوون هەروەها زاڵبوون بە سەر کۆسپ و تەنگ و چەڵمەکاندا. چونکە بەر لەوە شاری کەلارو دەوروبەری

دەیـان کێشـەو گرفتـی جـۆراو جـۆری هەبـوو، بـە کردنـەوەی ئـەم بەڕێوەبەرایەتییـە هەنـگاوەکان ئاسـتی باشـیان تێپەڕانـد و سـاڵانەش لـە باخچـەی منداڵانـەوە تـا دواناوندییـەکان خاوەنـی دەیـان چالاکـی جـۆراو جـۆر بـوون.

لـە گـەڵ گەشـەو زیاد بووبـی گەڕەکەکانـی شـاری کـەلارو رزگاری و تـەواوی ناحیـەو گوندەکانـی دەیـان ناوەنـدو قوتابخانـە زیادیـان کـرد کـە پـەروەردە رۆڵێکـی گرنـگ دەگیـڕێ لـە گەشـەی ژیـان و ژیـاری شـاردا.

خۆشـبەختابە لـەو گەشـەو بـەرەو پێشـەوە چوونـەدا، ئێسـتا سـەدان کـەس بە پلـەو ناونیشـانی زانسـتی و پـەروەردەو لـە بوارەکانـی تـردا شـوێنی دەسـتیان دیـارە و لـەو کاروانـەدا بەردەوامـن.

سروشـتی ژیـان وایـە لـە هـەر شـوێنێ بـواری ئابـوری و بازرگانـی هەلـی کار دەسـتە بـەر بـوو هاوشـان بـواری پـەروەردەو فێربوونیـش گەشـە دەکات ئەگـەر چـی سـاڵانی نـەوەدەکان ژیـان زۆر سـەخت بـوو. بـەڵام شـەپۆلی پەرەسـەندن و گەشـە کردنـی پـەروەردە بەرفراوانـتر بوونـی بـە خـۆوە دەبینـی لـە گـەڵ گەشـەی نیشـتە جـێ بـوون لـە شـاری کـەلار.

ئومێـدو خۆزگـەکان تـا دەهـات جێـی بە ناخۆشـی و کۆسـپەکان لـەق دەکـرد کـەلار بـووە چەقـی گەشـەی ناوچەکـە سـەرەڕای تێبینـی رەخنـەو کەموکورتیـەکان کـە هەبـوون هەڵوێسـت وەرگرتنیـش لـە بەرانبـەر کەموکورتیـەکان هـەر بەشـێکە لـە گەشـەو هۆشـیاری خەڵـک.

## بواری کلتوری :

لـە نێـو راسـتی سـاڵی نەوەدەکانـەوە جوڵانـەوەی جـۆش و خرۆشـی بـاش دروسـت بـوو لـە شـاری کـەلار، کۆمەڵـەو رێکخـراوەکان حزبـەکان کتێبخانـەی گشـتی کـەلار تیپـە شـانۆیەکان کاروچالاکـی هونـەری کـۆڕو کۆبوونـەوەی جـۆراو جـۆر، لـە هۆڵـی هونەرمەندانـی کۆنـی کـەلار جەدەلـی سیاسـی و فکـری و نیقاشـی جـۆراو جـۆر

بیرو باوەڕو فیکریەکان هۆڵی پڕ لە ئامادە بوو رەخنەو تەوژمی روحی کوردانە ئومێدی بەرووەو پێشکەوتن، بانگێشتی نوسەران و ئەدیبانی ناوداری شارەکانی تر کوردستان، ئەنجامدانی دەیەها کۆنفرانس و فیستڤاڵ، یادەکانی راپەڕین و هەشتی مارس و رۆژی جیهانی ئافرەتان و نەورۆزو یادی هەڵەبجەو ئەنفال و کۆڕەو رۆژی رۆژنامەگەری کوردی و رۆژی جیهانی کتێب و دەیان بۆنەو یادی تر لە نێو شاری کەلار رۆژانەو هەفتانە و مانگانە بەردەوامی هەبوو بە جۆرەها چالاکی سەرەڕای پێشەنگای هونەری هونەرمەندان.

## * سێ کۆشکی پلێت :

هەر لەو سەروبەندەدا دەکرێ ئەم سێ کۆشکە لە پلێت دروستکراو بە یاد بهێنینەوە کە زۆربەی رۆژنامەو گۆڤارەکان و هەندێ کتێب لەو سێ کۆشکەوە دەست دەکەوتن. یەکەم دانەیان لە فلکەی نێو شار بوو کە بەداخەوە ناویم لە یاد نیە خاوەنی کاک جەلال عەبدوڵا بوو کاک حەکیمی لە سەر بوو، دووەمیان لە سەر کۆڵانی نێو مەزادخانە کۆنەکەی نێو بازاڕ بوو روکنی ئێستای بازاڕی هاوچەرخ کە خاوەنی مامۆستا جبار هەمەوەنی بوو، ئەوەی سێیەمیان ئەم سەری بازاڕ بوو روکنی لای بەفر فرۆشەکان لاچەپی تەنیشت بازاڕی زانکۆی ئێستا کە ناوی کوردستانی نوێ بوو دواتر بوو بە مەم و زین کاک رەحمان خانی و کاک رزگار حاجی حەمید خاوەنی بوون. ئەم سێ کتێبخانەیە لە پلێت دروستکرا بوون سێ سەرچاوەی باشی ئەو سەردەمە بوون کە تا ئەندازەیەکی باد تینوێتی رێبوارانی رێگای خوێندنەوەیان دەشکاند سێ کەناڵی باشبوون لە سێ جێگەی شاردا خزمەتیان دەکرد بە ئەو کاتی بزوتنەوەی رۆشنبیری و رۆژنامەوانی و.... هتد کە قۆناغێک بوون لە سەرەتای دوای راپەڕین لە گەشەی شاری کەلار، وەبوونە بنەمایەک بۆ ئایندەیەکی گەشەیەکی تر.

## کتێبخانەکان :

کتێبخانـەی بێـدار کـە خاوەنـی مامۆسـتا رزگار فائـق لـە سـاڵی ٢٠٠٢ بـە رووی خوێنەرانـدا کرایـەوە، بـە کردنـەوەی ئـەم کتێبخانەیـە و هێنانـی جۆرەها کتێـب و گۆڤـارو رۆژنامـە پردێکـی باشـی دروسـتکرد لـە نێـوان بەرهەمـی شـارەکانی تـری کوردسـتان و کـەلار. هێنانـی زۆر کتێب و رووکردنـە ئـەو کتێبخانەیـە لە لایـەن خوێنەرانـەوە کاریگـەری باشـی هەبـوو تـا رۆشـنبیران رووی لێبکـەن و کتێـب بـە دەست بخـەن و گروتینێـک بـوو لـە گەشـەو خواسـتی کتێـب. دواتـر کتێبخانـەی شـێروانە لـە سـاڵی ٢٠٠٧ کرایـەوە خاوەنـی کاک دڵشـاد لـە شـوێنێکی گونجـاودا بـە هەمـان شـێوە دەیـان و سـەدان کتێبـی دانسـقەی خسـتە بـازاڕەوە خزمەتێکـی جـوان گـەورەی کـرد. دواتـر لـە سـاڵی ٢٠٢٠ بـە داخـەوە کتێبخانەکـەی گواسـتەوە بـۆ شـاری دەربەندیخـان و بـە نـاوی نثـار درێـژە بـە کارەکانـی خـۆی دەدات.

کتێبخانـەی خـاک خاوەنـی یەکەمـی کوڕێکـی گەنـج بـوو بـە نـاوی حەمـەی شـێخ وابزانـم لـە سـاڵی ٢٠١٢ یـان ٢٠١٣ کرایـەوە دواتـر لـە ٢٠١٤ کاک سـیامەند وەریگـرت و ئێسـتایش بەردەوامـە، ئـەم کتێبخانەیـە ئـەوکات دەکەوتـە پشـت کتێبخانـەی بێـدارەوە خەڵێکـی زۆر رووی تێدەکـرد بـە گشـتی ئـەم سـێ کتێبخانەیـە لـە ململانیـەی هێنانـی کتێـب و سـەرچاوەی گرنـگ و بـاش.

دوای بنیاتنانـی بـازاڕی زانکـۆ لـە سـاڵی ٢٠٠٨ کتێبخانـەی شـار کرایەوە، کـە تـا ئێسـتا بەردەوامـەو کاک مـەلا ئیدریـس خاوەنێتـی ئـەم کتێبخانەیـە وەک شـوێن و پێویسـت لـەم سـەری بـازاڕەوە بـە کۆمەڵێک سـەرچاوەو کتێـب کرایـەوە و زیاتریـش کتێبـی ئاینـی لـە خـۆ دەگـرت و تـا ئێسـتا بەردەوامـە.

دواتـر لـە شـوێنی ئیسـتای چایخانـەی میللـەت کتێبخانەیەکـی بەرفـراوان کرایـەوە بـە داخـەوە ناوەکەیـم لە یـاد نیـە، ئـەم کتێبخانەیەش بـە کۆمەڵـێ کتێبـی نایابـەوە کرایـەوە بـەڵام تەمەنـی کـورت بـوو کرایـە پـرۆژەی تـر.

## کۆمەڵەی روناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوک :

دروستبوونی کۆمەڵەی روناکبیری و کردنەوەی نوسینگەی گەرمیانی کۆمەڵە لە شاری کەلار دەرفەتێکی تر بە رووی ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و ئەدەبی و بوارەکانی تردا کردەوە، کۆمەڵەی روناکبیری لە ماوەیەکی کورتدا دەیان نوسەرو ئەدیبی لە دەوری خۆی کۆکردەوە دەستی بە کاروچالاکی کردو گرۆتینێکیدا بە جوڵانەوەی کلتوری و کۆمەڵایەتی، وە بۆ یەکەم جار بوو کچێک ببێ بە رپرسی نوسینگەی ناوەندێکی روناکبیری ئەوەیش ژیان حەمە سەعید بوو، لەوکاتە کۆمەڵە کتێبخانەکەی گەشەی بە خۆوە بینی خوێنەر رووی تێدەکرد رۆژانە خاڵک هاتوو چۆوی دەکرد دواتر کۆمەڵە بە ئامادە بوونی نەوەت کەس لە کتێبخانەی گشتی کۆنفراسێکی تری کرد ستافێکی تر متمانەیان وەرگرت و دوای ئەوەش بەندە بوومە بەرپرسی نوسینگەی کۆمەڵە و لە گەڵ ئەندامانی ستاف و کۆمەڵە ئێمەیش قۆناغێکی باشمان بە رێکرد زۆر کاروچالاکی کرا بۆ نمونە بۆ یەکەم جار بوو شەوچرەو گۆرانی و گونجیو خورمامان هێنایەوە کایە، یان بۆ یەکەم جار بوو کۆمەڵە توانی باشترین ئاهەنگی خێزانی سەری ساڵ بە شێوازێکی مۆدێرن سازبکات لە هۆڵی پەیمانگای تەکنیکی کەلار بە ئامادە بوونی سەرۆکی گشتی کۆمەڵە کاک شێخ محمد شاکەلی کە هەمیشە هاوکارو پشتیوانمان بوو لە هەر کارێک کە بۆ ناوچەکە بکرابایە. کۆمەڵە خاوەنی دەیان کارو چالاکی کۆرو کۆبوونەوەو کۆنفراسی کردووە ، من بە کورتی راگوزەر دەکەم بە سەر باسەکەمدا ئەگینا کارو چالاکی کۆمەڵەو رێکخراوەکان بە گشتی رەنگە کتێبێکی تایبەتی پێویست بێت.

## بنکەی گەلاوێژ :

یەکێکی تر کە ئەو سەردەمە گرۆتینێکی تریدا بە جوڵانەوەی ئەدەبی و رۆشنبیری و رۆژنامەوانی بنکەی ئەدەبی گەلاوێژ بوو لە شاری کەلار کە وابزانم پێش کۆمەڵەی روناکبیری لە کەلار دەستیان بە کارو چالاکی کرد، ئەم بنکەیە بارەگای هەبوو خاوەنی کتێبخانەیەکی باشبوو کتێبی باشیان دەهێنا کۆمەڵێ رۆژنامەو گۆڤار لەوێ دەبینرا رۆژنامەنوسان ئەدیب و شاعیرو نوسەران هاتوو چۆیان دەکرد رۆژانە دەردەشەی زۆر شت دەکرا گۆڤارو کتێب دەدرا بە خەڵک چی وەک دیاری یان وەک ئیستیعارە، بۆ یەکەم جار ئەم بنکەیە سەتەلایتی هێنا بۆ نێو بنکە ئەمەش دەرفەتێکی باشیدا تا سود بەوانە بگەیەنی و بە رووی دونیادا بکرێنەوە چونکە لە دوای نێوراستی نەوەدەکانەوە سەرەتای دەرکەوتنی سەتەلایت بوو خەڵک زۆر تامەزرۆی بوو لە شوێنێک دابنیشێ و تەماشای بکات. بنکە ی گەلاوێژ رۆڵێکی باشی هەبوو لە کۆڕو کۆنفراس و سمینارو چالاکیدا وەخاوەنی مێژووەیەکە لە گەشەی شاری کەلار.

## تیپە هونەرییەکان :

ئەم بوارە هێندە فراوانە دەکرێ هونەرمەندان زیاتر لە بارەیەوە بدوێن،کاروچالاکیەکانی هونەری شانۆ فیلم دەست رەنگینی هونەری تابلۆ پەیکەرتاشی و گۆرانی و کۆنسێرت مۆسیکارو کۆمەڵێ لە دەنگ خۆشان و... هتد هەموو ئەمانە مێژوویەکی جوانی رووی تواناو سەلیقەی هونەرمەندانن لە شاری کەلارو دەوروبەریدا. بە گشتی هونەرمەندان خاوەنی ئیرادەو وزەیەکی جوانن هەروەها تیپی شانۆی منداڵان کۆششی باشیان کرد تا منداڵ پەروەردەی نێو بواری شانۆو فلیم بکەن، هیواخوازم هاوریانی هونەرمەندان سەرجەم کاروچالاکیەکانیان کۆبکەنەوە و لە فەوتان رزگاری بکەن و دڵنیان هەموو کاروچالاکیەکانیان ئەستێرەیەکی گەشە بە ئاسمانی

مێژووی هونەری کوردی بە گشتی و گەرمیان و کەلار بە تایبەتی.

ئەوەی پێویستە من ئاماژەی پێ بکەم بۆ بیرهێنانەوە کە لە ساڵی ١٩٩٦ لە حزبی سۆسیالست تیپی هونەری و مۆزیک و شانۆمان سکاڵامان دامەزراند، بۆ ئەوکاتە کۆمەڵێک گەنجی خوێن گەرم هاتنە نێو تیپەکەوە زیاتر پرۆڤەی شانۆو مۆسیقایان دەکرد، هەرلەو ساڵە توانیان بە ١٢ تراک کۆنسێرتێک لە هۆڵی کۆنی هونەرمەندان پێشکەش بکەن و بۆ یەکەم جار بوو عازفی ساز بچێتە سەر مەنەسە و ڕۆڵ ببینێ کە خوشکی سەیادی عازفی ساز بوو، وە شەهید حەمید کاکەیی یەکێک بوو لە گۆرانی بێژەکان روحی شاد بێت لەم ڕۆژانە کە نزیک کۆتایی مانگی دووە یادی ڕۆژی شەهید بوونیەتی هەر بۆیە وەک وەفایەک بۆ ئەو گەنجە موسیکارو دەنگخۆشە ناچار بووم ئاماژە بەتیپی هونەری سکاڵا بکەم.

## سەنتەرو ڕێکخراوەکان :

سەنتەری ڕێکخراوی ئازادی لاوان و دواتریش سەنتەری چالاکی گەنجانی کەلارو پاشان لە گەڵ کۆمەڵەو ڕێکخراوەکانی تری حزبەکان یاخود ئەو ڕێکخراوانەی تر کە لە سێبەری حزبدا کرانەوە، هەموو ئەمانە دەستیان کرد بە چالاکی ڕێکخراوەیی و هونەری و کۆڕو کۆبوونەوەی پیشەیی و ئەدەبی بۆ گەنجانی شارەکە لە گەڵ دەیان و سەدان خولی فێربوونی کۆمپیوتەرو هۆشیاری یاسایی و زۆری تر. بە هەر هۆکارێک بوو بێ هەموو کارەکان بە ئاراستەی گەشەی شاری کەلار هەنگاوی دەنا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هیواو ئومێدی تاک زێدە تر دەبوو، ململانیەی ئەم کۆمەڵەو ڕێکخراوانە هۆکار بوون بۆ کێبڕکێی چالاکی جۆراو جۆر تا زیاتر توانای گەنجان بۆ خۆیان رابکێشن.

هەروەها دروست بوونی کۆمەڵەو ڕێکخراوە تایبەتەکانی بواری ئەنفال و جینۆساید لە سەر ئاستی گەرمیان و کوردستان، کەم تا زۆر ڕۆڵی خۆیان هەبوو بە ئێستایشەوە لە کارو چالاکیدا ئەگەر چی بێ کێشەوگرفت نیین.

* ڕێکخراوی گەنجانی بوێر : ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ٢٠١٣ دامەزراو هاوڕێ بەهادین سەرپەرشتی دەکرد، وەک ڕێکخراوێکی گەنجانی سەربەخۆ دەستیان بە کارو چالاکی کرد زۆر بەی چالاکیەکانیان بە هاوکاری ڕێکخراوە بیانیەکان ئەنجامدەدەن و شوێن دەستیان دیارەو تا ئێستایش بەردەوامن لە کاروچالاکی جۆراوجۆر.

## دیموکراسیخوازان :

دوای دروست بوونی بزوتنەوەی دیموکراسیخوازان بە ڕێبەرایەتی مامۆستا (بەهادین نوری) ڕوحی شاد بێت ئەم بزوتنەوەیە لە شاری کەلار لە نێو بازاڕ نوسینگەیەکیان کردەوە ئەمانیش گرنگیاندا بە کردنەوەی کتێبخانەیەک لە نێو شاردا و گروپێکی موسقاریشیان دامەزراندو کۆمەڵێ خەڵکی ڕۆشنبیرو گەنجیان لە دەوری خۆیان کۆکردەوە پەرەیان بە هەندێ کتێبخانەکەدا ئەگەر چی زۆر کەم ئیمکان بوون لە ڕووی ماددیەوە.

واتا لە شاری کەلار بە هۆکاری سیاسی و ڕێکخراوە حزبی نا حزبیەکانەوە پێویست وابوو چالاکی بکەیت ململانیە تا خەڵک بەلای خۆدا ڕابکێشی. بۆیە ڕۆژانە و هەفتانە و مانگانە چالاکی ڕۆشنبیری و جەماوەری دەکرا کە زۆربەی بانگێشت نامەکان لای من پارێزراون.

دواتر لە نێو شاری کەلار چەندین سەنتەری تەلەفونات و ئەنتەرنێت کرانەوە، لەم ڕێگایەوە خەڵک بە ڕووی دوونیای دەرەوەدا کرانەوە، کار ئاسانی لەم ڕێگەیەوە بۆ دونیای پەیوەندی کردن ناردنی بابەت و کاری ڕۆشنبیری و زۆر بواری تر هاتە ئاراوە دواتر سەتەلایت کەوتە نێو بازاڕەوە سەرەتا حزب و ڕێکخراوەکان و دواتر ماڵان ئەوەی هەیبوو توانیان بە دەستی بێنن بۆ کۆمپیوتەریش بە هەمان شێوە تیپەملیەکانی گۆرانی و مۆزیک هاتنە ئاراوە کامێرای کاسێتی گەورە و کامێرای فۆتۆگرافەر وەک تیم کاریان دەکرد شایی و زەماوەند تامو چێژی خۆی هەبوو، هەموو ئەمانە هۆکارکەلێک بوون بۆ گەشانەوەی خێرای شاری کەلار. بە هاتنی ئەم کەرەستانە و تەکنەلۆژیای نوێوە هەرەسی بە بەدالە کۆنەکەی شاری کەلار

هێنا کە یەکێک لە کارمەندە کانی ئەو کاتە رەحمەتی کاک فواد غە ریبی دەنگ خۆش بوو روحی شاد بێت.

## راگەیاندن و رۆژنامەگەری :

روونە لای هەموان راگەیاندن و رۆژنامەگەری رۆڵێکی گەورەی هەیە لە تەواوی جومگەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا و هەڵگری خاسیەت و پەیامێکی گرنگە بۆ هۆشیاری و گەیاندن و پێشکەوتن و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگە بە گشتی. راگەیاندن دەلاقەیەکە بۆ رۆڵ بینی تاک و کۆمەڵگە بە گشتی و دروستکردنی رایگشتی. هەتا بواری راگەیاندن ئازادو بەرفراوان نەبێ پەیامی رۆژنامەوانی بە باشی ناگات بۆیە دەسەڵات هەمیشە ترسە گەورەکەی لەم بوارەیە کە پێی دەڵێن: دەسەڵاتی چوارەم. هەتا پەیامی رۆژنامەگەری ئازاو ئازاد بێت دە هێندە گرنگ و کاریگەرە بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگە. بۆیە لە شاری کەلار لە ماوەیەکی کە م و خێرادا لە بواری راگەیاندن و رۆژنامەوانیدا لە سەر ئاستی شارو ناوچەییدا چەندین کەناڵی تیڤی و رادیۆیی کرانەوە ئەگەر چی حزبی بوون ئامانجی یەکەمیان گەیاندنی پەیامی سیاسییان بوو. بەڵام لە هەمانکاتدا هەر یەکەیان خاوەنی چەندین بەرنامەی جۆراو جۆر بوون و لەو رێگایەوە بۆ هۆشیاری لەو سەردەمە هەنگاوی باشبوون و بە هۆی ململانیە سیاسیەکانیشەوە بەرنامەو ئەدای جیاواز هەبوون. وەئەم کەناڵانە ژیانی لادێ و شاری پێکەوە گرێدا کە زۆربەی گوندەکان شەوان تەماشای ئەم تیڤیانەیان دەکرد یان کەسێک شوان لەو دەشتانە گوێی لە رادیۆکان دەگرت. چونکە ئەوکات راگەیاندنی ناوەندی کەمتر گرنگی بە دوورە دەستەکان دەدرا. بانگێشتکردنی سیاسی و رۆشنبیرو نوسەرو ئەدیب و شاعیر هونەرمەند لە لایەن ئەم کەناڵانەوە هەنگاوی باش بوو هەستی بوونی خودی فراوانتر دەکرد ئەمە وای دەکرد زیاتر بە دوای زانیاری و خوێندنەوەدا هەڵپە بکەیت و ئومیدی زیاتر دروست دەبوو بۆ داهاتوو. ئەو TV و راگەیاندنانە خەڵکی باشیان پێگەیاندو دواتر بوونە راگەیاندنکاری بە تواناو خاوەن سەلیقە و ئەزموون لە بوارەکانی پێژەری و

کامیرەمـان و ریپۆرتـەرو تەکنیـک و مۆنتێـرو... هتـد. دەکـرێ بڵێیـن لـە دوای راپەڕینـەوە بـە هەمـوو کەموکورتـی و کـەم ئەزمونێکانیشـەوە بـەو کەمـە داراییـەوە کـە هەیـان بـوو بـۆ ئەوکاتـی شـاری کـەلارو دەوبـەری تەوژمێکـی باشـیدا بە شـاری کـەلار. دەکـرێ و جێـی خۆیەتی ئامـاژە بـە هەنـدێ لـرو راگەیاندنانـە بکـەم، هیـوادارم هیـچ شـوێنێکم بیـر نەچـوو بێـت. لەوانـە ڕادیـۆی گەرمیـان کـە یەکـەم ڕادیـۆی دوای ڕاپەڕیـن بـوو دەسـتەیەك ڕۆشـنبیر و مامۆسـتای زانکـۆ لـە ڕیکـەوتی ١٩٩٣/٦/١ دایانمـەزراد. ئـەم ڕادیۆیـە دەنگـی مەڵبەنـدی یەکێتـی بـوو، زۆربـەی ڕێکخـراوە حکومـی و ناحکومییـەکان لێـرەوە پەیـام و بەرنامـەی خۆیـان هەبـوو، چونکـە بۆشـاییەکی فـراوان هەبـوون لـە بـواری میدیاییـدا ڕۆڵـی ئـەم ڕادیۆیـە لـە سـەر ئاسـتی ناوچەکـە دیار و پرشـنگدارە. ٢٠ سـاڵی تـەواو پەخـشی بەرنامـەکانی خـۆی کـرد. پاشـان رادیـۆو تیڤـی حزبـی شـوعی - رادیـۆو تیڤـی یەکێتـی -رادیـۆ و تیڤـی یەکگرتـووی ئیسـلامی - رادیـۆ و تیڤـی کۆمەڵـی ئیسـلامی - کەناڵـی تیڤـی سۆسیالسـت.

رادیـۆی تـەوار یـەک لـە رادیـۆ تایبـەت مەنـدەکان بـوو دەکـرێ بڵێیـن یەکـەم رادیـۆ بـوو لـە سـەر ئاسـتی عێـراق و کوردسـتان کـە تایبـەت بـوو بـە ژنـان ئەمـەش بـۆ شـاری کـەلار گرنـگ بـوو. لـەو سـەردەمە گرنگـی و کاریگـەری خـۆی هەبـوو خاوەنـی بەرنامـەی هەمـە جـۆر بـوون لـە هەمانکاتـدا دەنگێکـی جیـاوازی ژنـان بـوو لـە ناوچەکـە و ڕوویەکـی تـری گەشـەی شـاری کـەلار بـوو لـە بـواری راگەیاندنـدا کـە هاوشـان هـەر لـە کـەلار ڕۆژنامـەی تایبەتمەندیش بـە ژنـان هەبـوو لـە گـەڵ ڕۆژنامـەو گۆڤـاری تـری تایبـەت مەنـد بـە ورزش و زانسـت.

وەدواتریـش رادیـۆی دەنـگ وەک کەناڵێکـی سـەربە خـۆ دەسـتی بـە کارو بەرنامەکانـی خـۆی کـرد کـە تـا ئێسـتایش بەردەوامـە. بـۆ مێـژوو دەڵێـم شـاری کـەلار و گەشـەی خێرایەکانـی لـە بـواری راگەیاندنـدا بـە هەمـوو کـەم و کورتیەکانـەوە بازدانێکـی گـەورەی بـە خـۆوە بینـی لـە ئـان و سـاتی ئـەم گەشـە کردنـەدا زۆر ڕۆژنامەنـوس کەوتنـە بـەر پەلامـاری هێزەکانـی دەسـەڵات لـە سـوکایەتی پێکـردن، لێـدان، لـوت

شـكاندنی رۆژنامـه نـوس، پەلامـاردان و كامێـرا شـكاندن و هەڕشـە كـردن تـا بـە پەلاماردانـی رادیـۆی دەنـگ و سـوتاندنی ئـەم دەنگـە سەربەخۆیە دەگات گەنجـان بـە گشـتی . كـە رۆژنامـە نوسـی هاوڕێـم مامۆسـتا سـەباح عەلـی جـاف لـە بیبلۆگرافیایەكـدا زۆر بـە جوانـی هەمـووی خسـتۆتە روو كـە كـۆی گشـتی (٦٥) بڵاوكـراوەو رۆژنامـەو گۆڤـار لـە دوای راپەڕینـەوە تـا سـاڵی ٢٠١١ لەشـاری كـەلارو دەورو بـەری بـە شـێوازی جـۆراو جـۆر دەرچوونـە. ئـەوەی كـە دەسـت مامۆسـتا سـەباح نەكەوتـووەو پێـی نەزانیـوە بـڵاو كـراوەی زانسـتە كـە لـە دواناوەنـدی شـەهید ئـارام لـە سـاڵی ١٩٩٦ سـێ ژمـارەی لێدەرچـووە كـە ژمارەكانـی لای مـن پارێـز راون. ئـەم بـڵاو كراوەیـەش لـە سـەر لاپەڕەیەكـی A٤ بـە دەسـتوخەتە جوانەكـەی شـەهید ئومێـد نـوسراون، شـەهید ئومێـد ماوەیـەك لای مـن بـوو دواتـر چـوو بـۆ قەندیـل و لـەوێ شـەهید بـوو، واتـا لـە دوای راپەڕینـەوە (٦٦) بـڵاو كـراوەو گۆڤـارو رۆژنامـە دەرچوونـە .



## نوسینگەی گەرمیانی سەندیكای رۆژنامەنوسانی كوردستان :

لـە دوای پرۆسـەی ئـازادی عێـراق بـە گشـتی كوردسـتان چـووە قۆناغێكـی تـرەوە گەرمیان و كەلاریـش بەدەرنەبوون لـەو گۆڕانكاریەدا، وەك وتمـان شـاری كـەلار لـە رووی راگەیانـدن و رۆژنامەوانیـەوە هەنـگاوی گرنـگ و خێـرای بەخـۆوە بینـی. كۆمەڵێـك نوسـینگەی تـری كەنـاڵ و رۆژنامەكانـی تـری هەولێـرو سـلێمانی لە شـاری كـەلار كرانەوە یـان سـتافی پەیامنێریـان هەبـوو یـان رۆژنامـەكان هـەواڵ نێریـان هەبـوو بەمـەش گرۆتیبێكـی تریـدا بـە بوارەكە بـۆ نمونـە نوسـینگەی رۆژنامەی ئاسـۆ - نوسـینگەی رۆژنامەی هاوڵاتی - نوسـینگەی رۆژنامەی گۆڤاری بانـە رۆژ - نوسـینگەی كوردسـتانی نـوێ. كەناڵـە مەركەزیەكانـی وەك كوردسـات و سـپێدەو كۆمـەڵ و كوردسـتان و... هتـد نوسـینگەكانیان لـە شـاری كـەلار كـردەوە. ئەمانـە بوونـە گەیەنـەری جۆرەهـا دەنـگ و سـەدای جموجوڵەكانـی شـاری كـەلارو دەورو بـەری و كۆمەڵێـك كامیرەمـان و پەیامنێـر هاتنـە مەیدانەكـەوە، ئەمانـەو زۆری تـر بوونـە

هۆکاری پەلکێش کردنی سەندیکای رۆژنامە نوسانی کوردستان کە گرنگی بە گەرمیان و بزوتنەوە رۆژنامەوانیەکەی بدات. ئەگەر چی سەندیکا پێکهاتەیەکی حزبی بوو، بەڵام پاڵپشتیەکی کاریگەر بوو کاری رۆژنامە نوسی برەوی زیاتری پێدرا و سەندیکاش بە ئەرکی خۆیزانی گرنگی بە گەرمیان بدات و رێگە خۆشبکات بۆ کردنەوەی نوسینگەی گەرمیان، چونکە گەشەی رۆژنامەوانی و زۆر بوونی دەیان گۆڤارو رۆژنامە و کەناڵەکان بێ کێشەو گرفت نەبوون لە گەڵ دەسەلاتی ناوچەکە. داواکاری ئەندامێتی لە سەندیکا تا دەهات زیاتر دەبوو، بۆیە قۆناغی یەکەم کۆبوونەوەیەکی بەرفراوان کرا و زۆربەی رۆژنامەنوسان لەو کۆبوونەوەیە دا بەشدار بوون و لەو کۆبوونەوەیەدا بەندە وەک نوێنەر دەست نیشان کرام لە گەڵ چەند هاورێیەکی تر.رۆژنامەنوسانی گەرمیان پەیوەستکرا بە لقی کەرکوکی سەندیکادا و کارەکان و ئامادە سازی بۆ کۆنفراس و هەڵبژاردنی نوسینگە بکەین. بە وەرگرتنی ئەو مەلەفە بە هۆی پێکهاتەی حزبی سەندیکاوە کە زۆربەی کەناڵەکان سەر بە حزب بوون کارکردن ئاسان نە بوو بێ کێشەو گرفتیش نەبوو ! بەڵام بە ئیرادە و کاری دڵسۆزانە زاڵ دەبی بەسەر گرفتەکاندا بۆیە ئەو ئەرکەی پێم سپێردرا توانیم بەو پەری ئەمانەتەوە بە بێ لە یەکدانەوەی بیری حزبایەتی بە شانازیەوە گەیاندمە ئەنجام و سەرە رای رێگری کردنی کەسانێ لە ئاستی ئەنجومەنی باڵای سەندیکای رۆژنامەنوسان تا گەرمیان نەکرێ بە نوسیگەیەکی جیاوازو هەر بەو نیازەی هەر نوێنەرایەتیەک بێت بە لقی کەرکوکەوە ! پێداگری و هەوڵەکانی بۆ مێژوو دەیڵێم کاک فەرهاد عەونی و کاک حامد عەلی و کاریگەریەکانی بەندە لە نێو سەندیکاو ملنەدان بەو کەسانە کردنەوەی نوسینگەی گەرمیانی رۆژنامەنوسان بو بە ئەمری واقیع و دواتر لە کۆنفراسێکی تری چڕو پڕدا بە جۆش و خرۆشەوە ستافی نوسینگە هەڵبژێردران و بەندەیش وەک بەرپرسی نوسینگە. لێرەوە ئەرکمان بەرپرسیارێتیمان قورستر بوو داواکاری ئەندامێتی بە هۆکاری پاڵپشتی حزبەوە هێندە زۆرو بۆر بوو فریا نەدەکەوتین یان بە ناهەقە خەڵک وەک رۆژنامە نوس دەنێردراو

کەناڵێک پشتگیریەکی بۆ دەنوسی وەگرتنی ئەندامێتیش مەرجی یاسایی خۆی هەبوو، بۆیە یەکەم کاری قورسمان ئەوە بوو چۆن رووبەڕووی ئەم لێشاوە ببینەوە، بۆیە تا ئەندازەیەکی باش نەک هەر رووبەڕووی بووینەوە بەڵکو لێرەوە لەوێش خەڵک هەبوو بە ناوی رۆژنامەنوسیەوە پارەو رەشوەی وەردەگرت بە ناوی چاوۆێکەوتنەوە ئەوانەش مافی ئەندامێتیمان لێوەرگرتنەوە ! دەیان دۆسیەمان پشکنی ئەوەی بە فعلی رۆژنامە نوس نەبوو دوورمان خستنەوە و پشتمان بە راپۆرت و بابەت و کامیرەمان و بەڵگە بەست تا ئەندازەیەک سەندیکا بەورەو پێچوونی بە خۆوە بینی و بێ کەمو کورتیش نەبووین. بەڵام بۆ پشتیوانی ئیشوکارەکانی رۆژنامەنوسانی گەرمیان بە گشتی قەڵخان و پشتیوانێکی باشبووین لەو سەردەمە. سەندیکا رووبەڕووی هەر هەوڵێکی بەرتەسکردنەوەی کاری رۆژنامەنوسی دەبوویەوە هەر رۆژنامەنوسێک رووبەڕووی دادگا بکرابایەتەوە نوسینکە خاوەندارێتی لێدەکرد تەنانەت ئەگەر ئەوکەسە ئەندامی سەندیکایش نەبوایە هەمیشە روونکردنەوەو بەیانمان هەبوو. لە کاتی رووداوو خۆپیشاندانەکاندا چاودێر بووین تا بە کەمترین زیانی رۆژنامەنوسان کۆتایی پێ بێت کەم رۆژ لە سەر خەت نەبووینە لە گەڵ ئیدارەو دەسەڵات. بۆیە لە سەر ئەم باسە زیاتر دەدوێم بە گرنگی دەزانم ئەم قۆناغەی گەشەی شاری کەلار بە هەند وەربگیرێت وەک تێپەڕاندنی قۆناغێکی مێژووی کە چەند ئەرکاکان قورس بوون چەند هێندە گەشەی شار هەنگاوی دەنا ململانیەو رووبەڕووەکانیش هەوڵێک بوون بۆ کپکردنی دەنگی ئازاو ئازاد. سەندیکای رۆژنامەنوسان بووە قەڵغانێکی بە هێز بۆ پشتیوانیکردنی رۆژنامەنوسان، گرِوتینێکی تریدا بەبوارەکە دەیان کارو چالاکی و کۆڕو کۆبوونەوەی ئەنجامدا پێداگر بووین لە ئازادی وتن و نوسین و کاری رۆژنامەوانی، بەشداری کاروچالاکیەکانی شارەکانی تر دەبووین، لە کۆنفراسی دوا بڕیاری رەشنوسی یاسای رۆژنامەگەری رۆڵی باشمان هەبوو تاکە دەنگ بووین لە دژی دانانی ماددەی ئادابی گشتی لە یاسای کاری رۆژنامەنوسیدا کە تا ئێستا بەو ماددەیە رۆژانەمە نوسان راپێچی

زیندانـەکان دەکـرێ ! مانگانـە نوسـینگە راپۆرتـی پێشـێکاریەکانی دەگەیانـدە ئەنجومەنـی بـاڵا، نوسـینگە یاسـای کاری رۆژنامەنوسـی گەیانـدە دادگاو دادوەرەکان تـا کار بـەم یاسـایە بکرێت. زۆر هەوڵـی تـر سـەندیکا لـە گـەڵ گەشـەی شـاردا قۆناغـی زێرینـی خـۆی بـە رێکـرد. کـە بـە داخـەوە کار بـەوە گەیشـت رۆژنامەنـوس لـە ماڵەکـەی خۆیـدا بدرێتـە بـەر دەسـت رێـژی گولـە ! کـە جێـی داخـە وەڵامـی نوسـین بـە گولـە بدرێتـەوە! مـن هەمیشـە وتوومە رووی شارسـتانی و پێشـکەوتنی وڵات لـە چـاوی ئـازادی راگەیانـدن و رۆژنامەوانیـەوە تەماشا دەکـرێ رەئـی ئـازاو ئـازاد تـا چەنـد بەرقـەرارە ! کـە بـە داخـەوە ئـەو ئومێـدو هەنگاوانـە لـە سـاڵانی دواتـر لـە سەرانسـەری کوردسـتاندا رووی لـە پاشەکشـەکردن کـردو رەوتـی ژیـان و ژیـاری لـە پێشـکەوتنەوە بـۆ پاشەکشـەیەکی ئابڕووبەرانـە کـە دوورە لـە داخـوازی و مانـدوو بـوون و رەنجـی سـەدان سـاڵەی تێکۆشـانی خەڵکـی کوردسـتان بـە گشـتی. ئەگـەر چـی باسـەکەمان لـە سـەر شـاری کـەلارو گەشـەی شـارەکە بـوو، بـەڵام ناکـرێ خـۆت بـە دوور بگـرێ لـە سـەر هەنـدێ رووداو بـە ناچـاری پەلکێشـی نێـو رووداوەکانـت دەکات.

## دروستبوونی ئیدارەی گەرمیان

دوای ئـەو بـەرەو پێشـچوونانە لـە کـەلارو گەرمیـان بە گشـتی، ئەوەی زۆر پێویسـت بـوو دروسـتبوونی ئیـدارەی گەرمیـان بـوو کـە شـاری کـەلار سـەنتراڵی ئـەم ئیدارەیـە لـە خـۆ دەگـرێ، لـە گـەڵ بڕیـاری بـە ئیـدارە بوونـی گەرمیـان و تـەواوی یەکـە ئیـداری و بەڕێوەبەرێتییـەکان هاتنـە کـەلار لـە هەمـوو رووەیەکـەوە گۆڕانـکاری نەوعـی و ئیداریـەوە کـە هەمـوو ئـەم بەرێوەبەرایەتیانـە لـە شـاری کـەلار کرانـەوە، دەکـرێ بڵێیـن لـە هەمـوو ئاسـتەکانی پـەروەردە - کشـتوکاڵ - تەندروسـتی - رۆشـنبیری -.... هتـد. هەروەهـا گەشـەی زیاتـری ئابـوری و بازرگانـی لـە کـەلارو دەوروبـەری دەهێـدە زیاتـر بوویـەوە بـە تایبـەت دوای پرۆسـەی ئـازادی عێـراق شـارەکانی خانەقیـن جەلـەولا سـەعدیە و دیالـەو بـە گشـتی شـارەکانی تـری عێـراق زیاتـر کرانـەوە ئەمـە بـۆ شـاری کـەلار

گرنگ و کاریگەر بوو.

ئەوەی کە من دەمەوێ ئاماژەیەکی کورتی پێبدەم بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری گەرمیان و بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکانی گەرمیانە کە رۆڵێکی باشیان هەبوو لە ئەنجامدانی دەیان کاروچالاکی ئەدەبی و رۆشنبیری و هونەری.لایەنێکی تر ئاماژەی پێبکەم کردنەوەی پێشەنگای کتێب بوو کە بە شێوەی بەرفراوان و بە نرخی داشکاندن دەکرانەوە و چەندین چاپخانە لە سەرئاستی کوردستان بەشداریان دەکردو تەوژمی خوێنەر لەو ساڵانە دڵخۆشکەر بوون. وەلەو سەروبەندەدا کۆنفراس و فیستیڤاڵی بەرەوی پێدەدراو سەردەمی چڕو پڕی کارو چالاکی بوو. شاریش تا دەهات زیاتر بەرفراوانتر دەبوو گۆڕانێکی گەورە هاتە ئارا دەیان گەڕەکی نوێ دروست بوون چەندین قوتابخانەو داینگەو باخچەی ساوایان و دواناوەندی دروستکران تەوژمی پەروەردەو فێربوون بەرفروان بوونەوە. دەیان جادەی جووت سایت دروستکران کە ئێستا سیمایەکی جوانی نێو شارن کە دەیشکرا لەوە زیاتر بکرێت ! لە رووی بیناسازییەوە گۆڕانی بەرچاوی بەخۆوە بینی شوقەی بەرزو گەڕەکی مۆدێرن دروستکران پارکی نێو گەڕەکەکان و پارکی گەورەی نێو شار هەموو ئەمانە سیمای شارو جوانیان بەخشی بە ژیان و ژیاری شاری کەلار، ئەگەر چی هێشتا سیمای کۆنی نێو بازاڕ هێشتا هەر ماوە! بەڵام چەندین بازاڕی گەورەو جوان و مۆدێرن دروستکران و سیمای شاریان جوانتر کرد. بەرزە پردەکان و جوت سایدەکان و جادەی پشوێنەیی شارو هەموو ئەمانە گۆڕانکاری نوێ بوون، دروستکردنی گەڕەکی پیشەسازی و دورخستنەوەی لە نێو شار، دروستکردنی یاریگای نوێ و هۆڵی نوێ و چەندین ئوتێل و رێستورانت هەمووی بوونە هۆکاری بەرفراوانی و گەشەی شاری کەلار. بڕیاری بە ئیدارە بوونی گەرمیان کەلاری گۆڕی لە قەزایەکەوە بۆ پارێزگایەک ئەگەر چی بەفەرمی پارێزگا نیە، بەڵام دەتوانیین بڵێین لە هەموو روویەکەوە هیچی لە پارێزگا کەمتر نیە. لە هەموو روویەکەوە خاوەنی وزەو توانای بە هێزە ئەگەر بواری سیاسی رێگر نەبێ گەرمیان هەقی بە پارێزگا بوونی هەیە،

ئەمە چۆن کەی دەبێ ئەوە باسێکی ترە کە پەیوەستدارە بە دۆزی ڕەوای کوردەوە.

## زانکۆی گەرمیان

بەکردنەوەی زانکۆی گەرمیان لە ساڵی ٢٠١٠ جارێکی تر وەرچەرخانێکی تر لە بواری زانست روویدا، بەدەرلەوەی کە هەموومان قسەی ترمان هەیە لە سەر زانکۆکانی کوردستان و زانست و سیستەمەکەی ! ئەوەی لە واقیعی حاڵدا هەیە، کردنەوەی زانکۆی گەرمیان لە شاری کەلار بە هەموو مانایەک گرنگ و وەرچەرخان و بازدانێکی گەورە بوو لە گەشەکردنی شاری کەلار ئەگەر چی تەمەنی ئەم زانکۆیە زۆر نیە، بەڵام بۆ کەلارو گەرمیان گرنگ بوو. زانکۆ جگە لە ڕێڕەوی کارەکانی خۆی لە پاڵ ئەوەشدا دەستیان کردە چالاکیە جۆراو جۆرەکان کۆڕو سمینارو کۆنفراس و پێشەنگای کتێب و زۆری تر. بانگێشتی ئەدیبان و شاعیرانیان دەکردو نوسەرو ئەدیبانی دەرەوەی زانکۆیان بانگێشت دەکرد، زانکۆ بووە هیوایەک بۆ دوارۆژی ناوچەیەک کە جێی گرنگی پێدانی زیاترە تا لەو ڕێگایەوە گەرمیانیەکان بتوانن بگەن بە ئامانجە زانستیەکانیان یان بە پلەی باڵای زانستی و مەعریفی بە گشتی.

ئەوەی ماوەتەوە بیڵێم لە دوای حەوت ساڵ دابڕانم لە وڵات و شارە ئازیزەکەی کەلار ئەم چەند سەرەقەڵەم توانی بنوسم و ئەوەی لە یادم مابێ و یان لە چەند هاوڕیەکی ئازیز پرسیارم کردووە، چونکە دوورم لە ئەرشیفە تۆز لێنیشتووەکانم و بمبورن لە هەر کەموکورتیەک. بۆ ئەوەی توشی هەڵەی زەق و مێژووی نەبم هەوڵمداوە خۆم لە قەرەی ناوهێنان نەدەم مەگەر تاک و تەرا ناوی هاوڕیانم هێنابێ. دواوتەم بە هیوای ژیانێکی گەشتر بۆ گەرمیان و کەلار دەخوازم و بە هیوای کۆتایی هێنان و تێپەڕاندنی ئەم سەردەمە سەخت و نائومێدیەی رووی لە کوردستان کردووە.

## سـوپاس بـۆ هەریـەک لەمانـەی بـە نامـەو تەلەفـون بـە وشـەیەکیش بـووە هـاوکار بـوون.

- کتێبخای بێدار
- کتێبخانەی شێروانەی کۆن ئێستای نقار لە دەربەندیخان
- کتێبخانی شار
- کتێبخانەی خاک
- کاک رەحمان خانی
- مامۆستا سەباح عەلی جاف
- کامەران یاروەیس
- د - ئومێد بەرزان
- ساڵح هەلاج
- د- جلال سەعدوڵا
- مامۆستا شوان
- کاک مەجید ساڵح
- مامۆستا ئاسۆ وەهاب
- مامۆستا لاوان ئەحمەد



# تیپی شانۆی باوەنور
## مێژوویەکی لەبیرنەکراو
## شانازییەك بۆ هەمیشە

نامدار محەمەد عەلی

شارۆچکەی باوەنور یەکێکە لە ناحیە دێرینەکانی گەرمیان و مێژووی دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٧، دەتوانین بڵێین لە ئێستاو ڕابردووشدا شارۆچکەیەکی غەدرلێکراوبووە لەڕووی ئاوڕ نەدانەوەی جدی لە بواری گەنجانداو خزمەتی پێویست بەو توێژەیە نەکراوە، ئەمەش هۆکاربووە بۆئەوەی ئەم شارۆچکەیە تا ڕادەیەك وەك شارێکی کەنارگیر ببینرێت و کەمترین چالاکی هونەری و ڕۆشنبیری تێدا ئەنجام بدرێت، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش باوەنور لەهیچ کات و سەردەمێکدا گەنجی بەهرەمەندو بەتواناو بەسەلیقەی لێنەبڕاوەو لە هەر کوێیەکی شارۆچکەکەدا پەییان بە بۆشاییەك بردووە بە پێی توانای خۆیان هەوڵیانداوە بە هەرشێویەك بێت ئەو بۆشاییە پڕبکەنەوە بۆئەوەی بتوانن لە شاروشارۆچکەکانی دەوروبەریان دانەبڕێن بەتایبەت لە بواری ڕۆشنبیری و هونەریدا، هەر بۆیە بەشێك لەو گەنجانەی کە لەڕابدوودا جێ پەنجەیان بەسەر بواری ڕۆشنبیری هونەریی باوەنورەوە دیاربووە ئەمڕۆ بەشێکن لەمێژووی پڕبایەخی شارۆچکەکە.

ئـەوەی مەبەسـتمانە لـەم بابەتـەدا هەڵدانـەوەی مێـژووی لەبیرنەکراوی(تیپـی شـانۆی باوەنـور)ە کـە لەلایـەن چەنـد گەنجێکـی بەهرەمەنـدی ناوچەکـەوە لەبـەر پەرۆشـین بـۆ هونـەری شـانۆ لەسـەر بنەمـای خزمەتکردنیـان بـەو لایەنـە هونـەری شـانۆگەرییان لەباوەنـوردا بـە لوتکـە گەیانـد، کـە هەتـاوەك ئەمـرۆش هەندێـك لەدەقـە شـانۆییەکان و ڕۆڵ و نواندنـی هەندێـك لـە ئەکتـەرەکان لـە خەیـاڵ و بیـرەوەرەی بەشـێك لـە خەڵکـی ناوچەکـەدا ماوەتـەوە. بـۆ نووسـینەوەو تۆمارکردنـی زانیارییەکانـی ئـەم بابەتـە چاوپێکەوتنمان لەگـەڵ هەریـەك لە:بەڕێزان(علـی عزیـز محەمـەد) وەك دامەزرێنـەرو نووسـەرو دەرهێنـەری بەرهەمـە شـانۆییەکان تیـپ و(دڵشـاد محەمـەد قادر)یـش وەك یارمەتیـدەرو ئەکتـەری دیـاری تیـپ ئەنجامـداوە، پێـش ئـەوی بچینەسـەر پرسـیارەکان بـە پێویسـتمان زانـی بەڕێز(علـی عزیـز) وەك دامەزرێنـەری تیپـی شـانۆی باوەنـور بـە خوێنـەری ئـەم بابەتـە بناسـێنین:

علـی عزیـز لەساڵی (١٩٦٩) لـە ناحیـەی صویـرەی سـەر بـە پارێـزگای واسـط لەدایـك بـووە هـەر لەوێـش خوێندنـی سـەرتایی و ناوەنـدی تـەواو کـردووە، پاشـان چووەتـە کۆلێـژی سـەربازی و ئێسـتا بـە پلـەی مقـدم ئەفسـەرە لـە وەزارەتـی پێشـمەرگە، ناوبـراو پێـش ئـەوەی دەست وەربداتـە کاری شـانۆی یەکێـك بـووە لەڕۆشـنبیرو نووسـەرە دیارەکانـی شـارۆچکەی باوەنـورو گەرمیـان، لـە سـەرتای سـاڵانی هەشـتاکاندا چەندیـن بەرهەمـی ئەدەبـی وەك( ووتـارو چیـرۆك و پەخشـان و شـعیری) ی لـە ڕۆژنامـەو گۆڤـارە جیـا جیاکانـی ئـەو سـەردەمەدا بەزمانـی کـوردی و عەرەبـی بـڵاو کردووەتـەوە، بەشـێکی زۆری نووسـینەکانی تایبـەت بوونـە بـە بەگـژدا چوونـەوەی داب و نەریتـە سـواوەکانی ئـەو سـەردەمەی کۆمەڵگـە، دواتـر لـە کۆتایـی سـاڵی هەشـتاکاندا لەبـەر توانـاو حـەزی زۆری بـۆ هونـەری شـانۆ کاری ئامادەکردنـی بـۆ چەندیـن دەقـی شـانۆیی کـردووەو توانیویەتـی چەندیـن دەقیـش بنووسـێت، لەسـاڵی(٢٠١٩)دا کتێبێکـی بەچـاپ گەیانـدووە بـە ناونیشانی(پرسـیارە بـێ وەڵامـەکان)

## مێژووی دروستبوونی تیپی شانۆی باوەنور بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟ ئەندامێتی لە تیپەکەدا لەسەر چ بنەمایەك بوو؟

علی عزیز: لەشارۆچکەی باوەنوردا لەپێش ئەوەی تیپی شانۆش دروست بکرێت ساڵانە چەندین جار لەبۆنەو یادەکاندا نمایشی شانۆیان ئەنجام دەدا بۆیەکەمین جار لە ساڵی ١٩٨٧توانیم یەکەم دەقی شانۆی لە باوەنورو دەربەندیخان نمایش بکەم کە لەنووسین و دەرهێنانی خۆم بوو بەناو نیشانی(کێ تاوانبارە) ناوەڕۆکی دەقەکەش باسی لەو نا دادپەروەرییە دەکرد کە لەلایەن مامۆستاوە دەرهەق بە خوێندکار دەکرا، ئەو کەسانەش کە لەم دەقە شانۆییەدا ڕۆڵیان بینی ئەمانە بوون:(خۆم، دڵشاد محەمەد قادر، نوری ئەدیب، عبدللە عبدلقادر، کاروان عوسمان، غازی ئەحمەد میرزا، ئەکبر حاجی عبدللە، سەروەت ڕشید، حەسەنی میمکە گەوەر)، بەڵام دواتر لە ساڵی(١٩٩٠)دا تیپی شانۆی باوەنور بەشێوەیەکی فەرمی لەسەر دەستی(علی عزیز) دامەزرا بە هاوکاری و ئەندامێتی چەندین گەنجی بەهرەمەندو بەتوانا کە ئەمانە بوون:

دڵشاد محەمەد قادر، عومەر ڕەحمان، غازی ئەحمەد میرزا، سەروەت ڕەشید، ئەحمەد مەحمود( ئەحە نۆکە)، عبدللە عبدلقادری جوانەمەرگ(عەبە خەوخۆش)، دلێر عبدلکریم(دڵەی لالە مارف)، ئەکبەر حاجی عبدللە، نوری ئەدیب، حسێن ساڵح، عومەر حمید، سەرتیپ حبیب(یابە)، جەلال عەبدولمەجید، بەڵام دوای ماوەیەك ئەندامانی تیپەکە زیادیان کرد و چەند کەسێکی تر وەك ئەکتەر لە هەندێك لە شانۆگەرییەکاندا ڕۆڵیان بینیووە لەوانە(ستار عبدالکریم(ستارچاوشین)، شاخەوان عبدالکریم، شەماڵ ئەحمەد، نەبەرد عزیز، علی حسێن، کاروان محەمەد عبدللە، کاروان عوسمان. ئەندامێتی گرووپیش لەسەر بنەمای تواناو خۆنەویستی و خۆشەویستی بۆ کاری شانۆو هاوڕێیەتی و یەکتر قبوڵکردن بوو.

## پێش دروستبوونی تیپی شانۆی باوەنور هیچ گروپێکی تر هەبووە لە باوەنوردا؟

عەلی عزیز: ئەتوانم بڵێم وەك بوونی گروپی شانۆی هیچ گروپێکی ڕەسمی بوونی نەبووە بەڵام هەندێکجار لە قوتابخانەکاندا لەیادو بۆنە تایبەتەکاندا کە ئەوکات حیزبی بەعس ڕێکی دەخست ئەنجام دەدراو هەرکەس ئارەزوی بوایە بەژداریان پێدەکرد، بەڵام دەبوو شانۆگەرییەکە پڕ بە بەری حیزبی بەعس درومانی بۆ بکرایە.

## یەکەم بەرهەمی شانۆیتان لەژێر ناوی تیپی شانۆی باوەنوردا ناوی چی بوو؟ لە چ بەرواریێکدا نمایشتان کرد؟

عەلی عزیز: پاش ماوەیەك لە دروستبوون و ڕاگەیاندنی تیپی شانۆی باوەنور توانیمان لە ١٩٩٠/٤/٢٨ ی هەمان ساڵدا کە تیپەکەی تێدا دامەزرا لە خوێندنگەی دواناوەندی پێباز یەکەمین دەقی شانۆیی بە ناونیشانی (بەهار کۆچ نەکەی) کە لە نووسین و دەرهێنانی خۆم بوو نمایش بکەین، بەڵام لەپێش نمایشکردنی ئەو شانۆگەریە لەلایەن دەزگای ئەمنی ئەوکاتەی بەعسەوە پێداچوونەوە بەتەواوی بڕگەکانی دەقەکەدا کراو چەندین دەستەواژەیان لێ گۆڕیوە کە ئاماژە بووە بە هەستی نەتەوایەتی و دروشمی کوردایەتی

## شانۆگەرییەکان زۆرتر ڕەنگانەوەی چ لایەنێکی ژیان بوون؟ هەڵگری چ پەیامێك بوون؟

دڵشادمحەمەد: بەشێوەیەکی گشتی دەقە شانۆییەکان باسیان لەو نەهامەتیانە دەکرد کە ئەوکات بەشێکی زۆری کۆمەڵگە پێوە دەیان ناڵاند بەتایبەتی لەبواری کۆمەڵایەتیدا لە نموونەی پیاو سالاری و باوك سالاری، کێشەی قوتابی و مامۆستا هتد... هەندێك لە شانۆگەرییەکانیش نەتەوایەتی بوون و باسیان لە نەبەردی و قارەمانیەتی هێزی پێشمەرگەی کوردستانیان دەکرد، لەوانە

شانۆگەری (سێدارە) کە یەکێك بوو لەو شانۆگەرییانەی کە لەساڵی (٢٠٠٠)دا بۆجاری دووەم لەسەر خواست و داواکاری خەڵکی باوەنور لەکاتی بانگەشەی هەڵبژاردەکانی شارەوانیەکاندا نمایشکراو بینەرێکی زۆری هەبوو شوێنی نمایشەکەش لای یاریگای تۆپی پێی ئەوکاتەی باوەنور بوو. لەڕووی پەیامیشەوە شانۆگەرییەکان هەمیشە هەڵگری پەیامی ئاشتی و برایەتی و پێکەوەژیان بوون، دەتوانم بڵێم تا ڕادەیەکی زۆر باش پەیامەکانمان لەسەر ئەرزی واقعی ناو خەڵکی باوەنور کاریگەری و ڕەنگدانەوەی باشیان هەبوو.

## نووسین و دەرهێنانی دەقە شانۆییەکان لەلایەن کێ وەئەنجام دەدرا؟

دڵشاد محمەد: زۆربەی بەرهەمەکان لەلایەن کاك(عەلی عزیز)ەو دەنووسراو ئامادە دەکراو هەندێك جاریش من هاوکار دەبووم لە دەستکاری کردن و لابردن یان زیاد کردنی برگەیەك، دەقیش هەبووە لە کتێبەوە وەردەگیراو کاك علی خۆی دەرهێنانی بۆ دەکرد، لەبەرئەوەی ئێمە هەمیشە بە ڕۆحیەتی هاوڕێیانەوە کارەکانمان ئەنجامدەدا هیچکات ڕووبەڕووی خۆپەرستی و خۆسەپاندن نەبووین و هەموومان بەرپرسیارو خاوەن تیپ بووین.

## تا چەند خەڵکی ناوچەکە لەڕووی مادی و مەعنەوییەوە هاوکاربوون لەسەر خستنی تیپی شانۆی باوەنوردا؟ ئاستەنگەکانتان چی بوون؟

دڵشاد محمەد: لەڕاستیدا لەڕووی مەعنەوییەوە لەسەرتای دامەزراندنی تیپی شانۆی باوەنوردا کەوتینە بەر ڕەخنەو تانەو تەشەری خەڵکی ناوچەکەو زۆربەی کات بە لۆتی و دەستبەتاڵ و بێ کار ناو دەبراین، ئەکتەرمان هەبووە لەبەر ڕازی نەبوونی ماڵەوەیاندا لە ڕۆڵ بینین پەشیمان بووتەوەو وازی لە تیپەکە هێناوە، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند تیپی شانۆی باوەنور بە شانۆگەرییەکانی

توانی جێگەی خۆی لە دڵی خەڵکی ناوچەکەدا بکاتەوەو شانۆو هونەری شانۆ بەو خەڵکە ئاشنا بکات، کار بەوە گەیشت کە بەتەمەنەکانیش دەهاتن بۆ تەماشاکردنی شانۆگەرییەکان، چەندین جار دایکم کە ئەوکاتیش ژنێکی بەتەمەن بوو لە شانۆگەرییەکانمدا ئامادەبووە، لەڕووی مادیشەوە هیچ هاوکارییەکی مادیمان لە هیچ کەس و لایەنێکەوە نەبووە، لەو دەمەدا ژیان و گوزەران لەوپەڕی نارەحەتی و نەهامەتیدابوو زۆرەبەی کات کە(دلێری لالە مارف) ڕۆڵی ئافرەتی پێ دەسپێردرا پارەی موسەکەی پێنەبووە کە جوان خۆی ساف و لوس بکات، هەروەها نووسینی چەند نوسخەیەك لە دەقە شانۆییەکان بۆئەوەی لەلای هەمووان بێت و لەماڵەوە پرۆڤەی لەسەر بکرێت یەکێکی تربوو لە گرفتەکانمان، چونکە لەو کاتەدا نە کۆمپیوتەرو نە هیچ ئامێرێکی تر نەبوو کە پەرەی نووسراو بۆ چەند نوسخەیەك کۆپی بکات، ناچار کەسێك بە خەتێکی جوان چەن ڕۆژوو شەوێك بەکاربۆن دەینووسیەوە بۆمان، هەر لەسەر بابەتی نەبوونی ئامێری پێویست بۆ نووسین مامۆستا (خلیل محەمەد) کە یەکێك بوو لە خۆشنوسەکانی باوەنور بۆ نووسینی لافیتەی ئاگاداری کە چەن ڕۆژێك پێش نمایش لەچەند شوێنێکی باوەنور هەڵماندەواسی هاوکاریی باشی دەکردین.



## بەشێوەیەکی گشتی شانۆگەرییەکانتان لە چ کاتێکدا ئەنجام دەدا؟

دڵشاد محەمەد: لە زۆربەی یادو بۆنە تایبەتەکاندا ئێمە شانۆگەری تایبەتمان ئەنجام دەدا، بەڵام لەڕاستیدا بەهۆی بارودۆخی نالەباری ئابووری خەڵك و گرانی و قات و قڕییەوە هەمیشە هەوڵمان دەدا زۆربەی شانۆگەرییەکانمان لەو کاتانەدا ئەنجامبدەین کە (زەیت و گەنمەکە) بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرا واتە ئەو کاتانەی کە بایەعی دەهات و خەڵك کەمێك دەبوژایەوە، چونکە هەم ئێمە بە ڕۆحێت و توانایەکی ترەوە شانۆگەرییەکانمان نمایش دەکرد، هەم خەڵکیش بە پەرۆشتر دەبوو بۆ هاتنیان بۆ تەماشاکردنی شانۆگەری.

## ئەو شانۆگەرییە کامە بوو کە تەماشاکردی بە کڕینی بلیت بوو؟بلیتی بەچەند فرۆشرا؟ کەی بوو؟

دڵشاد محەمەد: لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ەوە هەنگاو قۆناغی باشمان بڕی و ساڵانە لەسەرجەم یاد و بۆنەکاندا چەندین نمایشی شانۆییمان ئەنجام دەدا، تا ئەو ڕادەیەی هەندێکجار تەماشاکردنی شانۆ لە باوەنوردا بە بلیت بوو هەر بلیتێکیش بە دوو دیناری ئەوکات دەفرۆشرا، دیارترینیان شانۆی(حیزبی کەرامەت و سەلامەت) بووە لە نووسینی (عزیز نەسین)و دەرهێنان و ئامادەکردنی خۆم بوو کە لەکاتی یەکەمین بانگەشەی پەرلەمانی کوردستاندا لە ساڵی(١٩٩٢) نمایشکرا، پارەی بلیتەکانیشمان بۆ کڕینی هەندێك پێویستی تیپەکە سەرف دەکرد، ئەمەجگە لەوەی هەریەکێکمان بەگوێرەی توانای مادی خۆی پارەی بۆ تیپەکەو پێداویستییەکانی سەرف دەکرد.

## لەو ماوەی ئێوە کاری شانۆیتان دەکرد لەباوەنوردا هیچ دابڕانێك ڕوویداوە؟ ئەگەر هەبووە هۆکاری چی بوو؟تاکەی بەردەوام بووە؟

علی عزیز: بەڵی دابڕانی زۆریش ڕوویداوە ئێستا تیشك دەخەمە سەر هۆکارەکانی ئەو دابڕانەش، یەکێك لەو گرفتە سەرەکیانەی کە ئیمە هەمانبوو نەبوونی شوێنی پێویست بوو بۆ پرۆڤەکردن و نمایشکردنی دەقە شانۆییەکانمان، زۆربەی کات تەکلیفمان لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکان دەکرد بۆ پێدانی ژورێك بۆپرۆڤەکردنی تیپەکەمان، بڕوات هەبێت هەندێکجار لەبەرنەبوونی شوێن پرۆڤەکانمان لەسەر ڕووباری سیروان ئەنجامداوە شتی وەهمیمان لەبری میزو کورسی بەکارهێناوە، هەندێك جاریش ناچاربووینە لەماڵی یەکێکمان کۆببینەوەو پرۆڤەی تێدا ئەنجام بدەین، ئەتوانم بڵێم ئیمە لەباوەنوردا مەلەمان دژی شەپۆل دەکرد مەلەکردنیش دژی شەپۆل سەخت و دژوارە، هەموو ئەرکێکی گروپ لەسەر خۆمان بوو هیچ کەس و لایەنێك هاوکارمان نەبوو کە بتوانێت کەمێك لە ئەرکی ئیمە کەم بکاتەوە، ئەوەبوو هۆڵ(مونەزەمە)ی کۆنمان کە ئێستا(نەخۆشخانەی شۆڕشە) بۆ خۆمان پێشنیار کرد کە بتوانین تێیدا نمایشەکانمان پیشانی خەڵك بدەین، بەڵام کاتێك ڕۆشتین بینیمان هۆڵکە زۆر داڕوخاوەو پێویستی بە کاری زۆر هەیە کە تێدا بکرێت، ئەوەبوو هەموومان پێکەوە توانیمان پشتی پەردەمان دروستکردو بە کیسە چیمەنتۆیەك کە بەقەرز هێنابومان سەکۆی شانۆمان دروستکرد، بیرمە تارۆژێك پێش نمایشکردنیش ئیمە هەر خەریکی کارکردن بووین بۆئەوەی بتوانین جێگەی پێویست بۆ بینەرانمان ئامادەبکەین، کە دەبوو لەبری ئەوەی (جەنراڵ پرۆڤە) بکەین بۆئەوەی لە کاتی نواندندا هیچ هەڵەیەك نەکەین، لەو دەمەدا ئێمە وامان بیردەکردەوە چیتر بە نەمانی بەعس ئەو ماف و ئازادیانەی کە پێشتر لێمان زەوت کرابوو بۆمان دەگەڕێتەوە، بەڵام زۆری نەخایاند هاوکێشەکە بەشێوەیك دەرکەوت کە لە خیاڵی ئیمەدا نەبوو، لەو کاتەدا کە ئیمە سەرقاڵی ڕێکخستن

و نۆژەنكردنـــەوەی ئـــەو هۆڵەبوویـــن بەرپرســـێكی حیزبـــی لەباوەنـــور پێشـنیاری ئـەوی كردبـوو كـە دەبێـت ئـەو هۆڵـە بدرێـت بـە گروپێكـی كۆنفـۆی خزمـی خـۆی كـە ئـەوكات لـە باوەنـور دامـەزرا، سـەرەڕای ئـەوەش لـەو كاتـەدا چەنـد شـوێنێكی چۆڵـی تـر هەبـوون بـۆ ئـەو گروپە كۆنفۆیـە، دوای گفتۆگۆكردنێكـی زۆرم لـە گەڵیـا بـێ سـود بـوو ئـەو هۆڵـەش كـە تاكـە ئومێـدی ئێمەبـوو لێـان وەرگیـرا، ئیـدی لـەو بـەرواره بـەدواوە نـا ئومێدیەكـی زۆر باڵـی كێشـا بەسـەر تیپەكەمانـداو ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ تیپەكەمـان بـەرەو پەرتەوازبـوون دەڕۆیشـت لەبەرامبـەر ئـەو بـێ دەنگـی و بـێ هەڵوێسـتییەی خەڵكـی باوەنـوردا زیاتـر تووشـی ڕەشـبنی بوویـن و دابڕانێكـی گـەورە لـە كاری شـانۆییماندا ڕوویـدا، ئـەم دابڕانـەش درێـژەی كێشـا هەتـاوەك سـاڵی(٢٠١٤) لەسـەر پێشـنیاری مامۆسـتا(كاروان محەمـەد عەبدوڵـڵا) هـەر یـەك لـە مـن و مامۆسـتا كاروان و مامۆسـتا سـەیوان و ئـارام جەبـار و ئامانـج جەبـار بەسـەردانێكمان بـۆلای مامۆسـتا(ئاكۆ هۆرێنـی) كـە بەرێوەبەری گشـتی ڕۆشـنبیری و هونەریـی گەرمیـان، بـە دەركردنـی مۆڵـەتـی فەرمـی و مـۆری تایبـەت بـە گروپەكەمـان جارێكـی تـر تیپەكەمـان زینـدوو كـردەوە، بـەڵام ئەمجارەیـان نـاوی تیپـی شـانۆی باوەنـور گـۆڕدرا



بـۆ نـاوی گروپـی شـانۆی باوەنـور، بەکـۆی دەنـگ بەنـدەش وەك سەرپەرەشـتیاری گـروپ هەڵبژێـردرام لێـرەوە جێـی خۆیەتـی سوپاسـی ئـەو متمانەیـان بکـەم کـە بەمنیـان بەخشـی، ئـەو شـانۆگەرییانەش کـە تـاوەك ئێسـتا لەژێـر ئـەم نـاوە تـازەدا ئەنجـام دروان بریتیـن لـە: شـانۆگەری (کورسـی) لـە دەرهێنانـی مامۆسـتا سـەیوان مەحمـود و شانۆگەری(پێشـمەرگە) لـە نووسـین و دەرهێنانـی عەلـی عەزیـز کـە لەسـاڵی یەکەمـی ڕۆژی باوەنـوردا نمایشـکراو شانۆگەری(پاشـا) لـە دەرهێنانـی مامۆسـتا سـەیوان کـە لـە سـاڵی دووەمـی ڕۆژی باوەنـوردا نمایشـکرا.

## ئایـا هیـچ کات لـە شـانۆگەرییەکانتاندا ئافـرەت ڕۆڵ و بەشـدارییان هەبـووە؟ تاچـەن لـە نێـو ئەندامەکانـدا لـەڕووی تەمەنـەوە جیـاوازی هەبـووە؟

دڵشـاد محەمـەد: هیـچ کات لـە شـانۆگەرییەکانماندا ئافـرەت بـەژدار نەبـووە ئـەو ڕۆڵانـەش کـە هـی ئافـرەت بـوون یەکێـك لـە ئەندامانـی تیـپ ڕۆڵـی ئافرەتیـان دەبینـی لەوانە(دڵـەی لالـە مـارف) ڕۆڵـی کچـی دەبینـی و(یابـە)ش ڕۆڵـی ژنـی دەبینـی، لـەڕووی تەمەنیشـەوە دەتوانـم بڵێـم زۆربەمـان هـاو تەمـەن بوویـن و جیاوازییەکـی زۆر نەبـوو لەنێوانمانـداو لەسـەر بنەمـای هاوڕێیەتـی کاری شـانۆیمان دەکـرد بەبـێ ئـەوی هیـچ کام لـە ئێمـە بەرژەوەندییەکـی تایبەتـی لـەم کارەمانـدا هەبێـت ئـەو ئامانجـە گشـتیەش کـە هەموومانـی کۆکردبـووەوە خزمەتکـردن بـوو بـە خەڵکـی شـاروچکەکەمان.

## زۆرتریـن و کەمتریـن بینـەر لـە کام شـانۆگەریەنەدا ئامادەییـان هەبـوو؟ ئەکـرێ ئامـاژە بـە سـاڵەکانیان بـدەی؟

عەلـی عزیـز: دەوانـم بڵێـم یەکێـك لـەو بەرهەمانـەی کـە زۆرتریـن بینـەری هەبـوو شـانۆی (سـێدارە)بوو کـە لەسـاڵی ١٩٩٣دا نمایشـمان کـرد، شـانۆگەرییەکە هەسـتی خەڵکـی جوڵانـدو ژمارەیەکـی زۆر لـە

